# هەڵەی زیرەک بەهەزارە

## گەورەترین هەڵەسیاسییەکان لەمێژوودا





ئیمپراتۆریەتەکانی ڕوخاند....شارستانیەتەکانی وێرانکرد



چارەنوسی گەلانی لەناوبرد.....سامانی گەلانی بەهەدەردا





نوسینی: مەجدی کامل

وەرگێرانی: دڵسۆز عومەر

2016

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە (٥٥٧)**




**ناسنامەی کتێب**

- ناوی کتێب: هەڵەی زیرەك بە هەزارە!!
- نوسینی: مجدی کامل
- بابەت: هەڵەی سیاسییەکان
- وەرگێڕانی: دڵسۆز عومەر
- بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٦
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (1213)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.



ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٣٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست


پێشەکی نوسەر ........................................ ٧

بە دانایی و ژیرانە، یان بە ئازایەتی و بوێری ........................ ٧

1-هیتلەر...ناپلیۆن...ژەنەڕاڵی زستان ........................................١١

2-جۆنسۆن ...نکسۆن و هەڵەیەکی مەزن بەناوی جەنگی ڤێتنام ........... ٤٩

3-هەڵەکەی هیرۆهیتۆ........................................٧٩

جنۆکەکەی ئامادەکرد، بەڵام شکستی هێنا لە بەکارهێنانیدا!! ................٧٩

4-گیڤارا.....بمکوژەو لەمن ئەفسانەیەك دروستبکە!! ........................ ١١١

5-حاییم بارلیف..... وانە لە ماجینۆوە فێرنەبوو!! ........................١٢٣

6-بۆریس یلتسن... ئیمپراتۆریەتەکەی تێکشکاند و کلیلەکانی جیهانی ڕادەستی

ئەمریکیەکان کرد!! ........................................ ١٤٣

7-بیلّ کلینتۆن ...کەوتن دوای کەوتن ؟! ........................١٦١

8-هەڵبژاردنی بوش وەك سەرۆك هەڵەیەك بوو کە لێخۆش بوونی نیە بۆ

ئەمریکیەکان!! ........................................١٧٥

9-تۆنی بلێر ...دوای درەوشانەی ئەستێرەکەی........................................٢١٥

زبڵدانی مێژووی هەڵبژارد!! ........................................٢١٥

10-ئەنوەر سادات.....دەرچوونی جنۆکەکە لە گولاّودانەکەدا!! ............ ٢٢٩

11-شاو مارکۆس...ئەوەی گرەو لەسەر ئەمریکیەکان بکات دەیدۆڕێنێت!! ...٢٥١

12-صدام حسێن و داگیرکردنی کوەیت....حساباتی هەڵەو کۆتاییەکی

نەهامەتبار!! ........................................٢٦٩

13- ڕۆبسبێر... هیچ وانەیەك فێرنەبوو........................................٣٠٣

هەڵەیەکی کوشندە لە سێدارەیدا!! ........................................٣٠٣

14-قاسم و بەکر و للیندی.................................................... ٣١٧
هەمان هەڵەو هەمان چارەنوس!!................................................ ٣١٧
15-عباس و هەنیە.............................................................. ٣٣٩
نەهامەتی گەڕانەوەی دۆسیەکە بۆ دواوە!!....................................... ٣٣٩
16-لویسی نۆهەم....لە خۆبایی بوون نهێنی نەهامەتیەکە!!..................... ٣٥٥
17-ئەبو عبدالله الاحمر.... لە دەستدانی کورسی دەسەلات و کۆتای خەون! ٣٦٧
18-شەجەرە دوڕ.....خواستی دەروونی کاتێك گەیشتە دەستەلات!!......... ٣٨٩
19-زین العابدین بن علی. ..کارەساتی تێگەیشتن دوای بەسەرچوونی کات!! ٣٩٩
20-نەفرینی بە پشتاوپشتکردنی دەستەلات....بزمارێك کە موبارەك لە تابووتی
خۆیدا!!............................................................................ ٤١٥
21-قەزافی و خۆبەهێزکردنی بەدەرەوە. ..کاتێك جادوەکە هەڵدەگەڕێتەوە بەسەر
جادووگەرەکەدا!!............................................................... ٤٣٣

# هەڵەی زیرەك بە هەزارە!!

## گەورەترین هەڵە سیاسیەکان لە مێژوودا

ئیمپراتۆریەتەکانی ڕوخاند....شارستانیەتەکانی وێرانکرد
چارەنوسی گەلانی لەناوبرد.....سامانی گەلانی
بەهەدەردا

# پێشەکی نوسەر

هەڵەی زیرەك بە هەزارە....ئەوە قسەیەکی جەماوەریە....لێرەدا مەبەست لە (زیرەك) کەسێکی داناو ژیر و چاوکراوەیە، کە سود لە ئەزمونەکانی ڕابردوو ئەوانی تر وەردەگرێت، بۆ چۆنیەتی وەرگرتنی بڕیاری پێویست لە ساتەوەختی گونجاودا، بە دانایی و ژیرانە، یان بە ئازایەتی و بوێری.

زیرەك ئەو کەسەیە کە باش کاروبارەکان هەڵدەسەنگێنێت، و بەباشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکات، بەبێ دەمارگیری و هەڵچون، یان بەبێ هەڵە و زیادەڕۆی وشوێنکەوتنی هەست و سۆزی. لەگەڵ وریای بە لێکەوتەوە دەرهاویشتەکانی هەموو ئەو بڕیارانەی کە دەریان دەکات.

لێرەدا پێویستە زیرەك، زیرەك بێت لەبەر ئەوەی بتوانێت جیاوازی بکات —لەکاتی وەرگرتنی بڕیارەکان لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن، لەگەڵ ئەو کێشەو دۆسیانەی کە ڕووبەڕوی دەبنەوە،لە نێوان پاداشت و هەڵە،لە نێوان لاواز و قەڵەو،لە نێوان ڕزگارکەرو ماندوکەر، لە نێوان ئەوەی کە بەرز و بڵندی لە خۆگرتووە و ئەوەی کە بەرەوە خوارەوەی دەبات.

ئەگەر کەسی زیرەك، لە خەڵکی گشتی و ئاسایی بێت، ئەوە ئەو لێکەوتەو دەرهاویشتانەی کە لە دەرئەنجامی بڕیارەکانی دەکەونەوە لە سنورێکی دیاریکراودا دەبن، بە شێوەیەك خۆشبەختی و ناڕەحەتیەکانی لە بازنەکانی دەوروبەری خۆیدا دەخولێنەوە. بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو کەسە پۆستێکی باڵای سیاسی یان سەربازی بەدەستەوە بێت، ئەوە بڕیارەکانی کاریگەریان دەبێت، لەسەر دەیان بگرە سەدان ملیۆن

مرۆڤ، له هاولاّتیانی ولاّتەکەی خۆیی و گەلانی دەوربەری و، بگره هەموو جیهانیش، به گشتی ئەگەر سەرکردەکەیان فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتێکی گەوره بێت، خۆ ئەگەر هاتوو سەرکردەی ولاّتێکی بچوکیش بێت، ئەوه هەر به هەنگاوه خراپەکانی، جەنگێك بەرپا دەکات، یان قەیرانێکی نێودەوڵەتی دروستدەکات.

هەڵەی زیرەك له جیهانی سیاسیدا، زۆرینەی جار باجەکەی ئابڕوچونێکی سیاسی سەرشۆڕکەر، یان تێکشکانێکی گەورەی سەربازی، یان جەنگێکی جیهانی یان هەرێمی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، که دواجار دەبێته هۆی وێرانکردن و تێکدانی ولاّتەکەی و له ناوچوونی خۆشی.

هەڵەی زیرەك گەورەیە،ئەگەر گەورەش بوو ئەوه ڕێڕەوی مێژوو دەگۆڕێت و ئیمپراتۆریەتەکان دەڕوخێنێت و سامانی ولاّتان بەهەدەر دەدات و سەرکەوتن و دەستکەتەکانی گەلان لەناو دەبات.

هەڵەی زیرەك ئەگەر کەسێکی سیاسی بیکات، دەبێته هۆی ئەوەی که سەرجەم ئەو نازناوانەی که گەل پێش چۆکدادانی و ڕوخانی لێی ناوه لێی دابماڵرێت، و له شوێن ئەو نازناوانه، نازناوی نوێ ی سوك وڕیسواکەر بەسەریدا بسەپێنرێت. کارەکەش لەو ئاستەدا ناوەستێت، له لاپەڕەکانی مێژوودا زۆرمان بینیوه، که زۆرێك لەو کەسانەی که تووشی ئەو هەڵه مەزنه بوون، گیانی خۆیان له پای ئەنجامدانی ئەو هەڵەیه داناوه، وەك باجێك بۆ هەڵه مەزنەکەی.

له جیهانی سیاسەتدا، مێژوو زۆرنموونەی لەو جۆرەمان پێشکەش دەکات، لەسەر ئەو هەڵه گەورانەی که سەرۆك و فەرمانده و سەرکرده سیاسی و سەربازیەکان ئەنجامیانداون، که هەندێکیان گەیشتوونەته ئاستی هەڵەی مەزن، بەهۆی پێداگری ئەوان لەسەر هەڵەکانیان، له کاتی ڕووخان، یان هەڵچون و شێت بوون، یان هەڵەشەی و تێکچوونیان، که دواجار بۆته هۆی ڕودانی کارەساتێك، که نه گەلەکەی خۆیان و نه هەموو گەلانی دونیاش پێشتر شتی لەو جۆرەیان به خۆیانەوه نەدیوه. خراپتر لەو هەڵەیەش ئەوەی که هەندێك لەو هەلاّنه لەگەڵ خۆیان گۆڕینی ڕێڕەوی مێژوویان

لێدەکەوێتەوە، بەرەو ڕێگەیەکی خراپ، کە زۆرینەی جار سەرەتایەکە بۆ دەستپێکردنی سەردەمێکی نوێ، کە بە هۆیەوە مرۆڤایەتی زۆرێك لە سامان و داهێنان و دەستکەوتەکاتە بەدەستهاتووەکانی لەدەستدەدات، دەیان بگرە سەدان ساڵ مرۆڤایەتی بەرەو دواوە دەباتەوە ! !

خوێنەری خۆشەویست، لەم کتێبەدا ئاشنا دەبیت، بە زۆرترین ئەو هەڵە مێژووییانەی کە لە جیهانی سیاسەتدا ئەنجامدراون، لەلایەن کەسانی سیاسیەوە، ئەو کەسانەی کە هیچ بیریان لێنەکردۆتەوە تا بەسەریدا نەکەوتوون، لە ڕوانگەی تێڕوانینیان بۆ شارەزای و ئەزموون و وانەی مێژووی،لە وەرگرتنی ئەزموون لە هەڵەکانی ئەوانەی پێش خۆیان.

بۆ نمونە لەم کتێبەدا ئەو هەڵانە بەرجەستەکراون کە هەریەکە لە ئیمپراتۆری فەرەنسی (ناپلیۆن پۆناپۆرت) و سەرکردەی ئەڵمانی (ئەدۆلف هیتلەر) و، ئیمپراتۆری ژاپۆنی (هیرۆ هیتۆ)، و هەر دوو سەرکردەی ئەمریکی (ليندۆن جۆنسۆن)و (ریچارد نیکسۆن)، ئەنجامیانداون،لە پێش ئەوانیشەوە ئەو هەڵانەی کە هەریەکە لە شاژنی میصر (شەجەرە دوڕ) و، پادشای فەرەنسا (لویسی نۆیەم) و کۆتا پادشای موسڵمانەکانی غرناتە (عبدالله بن بنی الاحمر) ئەنجامیانداون.

هەروەها لەم کتێبەدا ئەو هەڵە گەورانە دەبینین کە گەلان ئەنجامیانداون، وەك ئەو هەڵە گەورەیەی کە گەلی ئەمریکی ئەنجامیدا بە هەڵبژاردنی (جۆرج بوشی کوڕ) بە سەرۆکی ئەمریکا. یان ئەو لادانە گەورەیەیی کە زۆرینەی سەرکردەکانی شۆڕش لە جیهانی سێهەمدا کردیان، بە بەکارهێنانی ئەوەی کە پێی دەگوترێت شەرعیەتی شۆڕشگێڕی بە خراپترین شێوە، بۆ گرنتی کردنی مانەوەیان لەسەر کورسی دەستەڵاتی وڵاتەکانیان بۆ هەتا هەتایە.

هەروەها نموونەی سەرکردەیەکی تری وەك سەرۆکی عێراق(صدام حسێن)، کە بە بڕیارە هەڵەکانی وەك داگیرکردنی وڵاتی کوەیتی دراوسێی، تێکدان و وێرانکردن و مردنی بە دوای خۆیدا هێنا، بۆ گەلی عێراق و گەلانی دراوسێی، و گیانی خۆی لە باجی ئەو هەڵەیەدا لەدەستدا، لەم کتێبەدا باس دەکەین. ئەمە جگە لەوەی باس لەو هەڵە گەورانە

دەکەین کە سەرکردەکان بەرامبەر بە خۆیان ئەنجامیانداوە، بە بەجێهیشتنی چارەنوسی خۆیان لە دەستی هەندێك کەسی ناپاکی دەوربەری خۆیان، و پێدانی پۆستی گرنگ و هەستیار بەو کەسانە، کە دواجا بووەتە هۆی ئەوەی ئەو کەسانە لە دژیان هەڵبگەڕێننەوە و لە ناویان بەرن و لە سێدارەیان بدەن، وەك سەرۆکی وڵاتی چیللی سیلڤادۆر للیندی و، هەردوو سەرۆکی عێراقی عبدالکریم قاسم و ئەحمەد حسن بەکر.

هەروەها لەم کتێبەدا نموونەی ئەو سەرکردانە باسدەکەین، کە گرەویان لەسەر هاوپەیمانی ئەمریکیەکان کردووە، لە جیاتی ئەوەی گرەو لەسەر گەلەکانی خۆیان بکەن. بۆ ئەم کارەشیان باجێکی گەورەیانداوە، بەڵام دوای ئەوەی کە کار لەکار ترازاوە، ئینجا تێگەیشتوون کە ئەوەی گرەو لەسەر ئەمریکیەکان، یان هەر وڵاتێکی تری دەرەکی بکات بۆ گرەنتی کردنی مانەوە و درێژەدان بە دەستەڵاتەکەی دەیدۆڕێنێت، لە نمونەی ئەوانەش محمد ڕەزای شای ئێران و سەرۆکی فلیپینی فریناندۆ مارکۆس.هەروەها ئەو هەڵانەی کە دوو سەرۆکی تری وڵاتانی عەرەبی ئەنجامیاندا ئەنوەر سادات سەرۆکی میصر و حبیب بورقیبەی سەرۆکی تونس. وە ئەو هەڵانەی کەهەر دوو سەرکردەی بزوتنەوەی نیشتیمانی فەلەستینی سەرۆکی بزوتنەوەی فتح محمود عباس و سەرۆکی حکومەتەکەی حماس ئیسماعیل هەنیە ئەنجامیاندا،بە چوونە نێو ململانێ و پێکدادان و جەنگ لەسەر دەستەڵات، لە جیاتی هەوڵدانیان بۆ دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی فەلەستینی و بەرەنگاربوونەوەی ئیسرائیل.

هەموو ئەو کەساياتیانەی نێو ئەم کتێبە هەڵگری نازناوی زیرەکن، بەڵام بە ئەنجامدانی یەك هەڵەی گەورە، هەموو ئەوەی کە هەیان بووە لە دەستیانداوە، یان هەموو ئەو شتەی لە مێژوو ناوبانگ کە هەیان بووە سڕیانەتەوە.

مجدی حسێن کامیل

وتەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: (ئەوەی هەڵەکانی مێژوو شارەزانەبێت، دووبارەیان دەکاتەوە) ناپلیۆن، دواتریش هیتلەر ڕاستیەتی ئەم وتەیەیان سەلماند.

کاتێك ناپلیۆن لە ساڵی (١٨١٢)ز لەبەردەم دەروازەکانی شاری (مۆسکۆ) دا وەستا، ئیتر لەوێوە یەکەم شۆکی ڕاستەقینە پایەکانی سیستەمی ئیمپراتۆریەتەکەی هەژاند. دوای زیاتر لە سەدەیەکیش هیتلەر بە هەمان شێوە لەبەردەم دەروازەکانی مۆسکۆدا وەستایەوە، وەك ئەوەی کە هیچ وانەیەك لە ناپلیۆنەوە فێرنەبوو بێت.

لەمانگی دیسەمبەری ساڵی (١٩٤١)ز کارەکانی سوپای ئەڵمانی لە ڕوسیا کۆتایان هات بە هۆی ئازایەتی ڕوسەکان و دواتریش ژەنەڕاڵی زستان.

کۆتای هەردوو سەرکردەی نێودەوڵەتی ناپلیۆن و هیتلەر وەك یەك و هاوبەش بوو. هەردووکیان بە خێرایەکی سەرسوڕهێنەر ئەوروپایان داگیرکرد، بەهۆی تەکنیکی سەربازی نوێ و ڕێکخستنە سەربازیە نوێکانیانەوە.

هەردووکیان ڕێڕەوی داگیرکردن و جەنگە سەرکەوتووەکانیان بەردەوام بوو تا گەیاندینیە سەرکەشی و لە خۆبای بوون و بڕیاری داگیرکردنی ڕوسیایاندا. ئیتر لێرەوە سەرەتاکانی کۆتای خۆیانیان نوسیەوە.

ئەوروپا کیشوەرێکی بچوکە، دەکرێت سوپایەکی سەرکەوتوو تۆکمە بە خێرای داگیری بکات، لە بەرامبەردا ڕووبەری ڕوسیا زیاترە لە ڕووبەری هەرسێ کشوەری ئەفریقاو ئەوروپاو ئوستورالیا، لە چوارچێوەی ژینگەیەکی وشکانی کە هیچ تایبەتمەندیەکی نوێ و هاوچەرخی تێدا نەبێت ,ڕووبەرێکی گەورەی لەو شێوەیە پێویستی بە سوپایەکی زۆر و زەبەلاح و ڕێکخراو توانای لۆجستی مەزن هەیە.

سەرەڕای هۆکاری ئەو ڕووبەرە زۆرەی ڕوسیا (ژەنەڕاڵی زستانیش) هەیە کە سوپای داگیرکەران هەراساندەکات و ڕوسیا دەپارێزێت، بەڕێگەیەکی سروشتی و بەبێ هیچ تێچونێکی ئابووری.

کاتێك سەرکردەی فەرەنسی ناپلیۆن ساڵی (١٨١٢) ز بڕیاری داگیرکردنی ڕووسیایدا، خاوەنی بەهێزترین و باشترین سوپای ئەوروپا بوو.

لە سەرەتادا بە ئاسانی سنورەکانی ڕوسیای بەزاند، وەك هەریەکە لە هیتلەر دوای (١٢٩) ساڵ و پێشتریش لە ساڵی (١٧٠٩)ز کردیان. ڕووسەکان قوڵای جوگرافی وڵاتەکەیان قۆستەوەو پاشەکشەیان کرد لە بەردەم سوپای فەڕەنسیدا و بەرەنگاریان نەبوونەوە.

کاتێك ناپلیۆن چووە مۆسکۆ تەنها یەك مرۆڤیشی لێ نەمابوو (حکومەت هاوڵاتیانی گواست بوویەوە بە سیبریای سارد )بۆیە تێکشکاو بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا، سەرمای زستانیش لە کاتی گەڕانەوەیدا هێندەی تر تێکی شکاند (پلەکانی گەرما دابەزی بوون بۆ چل پلەی ژێر سفری سەدی ) بۆیە زۆرینەی سوپاکەی لە سەرماو برساندا مردن. لە کۆی (٦٠٠) شەش سەد هەزار سەرباز سەرمای ڕووسیا (٥٥٠) پێنج سەدو پەنجا هەزار سەربازی لەناو برد، بەبێ ئەوەی ئەو سوپایە هیچ جۆرە جەنگێکی ڕاستەقینە ببینن.

ئەوە زیانێك بوو کە ناپلیۆن نەی توانی بە هیچ شێوەیەك قەرە بووی بکاتەوە، و هۆکارێکیش بوو بۆ کۆتای هاتنی. ئەوە چیرۆکەکەی ناپلیۆن بوو لەگەڵ ڕووسەکان، یان هەڵە گەورەکەی بوو یان بڵێین هەڵە کوشندەکەی بوو.

ساڵی (١٨٠٠) ز ناپلیۆن بوویە ژەنەڕاڵێکی گەنج و بە شارەزاییە جەنگیەکانی پیاوانی ئەوروپای سەرسام کرد. ناپلیۆن لە دورگەی (کۆرسیکا ) لە دایك بووە، لە نێو تێکشکێنەرەکانی شۆرشی فەرەنسیدا گەشەی کردو و بوو بە دەستەڵاتداری فەرەنسا، کاتێکیش تەمەنی گەیشتە (٣٥) ساڵ بوو بە ئیمپراتۆری فەرەنسا.

ساڵی (١٨٠٤) بژاردەیەك لە سوپای پیمپراتۆری لە پاریس دەرکەوتوو بە خێرای دەستی گرت بە سەر ڕووبەرێکی زۆری زەوی، کە هیچ لایەنێك جگە لە فەرەنسیەکان بۆی نەبوو دەستەڵاتی بە سەردا هەبێت.

ناپلیۆن خاوەنی ڕەگ و ڕیشەیەکی ئاسنین بوو، بە تاکتیکی سەربازی ئازاو چاونەترس دەناسرایەوە؛ خەونی بە ئیمپراتۆریەتێکی ئەورووپیەوە دەبینی کە هی خۆی بێت و یەك حکومەت و دراو و یاسای شارستانی تێدا بێت و مافی هاوڵاتی ئاسای بپارێزێت.

کاتێك خەونەکەی هاتەدی، خێزانە شاهانەییەکان و دەستەڵاتە پشتاو پشتەکانی هەڵوەشاندەوە. ساڵی (١٨٠٧) ڕووسیاو بەریتانیا تەنها دوو تاکە هێز بوون کە بەرگری لە سەپاندنی دەستەڵاتەکی ناپلیۆن بکەن بەسەر تەواوی ئەورووپادا، دواتر لە جەنگی (فریدلاند) روسیای تێك شکاند، دوای سەرکەوتنەکەشی داوای وتووێژی ئاشتی کرد لەگەڵ (ئەسکەندەری یەکەم )قەیسەری ڕوسیا لە ڕێکەوتنامەی (تلست)، بۆ هاندانی ئەسکەندەریش پەیکەرێکی جوانی لەسەر ڕووباری (میمن ) بۆ دروستکرد.

ناپلیۆن دڵنیابوو لەوەی کە ئیمپراتۆریەتە نوێیەکەی پێویستی بە هاوپەیمانێکی بەهێز هەیە. لە کاتی گفتوگۆکردنیدا لەگەڵ قەیسەری روسیا (ئەسکەندەر) هەستی بەوەکردبوو کە کەسێکی ڕاستگۆیە.

ئەسکەندەر ئەرستۆکراتێکی کەشخەی تەمەن (سی) ساڵان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی دیبلۆماسی بێ هاوتابوو. بیروبۆچوونە لیبراڵیەکەی کردبوویە سەرکردەیەکی نەتەوەی. ئەسکەندەر حکومی ئیمپراتۆریەتیکی بەرفراوانی دەکرد لە ڕۆژهەڵات.

لەگەڵ پێشکەوتنی دانوستانەکاندا، بۆ ناپلیۆن ڕوون بویەوە کە دەیەوێت چۆن هاوکاری لە ئەسکەندەر وەربگرێت، ئەگەر فەرەنساو ڕوسیا بچنە پاڵ یەك ئەوکات بەریتانیا بە تەنها خۆی وەك دوژمنی فەرەنسا دەمێنێتەوە، دوژمنێکی گۆشەگیری تەواو. بەم شێوەیەش ناپلیۆن دەتوانێت بەتەواوی دەست بەسەر ئەورووپادا بگرێت.

ئەسکەندەر بەخێرای داواکاری هاوپەیمانیەتەکەی ڕەد نەکردەوە، بۆیە دواتر ڕێکەتنامەی ئاشتیان واژۆکرد، ڕێکەوتنامە لە نێوان دوو گەورەترین ئیمپراتۆری جیهان. هاوپەیمانیەتی نێوان ئەسکەندەرو ناپلیۆن بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی سەرجەم مامەڵە بازرگانیەکانی نێوان رووسیاو بەریتانیا، ئامانجیش لەمە مایە پووچ کردنی ئابووری بەریتانیا بوو.

لە پاریس (جۆزیف) تێبینی گۆڕانی هەڵسوکەوتی هاوسەرەکەی کردبوو، دوای چاوپێکەوتنی قەیسەری ڕووسیا، ناپلیۆن دەیویست زیاتر خۆی لە قەیسەر نزیك بکاتەوە، بۆ پەرەپێدانی هاوپەیمانیەتەکەشی ویستی ئەنجامدلنی هاوسەرگیری هەبوو. لە لایەکی تریشەوە نەوەی کوڕی دەویست بۆ مانەوەو بەردەوامیدان بە مانەوەی خێزانەکەی لە دەستەڵاتدا، بەڵام لە هەمان کاتدا ناپلیۆن دەیزانی جۆزیفی خێزانی توانای ئەوەی نیە کە منداڵ بهێنێتە دنیاوە، بەو شێوەیەش داوای هاوسەرگیری کرد لەگەڵ (ئان) خوشکە بچوکی ئەسکەندەری قەیسەری ڕوسیا.

ناپلیۆن ئامادە بوو قوربانی بدات بە هاوسەری و هەرکەسێکی تر لە پێناو ئایندەی فەرەنسا، بە (جۆزیفی ) خیزانی گووت :شوێنێك لە دڵدا نیە بۆ سیاسەت، بەڵکو تەنها لە مێشکدایە، دواتر لە ڕۆژی (١٥ کانونی یەکەمی ساڵی ١٨٠٩)ز دوای چواردە ساڵ لە ژیانی هاوسەرگیری لێ جیابوویەوە.

بەڵام دایکی ئەسکەندەر گومانی لەوە هەبوو، ناپلیۆنی وەها دەبینی کە کەسێکی سەرکەش و لەخۆباییە، بۆیە ڕێگەی نەدا کچەکەی ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجامبدات، ئەمەش ناپلیۆنی توشی شۆك کرد.

دوای تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر ئەمەدا ناپلیۆن ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ (ماری لویسی )کچی ئیمپراتۆری نەمسا پێك هینا، بەری ئەم هاوسەرگیریەش کوڕێك بوو بەناوی (فرانسوا جۆزێف) کە دەیویست شوێنگرەوەی باوکی بێت.

هاوپەیمانی ڕووسی فەرەنسی سێ ساڵ درێژەی کێشا، تا رووسیا توشی مایە پوچ بوون هات، ئەمەش ئەسکەندەری ناچارکرد دەسبکاتەوە بە بازرگانی کردن لەگەڵ

دوژمنە کۆنەکەی ناپلیۆن (بەریتانیا)، بۆیە ناپلیۆن هەستی بە ناپاکی کرد، هاوڕێیەتی و ڕاستگۆیی لای ئەو بە واتای هەموو شتێك دەهات.

ناپلیۆن دوو دڵ بوو لە ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی ئەسکەندەر، پێشتر هەرکەس و لایەنێك شەری ڕووسیای کرد بوو سەرنەکەوت بوو، ئایا ئەم سەر ئەکەوێ لە کاتێکدا ئەوان هەموویان شکستیان هێنا بوو؟ ؟. لە هەمان کاتیشدا پێویستی بە هاوپەیمانەی ڕووسیا هەبوو، بۆیە پێویستی بە سەرکەتنێکی یەکلاکەرەوە هەبوو تا ئەسکەندەر ناچار بە دانوستانی ئاشتی بکات.

بەو گەرم وگوڕیەی کە ناپلیۆنی پێناسرابوو دەستیکرد بە دانانی پلانی هێرشەکەی، لە یەك کاتداو بێ وەستان فەرمانی بۆ سێ وەزارەتی جیا دەرکرد، لە مێشکی خۆیدا هەموو ئەو تێچونانەی لێکدابوویەوە کە پێویست بوون بۆ دەست بەسەردا گرتنی وڵاتێکی گەورەی وەك ڕووسیا.

ناپلیۆن بیری لە هەموو ئەو ئەگەرانە کردبۆوەوە کە جەنگێکی گرنگ و چارەنوس سازی وەك ئەو جەنگە کە پێویستیەتی، لە هەمانکاتدا دوو دڵ و بە گومانیش بوو لە کە بچێتە ژێرباری تێچوونی ئەو جەنگەوە.

لە مانگی (مایۆی ساڵی ١٨١٢) ز ناپلیۆن نیو ملیۆن سەربازی ئامادەکرد، تەنها نیوەی ئەم سەربازانە فەرەنسی بوون، ئەم سوپایە یەکێك بوو لەو سوپا زەبەلاحانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینی بووی.

ڕاوێژکارەکەی ناپلیۆنی لەوە ئاگادارکردبوەوە کە داگیرکردنی وڵاتی ڕووسیا سەرکەشیەکی مەترسیدارە، بەڵام پلانەکەی ناپلیۆن ئامادە بوو، دواجار خۆی لە هەموو ئەو گومان و دوو دڵیە ڕزگارکرد کە هەی بوو لەو بارەیەوە و بڕیاری یەکلاکەرەوەیدا.

...ئایا خۆی ترسناکترین ژەنەڕاڵی ئەوروپا نیە؟ ؟.

ناپلیۆن لەڕێگەیدا بۆ ڕووسیا ڕایگەیاند :دەبینن کاممان یەکەم جار ماندوو دەبین، ئایا سوپاکەم ماندوو دەبێت لەسەر حسابی ڕووسیا، یان قەیسەر لە خۆراك پێدانی سوپاکەم لە سەر حسابی دەوڵەتەکەی، ئەمە تەنها مەسەلەی کاتە.

ناپلیۆن كاتێ ڕوسیای داگیركرد وێنەیەك لە كتێبی ژیاننامەی پادشا(چارلی دەیەمی) فەیلەسوفی گەورەی فەرەنسی (ڤۆڵتێری )لەگەڵ خۆی هەڵگرت بوو. پێش سەدەیەك ولە ساڵی (١٧٠٩) ز (چارلز) پادشای سوید لە جەنگی (باكوری گەورە) دا هێرشی كردبووە سەر رووسیا. چارلز بە هەمان شێوە سەربازەكانی بەجێهێشت لە كاتێكدا لە ناو جەرگەی روسیادا پێشڕەویان دەكرد، بە هۆی دووری ڕێگەی پەیوەندی كردن و پاڵپشتی و هاوكاری، كار گەیشتە پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ سوپا، چارلزیش وەك ناپلیۆن گیری خوارد لە سەرماو سۆڵەی زستان و بووەهۆی لە دەستدانی ژمارەیەكی زۆر لە سەربازەكانی. لە دواییدا دوای جەنگێك كە سێ ڕۆژی خایاند لە مانگی (یۆلیۆی ساڵی ١٧٠٩)ز زۆرینەی سوپای سویدی ناچار بوون خۆیان بدەن بەدەستەوە، تەنها پادشا خۆیی و هەزارو پێنج سەد كەس لە سەربازەكانی ڕزگاریان بوو لە كۆی حەڤدە هەزار سەرباز.

ساڵی (١٨١٢)ز ناپلیۆن سوربوو لەسەر ئەوەو دڵنیا بوو لەوەی كە ئەو ئەو هەڵەیە دووبارەناكاتەوە كە چارلز ئەنجامی دا بوو، بەڵام ئەوە تەنها گریمانەیەك بوو، وتەیەكی بەناوبانگ هەیە كەلە سەرەتای كتێبەكەشدا ئاماژەمان پێدا دەڵێت (ئەوەی هەڵەكانی مێژوو نەزانێت دووبارەیان دەكاتەوە ) ناپلیۆن و هیتلەریش ڕاستیەتی ئەم وتەیەیان سەلماند.

لە (١٤یونیۆ ساڵی ١٨١٢) ز ناپلیۆن هێرشەكەی بۆسەر رووسیا دەست پێكرد، لەو باوەڕەدا بوو جەنگێكی خێرا دەبێت لەسەر سنورو ئەسكەندەر ناچاردەكات بە بۆ بەستنی ڕێكەتنامەی ئاشتی لەگەڵیدا، دواجاریش پێش كۆتای هاتنی وەرزی هاوین دەگەڕێتەوە وڵاتەكەی. بەڵام یەكەكانی سوپاكەی ئەسكەندەر لەسەر سنور نەبوون، دابەش بوو بوون بەسەر دوو كۆمەڵەداو كاریان لەسەر هاوكاری و قوربانیدان دەكرد بۆ یەكتری لە ڕووبەڕوبوونەوەی ناپلیۆن.

ژەنەراڵ (باركلی دیتولی ) سەركردەی سوپای یەكەمی ڕووسیا بەرەو ڕۆژهەلأت كشا تابگات بە ژەنەراڵ (بیلیشن) سەركردەی سوپای دووەمی ڕووسیا. ناپلیۆن بەخێرای

بەردەوام بوو لە ئاراستەی ڕۆشتنەکەی بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە، بەڵام (دیتولی) ئەوەی ڕەدکردەوە بەرەنگاری ببێتەوەو پلە بەپلە فەرەنسیەکانی ڕاکێشایە نێو قوڵای خاکی وڵاتەکەیەوە.

ناپلیۆن بە هیچ شێوەیەك پێشبینی ئەوەی نەکردبوو بەو شێوەیە بچێتە ناو قوڵای خاکی ڕووسیاوە، دوای چوار هەفتە لە ڕۆشتن سوپاکەی ناپلیۆن دوو سەد میل لە سنورەکانی ڕووسیا دورکەوت بوویەوە و وردە وردە پاڵپشتی و هاوکاری ناڕەحەت بوو بوو.

یەکێك لە سەربازەکان لەو کاتەدا دەنوسێت و دەڵێت :(ئێمە لە پاش خۆمانەوەماڵی چۆڵ بەجێدەهێڵین، باخ و بێستان گەلێك کە بەندی تاڵان و برۆن، دەرئەنجامەکانی جەنگ مەترسیدارن، بە تایبەتی کە بەو هەموو سەربازە زۆرە وە کە دەستی پێکردووە )

سوپای فەرەنسا لەگەڵ هەر هەنگاوێکی کە بەرەو مۆسکۆ پێشڕەوی دەکرد زیاتر لاواز دەبوو، ڕووسەکان ئەو گوندانەیان دەسوتاند کە بە جێیان دەهێشت تا فەرەنسیەکان نەیکەنە جێگەی پشودان و حەوانەوەی خۆیان.

دوای حەوت هەفتە لە ڕۆشتن، هیلاکی زیاتر لە (١٠٠) سەد هەزار سەربازی فەرەنسی لە ناوبرد، دواجار سوپای ڕووسیا لە (سمولینسکی) کۆببوویەوەو خۆی ئامادەکرد بۆ بەرەنگار بوونەوەی ناپلیۆن کە ماندوو بوونی ڕێگە دوورەکەیان شەکەتی کردبوون.

ئێستا ژمارەی سەربازەکانی ناپلیۆن بووبوویەوە بە (١٦٥) هەزار سەرباز دوای ئەوەی ئەوانی تری لە ڕیگەدا بەجێهێشت بوو بۆ پاراستنی ڕێگەی گەیشتنی هاوکاریەکان، لە بەرامبەردا سوپای ڕووسیا (١٠٠) سەد هەزار سەرباز دەبوو، سەرەڕای ئەوەش جەنگێکی سەخت و قورس لە نێوانیاندا ڕویدا کە ماوەی (سێ) ڕۆژی خایاند و بەبێ ئەوەی هیچ لایەکیان دەستی بەسەر ئەوی تردا زاڵ بێت، یان بانگەشەی سەرکەتن بکات بەسەر ئەوی تریاندا.

روسەکان تێکشکان و بەرەو ئاراستەی ڕۆژهەڵات هەڵهاتن، دواتر لەکاتی پاشەکشەیاندا پەیڕەویان لە سیاسەتی زەوی سوتماگ کرد، هەموو ئەو گوندو گەنجینەی خواردنانەی

دەکەوتنە سەر ڕێگەیان دەسوتاند، لە کاتی پاشەکشەیاندا پلانی برسیکردنی فەرەنسیەکانیان دانابوو لە دوای خۆیانەوە.

بەردەوام ناپلیۆن هەستکردنی بە تێکشکان زیاد دەکرد کاتێك رووسەکان زیاتر بەرەو ڕۆژهەلأت ڕاودەنا، زیاتر سوپاکەی دەکەوتە بە مەترسیەوە، بەلأم لەهەمان کاتدا گەڕانەوەش بۆ پاریس تووشی مەترسی زیاتری دەکرد.

دواجار مۆسکۆی تەنها دوو هەفتە دووری مابوو، ئەسکەندەر وای دەبینی بە دەست گرتن بەسەر مۆسکۆی پایتەختدا ئەسکەندەر ناچار دەکات ئاشتی قبولّ بکات.

خوگرتنی ناپلیۆن بەسەرکەشیەوە وای لێکرد لە ڕۆشتنەکەی بەردەوام بێت، ئەسکەندەر لە مۆسکۆ وە پاشەکشەی کرد بۆ (سان بترسبۆرگ) بەمەش ڕووبەڕووی کارەساتێك بوویەوە و ئەم پاشەکشێیە کاریگەری لەسەر دلّ و دەرونی سوپا ترسنۆکەکەی دروستکرد، لە کاتێکدا کە پێویست بوو بەرگری لە مۆسکۆی پایتەخت بکات بەلأم نەی کرد. بۆیە بریاریك لە دەرئەنجامی ئەمەوە دەرچوو بە لابردنی ژەنەڕالّ (دیتولی ) و شوێنگرتنەوەی لەلایەن ژەنەڕالّ (کوتوسوف) وە.

ژەنەڕالّ(کوتوسوف) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە نارەحەتیەکی زۆری چەشت بوو، لە جەنگاوەرە پێشینەکان بوو تەمەنی زیاتر لە (٦٧)سالّ دەبوو، ئەم بە خێرای بریاری وەستاندنی پاشەکشەیداو داوای لە سوپای رووسیکرد بە رەنگاری فەرەنسیەکان ببنەوە. گوندی(بردینۆ) ی هەلّبژارد بۆ شوێنی بەرگریکردن لە مۆسکۆی پایتەخت.

ئەوە ئەو هەلّەبوو کە چاوەڕێ ی ناپلیۆنی دەکرد و بە جەنگێکی سادەی دەزانی و وای بۆ دەچوو کە دەکرێت بە ئاسانی سەرکەوتن تیادا بەدەست بهێنرێت، بۆ بەرزکرنەوەی مەعنەویاتی خۆی وێنایەکی بە کوڕەکەی دروستکردو بە پاسەوانەکەی خۆی گووت:(ئەگەر ئێستا کوڕەکەم پێگەیشتوو بوایە، بێگومان ئەمڕۆ بۆ ئەو دەبوو ).

لە ڕۆژی (٧ دیسەمبەری سالّی ١٨١٢) ز لە بەرزاییەکانی(برودینەر) هەموو ئەو شتانەی بینی کە لە گۆڕەپانی جەنگەکاندا ڕوویان دەدا.

ژەنەراڵەکانی زیاتر لە (١٣٠) هەزار سەربازی باشیان لەلا بوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی (١٢٠) هەزار سەربازی رووسی، ئەوەی ئێستا پێویست بوو لەسەر هەمووان ئەوە بوو کە هەمووان کار بکەن بۆ سەرکەوتن.

کاتژمێر شەشی بەرەبەیان تۆپ هاوێژەکانی فەرەنسا بە (٥٠٠) تۆپ هاوێژ دەستیانکرد بە بۆردوومانکردنی هێزەکانی رووسیا، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانی ناپلیۆن بوو ئەوە بوو کە رووسەکان زۆر بە توندی بەرپەرچی سەرچاوەی بۆردوومانەکەی فەرەنسیەکانیان دایەوە، هەرکات فەرەنسیەکان دەیانویست رووسەکان ناچار بە پاشەکشێ بکەن ڕووبەڕووی بەرپەرچی توندە رووسەکان دەبوونەوە.

یەکێك لە سەربازەکان لەو بارەیەوەدەڵێت (گرمەی تۆپەکان و هاواری هاوەڵە برینداره‌کانم لە دەوروبەرم، ئەم دیمەنانە هەمووی کاریگەری زۆریان بە جێهیشت لەسەر دڵ و دەروونم ).

لەگەڵ نەمانی تاریکیەکانی شەو، دەنگەکانی بەرەکانی جەنگ دەستیان پێدەکردەوە، جاری واهەبوو هێوردەبوویەوەو، جاری واش هەبوو مردن باڵی بەسەردا دەکێشا. یەکێك لە ئەفسەرەکان لەو بارەیەوە دەڵێت:(تەقەکردن و کوشتار لە گۆڕەپانەکەدا ئاڵوگۆڕ دەکران بە شێوەیەك گۆڕەپانی (برودینۆ) ی کردبوویەنمونەیەك بۆ ئەوەی هیچ لایەکمان دەستەڵاتی بەسەردا نەشکێت ).

ناپلیۆنیش دەربارەی ئەوجەنگە دەڵێت:ئەم جەنگە تونترین جەنگێك بوو کە بەشداریم تێدا کردبێت، فەرەنسیەکان سەلماندیان کە شایستەی سەرکەوتنن،رووسەکانیش سەلماندیان کەتێك ناشکێن ).

فەرەنسیەکان توشی ترس و بیم بوون لە ڕێژەی ئەو زیانانەی کە توشیان بوو، ئەوان زیاتر لە (٣٠) هەزار سەربازیان لە دەستدا، ئەمە جگە لەو سی هەزار سەربازە خۆبەخشنانەی کە لە بەرەکانی جەنگ خۆیان ڕادەگرت.

لە درەنگ شەوێکی هەمان شەودا ناپلیۆن جارێکی تر گوێ بیستی کشانەوەی هێزەکانی رووسیا بوو،رووسەکان بەبێ هیچ جۆرە بەرگریەك مۆسکۆی پایتەختیان بەجێ

هێشت بوو، ئیتر لێرەوە تەنها هەلێك كە بۆ ناپلیۆن مابوویەوە داگیركردنی شارەكەو ناچاركردنی ئەسكەندەر بوو بە ڕێكەتنامەی ئاشتی لەگەڵیدا.

دوای سێ مانگ لە ڕێڕۆشتنی لەشكرەكەی ناپلیۆن نزیك بوویەوە لە عەرشی ئیمپراتۆریەتی روسەكان، ئەو تەنها (٧٥) میل لەو عەرشەوە دوور بوو، دانیشتوانی مۆسكۆ شاریان بەجێ هێشت بوو لە ترسو بیمێكی زۆردا.

لە ڕۆژی (١٤) سێبتەمبەری هەمان ساڵدا ناپلیۆن توانی كەنارەكانی مۆسكۆ ببینێت، لە بەردەمیدا گومەزە ئاڵتونیەكان و كۆشكە جوانەكان دەدرەوشانەوە. بەڵام پێشوازی كەران لە بەردەمیدا كۆنەبوونەوەو سڵاوی ئیمپراتۆریەتیان بۆ نەكرد، ئەو هەستی بە گۆشەگیری و تورەی دەكرد كەس نەهاتە دەروازەكانی شار و داواكاری ئاشتیشی لە ئەسكەندەرەوە پێنەگەیشت.

ناپلیۆن دەستی گرت بەسەر (كرملنی) كۆشكی ئیمپراتۆریەتیدا، بە نێردراوێكی تایبەتدا داواكاری ئاشتی ئاڕاستەی ئەسكەندەر كردوو، هەر لە كۆشكەكە مایەوەو چاوەڕێی وەڵامی ئەسكەندەری كرد.

لە شەوی یەكەمدا پاسەوانەكان ناپلیۆنیان لە خەو هەستاندو پێیان ڕاگەیاند كە ئاگر لە چەند شوێنێكی مۆسكۆ بەر بووە، دواتر بۆ فەرەنسیەكان ئاشكرا بوو كە هەڵهاتووە رووسیەكان دەرگاكانی بەندیخانەكانی مۆسكۆیان كردۆتەوەو هەموو ئەو كەسانەیان بەرداوە كە لەوێ زیندانی بوون و بەڵینی سوتاندنی شاری مۆسكۆیان لێ وەرگرتوون. یەكێك لە پیاوانی ئار كوژێنەرەوە لەو بارەیەوە دەڵێت:(ئێمە لەسەر زەویەكی سوتاو ژێر ئاسمانێكی گڕگرتووی نێوان دیوارە ئاگرینەكاندا دەڕۆشتین ).

ناپلیۆن سەرسام بوو لە كارە، چۆن دەكرێت رووسەكان بە دەستی خۆیان پایتەختەكەیان بسوتێنن، لەلایەكی تریشەوە هیچ وەڵامێكی لە قەیسەرەوە بەدەست نەگەیشت، ناپلیۆن تا ئەو كاتەش بڕوای وابوو هاوپەیمانی خۆی و قەیسەر هەر ماوە، بەڵام لێرە بەدواوە گومانی لە و بارەیەوە بۆ دروست بوو.

ویستی لەو بارەیەوە كارێك بكات، بۆ ئەو مەبەستەش جارێكی تر نامەیەكی نائومێدی نارد بۆ (بترس بۆرگ)، بەڵام لە ڕاستیدا ئەسكەندەر مەیلی لەگەڵ ئاشتیدا نەبوو و بڕوای وابوو سەرمای زستان زیاتر لەوەی سەربازە رووسەكان دەیكەن فەرەنسیەكان لە ناو دەبات، ئارامگرتن سەركەوتن بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

ناپلیۆن لەسەر لێواری دۆزەخێكدا بوو، و لە مۆسكۆ دانیشت بوو چاوەڕێ ی وەڵامی ئەسكەندەری دەكرد، و ڕۆژ بە ڕۆژیش هاوكاریەكانی بە ئەستەمتر دەگەیشتن و جەتەو چەكدارە رووسیەكان ڕۆژانە هێرشیان دەكردە هێڵەكانی گواستنەوەی فەرەنسیەكان.

وەرزی زستان بەسەر رووسیادا هات و لەگەڵ خۆشیدا بارودۆخێكی ترسناكیشی هەڵگرت بوو، ناپلیۆن دەیویست بەرەو بترس بۆرگ بەڕێ بكەوێ، بەڵام ژەنەراڵە هاوكارەكانی ئامۆژاریان كرد ئەو كارە ئەنجام نەدات، چونكە دووریەكی ئێجگار زۆری هەیە.

لە ڕۆژی (١٥) ئۆكتۆبەر بەفر شاری مۆسكۆی پایتەختی داگرت، ئیتر بۆ ناپلیۆن ڕوون بویەوە كە چیتر ناتوانێت چاوەڕێ ی ئاشتی لە ئەسكەندەر بكات و پێویستە بەخێرا مۆسكۆ بەجێبهێڵێت.

دوای پێنج هەفتە لە داگیركردنی رووسیا سوپای فەرەنسا ناچار بوو بەبێ بەستنی پەیمانی ئاشتی شاری مۆسكۆ بەجێ بهێڵێت، كەلوپەل و پێداویستیەكانیان باركردە نێو كالیسكەكانیان، یەكێك لە سەربازەكان لەو كاتەدا دەنوسێت :(كارەكە دەستی پێكرد وەك ئەوەی یەكێك بێت لە سوپا كۆنەكان و گالیسكەكانی پڕبێت لە دیل و دەسكەوتەكان).

سەرەتا ناپلیۆن خۆی و سوپاكەی بەرەو باشوری ڕۆژئاوا بەڕێكەوت كە زیاتر گەرمتر بوو، بەڵام رووسەكان بەرەو دواوە پاڵیان پێوەنان بۆ ناوچەی (برودینۆ)، دوای جەند ڕۆژێك سوپاكە بەسەر ئەو جەستانەدا دەڕۆشت كە پێشتر لە ناوچەكەدا كوژرابوون.

دوای ئەوە كە سوپاكە سەهۆڵ بەندان دەوریدا، ناچاربوو لە گۆڕەپانەكانی جەنگ پاشەكشێ بكات، سوپاكە هیچ شوێنێكی شك نەدەبرد لەتاو سەرمای زستانداكە پشوی

تێدا بدات، بەفر زۆر بەخێرای دەهاتە خوارەوە، سەربازە فەرەنسیەکانیش هەژاربوون لە جل وبەرگ و پێلاوی گەرم و ئامادەی وەرزی زستان نەبوون، پلەکانی گەرما گەیشتنە (٣٠) پلەی ژێر سفری سەدی و کار گیشتە رەق بوونەوەی سەربازەکان.

ئا لەو کاتەدا ئیتر کاتی ئەسکەندەر بوو. .. سوپای رووسیا دەستیکرد بە هێرشکردن بۆ سەر سوپاکەی ناپلیۆن و بە تەمای تۆڵە سەندنەوە بوو لە فەرەنسیەکان، شان بەشانی ئەمەش سەرمای زستان رێگەکانی گەڕانەوەی فەرەنسیەکانی داخست بوو.

سەرما گەیشتە ئێسکەکانی سەربازەکانی ناپلیۆن، بۆیە سوپاکەی ناپلیۆن بەرەو رۆژئاوا بەرێکەوت لە رێگەیەکەوە کە بەفری لێ نەبێت دووری ئەو رێکەیەش بە (١٥٠٠) میل دووری لە پاریسی پایتەختەوە مەزندە دەکرا. یەکێك لە سەربازەکان لەو رێگەیەدا دەنوسێت و دەڵێت :(سەربازەکان بە درێژای رێگەکە بەملاو بەولادا دەکەوتن و، دواتر بە یەکجاری دەکەوتن و جوڵەیان لێدەبڕا، هەندێکیان قاچیان لە پێڵاوەکانیان دەردەهێنا کە یەکەمجار سور هەڵگەڕابوون بەڵام دواجار بە شین و رەش بوونەوە کۆتای دەهات ).

فەرەنسیەکان وازیان لە چەکەکانیان دەهێناو فرێیان دەدایە کەناری رێگەکە تا رووسەکان هەڵینەگرنەوەو سودی لێ نەبینن، لەلایەکی تریشەوە دەسکەوتە گران بەهاکانی شاری مۆسکۆیان لە نێو خەندەقەکاندا دەشاردەوە، لەگەڵ زیاتر بەرەو پێش چوونی سەربازەکان بەرەو رۆژئاوا، سەربازە فەرەنسیەکان ناچار بوون لە برساندا گۆشتی ئەسپەکانیان بخۆن.

لێرەدا رووسەکان بڕیاریاندا رێگە بگرن لە پاشەکشەی هێزە فەرەنسیەکان لە رێگەی رووباری (بریزینا ) وە. رووسەکان بۆسەیەکیان دانا بۆ ناپلیۆن و لەو بڕوایەدا بوون دەتوانن دەستگیری بکەن، ئەو تاکە پردەیان ڕوخان کە لەسەر رووباری (بریزینا ) بوو، کاتێك ناپلیۆن گەیشتە سەر ڕووبارەکە ڕووبەڕووی تەوژمێکی ئاوی بەستوو بوویەوە، و کەوتە تەڵەیەکەوە کەبۆی دانرا بوو.

ناپلیۆن هەموو ئەو بەڵگەنامە تایبەتیانەی کە پێی بوون سوتاندنی، لە ترسی ئەوەی نەوەك بە دیلی بکەوێتە دەست رووسەکان، کت و پڕ ناپلیۆن پلانێکی ئازایانەی دارشت

بە دروستکردنی پردێك لەسەر ڕووبارەکەو پەڕاندنەوەی هەموو سەربازەکانی. پیاوە ئازاکانی نارد بۆ کارکردن لە پێناو لادانی ڕێڕەوی ئاوی ڕووبارەکە، چوارسەد لە سەربازە ئەندازیارەکانیشی نارد بۆ تێکدانی نزیکترین ئەو خانوانەی کە لە ڕووبارەکەوە نزیکن بە مەبەستی بەکار هێنانی دارو تەختەکانیان بۆ دروستکردنی پردێکی خێرا لەسەر ڕووبارەکە. ئەوان هەرچیەکیان لە تواناداهەبوو لەسەر ڕووبارە بەستووەکە کردیان بۆ بنیادنانی دوو پردی گەورە، توانیان بنیادیان بنێن و دوای (٢٤) کاتژمێر ژمارەیەك لە سەربازە ماندوو بووەکان توانیان لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە.

ڕووسەکان بە پلانەکەیان زانی و دەستیانکرد بە بۆردومانکردنی پردەکان، ئەمەش بووەهۆی شپرزە بوونی فەرەنسیەکان و سەربازەکان بەهۆی پەلەکردنیان بۆ پەڕینەوە دەکەوتن بەسەر یەکتریدا، ڕووسەکان توانیان دوو جار ئەم دوو پردی بڕوخێنن بەڵام هەر دوو جارەکە لەلایەن فەرەنیسەکانەوە دروست کرانەوە، هەزاران لە سەربازەکان دەکەتنە نێو ئاوەکەوەو دەخنکان، بۆ ماوەیەك ڕووباری (بریزینا) بەهۆی جەستەی بەستووی سەربازە فەرەنسیەکانەوە بەسترا، سەرەڕای ئەم هەموو ڕووداوانە دواجار (٢٥) هەزار سەرباز ڕزگاریان بوو.

ناپلیۆن لە ڕووباری بریزینا پەڕیەوەو ڕزگاری بوو لەو تەڵەیەی کە ڕووسەکان بۆیان دانا بوو. بەڵام کێشەکان بەوە دواییان نەهات، هەواڵ لە پاریسەوە گەیشت بە بوونی هەوڵی کودەتاو کۆتای هێنان بە ئیمپراتۆریەتەکەی. بۆیە ناپلیۆن فەرمانیدا بە ژەنەڕاڵەکانی سوپاکەی بەخێرای بەرەو پاریس بەڕێ بکەون، دەستیانکرد بەو گەشتەی کە دووریەکەی (٧٠٠) میل دەبوو. ناپلیۆن گرنگی ئەوەی دەزانی کەپێویستەچەند زووبگاتە پاریس پێش ئەوەی هەواڵی ئەو شکستە گەورەیەی کەتووشی هاتووە بە هەموو ئەوروپادا بلاوبیێتەوە.

ئەم کارە چوار مانگی تەواوی پێویست بوو بۆ ئەوەی ئەو (٢٥) هەزار سەربازە لە ڕووسیاوە بگەنەوە پاریس. فەرەنسا زەرەرو زیانێکی زۆری بەرکەوت لەسەر ئەو

بیروباوەڕانەی ناپلیۆن کە باوەڕی وابوو دەتوانێت رووسیا داگیر بکات. بۆخۆشی دواتر لە بارەیەوە دەڵێت (سەریان شۆڕکردم و، خۆشم سەری خۆم شۆڕکرد ).

هێرشە شکست خواردووەکەی سەر رووسیا سەرەتای کۆتای هاتنی ناپلیۆن بوو، ئەو خەونەی کە هەی بوو بۆ ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆری ئەورووپای یەکگرتوو لە ناوچوو. ئەسکەندەریش بە ڕاستگۆو هاوڕێ ی دەرنەچوو هێرشیکردە سەر فەرەنساو ئیمپراتۆریەتەکەی لە ناوبرد.

بەریتانیاو رووسیا جارێکی تر هێزەکانیان لەگەڵ پاشماوەی هێزەکانی تریان، کۆیانکردنەوەو لە ساڵی (١٨١٥)ز لە جەنگی (واترلۆ) دا هێزەکانی ناپلیۆنیان تێك شکاندو کۆتاییان بە دەستەڵاتەکەی هێنا و دوریان خستەوە بۆ دورگەی(سانتا هێلانا) لە باشوری زەریای ئەتڵەسی، تا کۆتای تەمەنی لەوێ مایەوە و لە ساڵی (١٨٢١) ز کۆچی دوای کرد.

**ئێستاش باس لە چیرۆکی هیتلەر دەکەین لەگەڵ رووسەکاندا کە چۆن هەمان هەڵەی ناپلیۆن دووبارە دەکاتەوە بەڕێگەی هاوشێوەی ئەو، کۆتایەکەشی هەمان کۆتای ئەو دەبێت!!!**

بەڵێ...لە سێبتەمبەری ساڵی (١٩٤١) ز هیتلەر هەمان هەڵەی دووبارە کردەوە، کاتێك لە رووسیا هەڵگەڕایەوەو بڕیاری جەنگ و داگیرکردنی بیرە نەوتەکانی رووسیایدا. تا ئەوکاتە ئەڵمانیا خاوەنی گەورەترین هێزی جیهانی بوو. سەرکەوتوو بوو لە چوونە نێو رووسیا بە هێزێکی (٣) ملیۆن سەربازی.

ستالین سەرکردەی رووسیا دەیزانی رووسیا توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ئەڵمانیای نیە، بۆیە بڕیاریدا فاکتەری ڕووبەری رووسیا بەکار بهێنێت و چاوەڕێ ی داهاتنی وەرزی زستان بکات، هەروەها پەیڕەوی سیاسەتی پاشەکشێ و زەوی سوتماگی کرد، هەرچەندە ئەڵمانەکان گەیشتنە دەروازەکانی مۆسکۆ و ستالین گرادیان بۆ ماوەی (دە) مانگ

گەمارۆدا، بەڵام سەرماو برسیەتی سنورێکی بۆ دانان لەبەرەو پێش چوونیان بەرەو ڕۆژهەڵات.

لەبەرامبەردا رووسەکان کە لەگەڵ سەرمادا ڕاهات بوون گواستیانەوە بۆ پشت چیاکانی (ئۆڕاڵ) لەوێ کارگەی مەزنی دروستکردنی کەل وپەلی سەربازیان دامەزراند کە لە توانایدا هەبوو مانگانە دوو هەزار دەبابەو (١٨٢٢) فرۆکەی جەنگی بەرهەم بهێنێت.

کاتێك وەرزی زستان داهات رووسەکان هێرشە پێچەوانەکانیان دەست پێکرد، ئەوان پشت ئەستور بوون بە چەکی نوێ و سەربازەکانیان لە سیبریا.

جار دوای جار رووسەکان بەرەو پێش دەچوون و زیانی زۆریان بە ئەڵمانیەکان دەگەیاند، بۆیە دواجار بڕیاریاندا تا بەرلینی پایتەخت راویان بنێن. ئەڵمانەکان لە رووسیا کرانە دەرەوە دواتر لە ئۆکرانیا و بەڵتیق و دوای ئەمانەش رووسەکان توانیان پۆڵۆنیاو ڕۆمانیاو هەنگاریا و نەمساو ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیاش داگیر بکەن.

پێشکەوتنی رووسەکان خێرا بوو، دەست گرتنیان بە سەر ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا هۆکارێك بوو هاوپەیمانەکان لە بەرەی ڕۆژئاوا هێرشەکانیان بۆ سەر ئەڵمانیا چڕبکەنەوە و پەلەشی تێدا بکەن (چرچل سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ترسی لەوە هەبوو کە تەواوی ئەوروپا بکەوێتە ژێردەستەڵاتی رووسیا ).

سەرەڕای ئەوەی هاوپەیمانەکان هەستیان بە بەشی خۆیانکردبوو لە سەرکەوتنەکاندا، بەڵام رووسەکان لە پێش هەموانەوە چوونە بەرلین لە ڕۆژهەڵاتەوەو بینای (رایخشتاخ )یان بەسەر هیتلەردا ڕوخاند.

لە سەدەی بیست گۆڕانکاری زۆر لەسەر ئاستی جیهان روویاندا، (پادشا چارلز و ناپلیۆن) بنەما گشتیەکانی کەش و هەوایان دەزانی، بەڵام شتەکەیان بە ژمارە نەدەزانی، لە بەرئەوەی لە سەردەمی ئەواندا ژمارەی پێوانەی لەو بارەیەوە بەکار نەدەهێنرا و ئەوەی لەو بارەیەوە هەبوو و دەیانزانی ئەوە بوو کە کەش وهەوا لە زستاندا زۆر ساردە لەو ناوچەیەدا.

له بەرامبەردا هیتلەر بەشێوەی زانستی بارودۆخی کەش وهەوای دەزانی، بۆ خۆی بەشێکی زۆر پێشکەوتووی هەبوو بۆ زانینی بارودۆخی کەش و هەوا، بۆیە دەیتوانی زۆر بەباشی زانیاریە کەش و هەواییەکان لە وانەی پێش خۆی بەکار بهێنێت، بەلآم ئەوەی نەکرد؟ ؟؟.

هیتلەر واگومانی دەبرد کە دەتوانێت لە ماوەی یەك ساڵدا رووسیا داگیر بکات، بۆیە بە هیچ شێوەیەك بیری لەوە نەکردبوویەوە کە سەربازەکانی بە جل وبەرگی زستانە تەیارو ئامادە بکات، سەربازەکان تەنها جل وبەرگی هاوینەیان پۆشی بوو، واتە ئەو جل و بەرگە تەنها بۆ ئەو ماوەیە لە ساڵ دەشیا کە ماوەیەکی گەرمە. دواتر خراپتر لەوەی کە ئەبوایە رویدا، چونکە لە زستانی سالآنی (١٩٤٣،١٩٤٢،١٩٤١) ز لە رووسیا پلەکانی گەرما دابەزین بۆ (٤٥) پلەی ژێر سفری سەدی، لە هاوینی هەمان ئەو سالآنەشدا بۆ (٤٠) پلەی سەدی بەرز بوونەوە، ئەڵمانەکانیش لەگەڵ ئەم جۆرە کەش و هەوایەدا ڕانەهات بوون. بۆیە ژمارەیەکی زۆر گەورە لە سەربازە ئەڵمانیەکان بە هۆی بەرکەوتنیان بە سەرمای زستان گیانیان لە دەستدا. بە ڕادەیەك ژمارەی ئەو سەربازە ئەڵمانیانەی کەبە هۆی سەرماوە گیانیان لە دەستدا زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی ئەوانەی کە بەهۆی گوللەی سەربازەکان گیانیان لە دەستدا.

لێرەدا دەوەستین لە سەر جەنگی (ستالین گراد ) و بینەری گەورەترین هەڵەی مێژووی هیتلەر دەبین، کە کەوتنی خێرا کردوو دواتریش بە خۆکوشتنیدا. دەبینین هیتلەر چۆن کەوتە هەڵەوە لە هەڵسەنگاندنی هەندیك شتدا، وەك چوارچێوەی رووسیاو بەهێزیان و توانی جەنگیان لە هاویندا.

ساڵی (١٩٤١) ستالین و سەربازەکانی توانیان سود لەو سامانە زۆرە، و کەرەستەخاوە وەربگرن و بەکاری بهێنن لە بەرژەوەندی وڵاتەکەیاندا، ئەوان کاریاندەکرد لەسەر دابینکردنی وزەی پێویست، ئەمە سەرەڕای بەردەوام بوون لەسەر سەرقاڵکردی ئەڵمانەکان بە جەنگێکی خوێناویەوە.

جەنگی ستالین گراد ئەو جەنگە بوو کەلەنێوان ئەڵمانیان و هاوپەیمانەکانی و یەکێتی سۆڤیەتدا ڕویدا لە شاری (ستالین گراد ) کە ئەمڕۆ بە (فولجو گراد ) ناسراوە، لە نێوان (یەکی مانگی ئوغستسی ساڵی ١٩٤٢ تا دووی فەبرایەری ساڵی ١٩٤٣) ز وەك بە شێك لە جەنکەکانی جەنگی جیهانی دووەم. ئەم جەنگە دادەنرێت بە خاڵی وەرچەرخان لە جەنگی جیهانی دووەم لەسەر ئاستی ئەورووپیدا. دەتوانین بڵێین ئەم جەنگە خوێناوی ترین جەنگە کە مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیویەتی، لە دەرئەنجامی ئەو ڕێژە زۆرەی کوژرانی سەرباز کە ژمارەیان دەگەیشتە یەك ملیۆن و نیو سەرباز.

شاری ستالین گراد بەلای ڕاستی کەناری رووباری (فولگان ) درێژدەبێتەوە کە زیاتر لە (٣٠) کم درێژیەکەیەتی و گرنگیەکی تایبەتی پیشەسازی هەیە. ئەم ناوچەیە دادەنرێت بە زەویەکی فراوان کە زۆریك لە زەوی شۆرەداری تێدایەوە بە درێژکراوەی دەشتی ئەورووپی هەژمار دەکرێت، کە بەدەوڵەمەندترین ناوچەی یەکێتی سۆڤیەت دادەنرێت.

دەگەڕێینەوە بۆ باسکردنی لە جەنگەکە، دوای ئەوەی ئەڵمانەکان توانیان ژمارەیەکی زۆر لەو هێزە رووسیانە پاڵ پێوە بنێن بۆ دواوە کە بەرگریان لە شاری (ستالین گراد ) دەکرد. ڕۆژی (١٢سیبتەمبەری ساڵی ١٩٤٢) چوونە نێو شارەکەوە، لەوێ خۆیان لە جەنگێکی قورسدا بینیەوە، کە جەنگی کۆلان بە کۆڵان و ماڵ بەماڵ بوو، ئەڵمانەکان بە سروشتی خۆیان بەرگەی ئەوەیانگرت و جەنگێکی سەخت ڕوویدا و زەرەرو زیانیکی زۆر لە هەردوولا کەوت.

لە ڕۆژی (١٣سیبتەمبەری ساڵی١٩٤٢) سوپای تانکی چواری ئەڵمانی و ژمارەیەك لە سەربازە رۆمانەکان گەیشتنە سەر کەنارەکانی رووباری(ڤۆڵگا ) لە باشوری شارەکە. بەڵام نەیانتوانی دەست بەسەر شارەکەدا بگرن، سەرەڕای هێرشە یەك لە دوای یەکەکانیان کە دەیانکرد بۆ گەیشتنیان بە ناوچەی پیشەسازی لە باشوری شارەکە، بە هۆی زۆری و توندی بەرگری سۆڤیەتیەکان لە ناوچەکە.

## بەرگری بەرامبەری رووسیا :

بەرگریکردن لە شارەکە یەکەمجار لەبەرەی باشوری ڕۆژئاوای شارەکەوە دەستی پێکرد، سەرکردایەتی بالآی سۆڤیەت بڕیاریدا بەلەناو بردنی باڵی باشوری هێزە ئەڵمانیەکان، بە لەناوبردنی (هەردوو سوپای شەش و هێزی مودەڕەعەی چوار) موشیر(جۆکۆف) هەردوو فەریق(فاسیلیفسی و خورونوف) ڕاسپارد بە هاماهەنگی کردن دەربارەی جووڵەی ئە سێ بەرەیە.

هەروەها زۆرترین هێزی چەکدار سۆڤیەتیان گواستەوە بۆ ناوچەی (ستالین گراد) لە پێناو دەستەبەرکردنی سەرکەوتنێکی مەزن، لەگەڵ دیاریکردنی کاتی هێرشەکە بە ووردی بەشێوەیەك هاوسەنگ بێت لەگەڵ دابەزینی هاوپەیمانە رۆژئاوەیەکان لە مەغریب و جەزائیر.

(کاتژمێر ٧:٣٠) خولەکی ڕۆژی (٣٠) ئۆکتۆبەر (٧٠٠٠) حەوت هەزار تۆپ هاوێژی رووسی دەستیانکرد بە بۆردوومانکردنی هێزە ئەڵمانیەکان لە ناوچەی ستالین گراد وەك دەسپێك بۆ دژە هێرشی رووسەکان.

چەند یەکەیەکی سوپای رووسیا لەسەرەتاوە هێرشیانکردە سەر کەرتی (٣) ی سوپای ڕۆمانی، بەرەو پێش چونێکی فراوان ڕویدا لە هەردوو بەرەی (دوو،سێ ) لەسەر هەردوو پردی (کلیتسیا و بولوشوی ) سەر ڕوباری (دون).

لەم کاتەدا هەردوو فرقەی (٥،٦) و بەشێك لە هەردوو فرقەی (١٣،١٤) سوپای ڕۆمانی بە فەرماندەی (لاسکار) کۆبوونەوەو بەرگریەکی باشیان لە دژە هێرشی رووسیەکان کرد لە هەموو بەرەکانەوە. لەم کاتەدا بەشێك لە سوپای ئەڵمانی لە فەیلەقی (مودەرەعەی ٤٨) بەسەرکردایەتی فەریق(هایم) بەڕێکەوتن بۆ ڕێگرتن لەو بەرەو پێش چوونەی سوپای روسی، بەلآم فەیلەقی ئامادەپێکراو نەیتوانی هێرشەکانی سوپای رووسەکان تێك

بشكێنێت، بەهۆی نەبوونی هێزی پێویست لە بەرامبەر ئەو هێرشە بەردەوام و یەك لە دوای یەكانەی هێزە رووسیەكان.

لە (٢٠ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩٤٢) ز رووسەكان دەستیانكرد بە شەپۆلی دووەمی هێرشە هەڵگەڕاوەكانیان. سوپای (٥١) رووسی هێرشی توندی كردە سەر سەنگەرەكانی فەیلەقی (٦) ڕۆمانی (كەلە چوارچێوەی كەرتی چواری سوپای مودەرەعەی ئەڵمانی) بوون توانیان تەنها لە ماوەی سێ كاتژمێردا بەرەكەیان تێك بشكێنن، شان بەشانی ئەمەش رووسەكان لەهەمان كاتدا هێرشیان بردە سەر فرقەی (٢٠) رۆمانی كە لە چوارچێوەی كەرتی فەیلەقی چواری ئەڵمانی بوو. بەمەش هێزی رۆمانی تێك شكاو بووە هۆی ئەوەی كەلێن بكەوێتە نێو سوپای مودەرەعەی چوار و ببێتە دوو بەشی لەیەك دابڕاو.

ئەم كەلێنەش بووە هۆی دارمانی بەرگریەكانی فەیلەقی شەشی رۆمانی، ئەم دارمانەش بواری لەبەردەم سوپای رووسیدا ئاوەڵا كرد بۆ ڕاوەدوونانی سوپای شەشی ئەڵمانی لەبەرەی باشور.

لە (٢٢ئۆكتۆبەری ساڵی١٩٤٢) هەردوو فەیلەقی مودەرەعی چوار و بیست و شەشی رووسی دەستیانكرد بەسەر بەرەی باشوری ڕۆژئاوا بە گەیشتنی خێرایان بە پردی (دون) نزیك (كالاتش).

لە عەسری ڕۆژی(٢٣ئۆكتۆبەری ساڵی١٩٤٢) ریزەكانی پێشەوەی سوپا لە باشوری ڕۆژئاوا گەیشتن بە فەیلەقی چواری رووسی لە رێكخستنەكانی بەرەی ستالین گراد و ئەوانەی لە باشوری رۆژهەلاتەوە هات بوون لەلای (سوفیتسكی) بەپەیوەندی ئەم سوپایانەش رووسەكان توانیان گەمارۆی سوپای شەشی ئەڵمانی بدەن.

فەرماندەی گروپی سوپای (ب) ئەڵمانیا هەستی بەوەكرد كە گەمارۆدانی سوپای شەش و كەلێن خستنەنێو هەردوو سوپای ڕۆمانی، پێویستی بەوە هەیە لە ڕۆژئاواوە بەرەیەكی نوێ بكاتەوە، ئەمە جگە لەوەی پێویستی بە گۆڕانی فەرماندەكانی سوپا هەیە، بۆیە عەقید روكنی ئەڵمانی (فینك) ی لە پۆستی سەرۆكی ئەركانی فەیلەقی مودەرەعەی (٥٧) گواستەوە بۆ پۆستی سەرۆكی فەیلەقی (سێ) ی ڕۆمانی، هەروەها

فەرمانی دەرکرد بۆ سوپای (سێ) ی رۆمانی کە بەهیچ شێوەیەك هیچ جۆرە جوڵەیەکی پاشەکشێی ئەنجام نەداد.

بارودۆخەکە تاڕادەیەك جێگیری بەخۆوە بینی لە کەرتی(ب) سوپای ئەڵمانی، دوای ئەوەی کە سوپای رووسی هەموو فشارەکانی لەسەر سوپای شەشی ئەڵمانی چڕکردەوە کە لە ستالینگراد گەمارۆیاندابوون.

سوپای شەشی ئەڵمانی توشی زیانێکە زۆر گەورە بوویەوە، لە دەرئەنجامی ئەو جەنگەی کە تووشی هات لە دەوروبەری باکوری شاری (ستالین گراد)، ئەمەش بووە هۆی دابەزینی ورەی سەربازەکان، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە زستانی ساڵی (١٩٤٢) زستانێکی ئێجگار ساردوباراناوی بوو.

لەم کاتەدا هیتلەر فەرمانی زۆر توندی دەرکرد بۆ سوپای شەشی ئەڵمانی و ڕایگەیاند پێویستە خۆڕاگربن تا کۆتا فیشەك و کۆتا سەرباز. هەروەها فەرمانیدا بە دامەزراندنی کۆمەڵەی سوپای(دون) لە(٢٧ئۆکتۆبەری ساڵی١٩٤٢) ز لە سوپای شەشی گەمارۆدراو سوپای مودەڕەعەی چوار و پاشماوەی هەردوو سوپای سێ و چواری رۆمانی لە ژێر فەرماندەی (ئەریش فۆن مانشتاین) لەگەڵ هێزەکانی سوپای یازدە کەلە بەرەی ستالین گراد پێشڕەویانکرد بوو. ناوی ئەو بارەگایە گۆڕا بە (بارەگای کۆمەڵەی سوپای دون) و ڕاسپێردرا بە تێك شکاندنی گەمارۆکە، بەڵام بەبێ ئەوەی ستالین گراد چۆڵ بکرێت.

(فونامانشتاین ) بەرەیەکی نوێی کردەوە، کە لە باشوری (ئیلیسا) وە درێژەبوویەوە تا باکوری (کوتلنیکوفو). سەرکردایەتی سۆڤیەت سوربوو لەسەر ئەوەی کەپێش هەموو شتێك نابێت کردە سەربازیەکانی هەوڵی تێك شکاندنی گەمارۆکە سەربکەون، بۆ ئەم مەبەستەش (سوپای پاسەوانی دوو) بە سەرکردایەتی (مالینوفسکی) و سوپای (٥١) بە سەرکردایەتی فەریقی یەکەم (تروڤانون) ڕاسپێردران.

(باولوس) بارودۆخی سوپا هیلاکەکەی دەخاتە ڕوو پاش ئەو زیانە گەورەیەی کە بەری کەوت، و هیوای وەهابوو کە هیتلەر ڕەزامەندی دەربڕێت لەسەر پاشەکشێ ی سوپای شەشی ئەڵمانی لە (ستالین گراد)، لە بروسکەیەکیدا کە لە شەوی (٢٤/٢٣ ئۆکتۆبەری

ساڵی ١٩٤٢) ناردی بۆ هیتلەر داوای لێکرد کە ڕێگەی بدات بە شکاندنی گەمارۆکە و دورچوون پێش ئەوەی کار لەکار بترازێت، بەتایبەتی گەمارۆکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ قورستر و نارەحەت تر دەبوو، بە سروستی خۆی بەرگریکردن لە هەموو ئەو بەرانە دەبێتە هۆی لاوازی بوونی بەرگری سوپاکە، ئەمە جگە لەوەی سوپاکە لەو ڕۆژانەی دوایدا زیانێکی زۆریان بەرکەوت بوو، بە شێوەیەك تەواو لاوازی کردبوون. لەم هەڵوێستەشدا سەرۆکی ئەرکانی هێزی وشکانی فەریق(کورت زایتسلر) پاڵپشتی دەکرد.

لەسەرەتادا هیتلەر لە هەڵوێستی سوپاکەی تێگەیشت، ڕەزامەندیەکی سەرەتای پیشاندا، بۆ ئەو مەبەستەش پرسیاری لە سەرۆکی ئەرکانی سوپای وشکانی کرد کە ئایا چەند دەکرێت سوپای شەشی گەمارۆدراو لە ڕێگەی ئاسمانیەوە یارمەتی بدرێت. لەگەڵ ئەمەشدا فەرماندەی سوپای هەوای موشیر(هەرمان گورنگ) ئامادەی خۆی نیشان دابوو بە یارمەتیدانی یەکەکانی سوپای شەشی گەمارۆدراو.

وەڵامەکە بۆ سوپای شەشی گەمارۆدراو باش نەبوو، لە بەرئەوەی پێداویستی ڕۆژانەی ئەو سوپایە زیاتر لە (٧٥٠) تۆن کەل وپەل دەبوو بە هەموو جۆرەکانیەوە، بەڵام هێزی ئاسمانی ئەڵمانی بەڵێنی بە گواستنەوی نیوەی ئەو پێداویستیانە دابوو، دواتر هێزی ئاسمانی زیاتری کرد بە (٥٠٠) تۆنی ڕۆژانە لە دەرئەنجامی گفتوگۆکانی (٢٤ئۆکتۆبەری‌ساڵی١٩٤٢) ز.

لەم کاتەدا هیتلەر فەرمانی دەرکرد بە پێویستی خۆڕاگری سوپای شەش لە ستالین گراد، سەرەڕای پەیامە وریا کەرەوەکەی فەریق(زایتسلر) کە بە هیتلەری ڕاگەیاندبوو:(سەرۆك تۆ دەتەوێت پارێزگاری لە ستالین گراد بکەیت، بەڵام بەم زوانە ستالین گراد و سوپای شەشیش لە دەست دەدەیت. )

فەریقی یەکەم (باولوس) هەوڵیدا جارێکی تر لە چوارچێوەی ناوچە گەمارۆدراوەکەدا هێزەکانی ڕێکبخاتەوە،ئەو ناوچەیەیی کە درێژیەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا زیاتر لە (٤٠) کم دەبوو لە باشوریشەوە تا باکور (٢٠) کم درێژی دەبوو، ئەم ناوچەیە بەس بوو بۆ

بەڕێوەبردنی جەنگە بەرگریە سەرپێیەکان، فرۆکەخانەی (بیتومنك) ی هەڵکەوتوو لە ناوەڕاستی ناوچەکەش پارێزراو بوو لە بۆردوومانی هێزەکانی رووسیا.

ئەو هێزەی کەلەو کاتەدا لە ناوچەکەدا هەبوو هێزێکە تێکەڵ بوو، لە (٤) هەزار ئەڵمانی و (١٢) هەزار ئیتالی. ئەم هێزە گەمارۆدرابوون لە باکوری (میلیرۆفو)، ئەمانە توانیان لە یەکێك لە شەوەکاندا بە هاوکاری تۆپ هاوێژە بە تواناکانیان گەمارۆکە تێك بشکێنن و دەربازیان بێت، دواتر بە ڕێگەیەکی سەهۆڵ بەنداندا ڕۆشتن بە درێژای (٢٠) کم تا گەیشتنە هێڵەکانی تری سوپای ئەڵمانی، لە دەرئەنجامی بڕینی ئەو ڕێگە سەهۆڵ بەندانەش لە سەدا (دە) ی سەربازەکانیان تیاچوون.

رووسەکان بە هێزەکانی بەرەی باشوری ڕۆژئاواو بەرەی (فورنیش) شەپۆلی دووەمی هێرشەکانیان دەست پێکرد، لە بەرەی سوپای هەشتی ئیتالی کە پێکدەهاتن لە حەوت فرقەی ئیتالی و فرقەیەکی ئەڵمانی لە کەرتی (دونی ناوەڕاست)، دوای دوو ڕۆژیش لە شەرو کوشتار رووسەکان سەرکەوتنی مەزنیان بەدەست هێنا.

رووسەکان ئەو کەلێنەیان فراوانتر کرد کە لە بەرەی سوپای هەشتی ئیتالی ڕویدا بوو، تا بووەیە کەلێنێکی فراوان بە ڕادەیەك فراوانیەکەی گەیشتە زیاتر لە (١٠٠) کم. ئەم کارەساتەش بووەهۆی بێزاری و رق وقینی ژمارەیەك لە سوپای (دون ) ی ئەڵمانی کەلەو هێرشە توندانەدا بەرکەوت بوون کە رووسەکان لە ناوچەکەدا ئەنجامیاندا بوو بۆ دورخستنەوەی یەکەکەکانی بەرەی (محوەر) لە ستالین گراد، وەك پێشەکیەك بۆ لەناو بردنی سوپای شەشی ئەڵمانی. .هەر ئەم هێرشە ئامانجێکی تریشی بەدەست هێنا کە بریتی بوو لە لەناوبردنی باڵی باشوری یەکە ئەڵمانیەکان، بە گەیشتن بە (رۆستۆف) و گۆشەگیرکردنی پاشماوەی تری هێزە ئەڵمانیەکان لە (قەفقان).

لە شەوی چەژنی لەدایك بوون واتە(٢٤/٢٥ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٤٢) ز و ئەو دوو رۆژەی کە بەدوای ئەو دوو ڕۆژەدا هاتن، یەکەکانی بەرەی ستالین گرادی سۆڤیەتی هێرشەکانیان توندتر کردەوە لەسەر سوپای مودەرەعەی چواری ئەڵمان و سوپای

چواری رۆمانی. لە (٢٩ دیسەمبەری ساڵی١٩٤٢) ز فەیلەقی مودەرەعەی حەوتی رووسی شاری (کوتلنیکوفو) ی داگیرکرد.

لەو کاتەدا موشیر(ڤۆن مانشتاین) ناچار بوو هێرشی سوپای مودەرەعەی چوار رابگرێت، کەنیازی وەها بوو بگاتە شاری ستالین گراد و پەیوەندی بکات بە سوپای شەشەوە. تا ئەو شکانەی پێچاك بکات کە بەسەر بەرەی کۆمەڵەی سوپاکاندا هات بوو.

سوپای چواری مودەرەعە مایەوە و جەنگی سێ فەیلەقی رووسی دەکرد لە کەرتی باشوردا، لە کاتێکدا سوپای (هولیدت) لە کۆمەڵەی سپای(ب) جەنگی سێ سوپای تری دەکرد لە (تسیمیلیا).

بەم شێوەیە هەڵوێستی سوپای شەش چووە بواری بێ ئومێدیەوە لە ستالین گراد، دوای ئەو سەرکەوتنەی کە سوپای رووسی بەدەستی هێنا لە دوورخستنەوەی بەرە نوێیەکە لێیەوە بەو ئەندازە دووریە و تەیارکردنی خۆی بە چڕی بۆ توندکردنەوەی فشارەکان لەسەری بە شێوەیەکی رێکخراو

فەرماندەی باڵای هێزە ئەڵمانیەکان گەیشتە ئەو باوەڕەیی کە سوپای شەشی ئەڵمانی خۆی ناتوانێت بگەڕێتەوە ئەو ئاستەی کە بتوانێت بە کردەیەکی سەربازی خۆی رزگار بکات. بۆیە وای بەباش زانی کە ئەو سوپا گەمارۆدراوە لە کردەیەکی سەربازی نوێدا لە بەهاری ساڵی (١٩٤٣) رزگار بکرێت. بەڵام نەدەکرا لەو بارودۆخ و کەش و هەوا ساردەو کەمی چەك و تەقەمەنی و کەل وپەلە سەربازیەدا ئەو گەمارۆیە درێژە پێبدرێت، بەڵام دەکرا فرۆکەکان رۆژانە سێ گەشتی رۆژانە ئەنجامبدەن بۆ ناوچە گەمارۆدراوەکە، بەڵام ئەم کارەش لەهەمان کاتدا بەهۆی دورکەوتنەوەی بەرەی ئەڵمانی لە ستالین گراد ئەمەی سنوردارکرد بوو، ئەمە دوای ئەوەی روسەکان بەهۆی بەرگریە هەواییەکانیانەوە کە دژی فرۆکە ئەڵمانیەکان ئەنجامیان دەدا بووە هۆی ئەوەی ئەلمانەکان لە مانگی (دیسەمبەری ساڵی ١٩٤٢) ز یەکەی (٢٤٦) فرۆکەوانی لەدەست بدەن، لە کاتی گواستنەوەی پێداویستیەکان بۆ ستالین گراد لەلایەن یەکە فرۆکەوانیەوە.

له (٨ینایری ساڵی١٩٤٣) موشیر(روکوسوفسکی)ی ڕووسی داوای له فەریقی یەکەم(باولوس) ی ئەڵمانی کرد خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵام سەرکردە ئەڵمانیەکە ئەوەی ڕەد کردەوەو بەردەوامیدا بە جەنگ. لە سەر ئەمەشی له (٩) ینایەری هەمان ساڵدا هەواڵێکی له بەرلینەوە بە دەست گەیشت بە بەرزکردنەوەی پلە سەربازیەکەی بۆ(موشیر).

ڕووسەکان دەستیانکرد بە هێرشە کۆتاییەکانیان بۆ له ناوبردنی سوپای شەشی ئەلمانی له ستالین گراد له ڕۆژی (٢٠ ینایری ساڵی ١٩٤٣) ز دوای ئەوەی حەوت سوپای ڕووسی گەمارۆیی شارەکەیاندا له سێ بەرەوە (بەرەی ستالین گراد،بەرەی دون،بەرەی باشوری ڕۆژئاوا ).

پێشتر له (١٤ ینایری ساڵی ١٩٤٣) ز سوپای بیست و یەکی ڕووسی دەستی گرت بوو بەسەر فرۆکەخانەی (بیتۆ منکوهو) کە گرنگترین بنکەی ئاسمانی بوو کە هێزەکانی سوپای شەشی ئەڵمانی بەکاری دەهێنا، له ڕۆژی (٢٢) مانگی ینایری هەمان ساڵدایشدا ئەڵمانەکان فرۆکەخانەی(گومر) یان له دەستدا، بەم شێوەیەش بەتەواوی پەیوەندی هەوای ئەڵمانەکان بە وڵاتەکەیانەوە پچڕێنرا.

له ڕۆژی (٢٥ینایەری ساڵی ١٩٤٣) ز ڕووسەکان توانیان کەلێن بخەنە نێو یەکەکانی بەرگری سوپای شەشی ئەڵمانی له ستالین گراد فەیلەقی یازدەی هەمان سوپا. له (٣١) هەمان ڕۆژو ساڵدا بەشی زۆری سوپای شەشی ئەڵمانی خۆیان دابەست هێزەکانی ڕووسیاوە، و موشیر (باولوس) بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدانی سوپاکەی واژۆکرد بۆ موشیری سۆڤیەتی(دوکوسوفسکی).

بەڵام فەیلەقی یازدە مایەوەو جەنگا بەسەرکردایەتی فەریق(شتریکر)له کەلاوەکانی باکوری شاری(لتوفر)، بەڵام پێداویستیەکانی بەرگریکردن و درێژەپێدانی جەنگەکەیان زۆر لاواز بوون و دواجار له (٢ فەبرایەری ساڵی ١٩٤٣) ز ئەوانیش خۆیاندا بەدەستەوە.

لەژێر تاریکیەکانی جەنگی ستالین گراد، دیاردەکانی هێزی هیتلەر شاردرانەوەو دیار نەمان و زیرەکە شەیتانیەکانی شکستیان هێناو کەوت، وەك چۆن رودریك بریسویب

دەڵێت :(دەتوانین بڵێین جەنگی ستالین گراد گەورەترین جەنگە لە مێژوودا لە ڕووی ژمارەی بەشداریکەران لە جەنگەکەدا، کە زیاتر لە (٧) ملیۆن مرۆڤ بەشداریان تێدا کرد و لە ڕووبەرێك ئەنجامدا کە زیاتر بوو لە ڕووبەری زەوی وڵاتی فەرەنسا ).

بریسوب دانەری کتێبی (مۆسکۆی١٩٤١) ە باڵوێزی بەریتانیاش بووە لە مۆسکۆ، لە کاتی قۆناغی دەرکەوتنی شوعیەت لە شەستەکاندا، ماوەی مانەوەی لە رووسیا ماوەیەکی درێژ بوو، ئەو ژیانەی لەوێ بەسەری بردبوو،ئەوەش ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر چۆنیەتی نوسینی کتێبەکەی، کە وێنەیەکی زیندوی شاری مۆسکۆ دەکێشێت لە بەردەم دوژمنێکی درندەدا.

کتێبەکەی بریسویب بە پێدا هەڵدانێکی جوانی شاری مۆسکۆ دەست پێدەکات، ئاماژە بە مێژووەکەی دەکات، گوندەکانی دەوروبەری و وەرزەکانی ساڵی بەشێکی گرنگی لاپەرەکانی کتێبەکەی داگیرکردووە. لەو لێکۆلینەوەیەدا نوسەر ئاماژە بەوە دەکات کە جەنگی مۆسکۆ ماوەی شەش مانگی خایاندوە (لە سێبتەمبەری ١٩٤١ تا ئۆکتۆبەری ١٩٤٢) رووسیا زیاتر لە ژمارەی ئەو سەربازە ئەمریکی و بەریتانیانەی کە لە تەواوی جەنگەکەدا کوژران هاوڵاتی و سەربازی لەدەستداوە.

نوسەر  بە پێچەوانەی زۆرینەی خەڵکەوە کەلەو بڕوایەدان جەنگی ستالین گراد کە لەساڵی (١٩٤٢) ز ڕویدا لە بەرەکانی رۆژهەڵات جەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو بێت، ئەم پێی وایە جەنگی مۆسکۆ یەکلاکەرەوە بووە. جەنگی مۆسکۆ لە دەرەوەی شاری مۆسکۆ ڕویداوە، هێزە ئەڵمانیەکان لە ماوەیەکی کەمدا توانیان بەشیکی زۆری زەویە رووسیەکان داگیربکەن، بەڵام دواتر لە رووبەروبونەوەیەکی سەربازی توندا تێك شکان.

کاتێك هێرشی ئەڵمانەکان دەستی پێکرد، ستالین بڕیارگەلێکی ستراتیژی خۆکوژی دەرکرد لەو هەفتانەی کە هێرشەکەی تێدا ئەنجامدرا، کاتێك دەستەدەستە لە شەرکەرەکان خۆیان فڕێدەدایە بەردەم ڕێگەی هێزە ئەڵمانیەکان، کە یەك لە دوای یەك تێکیان دەشکاندن.

سەرکەوتنی سوپای سور یەکێك بوو لە دەرئەنجامی ئەو جەنگە چاوەڕوان نەکراوانەی کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا ڕوویاندا. رووسیا لە زۆر رووەوە ئامادەی ئەوە نەبوو و هێزەکانی لە کەناری هەڵوەشاندنەوەو تێك شکاندا بوون.

لە هاوینی ساڵی(١٩٤١) سوپای ئەڵمانیا (٢٠٠) میل بە ئاڕاستەی مۆسکۆ پێش کەوت بوو، دواتر تەنها لە سێ هەفتەو لە کۆتای هەمان ساڵدا تەنها (١٥) میل لە کۆشکی(کرملن) وە دووربوون، بەڵام دواتر لەماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا پاشەکشەیانکردو توشی تێك شکانێکی قورس بوون لە بەردەم هێرشە خۆکوژیەکانی روسیەکاندا.

دواجار زیانەکانی ئەڵمانەکان لە رووسیا بە لەدەستدانی (٥) ملیۆن مرۆڤ دەخەملێنرێت. نوسەر لەو باوەڕەدایە مۆسکۆ بەو شێوەیە نەدەکەوتە بە مەترسیەوە ئەگەر ستالین بە گرنگیەوە ئەو ئاگادارکردنەوانەی وەربگرتایە، کە باسیان لە هێرشی بەرفراوانی ئەڵمانەکان دەکرد لە سەرەتاکانی هاوینی ساڵی (١٩٤١) ز.

ستالین لەو باوەڕەدا بوو کە بەهیچ جۆرێك ئەڵمانەکان هێرش ئەنجام نادەن، چونکە بەریتانیەکان نەشکاون و سەریان بۆ هیتلەر شۆڕنەکردووە.

پێش چەند کاتژمێرێك لە دەست پێکردنی هێرشی ئەڵمانیەکان، ستالین لەو باوەڕەدا بوو کە هیچ جۆرە بەڵگەونیشانەیەك نیە بۆ بوونی ئەگەری هێرشی ئەڵمانیەکان، زیاتر لەوەش هەڕەشەشی لە هەر ژەنەڕاڵێك کردبوو کە واخۆی دەربخات ئامادەکاری بۆ جەنگ دەکات.

جەنگی مۆسکۆ مێژوویەکی سەربازی بەرجەستە دەکات کە بریسویت بە مێژووی کۆمەلأیەتی دیکیۆمێنتاری ناوی دەبات. نووسەر لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ دروستکردنی وێنەیەکی سایکۆلۆژی وشك، لەمیانەی دەیان لەگەڵ رووسەکان و ئەو یاداوەری و نامەو ڕۆژنامانەی کەلەو کاتەدا نوسراون.

وا دەردەکەوێت کە ئەم کتێبە کەمتر باس لە مەسەلە ستراتیژیەکان بکات، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە وێنەیەکی زیندوی ئەو کەسایەتیانە بکێشێت کەلەو ماوەیەدا

ژیاون. هەروەها ئەوشتانەی کەبەسەر مرۆڤە ئاساییەکاندا هاتوون و ئەو ڕۆڵەیان کەبینیویانە لە بەرگریکردن لە پایتەختەکەیان. ،ئەمە سەرەڕای ئەو نوسین و بەڵگەنامەو چاوپێکەوتنانەی کە ئەنجامی داون لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بەشداری جەنگەکەیان کردووەو لەوێ ژیاون.

لە ڕاستیدا هۆکارەکانی پشت هێرشی نازیەکان بۆ سەر رووسیاو کردەی پلان دانانەکەی ڕەگ و ڕیشەی تایبەتی خۆی هەیە، کە هیتلەر بۆ خۆی هەندێك لەو نهێنیانە لە کتێبی (خەباتی من) تۆماردەکات، کە دادەنرێت بە بەرنامەی بزوتنەوەی فاشتی ئەڵمانی. بۆ نموونە دەڵێت:(ئەگەر مەسەلەکە زەوی و خاکی کشتوکاڵی بێت، ئەوە بەشێوەیەکی بەرفراوان بەرجەستەنابێت، ئەگەر لەسەر حسابی رووسیا نەبێت، بۆیە لەسەر رایخی سێهەم پێویستە سەرلەنوێ لەسەر هەمان ئەو ڕێگەیە بڕوات کە ئەسپ سوارە (تیوتون ) نەکان لەسەری ڕۆشتوون ).

نازیەکان پلانە دوژمنکاریەکانیان بەرامبەر رووسەکان بەکار دەهێنا، بۆ دەست خستنی متمانەی قۆرخکارە ئەمریکی و بەریتانیەکان و دەستخستنی زیاتری هاوکاری ئەوان. هیتلەر لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆیدا دەڵێت :(پێویستە لەسەرمان ئێمە یاری بە تۆپەکە بکەین لەگەڵ سەرمایەدارەکانداو، دەوڵەتانی پەیمانی ڤێرسای لە ڕیزی خۆمان بهێڵینەوە بە بەرزکردنەوەی دروشمی دژە بەلشەفی،تاوایان لێبکەین بڕوا بەوەبکەن کە ئەڵمانیای نازی کۆتا قەڵای بەرگریکردنە لە بەردەم لافاوی سوردا، ئەمەش تاکە ڕێگەی دەرچوونە لە ماوەی مەترسی و دەرچوون لە مەرجەکانی ڕێکەوتنامەی ڤێرسا و دووبارە خۆ پڕچەك کردنەوە. )

هیتلەر ئەو مەبەستەی کە هەی بوو کاری لەسەردەکرد هاتەدی،حکومەتەکانی هەریەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەرتانیا و فەرەنسا زۆر بە خێرای دەستیانکرد بە گەمەی سیاسی هەڵخەلەتێنەر، ئەو دەوڵەتانە بڕوایان وەها بوو دەتوانن ئەڵمانیا هەڵ بخەڵێتێنن و بەکاری بهێنن بۆ بەرجەستەکردنی ئامانجە تایبەتیەکانی

خۆیان، بڕوایان وابوو زۆر بە ئاسانی دەتوانن دیکتاتۆریەتی فاشستی هەڵبخەڵەتێنن و لە خشتەی بەرن.

دیبلۆماسە ئەڵمانیەکان لە ڕۆژئاوا هەواڵی ئەوەیاندا بە حکومەتەکەیان لە بەرلین، کە گوایا حکومەتە ڕۆژئاواییەکان بڕوایەکی تەواویان بۆ دروست بووە که ئەڵمانیا دوژمنەکەیانی لە ڕۆژهەڵات گۆشەگیر کردووە و گەمارۆیداوە.

سەرکردە سەربازە ئەمریکی و بەریتانیەکان دەستیانکرد بە پێشکەشکردنی ئامۆژگاریە دۆستانەکانیان بۆ ئەدۆلف هیتلەر و ئاماژەیان بەو هەڵسوکەوتەدەکرد کە پەیڕەوی دەکرد لە کردەوە دەستدرێژی کارەکانیدا، بۆ نمونە گەورە بەرپرسانی بەریتانیا هانیاندا دەست پێشخەری بکات لە داگیرکردنی (چیك و سلۆڤاکیا) دواتر نەمساو پۆڵندا و دواتریش یەکێتی سۆڤیەت.

بەرنامەکەی هیتلەر بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا لەسەر بنەمای تیۆری ڕەگەز پەرستی دارێژرا بوو کە ڕقی لە مرۆڤ دەبوویەوە، هەروەها وێنای لەناوبردنی گەلەکانی تری کردبوویەوە لەلایەن گەلی ئەڵمانیەوە(گەلی هەڵبژیردراو) و مل پێکەچ کردن و بە بەندەکردنیان. ئەڵمانیەکان پلانێکی تەواویان دانا بوو بۆ مل پێکەچ کردنی گەلانی سۆڤیەت و سڕینەوەیان لە مێژوودا، ئەمە جگە لەوەی ڕقیشیان لە فەرەنسیەکاتن و ئەمریکیەکان و سەرجەم گەلانی ڕۆژئاوا دەبوویەوە.

کاتێك نازیەکان دڵنیا بوون لە توانای سەربازی خۆیان، ئەوە گرنتیەکی دانیٚ بۆ بەخێرای دەست پێکردنی جەنگ و داگیرکاریەکانیان، هیتلەر لەو بارەیەوە بۆ سەرکردەسەربازیەکانی دەڵێت : (ئەگەر توانیتان هێرش ئەنجام بدەن بیکەن، چۆن موسولینی کردی،ئەو گفتوگۆ دانوسانی ئەنجام نەدا کە چەند مانگیك بخایەنێت و بە هیواشی و پلە بەندی خۆی ئامادە بکات، بەڵکو ئەو هەمیشە وەك چەخماخەی غافڵگیر لە شەوی تاردا هەڵسوکەوتی دەکرد).

ئەمریکیەکان و خزمەتکارە دڵسۆزەکانیان لە نازیەکان، کاریان لەسەر بەکارهێنانی ناپاکەکان دەکرد، کە دەزگای هەواڵگری ئەڵمانی لە وڵاتەکاندا بڵاوی دەکردنەوە ،

هیتلەر هیوایەکی زۆری لەسەر ئەمانەهەڵچنی بوو، زۆر دڵی پێخۆش بوون، لەو بارەیەوە دەیگووت: (ئەوانە دەبنە دۆستمان و لەسەجەم وڵاتانی دوژمنانەوە دەستی هاوکاریمان بۆ درێژدەکەن، ئێمە ڕێگەی دەست خستنی ئە جۆرە دۆستانە دەزانین.بەڵام چەکمان بریتی دەبێت لە بڵاوکردنەوەی تێکدانی فکری و ناهاوسەنگی دەرونی و هەستی، بڵاوکردنەوەی هەستی بەزین و دڵەڕاوکێ. )

لە بیرکردنەوەکانیدا هەمیشە پلانی بۆ جەنگی بروسکە ئاساو سەختدەدا،لەو بارەیەوە دەیگوت: (فەرەنسیەکان و پۆڵندیەکان و نەمساییەکان و چیگ وسلۆڤاکیەکان لە ماوەی چەند خولەکێکی کەما سەرکردەکانیان لە دەست دەدەن، وەك سوپایەك وان کە دەستەی ئەرکانی جەنگی نەبێت،بە م شێوەیەك سەرجەم سەرکردە سیاسیەکان لەناو دەبەم لەو ڕێگەیەداو تێك چوونێکی گشتی دروست دەکەم کە لە سنورەکانی باوەڕدا بێت، بەڵام لەماوەیەکی درێژتردا پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەدا دروستدەکەم کە حکومەتی نوێ بنیاد دەنێنن، ئەو حکومەتانەی کە لەگەڵ ڕێبازی مندا گونجاو بن. ) .

نازیەکان دروشمێکیان بەرزکردەوەو جێ بەجێشیان کردناوی (جەنگی سەراپای) یان (جەنگی گشتگیر) بوو، ئەو جەنگەی کە پلانیان بۆدانابوو، تەنها جەنگیك نەبوو بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا، بەڵکو خەریك بوو جیاوازی نەدەکرد لە نێوان پێشەکی و پاشەکی و سوپاو خەڵکی سڤیلدا.

لە کاتێکدا ئەڵمانەکان بەخێراترین شێوە پەرەیان بە ئامێرو کەل وپەلە سەربازیەکان دەدات، کەچی دەوڵەتەئەورووپیەکان تا ئەو کاتەش لە خەونی ئەوەدا دەژیان کە ئەو وڵاتە بەکاربهێنن بۆ جێ بەجێکردنی مەرام و ئامانجەکانیان. ناکۆکیە ئیمپریالیەکان زوو یان درەنگ دەتەقینەوە، بۆ نموونە ڕۆژنامەی پارێزگاری بەریتانی (زەی فورتنایتلی ریڤیو) لە ساڵی (١٩٣٣) دەنوسێت (ئەڵمانیا لەم ڕۆژانەدا بووەتە بەهێزترین دەوڵەت لە ئەورووپا لەڕووی ئابوریەوە، ئەو خاوەنی باشترین پیشەسازی کەل وپەلەکانە، لەسەر ڕێگەی ئەوەشە کە هەموو جیهان بە کەل وپەلە پیشەسازیە هرزانەکانی داگیر بکات. ئەو کێ بڕکێ کەرێکی سەرسەخت و مەترسیداری ئابووریە نەك لەسەر ئاستی ئەورووپای

ناوەڕاست بە تەنها، بەڵكو لەسەر ئاستی هەموو دەوڵەتانی ئەوروپا بەگشتی بەبێ جیاوازی، بەتای بەتیلەسەر كێبڕكێ كەرە سەرەكیەكەی بەریتانیای مەزن. )

دەنگی خاوەن عەقڵ و بیروبۆچوونە پەسەندەكان لە سەر ئاستی ئەمریكاو ولآتانی ئەوروپی نەیان توانی ئەو دەنگە ڕێكخراوانە لەت بكەن یان كپیان بكەنەوە كە لە دەستەلآتدارانی بەرتانی ئەمریكیەوە دەردەچوون بۆ بنیادنانی پەیوەندیەكی باش لەگەڵ ئەڵمانیایی هیتلەریدا.

گومانی تێدا نیە كە بەهیچ شێوەیەك حەقی ئیمپریالە ئەڵمانیەكان نیە كە گومان بكەن لەوەی كە قۆرخكارە ئەمریكی و ئەورویەكان هەستی سۆزو مرۆڤانەیان تێدا بێت.

دوای كودەتای فاشستی لە ئەڵمانیا پەیوەندیە ئابوریەكانی قۆرخكارە ئەمریكی و ئەوروپیەكان لەگەڵ ئەڵمانەكاندا لە فراوان بوون و بەرەو پێش چووندا بوو.

ئیمپریالە ئەڵمانەكان ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان خست گەڕ بۆ پەرەپێدانی وزەو هێزی سەربازی ئەڵمانیای فاشستی و زیندوكردنەوەی دامەزراوە سەربازیە زەبەلاحەكانی.

بەرژەوەندخوازەكانی ئەمریكا لە ئەڵمانیا سەرقاڵ بوون بە بەرهەمهێنانی چەك و كەل و پەلە سەربازیەكان، لەو كاتەدا لافاوێك لە چەك و تەقەمەنی لە ئەمریكاوە دزەیانكردە نێو ئەڵمانیا. كۆمپانیا ئەمریكیەكان توانیان ڕەزامەندی حكومەتی ولآتەكەیان بەدەستەبهێنن، بۆ فرۆشتنی داهێنانەكانیان بە نازیەكان، بەرێگەدانیان بە دیزاینكردنی نوێ ترین جۆری چەك و بزوێنەری فرۆكەو فرۆكەی جەنگی و ئامێری لاسلكی و پیشەسازیەكانی. هەروەها نیشانەكانی بازرگانی و بوارەكانی داهێنانیان دابینكرد بۆ ئەڵمانیەكان بەمەبەستی پیشەسازی لاستیك و ڕۆنی پیشەسازی و تەقەمەنیە نوێیەكان، ئەمە جگە لەوەی یارمەتیاندا لە ڕێكخستنی بەرهەمهێنانی كانزای(ئەلەمنیۆم و مەگنیسیۆم و بریلیۆن ) چەندین ماددەی تری ستراتیژی گرنگ.

بەرتانیەكانیش هەموو هەوڵێكی خۆیان خستە گەڕ بۆ ئەوەی بەهەمان شێوەی ئەمریكیەكان پەیوەندیەكانیان لەگەڵ ئەڵمانیەكاندا رێكبخەن، گرنگترین و مەترسیدارترین

هەنگاوێك کەلەو بارەیەوە هاویشتیان بەستنی ڕێکەوتنامە بوو لەگەڵ ئەڵمانیەکاندا لەساڵی (١٩٣٥) ز.

ئەم ڕێکەوتنە پێشێل کردنێکی ئاشکرا و تەواوی پەیماننامەی ڤێرساری بوو، کاتێك ڕێگەدرا بە ئەڵمانیەکان بە بنیادنانەوەی کەشتی گەلەکانیان بە شێوەیەك کە ژمارەیەکی زۆر ژێردەریایی لە خۆبگرێت، بە دەق لە ڕێکەوتنامەکەدا هات بوو بەریتانیەکان هەموو یارمەتیەکی دارای و ئابووری و زانستی و تەکنیکی پێشکەش بە ئەڵمانیەکان دەکەن بە مەبەستی هێنانەدی ئەو ئامانجە. فەرەنسیەکانیش ڕۆڵی تایبەتی خۆیان بینی لە دووبارە بنیادنانەوەی هێزی دەریایی ئەڵمانی.

لەلایەکی تریشەوە، سەرەڕای ئەم هەموو هاوکاریانە فەرمانگە حکومیەکانی بەریتانیاو فەرەنسا هەموو هاوکاریەك و کارئاسانیەکیان بۆ ئەم مەبەستە پێشکەش دەکرد، ئامانجیش لە هەموو ئەم هاوکاریانە گۆشەگیرکردنی یەکێتی سۆڤیەت بوو لەسەر شانۆی نیودەوڵەتی.

لەو دەمەدا هێزی یەکێتی سۆڤیەت بە تەنها بوو، تاکە دەوڵەت بوو لەسەر ئاستی جیهان کە سیستەمێکی سۆسیالیستی هەبێت،بۆیە سەرەڕای ئەو پاڵپشتیەی کە دەوڵەتە دۆستەکانی پێشکەشیاندەکرد بەس نەبوو بۆ پوچەڵ کردنەوەی پیلانگێڕیە سەربازیەکانی دەوڵەتە ئیمپریالیەکان و دەستدرێژی کەرەکان. بۆیە یەکێتی سۆڤیەت پێشنیاری دروستکردنی بەرەیەکی یەکگرتووی کرد کە پێك هات بێت لە حکومەت و گەلە جیاوازەکان، بەبێ ئەوەی جەنگێکی تری جیهانی لێبکەوێتەوە.

بەڵام دەوڵەتە دەست درێژی کەرەکان زۆر بەترسەوە وەڵامی ئەم پێشنیارەیاندایەوە،هیچ جۆرە هەوڵێکیشیان نەداکەئەو نیازەیان بشارنەوە،لەو بارەیەوە حکومەتەکەی هیتلەر ڕایگەیاند ئەو بیرۆکەیە پەسەند ناکات و لە دژی هەموو ڕێکەتنێکی هاوکاریکردنی دوولایەنەیە کە دژی دەوڵەتەکانی تربێت، ڕاشیگەیاند ئەو بیرۆکەیە لە نیەتە دوژمنکاریەکەیەوە دژی ئاسایشی گشتیەو قبوڵ کراو نیە، ئەم هەڵوێستەی

هیتلەریش چاوەڕوانکراو بوو لە مەڕ ئەو پێشنیارەی سۆڤیەتیەکان. لەلایەکی تریشەوە بەریتانیەکان و ئەمریکیەکانیش لە دژی وەستانەوە بە هەمان شێوەی ئەڵمانیا.

سێرجۆن سیمۆن وەزیری بەریتانی بۆ کاروباری دەرەوە لە مانگی مایسی ساڵی(١٩٣٥) ز سەردانی هیتلەری لە بەرلین کردوو بەرهەمی سەردانەکەشی دروستکردنی بەرەیەکی ئەڵمانی بەریتانی بوو. لە کاتی گەڕانەوەیدا (جۆن) ڕاپۆرتێکی پێشکەش کرد، تیایدا ئەوەی شیکردەوە کە ڕازیە لە بیروبۆچوونەکانی هیتلەر ولەو بارەیەوە گووتی:(هیتلەر ڕوونی کردەوە بە شێوەیەك کە گومان هەڵناگرێت کە ئەڵمانیا ئامادەی تێدا نیە بۆ واژۆکردنی پەیمانێکی ڕۆژهەلاتی، کە بە دەقەکانی ئەڵمانیا ببەستێتەوە بەهاوکاری دوو لایەنی، بەتایبەتی ئەڵمانیا ئامادەی تێدا نیە بۆ بەستنی پەیمانی هاوکاری لەگەڵ ڕووسیادا. )

هیتلەر لە بۆنەیەکی تردا جەخت لەسەر نارەحەتی دیاریکردنی لایەنی دەستدرێژیکەر دەکاتەوە لە هەر کێشەیەکدا وپرسیار لەو بارەیەوە دەکات و دەڵێت:ئەگەر هاتوو لایەنەکانی تریش ڕێکەوتنامەیەکی لەو شێوەیەیان واژووکرد، واتە ڕێکەوتنامەی هاوکاری هاوبەشیان واژۆکرد چی؟ هەر خۆشی وەلأم دەداتەوەو دەڵێت:بۆیە ئەم بیرۆکەیە لە ئەوپەڕی مەترسیدایە، ئەگەر بێت و سەربگرێت و بکەوێتە بواری جێ بەجێکردنەوە.

سەرەڕای فشارە هاوبەشەکانی ئەڵمانیاو بەریتانیاو ئەمریکاو دەوڵەتە ئەوروپیەکانی تر، لەسەر ڕەدکردنەوەی پێشنیارەکەی سۆڤیەت لە بواری ئاسایشدا، بەلأم فشاری خەڵکی لەسەر هەردوو دەوڵەتی فەرەنسی و چیك و سلۆڤاکی ناچاریکردن بە بەستنی پەیمانی هاوکاری هاوبەش لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی (١٩٣٥) ز. بەلأم دواتر ئەو دوو دەوڵەتە وازیان لە پابەندیەکانیان هێنا بەرامبەر ئەو پەیمانە وەك کارێك بۆ ڕێگرتن لە دەست درێژی نازیەکان بۆ سەریان.

یەکێتی سۆڤیەت هەوڵێکی ئێجگار زۆریدا بۆ ئەوەی ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان بگاتە ئەو باوەڕەی کە ڕۆڵی پارێزەری گشتی ببینێت لە ئاشتیدا و ڕێ وشوێنی توند بگرێتە بەر دژی وڵاتانی دەستدرێژیکەر کە بە شێوەیەکی کردارەی دەستیان پێکرد بوو، بەلأم

ئەو هەلآنەی سەریان نەگرتوو بە هەوادا چوون، چونکە هەردوو حکومەتی فەرەنسی و بەریتانی ڕۆڵی یەکەمیان دەگێڕا لە کۆمەڵەی گەلاندا و خەریکی ڕێگە خۆشکردن بوون بۆ وڵاتە داگیرکەرەکان.

هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵەی گەلان پێشنیارەکانی یەکێتی سۆڤیەت ڕەد بکاتەوە، کۆمەڵەی گەلان بە درێژای ئەو ماوەیە بەدەستی خۆی خۆی توشی بێ دەستەلآتی و خاوبوونەوە کرد، وەك هاندانێك بۆ وڵاتە داگیرکەرەکان، هەر ئەمەش بووە هۆی مردنێکی حەتمی ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیە.

لەلایەکی تریشەوە بارودۆخەکە وەها بوو کەنەدەکرا چینی کرێکاران یەکبگرن، سەرکردە ڕاستڕەوەکانی پارتە سۆسیال دیموکراتەکان لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا سەرجەمی بزوتنە کرێکاریەکانیان لێك هەڵوەشاند بوویەوە، و هەموو پێداگریەکانی سۆڤیەتیان ڕەد دەکردەوە لە سەر دروستکردنی کاری هاوبەش لە دژی دروست بوونی جەنگ، ئەمانەهەموو لەکاتێکدا کە کرێکاران بۆ خۆیان سوربوون لەسەر داواکاری یەکگرتن.

ئەو هاوکاریەیی کە کۆمەڵە کرێکاریەکان پێشکەشیانکرد بە کۆماری ئیسپانیا، نموونویەك بۆ هاو سۆزی و هاوکاری پرۆلیتاری کرێکاری لەسەر ئاستی جیهاندا. نیشتمان پەروەرەکان لە (٥٤) وڵاتەوە لە شوعیەکان و سۆشیالیستەکان و ئەندامانی پارتە بورجوازیەکان و سەربەخۆکان شان بەشانی یەکتری دەجەنگان لە دژی هێزە فاشستیەکان لە کۆڕەپانەکانی ئیسپانیادا. ئەوان دەیان زانی ئەگەر لەدژی ئیتالیاو ئەڵمانیای فاشستی بجەنگن ئەوە وەك ئەوە وایە بەرگری لە وڵاتەکەیان بکەن لە دژی ئیمپریالیزمی داگیرکاری جیهانی.

گەلی سۆڤیەتی تەباو هاوکار بوو لەکەلّ ئامانجە ئاشتیەکاندا و هاوکاری پێشکەش بە گەلانی حەبەشە و ئیسپانیاو چین دەکرد. خەباتی سۆڤیەتی کاریگەری گەورەی نێودەوڵەتی بەجێهێشت، بەلآم هەوڵەکانی هیچ شوێنێکیان نەگرد جگە لەو دروشمانەی

که هێزە چەکدارەکان و گەلی سۆڤیەتی بەرزیان دەکردەوە بۆ ئامادە باشی جەنگێکی تەواو بۆ بەرگریکردن لە لە دوژمنکاریەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی و وەستاندنی.



ناپیلۆن پۆناپۆرت ...هەڵەی تەمەنی خۆی ئەنجامدا بەداگیرکردنی روسیا... هیتلەریش هەمان هەڵەی ئەنجامدایەوە و تووشی هەمان دۆران بووەوە , کەلەگەڵ خۆیدا تێکشکان و کۆتای خەونەکانی هەڵگرت بوو باجەکەشی کۆتایی هێنان بەژیانی بوو




نەخشەکە ئەو ڕێگەیە پیشاندەدات کەهێزەکانی ناپلیۆن پیایدا تێپەڕی تاگەیشتە مۆسکۆ , پێش ئەوەی تێك بشکێت ,بەهۆی ژەنەڕاڵی زستانەوە ! !



نـاپلیۆن لەگـەڵ دەسـتەیەك لەسـەربازەکانی روسـیا پـێش دابـەزینی ئـەو سـەرما و سۆڵەیەی کەجوڵەی سوپاکەی تووشی ئیفلجی کردوو سەرباز و خەونە فراوان خوازیەکانی لەناوبرد!!!!



سەربازەکانە هیتلـەر لـەریزی دیلیـدا , دوای ئـەوەی ژەنـەراڵی زسـتان تێکـی شـکاندن و هێزی روسەکان گەمارۆیاندان!!!

## 2-جۆنسۆن. ..نكسۆن و هەڵەیەكی مەزن بەناوی جەنگی ڤێتنام



بەم نزیکانە سەرکەوتوو دەبین بە خۆڕاگریمان لە ڤێتنام، بۆ بیرخستنەوەش ئێمە پێشتر ئەزموونمان هەیە، ئەمریکا ڕۆژێك لە ڕۆژان لاواز نەبووە، ئێمە دەزانین کە بەردەوام دەبین و دواجاریش بەم نزیکانە سەردەکەوین. ئەمە وتەی سەرۆکی ئەمریکی کۆچ کردوو (لیندون جۆنسۆن ) بوو لە بارەی جەنگی ڤێتنامەوە، کە ئالآی جەنگی هەلگرتوو بەردەوام بوو لەسەری، تا دواجار بەهۆیەوە ئەزموونە سیاسیەکەشی تێك شکا. دوای خۆشی قۆناغێکی نوێ دەستی پێکرد کە بەسەردەمی (نیکسۆن) ناسراوە، کە دوای چوار ساڵی تر لە درێژەدان بە جەنگ بە شکستێکی مەزنەوە پاشەکشەی لەو وڵاتەدا کرد.

ڤێتنامیەکان لە (٣٠) مانگی ئەپریلی هەموو ساڵێکدا ئاهەنگ دەگێڕن لە یادی ئازادکردنی وڵاتەکەیان لە داگیرکاری ئەمریکی و گەڕانەوەی ئازادی و سەروەری خۆیان بەسەر زەویەکانیاندا، دوای دەرکردنی داگیرکەری وڵاتەکەیان بە خراپترین شێوە، بە شێوەیەك کە بە دوای خۆیاندا کلکی شکست خواردوویان ڕاکێشا و سەریان شۆڕکرد بە شێوەیەك کە تێپەڕبوونی کات نەتوانێت لە مێژوودا بیکوژێنێتەوە.

لە هەمان ڕۆژی هەموو ساڵێکیشدا ئەمریکیەکانیش یادی ناخۆشترین ڕۆژی خۆیان دەکەنەوە لە مێژووی وڵاتەکەیاندا. یادی ئابڕوچون و ڕژانی خوێنی سەربازەکانیان و نەمانی شان و شکۆ و ناوبانگی جیهانیان.

ئەمریکیەکان لەگەڵیشیاندا هەموو جیهان ئەوەیان بیرناچێت کە وڵاتی ئەمریکا شکست و هاتنە دواوەی نەبوو تا بوویە ئەو هێزە کاریگەرە گەورەیەی جیهان. دوای ڕزگارکردنی ئەوروپیەکان لە بەزین. کاتێك نازیەکان تەنگیان پێهەڵچنی بوون و لە ژێر ڕەحمەتی دۆزەخی نازیەکاندا بوون، لە جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەوکات کە بەشداریکرد لە

جەنگەکەدا و چووە پاڵ هاوپەیمانەکان و جەنگەکەی لە سودی ئەوان کۆتای پێهێناو شکستی هێنا بەسەر نازیەکاندا.

ریچارد نیکسۆن دوو دڵ بوو لەبەکار هێنانی بۆمبی ئەتۆمی لە جەنگەکەیاندا لە دژی ڤێتنامیەکان، ئەو لە سەردەمی خۆیدا بە یەکێك لە زیرەکترین کەسایەتیە سیاسیەکانی جیهان ئەژمار دەکرا، ئەو یەکێك بوو لەو چەند کەسەی کە خاوەنی هۆشێکی سیاسی ئاست بەرز و کەم وێنە بوون، هەروەها خاوەن توانایەکی باش بوو لە بەڕێوەبردن و بردنەوەی جەنگەکان بەبێ کوشتار، بەلاَم ئەوان زیرەکیەکانیان هەڵی خەڵەتاندن و هۆش و عەقڵی بردن و بڕیاریان دەردەکرد بەبێ هیچ جۆرە حسابێکی دیارو ئاشکرا. تەنانەت توشی هەڵەبوون لە هەڵسەنگاندنی باردۆخی سیاسی و سەربازی کەش و هەوای دەوروبەریشیان لە کاتی ئەنجامدانی سەرکەشیەکانیان.

ئەوان هەستی شانازیکردن بە گەورەی هێزی سەربازی خۆیان لە ناوی بردن، ئەوان لەبەردەم هاوکێشەی هێزدا کەوتن، کە گرنگترین ڕەگەزە لە ڕەگەزەکانی هەر جەنگێك کە بریتیە لە (لایەنی بە ئامانجکراو) یان (دوژمن).

دوژمن لێرەدا لایەنێك نیە کە بەتەنها بەرەنگاری ببیتەوە، بەڵکو ئەو لایەنگرو دۆستی بۆ زیاد دەبێت، ئەو دۆستانەی کە لە ئەنجامی تێکنەشکانی لایەنەکەوە سودمەند دەبن، ئەمە ئەو شتەیە کە کاتێك سەرکردەکانی پۆستی بەڕێوەبردنی جەنگەکان وەردەگرن حسابی بۆ ناکەن، سەرەڕای بیر تیژی و زیرەکیان تێی دەپەڕێنن و هەڵە ئەنجام دەدەن و دەچنە سەر ڕێگەی (هەڵەی مێژووی گەورە ) کە نە گەلی ئەمریکی و نە گەلی ڤێتنام و نە جیهانیش بەگشتی لێیان خۆش نابێت، وەك چۆن دەڵێن: (هەڵەی زیرەکێك بە هەزارە ؟ ؟).

بناغەی کێشەکە ئەوە بوو کە زۆرینەی هەرە زۆری ڤێتنتامیەکان دەیانویست ڕزگاریان بێت لە داگیرکاری بیانی، کە بە فەرەنسیەکان دەستیان پێکرد، کە زۆر بە دڕندانە ڤێتنامیەکانیان دەکوشت و ئەوانیش بەجەستەیان قوربانیان دەدا لە پێناوی ڕزگارکردنی وڵاتەکەیان. لێرەوە ترسی ئەمریکیەکان دروست بوو، بۆ درێژبوونەوەی دەستەلاتی

شوعیەکان بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە دوای دەرچوونی فەرەنسیەکان لە ڤێتنام دێتە ئاراوە.

لە خۆبایی بوونی نیکسۆن بە دەستەڵات و هێزی سەربازیی و ئابووری وڵاتەکەی، ئەمریکای بردە نێو ڤیتنام بۆ زاڵبوونی کاتۆلیکەکان مەسیحیەکان بەسەر زۆرینەی گەلی بوزی و قەلاچۆکردنی شوعیەکان و پاڵپشتی هەڵمەتەکانی بە گاورکردنی بوزیەکان.

ئەوەی کە زیاتر هەڵسەنگاندنەکەی خراپترکرد، ئەوە بوو کە هاوپەیمانە ڤێتنامیەکانی ئەمریکیەکان چینێك بوون لە سەربازە گەندەڵەکان، کە زیاتر مەیلیان بەلای لوت بەرزی و قۆستنەوەی دەستەڵات و پشت ئەستوریان بە ئەمریکیەکان لە داپلۆسباندنی نەیارەکانیاندا دەچوون.

بۆیە شتێکی ئاسای بوو کە زۆرینەیەکی هەرە زۆری گەلی ڤێتنامی دوژمن و نەیاریان بێت و ڕقیان لێیان بێت. کە بەچاوی خۆیان سادەی و پاکی بەرگریکارکاران و سەرکردەکەیانیان دەبینی بەناوی(هۆشمینە) کە لە نێو ئەشکەوت و کوخەکاندا دەژیاو ژیانی سەخت و گرانی لەگەڵ شوێنکەوتووەکانیدا دابەش کردبوو.

لەهەمانکاتدا (چین) ڕەخنەی گرد لە بوونی بنکەیەکی تری ئەمریکیەکان لەسەر سنورەکانی دوای تایوان و کۆریای باشور. بۆیە (ماوسی تۆنگ) بڕیاریدا بە دروستکردنی لەمپەر لە بەردەم پلانی ئەمریکیەکان بە هەموو ئەو شتانەی کە لەبەردەستیدا هەبوون. یەکێتی سۆڤیەتی ڕازیکرد بەوەی کە بەرژەوەندیەکانی لەناو دەچن بە ئەگەری دروست بوونی مەترسیەکانی ئەمریکیەکان لە ناوچەی (هیندی چینی ) وەك تۆڵەیەك لە بەرامبەر دانپێدانەنانی دەستەڵات و شکۆی بەسەر ئەورووپای ڕۆژهەلات و بەرەنگار بوونەوەی شوعیەکان لە ئەورووپای ڕۆژئاوا.

بەم شێوەیە چانس لە بەرژەوەندی ڤێتنامیەکان وەرچەرخا بە دابین بوونی هاوکاری و پاڵپشتی دەرەکی.

بە ویستی جەنگ و بەردەوام بوون لەسەر بەرگری لە نێو ڕۆڵەکانی گەلدا درێژترین جەنگی پارتیزانیان دەست پێکرد. سەرەتای تێوەگلانی ئەمریکیەکان بە زۆنگاوی

ڤێتنامی بە ناردنی مەشق پێکەرەکان و ڕاوێژکارەکان دەستی پێکرد، بۆ مەشق پێدانەوەی هێزەکانی سوپای ڤێتنامی باشور و ڕاهێنانیان لەسەر چەکی نوێی ئەمریکی.

بەڵام دڵی ڤیتنامیەکان هاوسۆزی پلانی ئەمریکیەکان نەبوو، بۆیە بڕیاریاندا خۆیان ڕاستەوخۆ جەنگەکە بکەن، لەگەڵ بەرز بوونەوەی زیاترە زەرەروزیانەکانی ئەمریکیەکان تادەهات بۆردومانە وەحشیەکانیان چڕتر دەکردەوە لەسەر شارو شارۆچکەکان و هێڵەکانی یارمەتی و سوتاندنی دارستان و چەنگەڵەکان بە چەکی کیمیاوی، کە بووە هۆی توش بوونی ژمارەیەکی زۆری ڤێتنامیەکان بە نەخۆشتی ترسناکی وەك شێرپەنجە.

ڤێتنامیەکانیان زۆر بە دڕندانە دەکوشت، کەچی سەرەڕای ئەوەش ئەوان هەر بەرگەی ئەو بارودۆخەیان دەگرت، هێلەکانی یارمەتیدان لە چین و رووسیاوە درێژەیان هەبوو لە پێناو مانەوەی ئە بەرگریە دلێرانەیە، لەگەڵ بەردەوامی جەنگەکەدا ئەو هێڵانە بە ڕۆژ لەلایەن هێزە ئەمریکیەکانەوە بۆردوومان دەکران بەمەبەستی لە ناو بردنی ئەو پردو خەندەقانەی کە لەڕێگەیانەوە هاوکاری دەگەیشتە ڤێتنامیەکان، بەڵام بەشەو لەلایەن ڤێتنامیەکانەوە چاك دەکرانەوە.

چین دەرگای خۆبەخشی نهێنی کردەوە بۆ پەیوەندیکردن بە بەرگریکارانی ڤێتنامیەوە، لەلایەکی تریشەوە سۆڤیەتیەکان بە نهێنی موشەکی پێشکەوتو و فڕۆکەی کۆکردنەوەی زانیاری لە جۆری(میگ٢١) بە سەرکردایەتی تیمی تایبەتی سۆڤیەتی ناردە ڤێتنام.

زیانەکانی کەرتی فڕۆکەوانی ئەمریکی بەرەبەرە بەرز دەبوونەوە، ڤێتنامیەکان فڕۆکەوانە بەندکراوە ئەمریکیەکانیان لە نێو قەفەسی ئاژەڵاندا لە شەقامەکاندا دەگێڕا، کە فڕۆکەکانیان لە دەرئەنجامی بۆردومانی ئاسمانی ڤێتنامیەکان تێك شکا بوون، ئەمەش کاریگەری مەعنەوی قوڵی بەجێهێشت.

لەگەڵ بەردەوام بوون و زیاد بوونی زیانە مرۆییەکان لە نێو ریزەکانی سوپای ئەمریکیەکاندا، نارەزایەتیە نێوخۆیەکانیش دەستیان پێکرد لە دژی جەنگ، لە نێو گەنجەکانی زانکۆکاندا ئەوانەی کە بە زۆر بانگ دەکران بۆ خزمەتی سەربازی، لەلایەکی

تریشەوە رۆژنامە ئەمریکیەکان دەستیانکرد بە بلاوکردنەوەی هەواڵی تاوان وقەسابخانەو بۆردومانکردنی ناوچە مەدەنیەکان و لەناو بردنی گوندەکان لەلایەن سوپای ئەمریکیەوە لە ڤێتنام. بەم شێوەیەش جەنگاوەرە ئەمریکیەکان لە چاو هاوولاتیە ئەمریکیەکانیانەوە بوونە بوکوژ و خوێن رێژو تاوان بار.

هۆکارەکانی راگەیاندنی شوعیەکانیش لەسەرجەم ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا وێنەی ئابڕوچوونەکانی ئەمریکیەکانیان بلاو دەکردەوە. ئەمە جگە لەو بزوتنەوە جەماوەریانەی کە خۆپیشاندانی فراوانیان رێکدەخست دژی ئەمریکاو دەست تێوەردانی لە کاروباری ناوخۆی ڤێتنام. بەرپرسە ئەمریکیەکان لە هەموو شوێنێك رووبەرووی خۆپیشاندەرە تووڕەکان دەبوونەوە لە واشنتۆن، تەنانەت لە پاریس و لەندەن و ئەڵمانیاش، شکۆی سوارچاکی و رێزی سوپای ئەمریکا تێك شکاو، ئەوروپیەکان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئەمریکیەکان بوونەتە پیاو کوژو تاوان ئەنجامدەدەن لە ڤێتنام وەك ئەو تاوانانەی کە هیتلەری ئەنجامیدان لە ئەوروپا. بۆیە ئەمریکیەکان دەستیانکرد بە گەڕان بە دوای دەرچەیەکی سەربەرزانەدا بۆ دەرچوون لەو گێژاوە سەربازی و سیاسی وئەدەبیەی کە تێی کەوت بوون، بە تایبەت سەرۆك (نیکسۆن) هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی لەسەر بەڵێنی گەڕاندنەوەی سەربازەکانی بۆ لای کەس و کاریان و کۆتای پێهێنانی جەنگی ڤێتنام بە شێوازی دیبلۆماسی دەست پێکرد.

ڤێتنامیەکان لەوە تێگەیشت بوون کە مەسەلەی کشانەوەی ئەمریکیەکان شتێکی حەتمیە، تەنها پەیوەندی بەکاتەوە هەیە، هاوپەیمانەکانی ئەمریکاش لە ڤێتنام دەستیانکرد بوو بە خۆ ئامادەکردن بۆ قۆناغی دوای کشانەوەی ئەمریکیەکان لە ڤێتنام. لە کاتێکدا وەزیری نوێ ی دەرەوەی ئەمریکا (هینری کیسنجەر) دەستیکرد بە دانوسانەکانی لە پێناو دەرچوونێکی شەرەف مەندانەو پارێزگاریکردن لە مانەوەی حکومەتی ڤێتنامی باشور ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت. هەرچەندە (ڤیتکۆنج) پێشوازیکرد لە رۆشتنی ئەمریکیەکان بەلام رەدی کردەوە هیچ جۆرە بەڵێنێك بدات بۆ پاراستنی مانەوەی رژێمەکەی باشور.

لە کاتێکدا کە دانوسانیاندەکرد هێزەکانیشیا بەرەو پێشەوە دەچوون و گەمارۆی شاری (سایگۆن)یاندا، تارۆژی(٣٠ئەپریلی ساڵی١٩٧٥) ز گەلی ئەمریکی و هەموو جیهانیش بەو دیمەنە بەخەبەر هاتن، کە گەورەیی و خۆبەزلزانی لایەنی سەربازی ئەمریکی خستە نێو زەلکاوی خەجاڵەت بارییەوە، کاتێك شەقامەکانە سایگۆن داپۆشرابوون بە جل وبەرگی ئەو سەربازانەی کە فڕێیان دابوون و لە ترسا ڕایانکرد بوون لە شوێنەکانی خۆیان، دوای ئەوەش خۆیان دارنیی بوو لە هەموو ئەو ئاماژانەی کەپیشانی بدات ئەوان سەربازی سوپای ڤێتنامی باشورن. لە هەمان کاتدا فرۆکە ئەمریکیەکان سەرقاڵی گواستنەوەی کارمەندان و لایەنگرانی خۆیان بوون لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە سایگۆن.

لەم کاتەدا (ڤیتکۆنج)چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد بە هێمنی و، هەلێکیدا بەوانەی کە ڕایاندەکرد تا بە ئارامی ڕابکەن، بەلآم ئەوان هەر لە ژێرفشارێکی توندی ترس و تۆقان و شلەژاندا هەڵسوکەوتیان دەکرد، کە زاڵ بوو بەسەر هەستەکانیاندا.

ئەو ڕۆژە ڕۆژی لێ ئاوانەبوو دەنگی ئەم شکستە مێژوویيە ڕیشەکانی لە نێو خۆبەگەورەزانینی ئەمریکیەکاندا جێگیر بوو، بەدوای خۆیدا زنجیرەیەك کاردانەوەی کۆمەلآیەتی و سیاسی هێنا و ڤێتنامیەکانی کردە تارمایێك بۆ ڕاوەدوونانی ئەمریکیەکان تا ئەمرۆشی لەگەڵدا بێت درێژەی هەیە.

ڤێتنامیەکان (٣) ملیۆن کەس و تێکچوونی زۆرینەی ئاوەدانیەکانیان کردە قوربانی سەرکەوتنەکەیان، ئەمریکیەکانیش لەو سەرکەشیەیی کە ئەنجامیاندا (٥٨) هەزار سەربازیان لەدەستدا، کە تائێستەش لیکۆڵینەوەو توێژینەوەی جیاواز ئەنجام دەدەن بۆ دروستکردنی بەهانەیەك بۆ شکستەکەیان و جوانکردنی ڕووی خۆیان لەسەر ئاستی جیهان.

چەند هۆکارێك هەبوون لە پشت ئەو شکستە سەرشۆڕکەرەی ئەمریکیەکان و سەرکردەکانیان، بەتایبەت سەرۆکی لوت بەرزی ئەمریکیەکان (نیکسۆن). لە هەمان کاتدا چەند هۆکارێکیش بۆ ڤێتنامیەکان دەستەبەر بوو بوون، کە بۆ هیچ ململانێیەکی تری لەو

جۆرە دەستەبەر نەبوو بوون، جگە لە جیهادی ئەفغانیەکان نەبێت، کە ئەوانیش دواجار شکستیان بە هێزێکی گەورەی وەك رووسەکان هێنا.

کەسانی شارەزای سەربازی و ستراتیژی گرنگترین هۆکارەکان دەگەڕێننەوە بۆ ئەمانەی لای خوارەوە :-

### ١-سروشتی زەویەکە:

چڕی بەرگی ڕووەکی و دارستان و گژوگیا و ڕووبارەکان یارمەتیان دەدا لە کارئاسانیکردن بۆ هاتوچۆکردنی پیاوانی (ڤیتکۆنگ) لە نێوان سەرجەم ناوچە جیاوازەکانی ڤێتنامدا. هەروەها ئەمریکیەکانی لەوە دەستەوسان دەکرد کە زانیاری هەواییان هەبێت و بۆردومانی ڕاستەوخۆی یەکە جەنگ کەرەکانی ڤێتنامیەکان بکەن. ئەمەش سنورێکی باشی دانابوو بۆ ڕادەی سەرکەوتن و کاریگەری هێزی ئاسمانی ئەمریکی.

ڤێتنامیەکان وەك تارماییێك جوڵەیان دەکرد و بە کت و پڕی دەردەکەوتن و هێرشەکەیان ئەنجام دەداو دواتر لە نێو جەنگەڵەکاندا خۆیان دەشاردەوە،پێش ئەوەی ئەمریکیەکان سزایان بدەن و تۆڵەیان لێبکەنەوە. بەم شێوەیە بنەمای کت وپڕی لە زۆربەی جەنگی ڤێتنامیەکاندا بووە بنەمایەکی سەرەکی، کە بەهۆیەوە توانیان زیانێکی ئێجگار زۆری گیانی بە ئەمریکیەکان بگەیەنن.

### ٢-ڕێکی و دابینکردنی پاڵپشتی لۆجستی:-

هەریەکە لە یەکێتی سۆڤیەت و چین وایان دەبینی کە گۆڕانی بەشێك لە ڤێتنام بۆ کۆریای باشوری نوێ، مەترسیەکی ڕاستەوخۆ دروست دەکات لەسەر دۆستەکانیان لە ناوچەکەداو، دواتریش سەرچاوەی دوودڵی و مەترسی دەبێت بۆ سەر سەلامەتی زەویەکانیان لە ململانێکانی داهاتوودا. بۆیە بە گوژمە چەك و خۆراك و شمەك و کەل و پەلی سەربازی و سوتەمەنیان دەبەخشیە هێزەکان (ڤینکۆنگ)، هێڵەکانی گەیاندنی

یارمەتیش بەبێ وەستان لە کارا بوون تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە دەکەوتنە بە هێرشی ئاسمانی ئەمریکیەکان.

رووسەکان یارمەتی و پاڵپشتی ڕاستەوخۆیان دەکرد، بەناردنی ڕاوێژکارو چەکی بەرگری ئاسمانی، لەلایەکی تریشەوە فڕۆکەوانە چینیەکان گەیشتنە ئەو وڵاتە بۆ تەحەداکردنی ئیمپریالیزمە ئەمریکیەکان لە ئاسمانی ڤێتنامدا بە جۆری فڕۆکەی (میگ ١٥،١٧)، هەرچەندە ئەمانە توشی بۆردوومانی چڕی ئەمریکیەکان بوونەوە و زۆرێکیان تێك شکێنران، بەڵام ئەوانەیان کە مابوونەوە زەرەرو زیانێکی زۆریان بە ئەمریکیەکان گەیاند.

ڤێتنامیەکان هیچ جۆرە خەرجیەکی ئەو چەك و تەقەمەنیانەیان نەدەدا کە بەکاریان دەهێنا، هەموو ئەوانە بەشێوەی بەخشش و یارمەتی بۆیان دەهات، رووسەکان بەبێ سڵەمینەوە هەرچیەك تەکنۆلۆژیاو شتی نوێ یان هەبوو پێشکەشی ڤێتنامیەکانیان دەکرد، لە پێناو ماندوکردنی ئەمریکیەکاندا. ئەمە جگە لەوەی ڕووباری خۆبەخشە ڤێتنامیەکان نەدەوەستاو بەردەوام هەبوو.

### ٣-هاوسۆزی نێودەوڵەتی :-

ڤێتنام بەختداربوو بەو ڕوماڵە هەواڵیە بەرفراوانەی کە لەلایەن هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی شوعیەکان و سەرجەم هاوپەیمانەکانیان لە رۆژهەڵات و رۆژئاواو ئەمریکای لاتینی دەکرا. هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژهەڵات سەرکەوتووبوون لە باوەڕ پێهێنانی گەلانی جیهان بە ڕاستی و دروستی خەباتی ڤێتنامیەکان و مەرامە خراپەکانی ئەمریکیەکان بۆ دەست بەسەرداگرتنی ڤێتنام، کە سوپاکەی بەهیچ جۆرێك دەستی نەدەپاراست لە ئەنجامدانی تاوانی جەنگی و کارە وەحشی گەراییەکانی، بە ئامانجی سەپاندنی ویستەکانی خۆی بەسەر ئەوانی تردا.

ئەو وێنانەی کە لە گۆرەپانی جەنگەوە دەردەچون بەو هەموو کارەساتەوناوەڕۆکە کاریگەرەیانەوە، لە نەهامەتی مرۆیی و قوربانی بێ تاوانەکان، گرنگترین هۆکارێك بوون

بەهێزکردنی هاوسۆزی نێودەوڵەتی بەرامبەر خەباتگێڕە ڤێتنامیەکان. ئەم تێگەیشتنە نێودەوڵەتیەش کارگەری هەبوو لەسەر بەردەوامی بەرگری و زیاد بوونی خۆبەخشەکان. دواجار هۆکاری گرنگ و یەکەم بریتی بوو لە پێداگری گەلی ڤێتنامی لەسەر بەرگریکردن بە چاو پۆشی لە زۆری قوربانیەکان.

بەڵام دەربارەی هۆکارەکانی شکستی ئەمریکیەکان، دەتوانین بڵێین لە سەرەتای جەنگ و کۆتاییەکەی و ئێستاش شکستەکەی ڤێتنام (کە زۆرترین و ئەوپەڕی سەرشۆڕی سەربازی ئەمریکی بوو لە مێژووی ئەمریکادا) بوارێك بوو لیکۆڵینەوەو توێژینەوەی جیاواز. کە بووەهۆی سەرلە نوێ بنیادنانەوەی پەیکەرەی هێزی سەربازی ئەمریکی و کارە لە پێشینەیەکانی، هەروەها ئەو بنەمایانەی کە پێویستە لە داهاتوودا جەنگەکانی لەسەر ئەنجامبدات، گرنگترینیان بنەمای (واینبرجر) بوو کە ئەمیش لەسەر دوو بنەمای سەرەکی وەستاوە :—

یەکەم بریتیە لە مەشق و ڕاهێنان لەکاتی ئاشتیدا.

دووەمیش بریتیە لە ڕوونی ئامانجی سیاسی لە کاتی دروستکردنی جەنگ و کۆدەنگی ئەمریکیەکان لەسەر ئەوەی کە ئەو ئامانجە شایەنی هەڵگیساندنی جەنگێکە بۆ دەستە بەرکردنی.

**به پێی تێڕوانینی سەرکردە سەربازیە ئەمریکیەکان ئەمانەی لای خوارەوە گرنگترین هۆکاری شکستی ئەمریکا بوون لە جەنگی ڤێتنامدا :-**

**١-هاوتا نەبوونی بڕیارە سیاسیەکان لەگەڵ ڕێڕەوی کردە مەیدانیەکاندا :-**

سەپاندنی بڕیارە سیاسیەکان لەلایەن ئەو سەرکردانەوەکەلە جەنگەکەوە تێوەگلابوون وەك هەریەکە لە (دواین ئەیزن هاوەر، جۆن کەنەدی، لینسۆن جۆنسۆن، ریچارد نیکسۆن) و دەست تێوەردانیان لە هەموارکردنەوەی پلانەکان و ڕێڕەوی کردە سەربازیەکان، وایانکرد کە سەرکردە مەیدانیەکان نەتوانن ئەو سەرکەتنە بەدەست بهێنن کە لە لێواری بەدەست هێنانیدا بوون، هەروەها ئەو کۆت و بەندانەی کە لە قۆناغە کۆتاییەکاندا سەپێنرا بەسەر بۆردومانی ئاسمانیدا، بووە هۆی ئەوەی کە ڤێتنامیەکان یارمەتیەکی ئێجگار زۆریان پێ بگات، کە دەکرا پێش ئەوەی بگەنە بەرەکانی جەنگ لەناو ببرێن، ئەگە بهاتایە لە واشنتۆنەوە فەرمان دەربچوایە.

بۆیە زۆربەی سەرکردە سەربازیە گەورەکان سەرکۆنەی ئەو دەست تێوەردانانەیان دەکرد لە ڕێڕەوی ئۆپەراسیۆنەکاندا، ئەمە سەرەڕای نەزانینی سەرکردایەتی سیاسی بەو مەترسیە سەربازیەیی کە سەربازە ئەمریکیەکان لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا ڕووبەڕووی دەبوونەوە.

پەنا بردنیان بۆ هۆکاری سیاسی لە سەپاندنی کۆت و بەندی تێك شکێنەر لە بەکارهێنانی سەرجەم هێزی لەبەردەستدا بوو لە پێناو تێکشکاندنی ورەو مەعنەویەتی ڤێتنامیەکان لە ساڵی (١٩٧٠) ز زۆر جێگەی گەشبینی بوو بۆ یەکلاکردنەوەی جەنگەکە لە ماوەی دوو ساڵدا، بەڵام ئەگەر ئاراستەی کەش و هەوای سیاسی نەگۆڕایە، بە هۆکاری فشاری جەماوەری خوێندکاران و دواجار مل کەچکردنی سیاسیەکان بۆ هەست و سۆزی نەیارانی جەنگ.

## 2-سیستەمی سەربازگرتنی بە زۆر :-

زۆرینەی هەرە زۆری ئەو سەربازە ئەمریکیانەی کە لە ڤێتنام بوون، لە سەربازە خۆبەخشەکان نەبوون، تەنانەت لە پیشەگەرە سەربازیەکانیش نەبوون، بەڵکو پێکدەهاتن لەو گەنج و خوێندکارانەی کە لەلایەن سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانەوە بە زۆر بانگ کرا بوون بۆ خزمەتی سەربازی. بۆیە ئەوانە بەزۆر ڕێکخرا بوون لە نێو هێزە چەکدارەکاندا، نەك بە پاڵنەرێکی نیشتمانیەوە چووبن، ئەوان ڕاهێنانیان بە خێرا تەواو دەکردو، دەنێران بۆ بەرەکانی جەنگ لە پێناو پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی هێزە جەنگ کەرەکانی لە مەیدانەکانی جەنگ لە ڤێتنام.

قورەکە زیاتر خەست بوویەوە، کاتێك زۆرینەی ئەو سەربازانە بڕوایان بە هۆکارەکانی جەنگەکەو ڕەوا بوونی نەبوو، تا لە پێناویدا قوربانی بە جەستەی خۆیان بدەن، کوڕانی بەرپرس و دەوڵەمەندەکان خۆیان بەدزیەوە لە چوونیان بۆ ڤێتنام، بە خۆبەخشینیان بە ڕیزەکانی پاسەوانی سنوری لە نێوخۆی وڵاتەکەیاندا، وەك جۆن (جۆرج بۆشی) باوك کردی، یان ڕایاندەکرد بۆ دەرەوەی وڵات، بەهەر ڕێگەیەکی خۆدزینەوە بێت، وەك چۆن سەرۆك(بیل کلینتۆن ) کردی، کە هەموو ماوەی جەنگەکەی لە بەریتانیا بە ماوەی خوێندنەوە بەسەر برد.

زۆرینەی ئەو کەسانەی کە دەچوونە ڤێتنام بۆ جەنگ ئەزموون و شارەزایان نەبوو، ئازایەتیان لەدەست دابوو،و ئامادەی قوربانیدان نەبوون، بەڵام جەنگ نەدە وەستاو خۆی دەسەپاند بەسەریاندا و ناچاریدەکردن بە خێرای خۆیان لەگەڵیدا بگونجێنن.

### ٣- گۆڕانی ئامانجەکانی جەنگ لەگەڵ تێپەڕبوونی کات :

کاتێك ئەمریکیەکان لە جەنگەکەوە تێوەگلان، ئامانجیان یارمەتیدانی سوپای ڤێتنامی باشور بوو لە دژی دوژمنە باکوریەکانیان. بەم شێوەیە لەسەرەتادا تەنها پرچەککردن و ڕاهێنان و کاری ڕاوێژکاری بوو.کاتێك بۆ ڕاوێژکارە ئەمریکیەکان ئاشکرا بوو کە هاوپەیمانەکانیان ناتوانن ئامانجەکان بهێننەدی، هەندێك سەربازیان داواکرد لە وڵاتەکەیان بۆ مەبەستی یارمەتیدانیان لە کاتی گەڕانەو پشکنینەکاندا،واتە گەڕان بە دوای هێزی دوژمن و لە ناوبردنیان بە هێز بە ئامانجی لاوازکردنیان و کردنیان بە پاروی ڤێتنامیە باشوریەکان.

لەگەڵ شکستی ئەم هەنگاوەشیاندا ئەمریکیەکان خۆیان هەستان بە سەرکردایەتی کردنی هێزی هاوپەیمانەکانیان لە کردە سەربازیەکاندا، دواتریش بەمە نەوەستانەوە و دوای هێزی ئەمریکیان کرد بۆ جێ بەجێکردنی ئامانجەکەیان بە ڕاستەوخۆی. ئیتر لێرەوە بە خێرای خزانە نێو جەنگەکەوە، و هیچ کەسێکیش زاتی ئەوەی نەدەکرد کە پرسیارە گرنگەکە بکات کە بۆچی هاتوون؟ ؟ئایا هاتوون یارمەتی باشوریەکان بدەن؟ یان هاتوون بچنە جەنگەکەوە لە جیاتی ئەوان؟

### ٤-کاریگەری ڕاگەیاندنێکی تێکشکێنەر لەسەر مەعنەویات :-

لەسەر ئەمە کۆدەنگیەك هەیە، نەك تەنها لەنێو سەرکردەکاندا، بەڵکو لەنێو سەربازەکانیشدا، بەوەی کاتێك پەیامنێرە ئەمریکیەکان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا وێنەکانیان بڵاودەکردەوە و لە ڕێگەی شاشەکانی تەلەفزیۆنەوە شەوانە لە هەمووماڵەکاندا نەهامەتیەکان و ئابڕوچوونەکانی هێزەکانی ئەمریکیەکانیان بەخش دەکرد، هەموانی توشی شۆك و ڕاچڵەکین کرد و داوایان لە سیاسیەکانکرد بە وەستانی جەنگ و گەڕانەوەی ڕۆڵەکانیان و ڕزگارکردنیان لە مردنی شوێنە نادیارەکانی ڤێتنام، یان بوونیان

بە پیاو کوژ و خوێن ڕێژو تاوانبار، کە هیچ کەسێك لە ئەمریکیەکان ئامادەی مردن نەبوو لەو پێناوەدا. هەروەها ڕاگەیاندنی ئەمریکی وەهای کردبوو لە وانەی کە لەجەنگی ڤێتنام دەگەڕانەوە ڕێزو شکۆیان لەدەست بدەن، بە پێچەوانەی ئەو سەربازانەی کە لە جەنگەکانی تری ئەمریکاوە گەڕابوونەوە.

هاوڵاتیان نمونەیان لەو قەسابخانەو دەست درێژیانە دەبینی کە هەندێك یەکەی سەربازی ئەمریکی ئەنجامیاندا بوو لە ڤێتنام.کە هەموو ئەو سنورانەیان بە زاند بووکە هەست و سۆزی مرۆڤی قبوڵی دەکات. تەنانەت لەوەش تێپەڕی بوو کە لە جەنگە خوێناویەکاندا ڕوودەدات.

بۆیە هەندێك لەو سەربازە ئەمریکیانەی کە لە جەنگی ڤێتنام گەڕابوونەوە ڕووبەڕووی تف لێکردن و سوکایەتی بوونەوەو نازناوی (بوکوژی منداڵانیان ) لێنران، لەلایەن گەنجەکانی زانکۆکانەوە، بۆیە لەو کاتەدا هیچ کەسێکی سیاسی کە چاوی لە داهاتوو بوایە زاتی ئەوەی نەدەکرد کە باس لە پشتگیری کردن لە جەنگ و درێژەپێدانی بکات.

دەربارەی دەرئەنجامەکانی جەنگی ڤێتنام دەتوانین بڵێین بووەهۆی ئەوەی کە سنورە سیاسیەکانی وڵاتی (چین) زیاتر بچەسپێنێ، لە هەمان کاتدا زیانەکانی جەنگ و ئابڕووچونەکان زۆر بوون، ئەمە سەرەڕای ڕوودانی زیاتری سەرکەشی سەربازی و پەرەسەندنی سیاسی.

هەردوو جەمسەری جەنگی سارد یەکێتی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە لە ئایندەدا پێویستە لەکاتی ڕوودانی گرفتەکاندا هاوپەیمانەکانیان بۆ خۆیان جەنگەکانیان ئەنجام بدەن،ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە جیهان بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر ڕزگاری بوو لە خزانی بۆ نێو دۆزەخی جەنگێکی تری جیهانی بە هۆی جەنگی ڤێتنامەوە.

لێرەدا سوربوونێکی دوولایەنە هەبوو لەسەر دوورکەوتنەوە پێکدادان و بەرەو پێشبردنی لێك تێگەیشتنەکان. بەم شێوەیەش قۆناغێکی نوێ لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان دەستی پێکرد کە بەسەردەمی ئومێدەکان ناسرا. هەردوولا بە پێی

تێگەیشتنیان بڕیاریاندا، کە ڕێگە نەدەن بە هاوپەیمانەکانیان ڕایانکێشنە نێو پێکدادانی ڕاستەوخۆی سەربازییەوە. ئەمەش لەدەرئەنجامی سەردانی گەورە بەرپرسانی هەردوولا هاتە ئاراوە. هەریەکەیان لەلای خۆیەوە کۆت و بەندی دادەنا لەسەرپرچەك کردنی هاوپەیمانەکانی، بە شێوەیەك کە هاوسەنگی هێز لە جیهاندا پارێزراو بێت و شتی کت وپڕی ورسکەر ڕوونەدات.

ڤێتنامیش وەك نمونەیەك مایەوە بۆ گەل و نەتەوە بچوکەکان، لە بەردەوامی خەبات و بەرگری لە ڕەدکردنەوەی دەستەلاتی بیانی و داگیرکەران.

لەگەڵ تەواو بوونی گەڕانەوەی هێزە ئەمریکیەکان بۆ نیشتمانەکەیان، کیشە کۆمەلآیەتیەکان زۆر وکەڵەکە بوون و هێزەکانیش سوپاس و پێزانینیان ئاڕاستە نەکرا بەرامبەر بەو ڕۆڵەی کەلە جەنگەکەدا گێڕا بوویان.

لەسەر ئاستی مێژوویش دەرئەنجامەکانی تێکشکانی جەنگی ڤێتنام، شکستێك بوون لە ڕێڕەوی دروستکردن و بنیادنانی ئیمپراتۆریەتی ئەمریکی جیهانی.

ئەم هەموو شکست و ڕوداوانە لەسەر سەرکردەکانی قەیرانەکە تۆمارکران، (ئەیزنهاوەر) ئەمریکای بردە نێو ململانێکانی جەنگی سارد و پێشبڕکێ ی خۆ پرچەك کردن بە ئاڕاستەی بەدەست هێنانی چەکی کۆکوژ،ئەمە جگە لەوەی سوپاکەی هاویشتە نێو جەنگی ڤێتنامەوە.

(لیندۆن جۆنسۆن)یش گەیاندیە کارەساتەکەو، (ڕیچارد نکسۆن) یش لە دەرئەنجامی دان نەنانی بە شکستەکەدا گەیاندیە نەهامەتیە گەورەکە و تێکشکانە سەرشۆڕکەرەکە.

ئەوان بە سەرکەشیەکانیان لە ڤێتنام هۆکارێك بوون تا بگەنە (دەلاقە کوشندەکە ) کە لە پێکهاتەکانی ئاسایشە نەتەوەی بە (گرێ ی ڤێتنام ) ناسراوە. کورتیەکەی بریتیە لەوەی کە کاتێك سەربازی ئەمریکی لە دەرەوەی وڵات توشی جەنگ دەبێت، ورەی خۆی لەدەست دەدات و هەڵدێ و شکستدەهێنێ لەبەردەم ئەو جەنگاوەرانەی کە لە ڕیزەکانی بزوتنەوە ڕزگاری خوازەکانی وڵاتاندادەجەنگن.

سەرکردە سەربازیەکان و بڕیارانی بواری ستراتیژیەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاریاندا دان بە بوونی ئەو (دەلاقەکوشندەیەدا) بنێن لە پێکهاتەی ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکیدا، کە بریتیە لە دەلاقەی لاوازی مەعنەویەت.بۆیە ستراتیژیەتی سەربازی ئەمریکی دوای ئەمە بەوە ناسرا کە دووركەوتەوە لە بەرپاکردنی جەنگی مەیدانی لەگەڵ دوژمندا، پێش ئەوەی کە هێزی بنەڕەتی دوژمنانی لە ڕێگەی هێزی ئاسمانی و موشەکە دورهاوێژەکانیەوە لەناو ببات، بە پشت بەستن بە مانگە دەستکردەکان بۆ ئاسانکاری سەرکردایەتی و زاڵ بوون بەسەر بارودۆخەکەدا. ئەمە هۆکارێك بوو بۆ گرنتی تێکشکاندنی هێزی بنەڕەتی دوژمن لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە هۆکاریك بوو بۆ پەرەپێدانی سیستەمی چەکی پێشکەوتو و پشت بەستن بە سەرکەوتنی تەکنۆلۆژی بەسەر دوژمندا.

لەو چوارچێوەیەدا یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی بنیادنانەوەی هێزی چەکداری ئەمریکی بریتی بوو لە گرتنی دەلاقەی مەعنەویەت بە داهێنانی تەکنۆلۆژی. کە لەو باوەڕەدا بوون ئامێرێکی بێ گیان جێگەی مرۆڤ دەگرێتەوە لە جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی تێکشکاندنی دوژمن.

ئەم جۆرە لە جەنگ بەوە جیا دەکرێتەوە، کە غافڵ گیرو خێرایە و چەند ڕۆژێك یان نزیکەی دوو هەفتە دەخایەنێت، ئەو ماوەیەش ڕێگەنادات بە دوژمن کە سەرلە نوێ خۆی ڕێك بخاتەوە و چارەسەری ئەو زیانە زۆرانە بکات کە لە ئەنجامی ئەو بۆردومانە چڕەوە توشی دەبن. بۆیە ئیتر لێرەوە جەنگە میدانیەکە دەست پێدەکات و کورت دەبێتەوە لەسەر پاشماوەی هێزە تێکشکاوەکانی دوژمن، بەم شێوەیەش گرێ ی ڤێتنام دەکرێتەوەو سارێژ دەبێت.

بیرۆکەی (جەنگی هەوای چڕ )بۆخۆی ستراتیژێکی تەواو جیاوازە لە بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی بۆ لاوازکردنی دوژمن پێش پێکدادانی ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا، لەبەر ئەوەی لەو جۆرە کاتانەدا هێزی ئاسمانی تەنها هێزی دوژمن لاواز دەکات، نەك هێزە بنەڕەتیەکەی

لەناو ببات. لە چوارچێوەی ئەم جۆرە ستراتیژیانەدا جەنگەکە بەهۆی هێزەکانی بەرگری و پیادەو تۆپ و. ... هتد یەکلای دەبێتەوە.

پەرچەکردای ئەمریکیەکان بەرامبەر شکستەکەیان لە ڤێتنام بە پەژارەو رەشبینی بەرامبەر بەداهاتوو ناسرا، وتەکانی (هنری کیسنجەری) وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەمریکا، پڕبوون لە تاڵی و نائومێدی و ئاماژەکردن بە گەڕانەوە بۆ (سیاسەتی گۆشەگیری)، ئەم قسانەش لە کتێبی (ئەمریکی و ئەورووپیە گەورەکان) پشتڕاستکراوەتەوە.

ئیدارەی سەرۆکی ئەمریکی کۆچکردوو (ڕۆناڵد ریگان )دوای نزیکەی شەش ساڵ لە شکستی ڤێتنام، لە ساڵی (١٩٨١) بۆ گەشەسەندنی باری دەرونی و سڕینەوەی گرێ ی ڤێتام ویستی چەند کردەیەکی سەربازی خۆنواندنی لە وڵاتە بچوکەکانی وەك (گرانادا و پەنەما) ئەنجامبدات،کە سەرکەوتن تیایاندا شتێکی حەتمی و مسۆگەرە. دواتر دەست بکات بە دانانی پلان بۆ جەنگێکی سەرەکی و بیرۆکەی (جەنگی ئاسمان چڕ) ی تێدا تاقیبکاتەوە.

ڕەگەزی یەکلاکەرەوە لەم جۆرە پلانەدا بریتیە لە:گرەنتی سەرکەوتنی ڕەها بەسەر دوژمن و لەناوبردنی هێزە بنەڕەتیەکەی پێش دەست پێکردنی جەنگی ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا.

کیسنجەر وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەمریکا، سەرۆکی وڵاتەکەی لە مەترسی پاشەکشێ لە ڤێتنام ئاگادار دەکاتەوە لە نوسینێکیدا کە بۆی دەنێرێت لە ڕۆژی (١٠ سێبتەمبەری ساڵی ١٩٦٩) دەڵێت: (بەڕێز سەرۆك تۆ دەزانیت، کە ئەمریکیەکان زۆر حەزیان لە پاقلەی سودانیە، هەرکات لە ڤێتنام پاشەکشەمان کرد سەرباز دوای سەرباز،ئەوە وەك ئەوە وایە دانە دوای دانە پاقلەی سودانیان پێشکەش بکەین، کە هەتا زیاتریان بدەینێ داوای زیاترمان لێ دەکەن ).کیسنجەر وەك چۆن نیکسۆنی لە مەترسی کشانەوە لە ڤێتنام ئاگادارکردەوە، بەهەمان شێوەش (بۆش و جێگرە) کەی ئاگادارکردەوە لە هەڵەی پاشەکشێ. ئەو لە ساڵی (٢٠٠٧) ز سەردانی کۆشکی سپی

کردوو وێنەیەك لەو وتارەی کە بۆ سەرۆك نیکسۆنی نوسی بوو دا بە یەکێك لە یاریدەدەرەکانی سەرۆك بوش و ئاگاداریکردەوە لەوەی هەڵەی ڤێتنام لە عێراقدا دووبارە نەکاتەوە.

هەندێك لە توێژەران وایدەبینن کە ئەوەناگونجێت و ناکرێت بۆ ئەمریکایەك کەلەسەر توندو تیژی و تیرۆرو جەنگ دامەزراوە، و هێزی خۆی بە خوێن و سەپاندنی بڕیارەکانی بە هێزکردووە، لە میانەی دروستکردنی جەنگ و داگیرکردنی زەوی ئەوانی ترو تاڵانکردنی سەروەت و سامانیان و دەست گرتنی بەسەر جیهاندا. ئەمە لە سەردەمی سەرۆك (ئەبراهام لیکۆلن) کە باکور و باشوری بە زەبری تفەنگ یەك خست، تا سەردەمی (بۆش) ی کوڕ درێژەی کێشا کە عێراقی داگیرکرد بە بێ هیچ ڕوکەشێکی یاسای یان شەرعی یان نێودەوڵەتی.

لە کاتی لە دایك بوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە ستراتیژیەتی ئەمریکی لەسەر دوو پێوەری بنەڕەتی وەستاوە :

یەکەم:خۆگێل کردن لە ڕابردوو بەسەرجەم پێشینەکانیەوە و خۆدابڕاندن لە مێژوو، جیابوونەوە لەسەرجەم سەرگوزشتەکانی. وەك هەوڵدانێك بەدوای جوگرافیایەکی فراوانتردا، ئەم لێکدابڕانەش لە میانەی خۆگێل کردن دەبێت لە هەر باس و خواسێکی گەرم کە پەیوەندی ڕابردوو مێژووەوە هەبێت.

دووەم:پێوەرەکانی قازانج و زیان :ئەم پێوەرانە لەلایەن ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکیەوە پشتگیری ئەکرێن. تا ئەمریکا ببێتە بە هێزترین دەوڵەت لەسەر ئاستی جیهانداو دەستی بەسەر ماڵ و سامان و ویستی گەلاندا بڕوات.

لە ساڵی (١٩٩٢) ز لەسەردەمی سەرۆك (بیل کلینتۆن) دا بەڵگەنامەیەکی نهێنی گرنگ ئاشکرا بوو کە تیایدا هاتووە (پێویستە لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بە جدی کاربکات، تا دڵنیا بێت لەوەی هیچ هێزێکی ڕکەبەری یان دۆستی، لە هیچ شوێنێکی جیهاندا دروست نابێت کە هێزو توانای هاوسەنگی هێزو توانای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێت ).

له پێوەری یەکەمدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵی چاو پۆشی لە مێژووی میراتی شارستانیەتی گەلان و خۆگێلکردن لە مێژووە دەدات و هەوڵی سەپاندنی جۆرێکی ڕۆشنبیری نوێ دەدات، کە دابڕاو بێت لە گیانی مێژووی. بۆ ئەمەش پشت دەبەستێت بە هۆکار و دروشم بە قۆستنەوەی سۆزی مرۆیی بۆ ئازادی و دیموکراسی و وەبەرهێنانی کێشەو نەهامەتیەکانی لە ستەم و زۆرداری، بۆ تێپەڕاندنی یان سەپاندنی ڕۆشنبیریەك کەوەلامدەرەوەی هەست و سۆزەکانی بێت.

پێوەری دووەم بریتیە لەو ستراتیژیەتە ئەمریکییەی کە سازش دەکات لە هەموو شتێك، تەنانەت شکۆی سەربازیش لە بەردەم پێوەری قازانج و زەرەردا.

لە ڤێتنام سەرۆك (ڕیچارد نیکسۆن) فەرمانیدا بە پاشەکشێ ی هێزەکان ولاتەکەی لە ڤێتنامی باشور، دوای ئەوەی زیانێکی گەورەیان بەرکەوت لە هێرشی بەناوبانگی (تیت) لە نێو جەرگەی (سایگۆن) ی پایتەختی ڤێتنامی باشور.

لە سەردەمی سەرۆك (ڕۆناڵد ڕێگان)یشدا هێزی مارینزی ئەمریکی لە ولاتی لوبنان پاشەکشەیانکرد، کاتێك زۆرینەیان لەیەك تەقینەوەدا کوژران.

هەمان شتیش ڕوویدایەوە لەسەردەمی (بیل کلینتۆن) کاتێك ژەنەڕاڵ (محمد عیدی) لە گەمارۆیەکی نهێنیدا لە (مەقادیشۆ) ی پایتەختی سۆماڵ توانی زۆرینەی مارینزە ئەمریکیەکان لەناو ببات. دوای ئەوەی سەربازە ئەمریکیەکانی کوشت دەستیکرد بەسەر برینیان و لە نێو سوکایەتیەکی زۆردا لە گۆڕەپانەکانی مەقادیشۆی پایتەخت وەك تۆپ شەقیان لەسەری سەربازە ئەمریکیەکان هەڵدەدا.

لێرەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چووە نێو زنجیرەیەك لە جەنگ و کوشتارەوە. بۆ هەموو جەنگێکیش کە ئەنجامی دەدا بیانوی بۆ دەهێنایەوە و بەرگێکی ڕاگەیاندن و لۆجستی بۆ دروستدەکرد و ڕەنگی جەنگەکەی پێدەکرد.

هەموو جەنگێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، کە جیاوازە یان پەیوەندی بە هەندێکی تریانەوە هەیە، لە مەبەست و ئامانج و تەکنیك و پلانە جەنگیەکانەوە چەندیەتی و چۆنیەتیەوە. ئەمانەش هەموو پشت دەبەستن بەو ئامانجانەی کە پسپۆڕە سەربازیەکان و

ڕاوێژکارە تایبەتیەکان ئامادەی دەکەن، ئەم کەسە تایبەتمەندانەش لەلایەن سەرکردە بالآکانی نێو کۆشکی سپیەوە هەڵدەبژێردرێن، ئەمە سەرەڕای ئەو پلان و بیروڕایانەی کە گەورە بەرپرسانی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکیەوە لەو بارەیەوە دەیدەن. لەوانەش:—

١—زۆرینەی ئەو جەنگانەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداری تێدا کردووە، جەنگانێك بوون کە لە ژێر ئەو جۆرە پێشەکیانەدا بوون کە ئاماژەمان پێدان.

لە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا ئەو دەوڵەتە مەزنە پەلەی نەکرد لە چوونە نێو جەنگەکەوە، وەك چۆن مێژوو نوسان باسیدەکەن، کە ئەو پەلەی نەکردووەو چاوەڕێ ی دەرئەنجامەکانی جەنگەکەی کردووە تا بەگوێرەی پێوەری قازانج و زیان هەڵیبسەنگێنێت.

وەك چۆن هەندێك لە مێژوونوسان لەو باوەڕەدان، کە کاتێك ساڵی (١٩٤١) چووە نێو جەنگی جیهانی دووەمەوە، لە پێناو دابەشکردنی زیان و قازانج بوو لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا و، وەبەرهێنانی ئەو سەرکەوتنە بوو لە پێناو بەرژەوەندی دەستەلآتی و دەست ڕۆیشتووی خۆی بە کەمترین زیان، دوای دەرکەوتنی ئاسۆکانی سەرکەوتن لە جەنگەدا.

ئەوەی ئەم جەنگەی ئەمریکا لە جەنگەکانی تری جیادەکاتەوە، بەکار هێنانی چەکی ئەتۆمی و وێرانکردنی شاری (هێرۆشیمای ) ژاپۆنی بوو. شیکەرەو سەربازیەکان لەو باوەڕەدان کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیتوانی بە چەکی کلاسیکیش سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لەو جەنگەدا، بەلآم ئەوەی نەکردو پەنای بردە بەر چەکی ئەتۆمی لە پێناو ترساندنی جیهان بەگشتی و یەکێتی سۆڤیەت بە تایبەتی، کە وەك هێزێکی مەزن دەرکەوت بوو لە بەردەم فراوان خوازیەکانی ئەمریکادا.

٢— بە درێژای زیاتر لە نیو سەدە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمریکا، ممارەسەی جەنگ و توندو تیژی دەکرد بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.بۆ نموونە لە ئەفغانستان لە

کاتی داگیرکدنی ئەو ولاَتە لەلایەن رووسەکانەوە، ئەمریکا ئەوانەی پرچەك کرد کە ئێستا بە توندڕەو ناویان دەبات، لە پێناو دژایەتی کردنی یەکێتی سۆڤیەت، کە دواجار بووە هۆی شکستی رووسەکان وەرگرتنی دەستەلاَت لە ئەفغانستان لەلایەن (تالیبان) ەوە. دواتر جادووەکە بەسەر جادووگەرەکەدا هەلگەڕایەوەو، ئەفغانستان بووبە نموونەیەك بۆ بیٚ سەروبەرەی کارەکانی ئەمریکا، بە شێوەیەك کە توندو تیژی و کوشتار و ئاشوب تا ئێستاش باڵی بەسەر ئەو ولاَتەدا کێشاوە، ئەمریکاش تا ئێستا لە دژی هاوپەیمانە کلاسیکەکەی دەجەنگێت، لە ژێر دروشمی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆرو بلاَوکردنەوەی ئازادی و دیموکراسی، دوای دانانی حکومەتێکی دۆست و لایەنگری خۆی وەك چۆن پێشتر لە ڤێتنام کردی.

٣–لە سەردەمی سەرۆك (هاری ترومان ) ئەمریکا سیٚ جەنگی وێرانکەری پەرپاکرد لەگەلٚ هەریەکە لە کۆریا و ژاپۆن و ئێران، هەر سیٚ جەنگەکەش بەسەرکردایەتی ژەنەڕالی ئەمریکی ڕق ئەستور(ڤان فلیت ) بوون. لە سەردەمی سەرۆك (جۆن کەنەدی) یش ئەمریکا لە (دورگەی بەرازەکان) لە دژی کوبا جەنگێکی تری هەلگیساندا، کە خەریك بوو سەر بکێشێت بۆ دروست بوونی جەنگێکی ئەتۆمی لەگەلٚ یەکێتی سۆڤیەتدا.

لەلایەکی تریشەوە هەمان فشاری سەربازی دژی ڤێتنام بەکار هێناو دواجار سەری کێشا بۆ جەنگی ڤێتنام. بە خوێندنەوەیەکی خێرای تۆماری سەرۆکی ئەمریکی (لیندۆ جونسۆن) بۆمان دەردەکەوێت کە جەنگی ڤێتنامی گەیاندە کۆتای و بە دەستی ئەنقەست هێرشیکردە سەر ڤێتنامی باکور. جۆنسۆن دادەنرێت بە ئەندازیاری جەنگی رۆژهەلاَتی ناوەڕاست لە سالّی (١٩٦٧) ز کاتێك دەولّەتەکەی سەرکردایەیی ئەو جولاَنەوەی کرد لە جەنگی دژی عەرەب و بەرهەلّستکاری فراوانخوازیەکانی زایۆنیزمی، لە هەلّێکیدا بۆ لەبار بردن و شکست پێهێنانی فراوان بوونی شۆڕشی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی بەسەرکردایەتی (جمال عبدالناصر).

ریچارد نیکسۆنیش دەستی درێژ بوو لە فراوانکردنی چوارچێوەی جەنگی ڤێتنام و گەیاندنی بە هەریەکە لە ولأتانی (لاوس و کەمبۆدیا ). لە سەردەمی ئەم سەرۆکەدا، کاتێك (هنری کیسنجەر ) وەزیری دەرەوەی بوو ئەمریکا خەریکی جەنگ کردن بوو لە ئەفریقا و ئەمریکای لاتینی لە هەڵێکیدا بۆ رووخاندنی حکومەتی شەرعی ولأتی (چیللی ).
هەر ئەم وەزیرە دەرەوەیە جەنگی ساڵی (١٩٧٢)ز لە دژی عەرەب بەڕێوەدەبرد.
پێشوەستانی جەنگەکە سەرۆك ئەنوەر سادات نامەیەکی بۆ دەنێرێت و دەنوسێت:(من دەتوانم جەنگی ئیسرائیل بکەم،بەلأم ناتوانم جەنگی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەم ).
کاتێکیش (جۆرج بۆشی باوك) بوویە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە ژێر دروشمی ئازادی (کوێت) دا جەنگی دووەمی کەنداوی هەڵگیساند.

٤- جۆرج بۆشی کوڕ، ڕوخاندنی ڕژێمەکی (صدام حسین ) ی کردە ئامانج، لە ژێر بیانووی بوونی چەکی کۆمەڵ کوژ، و توانیشی کۆنگرێسی ئەمریکی ڕازی بکات بە بیانووە بەتاڵەکەی. هێزە سەربازیەکانی ناردە عێراق لە ژێر ناونیشانی ئازادکردنی عێراق و بلأوکردنەوەی ئازادی و دیموکراسی. بەلأم لە ڕاستیدا وشك و تەڕی پێکەوە سوتاند و، تا ئێستاش بە بەردەوامی بە زەوی و گەلیەوە دەناڵێنێت لە ژێر زۆرداری داگیرکەردا (ئەمە کاتێك نوسراوە کە هێزەکانی ئەمریکا لە عێراقدا نەکشابوونەوە -وەرگێڕ-).
وا دەردەکەوێت کە بۆش ویستبێتی بە تەنها خۆی تۆڵە لە صدام بکاتەوە بۆ ئەو مەبەستەش هەوڵی ڕازیکردنی نەتەوە یەکگرتووەکانی دا تا ئەو هەوڵە تایبەتیەی پێ دا بپۆشێ، بەلأم شکستی هێناو، عێراقی داگیرکرد، سەرەڕای دژایەتی کردنی هەندێك لە هاوپەیمانەکانی. ئێستا ئەو جەنگە فتیلەکانی ئاژاوەیەکی تائیفی داگیساندووە و خاپورکردنی ژێرخانی ئابوری لێکەوتۆتەوە. ئەمریکاش لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەیەکە کە بەهۆیەوە پارێزگاری لە ئابڕوچوونەکەی بکات. ،لە میانەی پێشنیاری هەڵبژاردنی دیموکراسی و بەرژەوەندی نیشتمانی دان نان بە هەندێك هەڵەی داگیرکردن و گۆڕانی

هەندێك یەكەی ستراتیژی ئەمریكی و جێ گۆڕكێ پێكردنی ژمارەیەك سەركردەی سەربازی مەیدانی و زیادكردنی مارینزی ئەمریكی لەسەر خاكی عێراق، ئەمە هەمووی لە كەشێكی خراپی گەندەڵی دارای و ئیداری بەربلاودا لە عێراق.

تا ئێستاش بە بەردەوامی ئەمریكا هەوڵی شاردنەوەی ڕاستی زیانە گیانی و داراییەكانی ئەو جەنگەدەدات، دوای ئەوەی ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر جیاوازیەكانی نێو كۆمەڵگەی ئەمریكی و، دەست پێكردنی فشارەكانی پارتی دیموكراتی بۆ سەر جۆرج بۆش لە پێناو كشانەوەی خێرای هێزەكای ئەمریكی لە عێراق.

ئەوەی كە جێگەی سەرنجە ئەو ئاماژەكردنەیە بە كۆتای هاتنی ماوەی سەرۆكایەتی بۆش و دەرچوون لە كێشەی عێراق، وەك چۆن ئەمریكیەكان باسیدەكەن، هیچ نیە جگە لە قەیرانێكی خنكێنەر نەبێت كە بوونی هێزی بیانی لە عێراقدا ڕادەماڵێت و، ئەمریكیەكانیش وەك ئازارشكێنێك بەكاری دەهێنن بۆ هەڵمژینی توڕەی گەلی ئەمریكی و هێوركردنەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی.

٥-ستراتیژیەتی كودەتا ناوخۆیەكان :-

ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وەك یەكێك لە هۆكارەكانی سەپاندنی دەستەڵاتی پەنای بردووەتە بەر ئەنجامدانی كودەتا ناوخۆیەكانی وڵاتان، بۆ لابردنی ئەو حكومەتانەی كە ڕازی نەدەبوون بە داگیركاری و، شوێنی مەرام و ستراتیژەكانی ئەمریكیەكان نەدەكەوتن و كەسانی نیشتمان پەروەر سەركردایەتیان دەكردن كە شوێنكەوتن و بالادەستی ئیمپریالیزمی جیهانیان ڕەد دەكردەوە.

تا لە ڕێگەی ئەم كودەتایانەوە ئەم جۆرە كەسانە لاببات و كە سانێك لە شوێن ئەوان دابنێ كە خۆشەویستی و گوێڕایەڵیان بۆ ئەمریكیەكان تێدا بێت، وەك ئەوەی لە وڵاتی (گواتیمالا) ڕویدا بە ڕوخاندنی حكومەتەكەی (ئەربیتز) و، ئەوەی لە ئێران ڕویدا بە لادانی حكومەتەكەی (مصدق).

هەندێك لە شیکەرەوە سیاسیەکان سەرۆکی ئەمریکی (ئەیزن هاوەر) بە خاوەنی تیۆری کودەتا ناوخۆییەکان دەزانن، بۆیە لەسەردەمی وەزیرەکەی دەرەوەیدا (هنری کیسنجەر) چەند کودەتایەکی ناوخۆی لە ئەفریقاو ئەمریکای لاتینی بەڕێوە بردووە. پێش ڕوخاندنی ڕژێمەکەی (صدام) یش ئەمریکا پلانی هەبووە بۆ ڕوخاندنی حکومەتەکەی (صدام حسێن) یش.

٦- ستراتیژیەتی کوشتن و تیرۆری تایبەتی :-

ستراتیژیەتی ئەمریکا پەنای بردە بەر زنجیرەیەك لە تیرۆری تایبەتی سەرکردەی وڵاتان و نیشتمان پەروەرە دیارەکان، لە پێناو ڕزگار بوون لە دوژمنایەتیان، وەك تیرۆرکردنی ژمارەیەك نیشتمان پەروەری دیار لە سەر ئاستی جیهان، ئەو جۆرە کەسانەی کە باوەڕیان بە بنەماو پرەنسیپەکانی ئازادی و ڕزگاریخوازی و شۆڕشگێڕی هەبوو. ئیسرائیلیەکانیش ئەوەیان لە ئەمریکیەکانەوە وەرگرت، و پشتیان بە لەناو بردنی جەستەی بەست وەك ڕێگەیەك بۆ سەپاندنی بڕیارەکانیان و باڵادەستی خۆیان.

مێژوو پێمان دەڵێت کە سەرۆکی ئەمریکی (جۆن کەنەدی) فەرمانیکردووە بە دەستگیرکردنی سەرۆك کۆماری ڤێتنامی باشور و کوشتنی لە ساڵی (١٩٦٣) ز هەروەها سەرۆکی ئەمریکی (ڕیچارد نیکسۆن) فەرمانیداوە بە کوشتنی (لیندی ) سەرۆکی شەرعی وڵاتی (چیللی ) لە ئەمریکای لاتینی. بەڵگەنامەی نهێنی هەیە کە شیکەرەوە سیاسیەکان ئاشکرای دەکەن ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی، پلانی هەبووە بۆ تیرۆرکردنی (جمال عبالناصر) بە فەرمانی ڕاستەوخۆی سەرۆکی ئەمریکی (ئەیزن هاوەر) لە بەر بوونی بە کەسێکی جەماوەری نیشتمانی ڕزگاریخواز.

هەندیك لە مێژونوسان لەو بارەیەوە دەڵێن: هەر لە ساڵی (١٩٧٤) ز یاسای ئەمریکی دەستەڵاتیداوە بە سەرۆکی وڵات بۆ تیرۆرکردنی هەر سەرۆکی وڵاتێك، یان هەر کەسێکی نیشتمان پەروەر لە جیهاندا، ئەگەر لەسەری ساغ بوویەوە کە دوژمنایەتی ئیمپریالیزمی

جیهانی دەکات، یان بۆخۆی هەڵگری هەستێکی نیشتمانی و شۆڕشگێڕی و ڕزگاری خوازیە.

جگە لە سەرۆکی ئەمریکی (جیراڵد فۆرد ) کە وازی لەو پرۆگرامە تیرۆریسیە هێنا، بە پشت بەستن بە چەند هۆکارێکی تری تیرۆریستی، کە هەمان ئەو شتانەی کە ستراتیژیەتی ئەمریکی دەیویست دەی هێنایەدی، ئیتر هەموو سەرۆکەکانی تر کە چوونە کۆشکی سپی ئەو سیاسەتەیان پەیڕەوی دەکرد،لە ڕێگەی تیرۆری لە ناوبردنی جەستەییەوە، بە پشت بەستن بە بیرو بۆچون و زانیاریەکانی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی، یان بە گوێرەی پێشهاتە نوێ یەکانی سەر گۆڕەپانەکە، کە پێویستیان بە بەکارهێنانی ڕێگەیەکی تر هەبوو بێت، بەلآم بە مەرجێك هەمان ئەنجامی بەدەست هێنا بێت. بەکورتی هەرچۆنێك بێت کۆدەنگیەکی ئەمریکی هەیە لەسەر تیرۆری جەستەی.

کۆتا زنجیرە لە زنجیرەکانی تیرۆری تایبەت کە کۆتاش نیە، ئەوە بوو کە هۆگۆ چاڤێزی سەرۆکی فەنزوێلا باسی لێوە کرد لە ڕێگەی ئاژانسی هەواڵی (ئەشیۆ شێتت پرێس)، بەوەی کە دەزگای هەواڵگری ئەمریکی (سی، ئای،ئەی) پلانیان بۆ داناوە بۆ تیرۆرکردنی. هەوڵی تیرۆرکردنەکەو دانانی (جۆن نیگرۆ پۆنتی ) بە جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (کۆندۆ لیزا ڕایس) کە پێشتر لە پۆستی بەڕێوەبەری ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکی کاری کرد بوو، بەیەکەوە گرێدراون.

فەنزوێلا (نیگرۆ پۆنتی ) بەوە تاوانبار دەکرد کاتێك لە ساڵی (١٩٨١–١٩٨٥) باڵوێزی وڵاتەکەی بووە لە (هیندۆراس) ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لەو جەنگەی کە هێزەکانی (کۆنترا) ی بەرهەڵستکار لە دژی حکومەتە چەپڕەوەکەی (ساندستین) بەرپایانکرد.

شتراتیژیەتی ئەمریکی هەمیشە پەنای دەبردە بەر ڕوپۆشکردنی ڕاگەیاندن، لە چوارچێوەیەکدا کە هاکارو هەماهەنگ بێت لەگەڵ جوڵەی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی، وەك هەوڵێك بۆ دروستکردنی جۆرێك لە ڕۆشنبیری و بیروڕا کە بیانوبدات بە جەنگ و داگیرکاری.

بەڵام لەڕاستیدا هەمیشە ئەم جۆرە هەوڵانەی ئەمریکا بە خێرا ئاشکرا دەبوون و روون دەبوونەوە بۆ ڕای گشتی. بۆ نموونە سەرۆکی ئەمریکی (جۆنسۆن) پاساوی هێرشکرنە سەر ڤێتنامی بە بوونی بەڵگەیەك دایەوە، کە گوایا دەستدرێژی کراوەتە سەر گەشتی گەلی ئەمریکی لە کەنداوی (تونکین) بەڵام دواتر کۆنگرێس ئەمریکاخۆی دانی بە ناڕاستی ئەو بەڵگەیەدانا.

جۆرج بۆشی باوکیش لە دواین ڕۆژەکانی دەستەڵاتیدا، فەرمانی بە داگیرکردنی کەناراوەکانی صۆماڵ دا و بەبێ جەنگ داگیریکرد، بە بیانووی یارمەتیدانی مرۆی.

ئەمریکا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بە بیانوی ئازادی و، لە دووەمیشدا بە بیانوی بەرەنگاربونەوەی نازیەت بەشداریکرد لە جەنگەکەدا کرد. لە کۆریاش ئەمریکیەکان جەنگیان لە ژێرئاڵای نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەکرد، دواجاریش عێراقی داگیرکرد بە بیانوی بوونی چەکی کۆمەڵ کوژ، کە کۆنگرێسی ئەمریکا بۆخۆی ئەوەی بەدرۆ خستەوە، بەڵام دوای ئەوەی کارلەکار ترازا. بە بازدانێك کە (بۆش) کردی بە بێ مۆڵەتی نەتەوەیەکگرتووەکان و ناڕەزایەتی ژمارەیەك لە هاوپەیمانەکانی. لە ڕووی مێژوویەوە ئەوە سەلمێنرا کە ئەو زانیاریە هەواڵگریانەی بۆش پشتی پێ بەستن لە داگیرکردنی عێراقدا، ڕات و دروست نە بوون و لەسەر بنەمایەکی سیاسی و تۆڵە سێنەرە هەڵچنرابوون.

دەگەڕێینەوە بۆ جەنگی سارد لە سەردەمی سەرۆکی ئەمریکی (هاری ترومان) و پێش ئەو جەنگە کەلەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٩) ز زیاتر چڕبویەوە. واتە دوای جەنگی جیهانی دووەم، لە دەرئەنجامی بوونی دوو هێزی گەورە، کە ململانێ یان بوو لە بواری ستراتیژیەت و دەستەڵات و بەرژەوەندی و دیدگای سیاسی.

پێدەچێت ئەم جەنگە جارێکی تر سەرهەڵبداتەوە، لە چوارچێوەی ئەو بیرو گومانانەی کە قەڵغانی موشەکی بەرگری ورووژاندویەتی، کە ئەمریکا بە نیازی جێگیریرکردنیەتی لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا، لەبەر ئەوە لەبەردەم بەرهەڵستیەکی توندی روسیادایە، ئەمە سەرەڕای ئەو لێدوانانەی کە سەرۆکی ئەمریکی (بۆش) و وەزیری دەرەوەی (ڕایس)

داویانە دەربارەی سەرۆکی رووسی(پۆتین ) و ئەو سیاسەتانەی کە گرتویەتیەبەر، بەوەی گوایا لە دیموکراسیەت لایداوە و دەستەلاتی رووسی بەرەو دیکتاتۆریەت هەنگاوی ناوە.

لەوانەیە ئەو گەرانە بۆ جەنگی سارد، دەروازەیەك بێت بۆ گەیاندنی ورچی سپی بە ئاواگەرمەکان و دەرکەوتنی لە سەر گۆرەپانەکە، وەك هێزێکی هاوسەنگ بۆ هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

بەم شێوەیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەولّی تاکرەویدایە لە جیهانداو خەریکی دروستکرنی ئاژاوەو توندوتیژی و دابەشکردنی ولاَتەکانە بەسەر چەند ولاَتێکی بچوکی دژ بەیەکداو، سەپاندنی کۆت و بەندی زیاترە بەسەر ئازادیەکاندا لە ژێر دروشمی دیموکراسیدا. بۆ مانەوەی جێپێ ی خۆی لە دەست بەسەردا گرتنی میمبەری نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەولّەتی، لە پێناو گەمارۆدانی ئەو دەولّەتانەی کە دژی دەستەلاَت و سەرداریەتی ئەمریکین بەسەر جیهاندا.



کینـــــدی بەسیاســــەتە
هەڵــەکانی ڕێگـەی جـەنگی
گرتەبەر , نەیدەزانی بەوەی
کـەدەیکات دەبێتــە هــۆی
ئەوەی کە وڵاتەکـەی تێـوە
بگلێنێت



کینــدی لەگـەڵ جێگرەکـەی
جۆنسۆن , کـەدوای تیرۆرکردنـی
دەســـــەڵاتی وەرگـــــرت و
ئەمەریکیـەکانی نـاردە ڤێتنـام
لــەخراپترین و مەترسـیدارترین
بڕیارەکانی لەمێژووی وڵاتەکەی
و جیهاندا ! !



دیل کراوە ئەمریکییەکان لە ڤێتنام , کە خراپترین تێکشکانی سەربازیی و گەورەترین هێز لە مێژوودا نیشاندەدات , ئەوەش باجی هەڵەکانی نیکسۆن بوو بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن , بەڵام بوو بەکارەسات! ! !





نیکسۆن لەسەر نەخشە پلانی کشانەوەی هێزەکانی لە ڤێتنام دەخاتە ڕوو , دوای داننانی بەشکست و تێکشکاندا! ! !

## 3-هەڵەکەی هیرۆهیتۆ....

## جنۆکەکەی ئامادەکرد، بەڵام شکستی هێنا لە بەکارهێنانیدا!!



کاتێك دوژمنەکەت هەوڵیدا لایەنێکی بەهێز بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بۆ ئەوەی بچێتە پاڵی لە جەنگەکەدا لە دژی تۆ، ئەوە پێویستە لەسەرت ئەوە بگۆڕیت بەبێ ئەوەی بیوروژێنیت، ئەگەرنا پاڵنەرێکی پێشکەش دەکەیت کە بچێتە جەنگێکی وێرانکەرەوە لەگەڵتا، ئەگەر ئەوەشت ئەنجامدا ئەوە (هەڵەی تەمەنت ) ئەنجامداوە ! !

ستراتیژدارێژەرانی ئەمریکا، پێش ڕوداوەکانی (١١ سێبتەمبەر) ی ساڵی ٢٠٠١ز واشنتۆن و نیویۆرك، مێژووی ئەمریکایان دابەشدەکرد بەسەر پێش ڕووداوی (بیرل هاربر) و دوای ڕوداوەکە. هێرشە خۆکوژیەکانی ژاپۆنیەکان بۆ سەر کەشتی گەلی ئەمریکی لە (بیرل هاربر) دادەنرێت بۆ پێشەکیەك نەك تەنها بۆ ئەوەی ئەمریکا بچێتە نێو جەنگی جیهانی دووەم و بۆمبی ئەتۆمی بەکار بهێنێت لە شارێکی ژاپۆنی، بەڵکو ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەو بەرهەم هێنانەوەی جیهان لەسەر پێوەری بەرژەوەندیەکان و دەستەلاتی ئەمریکا.

دوای ڕۆژێك لە (سێشەممەی ڕەش) ی ئەمریکی (کیسنجەر) لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا نوسی: (پێویستە لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەلە بکات، تا ئەو ڕۆژە بکاتە دەستپێکی دەست پێکردنی دەستەلاتی ئەمریکی وەك چۆن لە دوای (بیرل هاربر) ڕویدا ).

لە ڕاستیدا لێدانی بەندەری (بیرل هاربر) یە کێکە لە گەورەترین هەڵە مێژوویەکان، کە دونیای گۆڕی، ئەگەر ئیمپراتۆری ژاپۆن عەقڵی لە دەستنەدابایەو، ڕژێمەکەی بڕیارێکی کارەسات باری لەو شێوەیە نەدابایە و ئەو هەڵەیەی نەکردایە، ئەوە دیاری لەناو چوونی خۆی و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی لە بەرەی میحوەر پێشکەش بە نەیارەکانی نەدەکرد، تا جەنگ بەو شێوەیە کۆتای پێ بێت و خۆی و هاوپەیمانەکانی توشی ئەو شکستە سەرشۆڕکەرە بن.

کاتێك دوژمنەکەت هەوڵیدا لایەنێکی بەهێز بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بۆ ئەوەی بچێتە پاڵی لە جەنگەکەدا لە دژی تۆ، ئەوە پێویستە لەسەرت ئەوە بگۆڕیت بەبێ ئەوەی بیوروژێنیت، ئەگەرنا پاڵنەرێکی پێشکەش دەکەیت کە بچێتە جەنگێکی وێرانکەرەوە لەگەڵتا، ئەگەر ئەوەشت ئەنجامدا ئەوە (هەڵەی تەمەنت ) ئەنجامداوە ! !

ستراتیژدارێژەرانی ئەمریکا، پێش ڕوداوەکانی (١١ سێبتەمبەر) ی ساڵی ٢٠٠١ز واشنتۆن و نیویۆرك، مێژووی ئەمریکایان دابەشدەکرد بەسەر پێش ڕووداوی (بێرل هاربر) و دوای ڕوداوەکە. هێرشە خۆکوژیەکانی ژاپۆنیەکان بۆ سەر کەشتی گەلی ئەمریکی لە (بێرل هاربر) دادەنرێت بۆ پێشەکیەك نەك تەنها بۆ ئەوەی ئەمریکا بچێتە نێو جەنگی جیهانی دووەم و بۆمبی ئەتۆمی بەکار بهێنێت لە شارێکی ژاپۆنی، بەڵکو ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەو بەرهەم هێنانەوەی جیهان لەسەر پێوەری بەرژەوەندیەکان و دەستەلاتی ئەمریکا.

دوای ڕۆژێك لە (سێشەممەی ڕەش) ی ئەمریکی (کیسنجەر) لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا نوسی: (پێویستە لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەلە بکات، تا ئەو ڕۆژە بکاتە دەستپێکی دەست پێکردنی دەستەلاتی ئەمریکی وەك چۆن لە دوای (بێرل هاربر) ڕویدا ).

لە ڕاستیدا لێدانی بەندەری (بێرل هاربر) یە کێکە لە گەورەترین هەڵە مێژوویەکان، کە دونیای گۆڕی، ئەگەر ئیمپراتۆری ژاپۆن عەقڵی لە دەستنەدابایەو، ڕژێمەکەی بڕیارێکی کارەسات باری لەو شێوەیە نەدابایە و ئەو هەڵەیەی نەکردایە، ئەوە دیاری لەناو چوونی خۆی و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی لە بەرەی میحوەر پێشکەش بە نەیارەکانی نەدەکرد، تا جەنگ بەو شێوەیە کۆتای پێ بێت و خۆی و هاوپەیمانەکانی توشی ئەو شکستە سەرشۆڕکەرە بن.

پێش ئەوەی باس لە وردەكاریەكانی هێرشی كارەساتباری سەر (بیرل هاربر) بكەین، لەسەر بارودۆخی پێش هێرشەكە دەوەستین، لەسەر ئەو پێ هەڵخلیسكانانەی ئەو ڕووبەڕوو بوونەوە خوێناویەی نێوان ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاو ژاپۆن، كە بە لێدانی دووەم بۆمبی ئەتۆمی و خۆبەدەستەوەدان و سەرشۆڕكردنی ئیمپراتۆریەتەكەی كۆتای هات وەك نرخی ئەو هەڵەگەورەیەیی كە ئەنجامیدا!!

لە سێبتەمبەری ساڵی (١٩٤٠) ز ژاپۆن لەگەڵ هەریەكە لە ئەڵمانیا و ئیتالیا ڕێكەوتنامەی واژۆكرد، كە بە پێی ئەو ڕێكەتنامانە هەریەكەیان سەرجەم یارمەتیە سەربازی و سیاسی و ئابوریەكانی پێشكەشی ئەوی تر دەكات، ئەگەر هەر دەوڵەتێكی بەشدار نەبوو لە جەنگی ئەوروپی یان ململانێ ی چینی ژاپۆنی هێرش بكاتە سەر هەر لایەكیان. مەبەستی سەرەكی لەم ڕێكەتننامانە،ئاگاداركردنەوەی ئەمریكابوو لە ئەگەری یارمەتیدانی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەكان. لە هەمانكاتدا ئەو ڕێكەتنامەیە كە لەگەڵ ئەڵمانیادا واژۆی كرد بوو، ئەوەی پێویست نەكرد بوو لەسەر ژاپۆن، كە هاوكاری ئەڵمانیا بكات لە كاتێكدا ئەگەر هێرش بكاتە سەر یەكێتی سۆڤیەت.

لە ئەپریلی ساڵی (١٩٤١)ز ژاپۆن و ڕووسەكان ڕێكەتننامەیەكیان واژۆكرد، كە بە پێی ڕێكەوتنەكە دەبوایە هەریەكەیان بێ لایەن بێت ئەگەر هەر دەوڵەتێكیان چووە جەنگێكی ترەوە دژی هەر وڵاتێكی تر. بەم شێوەیە ژاپۆن ناچار نەبوو دەستی یارمەتی ڕاستەوخۆ درێژبكات بۆ ئەڵمانیا لە كردە سەربازیەكانی كە لە مانگی یۆنیۆی ساڵی (١٩٤١) ز دەستی پێكرد بوون. لەگەڵ ئەوەشدا دوای شەش مانگ لەو بەروارە، یارمەتی ناڕاستەخۆی پێشكەش بە ئەڵمانەكان كرد كاتێك هێرشەكانی بۆ سەر موڵكەكانی بەریتانی و ئەمریكیەكان لە زەریای هادی دەست پێكرد و سەرقاڵی كردن لەوەی كە دەستی یارمەتی كاریگەر بۆ یەكێتی سۆڤیەت درێژبكەن.

لە ڕاستیدا تەماع و فراوانخوازیەكانی ژاپۆنیەكان زیاتر بوو لە كاتی هەڵگیرسانی جەنگ لە ئەوروپا، كەوتنی هۆڵنداو فەرەنساو هیلاك بوونی بەریتانیا لە گۆڕەپانەكانی ئەوروپا و

حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست، هانی ژاپۆنیەکانیدا تا دەستیان لەسەر موڵکەکانی فەرەنسیەکان و هۆڵندیەکان و ئیتالیەکان دابنێت لە زەریای هێمندا.

لە مانگی یۆنیۆی ساڵی (١٩٤٠) ز حکومەتی ژاپۆنی کاریدەکرد لەسەر بەدەست هێنانی مافی تایبەت لە نیمچە دورگەی هیندی چینی حکومەتەکەی (فیشی ) ناچارکرد کە بنکەی ئاسمانی بداتێ لە (تونکین). چاوچنۆکی ژاپۆنیەکان لەو ئاستەشدا نەوەستاو ژمارەیەك لە هێزەکانی لە زەویەکانی هیندی چینی و دابەزاند دەستیکرد بە جوڵەکردن بە ئاڕاستەی (بۆرما) و موڵکەکانی هۆڵندیەکان لە ئەندۆنیسیاو بنکەی دەریایی بەریتانی لە سەنگا فورە.

ئەو جموجوڵەی هێزەکانی ژاپۆنی بووە هۆی بێزارکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە هەر لەساڵی (١٩٣١) ز بەربەرەکانێ ی تەماعەکانی ژاپۆنیەکانی دەکرد، دەستیکرد بە یارمەتیدانی ئەوەی لە توانایدا هەبوو بۆ حکومەتەکەی (تشانج کای شیك) لە (چین)، بە تایبەتی کاتێك ڕووبەڕووی دوژمنکاری ژاپۆنیەکان بوویەوە لە ساڵی (١٩٣٧) ز.

بەڵام دوو دڵ بوو لە هەڵگرتنی هەنگاوی کاریگەر بۆ یارمەتیدانی هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانی، بە شێوەیەك کە وەڵامی پێشنیارەکانی حکومەتی بەریتانیای نەدایەوە بۆ ناردنی کەشتی گەلی ئەمریکی بۆ سەنگافورە تەنها ڕێگەی فشاری بەکار هێنا، وەك پچڕاندنی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ژاپۆن و بلۆك کردنی دارایەکانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەم سیاسەتە هیچ جۆرە لەمپەرێکی بۆ بڕیاری ژاپۆنیەکان دانەنا لە جێ بەجێکردنی پلانەکەیان کە دایان نابوو بۆ دەرکردنی ئەوروپیەکان لە ڕۆژهەڵاتی دوور.

پەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی نێوان هەردوو حکومەتی ئەمریکی و ژاپۆنی تا سەرەتاکانی ساڵە (١٩٤١) درێژەیان هەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا دانوسانێکی نەزۆکی بێ بەرهەم بوو،و هەردوولا متمانەیان بەیەکتر نەبوو بەرژەوەندیەکانیان بە درێژای هێڵەکە لە دژی یەکتر بوون.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێداگربوو لەسەر گەڕانەوەی سیاسەتی دەرگای کراوە لە (چین) و گەڕانەوەی کاروبار لە ڕۆژهەلاتی دوور بۆ ئەو هەلوێستەی کە پێش کارەساتی سالی (١٩٣٦) لە ناوچەکەدا هەبووە، ژاپۆنیەکانیش سوربوون لەسەر فراوانخوازیەکانیان لە ناوچەکەدا.

لە مانگی مارسی سالی (١٩٤١) ز سەرۆکی ئەمریکی ڕۆزفێلد بە بالوێزی ژاپۆنی ڕاگەیاندبوو کە سەرۆك وەزیرانی ژاپۆن ناردبووی بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی هاوبەش لە نێوان هەردوو دەولەتدا (هەستان بە هەر دوژمن کاریەکی نوێ وا لە ئەمریکا دەکات بچێتە جەنگەکەوە لە دژی ژاپۆن )

ئەم هەڕەشەیە هیچ جۆرە دەنگدانەوەیەکی لای ژاپۆنیەکان دروست نەکرد، بە پێی تێگەیشتنی هەلەی خۆیان ئەوەیان بە هەلێکی باش دەزانی بۆ ئەوەی بە تاکڕەوی خۆیان کاربکەن لە ڕۆژهەلاتی دوور دا، بەلام ئەم بڕیارەیان بەرگری لەوە نەکرد کە شاندی ژاپۆنی بەردەوام نەبێت لە گفتوگۆکانی لە واشنتۆن، بە مەبەستی لابردنی لەمپەرەکانی ئەگەری پێکدادانی هەردوو دەولەتەکە. بەلام دواجار نەگەیشتە مانگی ئۆکتۆبەر ژاپۆنیەکان هەموو ناوچەکانی هندی چینیان هەل لوشی واتە دەستیان بەسەردا گرت.

لە کاتێکدا هێشتا شاندی ژاپۆنی لە دانوستاندا بوون لەگەل ئەمریکیەکان، کتوپڕ لە یەکێکەلە بەیانیەکانی سالی (١٩٤١) کەشتی گەلە فڕۆکە هەلگرەکانی ئەمریکا لە بنکەی مەزنی دەریای (بیرل هاربر) لە دوورگەی (هاوای) بە دەنگی بۆردومانی هێرشی ژاپۆنیەکان خەبەریان بوویەوە.

ژاپۆنیەکان گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی کە ڕەگەزو بنەمای کت وپڕو خێرا گرنگترین بنەمای هێرشکردنن، هەروەها ستراتیژیەتی ژاپۆنیەکان لەسەر بنەمای ڕوتاندنەوەی ئەمریکیەکان لە چەك بنیادنرا بوو، ئامانجی پلانەکەشیان تەماعی پەکخستنی هێزەکانی ئەمریکا بوو لە دورگەی هاوای داگیرکردنی باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیا بوو.

هێرشە وێرانکەری فڕۆکە بەریتانیەکان بۆ سەر کەشتی گەلی ئیتالیەکان لە بەندەری (تارانتۆ) هاندەرو سروشێکی باش بوو تا ژاپۆنیەکانیش بیر لە هێرشکردنە سەر بەندەری (بیرل هاربر) بکەنەوە، بە ساڵێك دوای ئەو هێرشە.

سەرکەوتن لە لێدانی یەکەمی هێرشەکاندا بە کارێکی ئێجگار گرنگ ئەژمار دەکرێت. لێرەدا متمانەی ئەدمیراڵی ژاپۆنی (یاماموتو ) چەسپا لە بارەی هێرشەکەیەوە، دوای جێ بەجێکردنی هێرشەکانی فڕۆکە هەڵگرەکانی بەریتانیەوە بۆ سەر ئیتالیەکان، بە تەنها خۆیان لە بۆردوومانکردنی بەندەری (تارانتۆ). بۆیە لە ساڵی پێشتردا لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەنجامدا بوو لەسەر بەندەری تارانتۆی ئیتالی.

یاماموتو گەیشتە ئەو باوەڕەی کە پێویستە پێش ئەوەی دەست بگرێت بەسەر باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیا، پێویستە کەشتی گەلی ئەمریکی لە (بیرل هاربر) لە ناوبەرێت، بۆ ئەم مەبەستە خۆی و سەرکردەکانی تری کەشتی گەلەکەی چەند مانگێگ بە نهێنی ڕاهێنانیان کرد لەسەر بنکەیەکی دورە دەتی ژاپۆنی وەك ئامادەکاری هێرشەکەیان بۆسەر بنکەی (بیرل هاربر) ئەمریکی.

سەرکردە ژاپۆنیەکە پلانی داڕشت بوو بۆ دەست بەسەرداگرتنی نەوت و گواستنەوەی خێرای بۆ ژاپۆن، بەلأم مەترسی گەورە بە نسبەت ئەوانەوە بریتی بوو لە کەشتی گەلی ئەمریکی، ئەو کەشتی گەلەش لە کوێ بوو؟لە بیرل هارربر بوو. لێرەدا پاڵنەری سەرەکی لە بیرل هاربر بریتی بوو هەوڵی لەناوبردنی کەشتی گەلی ئەمریکی بۆ پاراستنی گەنجینەکان نەوت بەبێ هیچ جۆرە حسابێك بۆ لەمپەرەکانی بەردەمی.

یاماموتو دڵنیا بوو لە فڕۆکەکانی هەڵگری موشەکی تۆربید، کە بەتایبەت دروستکرا بوون بۆ ئەوەی لە ئاوی تەنکدا بهاوێژرێن و بتەقنەوە، ژاپۆنیەکان ڕاستەوخۆ ڕاهات بوون لەگەڵ دەریاو کەش و هەوای ساردا، کەشتی گەلی ئەدمیراڵ (ناگومو) سودیان لەو پەردەیە وەرگرت کە تەم و مژو باران بۆی دروست کردبوون و ژێر دەریاییە ژاپۆنیەکانیش لە ژێر ئاوەکەوە دەڕۆشتن و پاسەوانی کەشتی گەلەکەیان دەکرد.

له دیسەمبەری ساڵی (١٩٤١) ز کەشتی گەلی ژاپۆنی بەهێزو خێرایەکی زۆرەوە بەرەو ڕۆژهەڵات کشا، سەرکردەی کەشتی گەلەکە ئەدمیراڵ(ناگومو) لە ڕێ ڕۆشتنیدا پشتی بەو دەریایانە دەبەست کە دوری دەخستنەوە لە چاودێری کەشتی و فرۆکە بیانیەکان. ئەم کەشتی گەلە زەبەلاحە جیاوازیەکی ڕیشەی هەبوو لەگەڵ سەرجەم کەشتی گەلەکانی تری پێشووی خۆی، بەوەی کە لە ناوەڕاستی ئەم کەشتی گەلەدا شەش فڕۆکە هەڵگر دەڕۆشتن کە (٣٦٠) فڕۆکەی جەنگیان هەڵگرت بوو.

توانای ئەم کەشتی گەلە بە شێوەیەکی گشتی و شان بەشانی هێزێکی زۆری فرۆکەکانی توانایەکی وەهای پێ بەخشی بوو کە لە مێژووی هێزی دەریاییدا وێنەی نەبوو. سەرکردە ژاپۆنیەکان توشی سەرلێ شێواوی بوو بوون، ئیمپراتۆری وولات فەرمانی جێ بەجێکردنی هێرشەکەی پێدا بوون، بەوەی کە بەو هێزە شەرکەرە دەتوانن مێژوویەکی نوێ بۆ وڵاتەکەیان بنوسنەوە. بە بەدەست هێنانی سەرکەوتنێکی گەورەو دەستخستنی ناوبانگێکی فراوان، بە جێ بەجێکردنیشی دەنگدانەوەیەکی گەورەی دەبێت. بۆیە لە ماوەی دوو کاتژمێردا فرۆکەکان لەسەر پشتی فڕۆکە هەڵگرەکانەوە دەردەچن بە هاوسەنگیەکی زۆرەوە لە زەریای هێمندا کارەکە جێ بەجێدەکەن، وەك چۆن لە میانەی ئەو ململانێ درێژەی کە بە درێژای هەزاران میل درێژەی کێشا لە زەریادا، فرۆکە هەڵگرەکان بە سەربەرزی لێی دەرچوون و هیچ لایەنێك نەیدەتوانی خۆی بدات لە ململانێ کردن لەگەڵیان.

تێگەیشتنی جێ بەجێکردنی لێدانێکی ئاسمانی گشتگیر کە لە کەشتیەکانەوە دەربچێت تا ئەو کاتەش شتێکی نوێ بوو.

ئەدمیراڵ (ناگومو) بە هیچ شێوەیەك لەو باوەڕەدا نەبوو، کە هێرشیکی لەو جۆرە دەرئەنجامەکانی بە کردەی بچەسپێن. سەرەڕای ئەوەش کە کەشتی گەلەکە ئامادەبوو، بەڵام لە تواناشیدا نەبوو هێرشەکە ڕابگرێت تەنها بە فەرمانێك نەبێت کە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە بۆ ئەدمیراڵ(یاماموتو) نەبێت، کە گەل و ئیمپراتۆی ژاپۆنی بە کەسێکی

زیرەك و دانایان دادەنا لە مێژووی ولاّتەکەیاندا و لە هەمان کاتدا یەکێکیش بوو لە سەرکردە دەگمەنەکانی جیهان لەو کاتەدا.

ئەو ستراتیژیەتەی کە ئەم هێرشەی لەسەر بنیادنرا بوو تا ڕادەیەکی زۆر دانراوی (یاماموتو ) بوو، کە لەو باوەڕەدا بوو دوژمنی سەرەکی ژاپۆن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. پایە بنەڕەتیەکانی ئەو ستراتیژیەتە لەسەر وەشاندنی گورزێکی کاریگەر وەستا بوو بۆ سەر بنکەی هێزی ئاسمانی ئەمریکی لە (بیرل هاربر) لە زەریایی هێمن. کۆکردنەوەی تەواوی هێزی ئاسمانی و فرۆکە هەڵگرەکانی ژاپۆنی بۆ ئەو کردەیە بە تەنها، کە تاقیکردنەوەیەکی وردی لەسەر کرابوو لە میانەی ڕاهێنانێکی چڕوپڕی پێشوتردا.

یاماموتو لەو باوەڕەدا بوو کە تاکە هەلی سەرکەوتن لەبەردەم ژاپۆنیەکاندا لە جەنگەکانی دواتردا بریتییە لەوەی کە یەکەمجار هێرش بکات، ئەو سوربوو لەسەر وەشاندنی زنجیرەیەك هێرشی خێرا لە دژی چەند یەکەیەك لە ئامانجە دیاریکراوەکان، ئومێدی وابوو تائەو کاتەی ئەمریکیەکان هێزەکانیان بنیاد دەنێنەوە، ژاپۆن ببێتە ئیمپراتۆریەتێکی دەریایی مەزن و هێزە بلاّوە بووەکانی لە دورگەکانی زەریای هێمندا بپارێزێت.

ئەوەی کە زیاتر (یاماموتو) ی نیگەران کردبوو، ئەوە بوو کە دەترسا لەوەی کە سەرجەم کەشتیەکانی کەشتی گەلی ئەمریکی لە بەندەری (بیرل هاربر) دا نەبن، یاماموتو ئەوەی دەزانی کە بۆ ئەو کارە پێش هەموو شتێك پێویستە کەشتیە فرۆکە هەڵگرەکانی ئەمریکا تێك بشکێنێت لە بەندەرەکەدا.

لە ڕۆژی (٦ دیسەمبەری ساڵی١٩٤١) ز دانوسانەکان لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا شکستیان هێنا، تۆکیۆ نامەیەکی دوورودرێژی نارد بۆ باڵوێزخانەی ولاّتەکەی لە واشنتۆن و ڕای سپارد بە پێشکەشکردنی نامەکە، کە کۆتاییەکەی بە ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی ئەمریکا کۆتای هات بوو، دواتر لە کاتژمێر یەکی ڕۆژی دواتردا جەنگەکە دەستی پێکرد،

سەرجەم هێزە دەریایەکانی ژاپۆن دەیان زانی کە جەنگ لەبەر دەرگایەو لە ئان و ساتیدایە.

یاماموتو لە بروسکەیەکیدا بۆ کەشتی گەلی ژاپۆنی دەڵێت: (چارەنوسی ئیمپراتۆریەت، بەستراوەتەوە بەو کارەوە، بۆیە پێویستە کەس چروکی نەکات لە قوربانیدان بە خۆی لەو پێناوەدا )

لە٧مانگی دیسەمبەری هەمان ساڵدا، ژاپۆنیەکان هێرشەکانیان لە زەریای هێمن شان بەشانی هێرشێکی تریان لە باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیا لە بەندەری (بیرل هاربر) لە دورگەی هاوای دەست پێکرد. لەو کاتەدا (٣٥٠) فرۆکەی ژاپۆنی سەر کەشتی هەڵگرە ژاپۆنیەکان لە نزیك باکوری دورگەی هاوای هێرشیانکردە سەر بنکەی ئەمریکی بیرل هاربر، ئەمە لە بەرەبەیانێکی زووی ئەو ڕۆژەدا، لەو ڕۆژەدا ئاستی بینین و کەش و هەوا زۆر نمونەی بوو، فرۆکەوانە ژاپۆنیەکان وا هەستیاندەکرد کە دوژمنەکانیان لە کاتی بێ ئاگایدا گرتوون، ئەوەش شتێکی کت و پری تەواو بوو بۆ ئەوان.

بە دەنگێک کە لە دەنگی هەورە بروکە دەچوو کەشتی گەورەی جەنگی (ئەیرزونا) تەقیەوە، دوای ئەوەی کەوتە بەر هێرشی فرۆکە جەنگیەکانی ژاپۆنیەکان، و لە بەشەکانی تری سەکۆی بەندەرەکە دابڕێنرا، ئەوەش سەرەتای شتە چاوەڕوان نەکراوەکە بوو.

تۆپ هاوێژە ژاپۆنیەکان وێستگەی (کانۆهی) ئاسمانی هێزە دەریایەکانی ئەمریکایان بۆردوومانکرد، و تۆپخانەکان و ژمارەیەك فرۆکەی جەنگیش کێلگەی (بیلوز) یشیان بۆردوومان کرد.

یەکێك لە ئەفسەرە ئەمریکیەکان کە لەو کاتەدا لە کێڵگەی بیلوز بوو بەم شێوە ڕوداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت : (ئەفسەر بووم لە بەشی پەیوەندیەکان، لە فەرمانگە چاودێری(٨٦) لە کێڵگەی بیلوزی هەڵکەوتوو لەلای دورگەی (با)، لە حەوتی دیسەمبەر کاتژمێر حەوت ونیوی بەیانی، هەموو ئەو کەسانەی کە لە ناوەندی ئەفسەرە ڕەبەنەکان بوون، بەدەنگی فرۆکەیەکی تێك شکاو بەخەبەر هاتنەوە، فرۆکەیەکی لە

جۆری (ب١٧) لە کۆتای قادرمەکاندا تێك شکا بوو، ترس و بیمێکی زۆری لە نێو دڵی گروپی کاردا خستەوەو هاواریان دەکرد هێرش کراوەتە سەرمان، کاتێك قسەمان لەگەڵ گروپی کاردا دەکرد؟ ،تووشی بۆردوومانی فرۆکە ژاپۆنیەکان دەبووینەوە، کە بە بەرزایەکی ئێجگار نزم بەسەر ئاسمانی ناوچەکەدا دەسوڕانەوە، بە شێوەیەك کە دەم و چاوی فرۆکەوانەکانمام دەبینی و بە شوێن ئەو کەسانەدا دەسوڕانەوە کە خۆیان شاردبووەوە لە ترسی بۆردوومانەکە. بیرم دێ بازمدەداو ڕامدەکرد لە ژێر ئەو کەپرانەی کە دروستکرابوون بۆ بەڕێوەبردنی کردە سەربازیەکان. )

کاتژمێر حەوت و پەنجاو هەشت خولەك فرۆکە ژاپۆنیەکان گەیشتنە (بیرل هاربر)، ئیتر لێرەوە هیچ کەس گومانی لە کۆتای هاتنی ژاپۆنیەکان نەدەکرد.

بۆردوومانی ژاپۆنیەکان بەردەوام بوو لەسەر دامەزراوە سەربازیەکان و هێرشێکی بەرفراوانیانکردە سەر دوورگەکە. ژاپۆنیەکان تەنها بە هێرشکردنەسەر پێگە سەربازیەکان نەوەستانەوە، بەڵکو ڕووشیانکردە ئامانجە مەدەنیەکان و هێرشیشیان کردە سەر ئەوانیش.

خاتونێکی ئەمریکی یادەوەریەکانی خۆی لەسەرەتای هێرشەکە بۆ سەر بەندەری بیرل هاربر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (هاتنی زنجیرەی فرۆکەکان یەك لەدوای یەك شتێکی سەیرو نامۆ نەبوو، ئێمە لە دامەزراوەیەکی سەربازیدا دەژیاین، لەگەڵ ئەوەشدا هەستمان بە شتێکی جیاواز دەکرد، لە بەرئەوەی دیواری خانووەکانمان دەلەریەوە بە هۆی تەقینەوەی بۆردوومانی ژاپۆنیەکانەوە )

هەرکەسێك کە توانای هەڵگرتنی چەکی هەبوو بە پەلەو شپرزەی چەکی هەڵدەگرت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە، بارێکی شڵەژان و دوودڵی باڵی کێشا بوو بەسەر بارودۆخەکەدا، ئەمریکیەکان هەوڵیاندەدا لەوە تێبگەن کەچی ڕوودەدات.

کاتژمێر هەشت و پێنج خولەکی سەر لەبەیانی تۆپ هاوێژەکانی کەشتی جەنگی (نیفادا) دەستیانکرد بە بۆردومانکردنی فرۆکە تۆربیدەکان و کەشتیە چاککەرەوەکانی وەستاو لە نزیك ئەریزونا بە هەمان شێوە. کەشتی جەنگی گەورەی کالیفۆرنیا

موشەکێکی گەورەی بەرکەوت، فرۆکە ژاپۆنیەکانیش لە بەرزایەکی زۆرەوە دەستیانکرد بە بۆردوومانکردنی کەشتیە جەنگیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا بەرگری ئەمریکیەکان لەم کاتەدا رێکخراو کاریگەر نەبوو.

لە نێوان ئامانجە ئاسانەکاندا کەشتی (ئۆکلا هۆما) لاواز بوو، لەو کاتەدا کەشتی ئۆکلا هۆما بە زیاتر لە (دە )موشەك پێکراو، بووە هۆی کون بوونی، لە کاتێکدا کە شەوی پێشوو دەرچەو پەنجەرەکانی بەکراووەی بەجێ هێڵرابوون و ئاو چووە نێو کەشتیەکەوە. لە کاتژمێر هەشت و چواردە خولەکی سەرلە بەیانی کەشتی ئۆکلاهۆما هەڵگەڕایەوە نێو بەندەرەکەو (٤٠٠) کەس تیایدا گیریان خوارد. ،لەم کاتەدا یاریدەدەرێکی تۆپ هاوێژەکان بەناوی (لیۆن کولب) فەرمانیدا بە چۆڵکردنی کەشتیەکە، چونکە لەو باوەڕەدا بوو کەکەشتیەکە ژێرئاو دەکەوێت.

لە سەروی ئاگرو بڵێسەی تێك شکانەکەوە، فرۆکەوانێکی ژاپۆنی بەناوی(تایسوکی مارویاما) تەمەن (١٩) ساڵان چاودێری ئەو تێکشانەی دەکرد کە بۆمبەکانی کردبوویان و دەیگوت: (ئەو بۆمبەم پێکا کە کەشتی ئۆکلاهۆما دەی وەشاند، بەوەش یەکەم کاری سەرشانم ئەنجامدا، زۆر دڵخۆشبم بە پێکانی کەشتیەکە و ئێمە بەبێ گومان جەنگەکە دەبەینەوە ).

بە درێژای شەو هەوڵە نائومێدەکان بەردەوام بوون بۆ ڕزگارکردنی ئەوانەی گیریانخواردبوو لە نێو کەشتی ئۆکلاهۆمای ئاوەژووبوودا.

یەکێك لە دەریاوانە ئەمریکیەکان ڕووداوەکانی ئەو هێرشەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە : (کاتێك یەکەم کۆمەڵە موشەك کێشایان بە دوو کەشتیەکەدا لە حەوتی دیسەمبەردا، پرسیار لەوە دەکرا کە چی ڕوودەدات؟دوای ڕوودانی تەقینەوەی دووەم و سێهەم بەرپرسێك هاتە ژووری پەیوەندیەکان و پێ ی گوتین :هەموو کەسێك شوێنی خۆی بگرێت لە کەشتیەکەدا، دوژمن هێرشی کردۆتە سەرمان، لەو کاتەدا بە خۆمم گوت دوژمن کێیە ؟)

هەموو ئامانجە سەربازیەکان بەرکەوت بوون، ئەمریکیەکان سەرجەم ئامێرەکانی بەرگریکردنیان بەکار هێنا، بەڵام بە ئەندازەی هێزی هێرشەکە نەبوو.

کاتژمێر هەشت و هەشت خولەکی سەر لە بەیانی ڕادیۆی ناوچەی (کای ج.ئیم.بی) بەخشی موزیکی خۆی ڕاگرت و بانگەوازی بۆ هەموو سەربازەکان کرد تا بگەڕێنەوە سەر خزمەتی سەربازی خۆیان. فرۆکە ژاپۆنیەکانیش لە بەرزی دە هەزار پێ وە بۆمبەکانیان فڕێ دەدایە خوارەوە، ئەو بۆمبانەی کە قەڵغانی بەرگریان تێپەڕاندبوو.

یەکێك لە فرۆکەکان ڕاستەوخۆ کەشتی جەنگی ئەریزونای بۆردوومانکرد، لە کاتژمێر هەشت و دە خولەکی سەر لە بەیان، گەنجینەی پێشەوەی جبەخانەی سەر کەشتی ئەریزونا تەقیەوەو ئاگرێکی مەزنی دروستکرد، لە ماوەی کەمتر لە (٩) خولەکدا ئەو کەشتیە گەورەیە ژێر ئاو کەوت.

یەکێك لەوانەی کە تەقینەوەی کەشتی ئەریزونای بینیوە بەم شێوەیە ئەو دیمەنانەمان بۆ دەگێڕێتەوە (لە بەرزایەکی ئێچگار زۆرەوە بۆمبەکانم دەبینی دەبارینە سەر ئەریزونا، ئەریزونام بینی دەتەقیەوە و کڵپەی ئاگرو دوکەڵەکەی (٥٠٠–٦٠٠) پێ بە هەوادا بەرز دەبوویەوە، ئەو زۆر ترسناك بوو، یەکێك لەو کاتەدا پرسیاری لێکردم دەترسی؟وەڵامم دایەوە بەڵێ بەبێ گومان دەترسم، کەس هەیە نەترسێت؟

یو ئێس ئێس ئۆکلا هۆما گۆڕا بە ئامانجێکی ئاسان، یەکێك لە سەربازە ئەمریکیەکان لەو هێرشەدا دەڵێت: (لەو کاتەدا هەستم بەوە کرد کە زۆر نزیکم لە مردن، ویستم بچمە کۆگاکەم لە ژێرزەمینەکەدا بۆ دەرهێنانی کەل و پەلەکانم لەوێ دوای ئەوەی کە فەرمانمان پێکرا بە چۆڵ کردنی کەشتیەکە، لە نێو ئەو کەل و پەلانەدا ئەو ئەنگوستیلەیەی هەبوو کە کڕی بووم بۆ هاوسەرەکەم، ئەوە ئەو شتە بووم کە پاڵی پێوە دەنام بە ئاڕاستەی ڕاکردنم )

شەپۆلی یەکەمی هێرشی کت و پڕی ژاپۆنیەکان سەرکەتنێکی گاڵتەجاڕی بە دەست هێنا بەسەر دوژمن و توشی شڵەژانێکی خێرای کردن.

له کاتژمێر هەشت و پەنجا خولەك، شەپۆلی دووەمی فرۆکە ژاپۆنیەکان نزیك بوونەوە له باکورەوە، پلانی هێرشەکەش لێدانی بنکەی سەربازی ئەمریکیەکان بوو، ئەو بنکانەی که له دورگەکەدا بلاوەیان پێکرا بوو. به فرۆکە جەنگ کەرەکان و تۆپ هاوێژەکان.

له کاتژمێر هەشت و پەنجاو چوار خولەك، هێرشی دووەم دەستی پێکرد، (٧٨) تۆپی بەرپەرچدەرەوە، کەشتیەکەیان له بیرل هاربر بۆردوومانکرد و (٥٤) تۆپی دورهاوێژیش وێستگە ئاسمانیەکانی سەر به هێزی دەریاییان بۆردوومان کرد، (٣٦) فرۆکەی جەنگ کەریش لەسەر ئاسمانی بەندەرەکە پارێزگاریان له گرەنتی زالّ بوون بەسەر ئاسمانی ناوچەکەدا دەکرد، شەپۆلی دووەمی هێرشەکە ئاژاوەیەکی خراپی نایەوە و ئەمریکیەکان تەقەیان له هەرشتێك دەکرد که له ئاسمانی ناوچەکە بجولاّیەتەوە.

فرۆکە جەنگیەکان له بەیانی ئەو ڕۆژەدا هەردوو شەپۆلی هێرشەکانیان ئەنجامدا، یەکەمیان له کاتژمێر پێنج بۆ هەشتی بەیانی، دووەمیان له کاتژمێر هەشت و چل خولەکی بەیانی ئەنجامدران، دوای هەردوو هێرشەکە کاتژمێر(دە) ی هەمان ڕۆژ هەموو شتێك تەواو بوو.

ئەو هێرشە کت و پڕە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا و پلانەکەشیان، هەروەها سەرکەوتنێکی سەرتاسەری بەدەست هێنا و سەرجەم ئەو پێشبینیانەی که کردبوویان بەدەست هاتن.

ژاپۆنیەکان توانیان به پلانێکی به هێزی چاونەترسانە، ڕزگاریان بێت له بەشێکی زۆری ئەو هێزە دەریای و ئاسمانیانەی که ئەمریکا له ڕۆژهەلاّتی دوور مۆلّیدا بوون.

تۆپە بەرپەرچدەرەوەکان و فڕۆکەجەنگ کەرەکان و ئەو فرۆکانەی که هەلّگری تۆربیدەکان بوون، هەموویان توانیان (بیرل هابر) بگۆڕن به تۆپەلّەیەك له ئاگرو گڕپەربدەنە دامەزراوە سەربازیەکان، تۆپ و تۆربیدە ژاپۆنیەکان کەشتیە جەنگیە ئەمریکیەکانیان گۆڕی به پارچەیەك ئاگر، له دەرئەنجامی ئەو تەقینەوانەی که بەسەریاندا هێنا. لەو کاتەدا کەسانی سڤیل ڕایاندەکرد تا گیانی خۆیان ڕزگاربکەن،

هیچیش لە بەردەم سوپای ئەمریکیدا نەما بوو تەنها بەرپەرچ دانەوەیەك نەبێت کە خاڵی بێت لە هەر پلانێکی رێکخراوی تۆکمە.

هەرکات فرۆکە جەنگ کەرەکان دوای بۆردوومانکردنیان دەگەڕانەوە سەر پشتی فرۆکە هەڵگرەکان، لە دوای خۆیانەوە وێرانەیەکیان بەجێدەهێشت کە وێنەو هاوتای نەبوو.

زیانی گەورەی هێزی دەریای ئەمریکی بریتی بوو لە سێ کەشتی گەورەی جەنگی لە نێو ئەوانەشدا هەردوو کەشتی جەنگی (کالیفۆرنیا و نیفادا) شەش کەشتی تری جەنگی و پێنج ژێرئاوی و سەدو چل فرۆکە،زیانە جەستەیەکانیش بریتی بوون لە (٤٤٧٥) کوژراو بریندارو ونبوو لە سەربازو کەسانی سڤیل. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دانیشتوانی دوورگەی هاوای لە حاڵەتێکی خراپی ترس و بیمدا دەژیان.

یەکێك لەوانەی کە لەو کاتەدا لەوێ بوو دەڵێت : (قەد ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرمان لەوە نەکردبوەوە کە بەهێزترین بنکەمان کە زۆرینەی کەشتیەکانی کەشتی گەلەکەمانی لە خۆگرت بوو بەو شێوەیە بۆردوومان بکرێت، لەو باوەڕەدا نەبووم کە ئەفسەرە ئەمریکیەکان بیریان لەوە کردبێتەوە، کە ژاپۆنیەکان ڕۆژێك لە ڕۆژان لە نزیکەوە بەو شێوەیە ئەو هێرشە ئەنجامبدەن. )

ئەو هێرشە هەستکردن بە ترس و دڵەڕاوکێ ی بەدوای خۆیدا هێنا، جووڵەی سوپای ئەمریکی توشی ئیفلیجی و پەککستن کرد، هیچ هەلێك نەمابوو بۆ ڕزگارکردنی دەست بەسەردا گرتنی دوورگەی هاوای، بۆیە دەست بەسەردا گرتنی بووبوویە شتێکی حەتمی. یەکێك لە سەربازە ئەمریکیەکان بارودۆخی دوای هێرشی ژاپۆنیەکان دەگێڕتەوەو دەڵێت : (ئێمە دواتر لەو ڕۆژەدا زانیمان کە هێزی زەمینی ژاپۆنی دابەزیونەتە ناو بیرل هاربر ).

دوای تێپەڕبوونی چوار کاتژمێر بەسەر هێرشەکەدا، ئاگر لە دوورگەکە بەربوو دوکەڵی ڕەش ئاسمانی ناوچەکەی گرت و پەیوەندیەکان لەگەڵ وشکانیدا پچڕان  بە شێوەیەك گەیشتنی فریاگوزاری شتێکی موستەحیل بوو.

هێرشی ژاپۆنیەکان کت وپڕو وێرانکەرو بروسکە ئاسابوو، ترس سەراپا ناوچەکەی داگرت بوو، لە ترسی دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکە لەلایەن ژاپۆنیەکانەوە، بە

شێوەیەك كە جۆرێك لە حاڵەتی شێتی و دوودڵی دروستكردبوو، دورگەكە توشی وێرانەیەكی تەواو بووبوو.

سەركردەی ژاپۆنی (فوشیدا) لەسەر پشتی كەشتی فرۆكە هەڵگری وڵاتەكەی سوربوو لەسەر دەست پێكردنی شەپۆلی سێهەمی هێرشەكەیان. لە كاتژمێر یەك و نیوی نیوەڕۆ ئەدمیراڵ(ناگۆمۆ) بڕیاریدا بە هەڵوەشاندنەوەی هێرشەكەو پاشەكشێ ی كەشتی گەلی ژاپۆنی. یەكێك لە ئەمریكیەك لەو بارەیەوە دەڵێت : (ئەوان لە توانایاندا هەبوو بۆردومانی حەوزی وشك بكەن، لەمپەر دروست بكەن بۆ نۆژەنكردنەوەی كەشتیە جەنگیە زیان لێكەوتووەكان، ئەگەر بۆردوومانی دەروازەكانی حەوزی وشكیان بكردایێ، ئەوە ئەندازەی زیانەكان زۆر لەوە زیاتر دەبوون )

وا دەردەكەوێت كە ئەدمیراڵ (ناگۆمۆ)بۆیە هێرشی شەپۆلی سێهەمی هەڵوەشاندتەوە، لەبەر ئەوەی دڵنیا نەبووە لە شوێنی تەواوی كەشتیە فرۆكە هەڵگرە ئەمریكیەكان، لەگەڵ ئەوەشدا هێزەكانی سەركەوتنێكی گەورەیان بەدەست هێنا بوو لە هەردوو شەپۆلە یەكەم و دووەمدا و،ترس لەوە نەما بوو كە ئەگەر شەپۆلی سێهەم ئەنجامبدات شكستبهێنێت.بەم شێوەیە هێرشی سەر بیرل هاربر كەشتی گەلی ئەمریكی لە زەریایی هێمندا تووشی ئیفلیجی كرد.

دوای ئەم هێرشەش هێزی دەریایی ژاپۆنی توانی دوو كەشتی گەورەی بەریتانی ژێرئاو بخات لە بەرواری (١٠ دیسەمبەری ساڵی ١٩٤١) ز. دوای مانگێك لەم هێرشەش هێزە ژاپۆنیەكان توانیان نیمچەدورگەی (ملانۆ) داگیربكەن و دەست بەسەر (سەنگافورە) دا بگرن لە (١٥ فبرایەری ١٩٤٢) دوای خۆبەدەستەوەدانی هێزەكانی كە زیاتر لە شەست هەزار سەرباز دەبوون، لە هەمانكاتدا ژاپۆنیەكان (بۆرما) یان داگیركردوو پاكیانكردەوە لە هێزە هاوبەشەكانی بەریتانی چینی و ڕێگەی سەرەكی بۆرمایان داخست كە هاوپەیمانەكان یارمەتیان پێدا دەنارد بۆ چین، لە بۆرما حكومەتێكی سەر بە ژاپۆنیان دروستكرد.

لە ناوەڕاستی مانگی فەبرایر کەشتی گەلی ژاپۆنی لە دەریای (جاوە) هێزێکی هاوپەیمانەکانی تێك شکاند، کە پێکدەهات لە (٥) کەشتی گەورەی جەنگی و شەش کەشتی تری جەنگی تری وێرانکەر، بەو شێوەیەش ڕێگەکرایەوە بۆ داگیرکردنی هەموو دورگەی هندی ڕۆژهەلاتی هۆڵندی،دوای ئەمەش هێزە ژاپۆنیەکان توانیان ئەمریکیەکان لە دوورگەی فلیپین دەربکەن دوای خۆبەدەستەوەدانی هێزە پارێزگارەکانی. بەم شێوەیەش ئیتر بەرەنگاربوونەوەی هاوپەیمانەکان لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی دوور لە دژی ژاپۆنیەکان بوو بە شتێکی حەتمی، و پێشبینی ئەوەیاندەکرد کە داگیرکردنی دواتریان ئوستراليا بێت.

لەو کاتەدا هەلێکی زۆر باش بوو بۆ ژاپۆنیەکان، بە تێڕوانین لەو سەرکەوتنە دەریایەی کە لە زەریای هێمن و دەریاکانی ڕۆژهەلاتی ئاسیا بە دەستیان هێنا بوو، بەدەستگرتن بەسەر موڵك و ماڵی ئەمریکی و هۆڵندیەکان. هۆنگ کۆنگیش لە کۆتاییەکان دیسەمبەری ساڵی (١٩٤١) ز خۆی دابەدەستەوە، دورگەکانی هندی ڕۆژهەلاتی هۆڵندیش لە مانگی مارسی ساڵی (١٩٤٢) ز. دواتریش ژاپۆنیەکان (مەلانۆ)یان گەمارۆدا کاتێك دەستیانگرت بەسەر کوالالامپور چوونە نێو (جوهور)، ئیتر هێزە بەریتانیەکانی ناچارکرد لە مانگی ینایری هەمان ساڵدا (ملایۆ) بەجێ بهێڵن.

ژاپۆنیەکان بە شوێن ئەو ئامادەکاریەدا دەڕۆشتن بۆ دەست پێکردنی ئەو جەنگە، ئەگەر جەنگی ئەڵمانی سۆڤیەتی بە قازانجی ئەڵمانەکان بشکایەتەوە. ئەڵمانیا پێگەی خۆی هەڵبژارد بە هێرشکردنە سەر ڕووس، بەلام جیاوازیە ئیمپریالیزمیەکان لە نێوان ئەو ژاپۆندا، وای لە ژاپۆن کرد ئەو ڕێگە بگرێتە بەر کە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی تێدا دەبینێتەوە. ،هەرچەندە بەشداری جەنگەکەشی نەکرد، بەلام تەماعە داگیرکەرانەکانی ڕووسیای ناچارکرد کە ژمارەیەکی زۆر سەربازی لە سیبریا کۆبکاتەوە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر ململانەیەکی ڕووسی ژاپۆنی، بە تایبەتی کاتێك ژاپۆن ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە هێزەکانی لەسەر سنور بلاوە پێکردبوو.

له (٢٥ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤١)ز جارێکی تر ڕێکەوتننامەی ڕیشەکێشکردنی شوعیەت واژۆکرایەوە، لە نێوان هەریەکە لە (ئەڵمانیا،ئیتالیا،ئیسپانیا،فلەندا،کرواتیا،دانیمارك،ڕۆمانیا،بولگاریا،ژاپۆن) و ئەو حکومەتانەی کە بە کرێ گرتەی خۆی بوون وەك مەنشوریا و حکومەتەکەی (وایخ شسنج ڕی) لە چینی داگیرکراو. ئەوەی کە ڕوونە لەم پەیمانەدا دەرکەوتنی کوتلەیەکی سەربازیە لە دژی کوتلەی سۆڤیەتی ئەنگلۆ ئەمریکی.

لێرەوە ئەمریکا چووە نێو جەنگێکەوە کە ئامادە نەبوو بە شداری تێدا بکات، وەڵامی خوێناوی ترین هێرشی دایەوە لە مێژوویدا لە پێش ڕووداوەکانی (١١ سێبتەمبەر) بە هێرشێکی شەیتانی ئەتۆمی بۆ سەر ژاپۆن، کە وێنەی نەبوو لە گەورەترین قەسابخانەی مرۆیی و کارەساتی ژینگەی لە هەموو مێژوودا.

بەم شێوەیە ئیمپراتۆری ژاپۆنی (هیرۆهیتۆ) و سەرکردە سەربازیەکانی هەڵەیەکی گەورەیان ئەنجامدا بە لێدانی (بیرل هاربر). ژاپۆنیەکان لە هەڵسەنگاندنی ئەمریکیەکاندا بەهەڵەدا چوون، وا گومانیان کرد کە سەرکەوتنەکانیان بێ ئومێدی لە دڵی ئەمریکیەکاندا دروستکردووە، بەڵام لە ڕاستیدا هێزەکانی ئەمریکا هەناسەو هۆشیاریان بۆ گەڕایەوە بە شێوەیەك کە پەرچەکرداری سیاسی ئەمریکیەکان خێرابوو، جەنگی دژی بەرەی محوەر ڕاگەیاند دوای گفتوگریەکی کورتی کۆنگرێس،بە پاڵپشتیەکی تەواوی گەلی ئەمریکیەوە. بەڵام لە ڕاستیدا کاردانەوە سەربازیەکانی خێرا نەبوون، تا دوای دوو مانگ هێزە دەریاییەکانی ئەمریکا کردەیەکی هەڵگەڕانەوەیان ئەنجامدا بۆ سەر ژاپۆنیەکان و یەکە هاوبەشەکان دەست پێشخەریانکرد لە لەناوبردنی هێزەکانی ژاپۆن لە هەردوو دوورگەی (مارشاڵ و جلبیر) و (٢٤) شوباتیش تۆپ ئەمریکیەکان بۆردوومانی دورگەی (ویك) یانکرد.

له (٤) مارس بۆردومانێکی تری ئەمریکیەکان بۆ سەر دوورگەی (مارکۆس) ئەنجامدراکە(١٥٠٠)کم لە تۆکیۆی پایتەختەوە دووربوو، لە (١٠) ی مارس فڕۆکە ئەمریکیەکان کە لەسەر کەشتیە فڕۆکە هەڵگرەکان دەفڕین بۆردوومانی بنکە

ژاپۆنیەکانیاندەکرد لە (لائی و سلامۆدا) لە غینیای نوێش کەشتیەکی بچوکی تێکشکێنەری مینیان ژێرئاوخست، دوای ئەمەش کەشتیەکی تریشیان ژێرئاوخست.

ئەمریکیەکان گەڕانەوە بۆ ئەنجامدانی کردەیەکی کت و پڕی تر لە دژی ژاپۆنیەکان، ئەویش بە ئەنجامدانی هێرشی ڕاستەوخۆ بۆسەر خودی ژاپۆن خۆی. لە (١٨) ئەپریل بۆ یەکەمجار هەردوو کەشتی فڕۆکە هەڵگری ئەمریکی (ئەنترا براین)و( هۆرنیت) بەرەو ئەو ناوچانە کشان کە تەنها (١٠٠٠) کم لە تۆکیۆی پایتەختەوە دووربوون. ئەو بۆردوومان تەنها کردەیەکی سادەبوو کە بەبێ دوو دڵی و گومان ئەنجامدرابوو، بەڵام لە هەمان کاتدا توانای هونەری ئەمریکیەکانی دەرخست لە بەردەوام بوون لەسەر خەبات و تێکۆشان تا سەرکەوتن. ئەم بۆردوومانە توانی وا لە ئەمریکیەکان بکات کە متمانە بەخۆ بوونیان بۆ بگەڕێتەوە و ترش و بیمیش لە دڵی ژاپۆنیەکاندا درووست بکات.

بۆردوومان و هێرشەکان بەردەوام بوون بە شێوەی بەردەوام، بەڵام ئەوانە بەس نەبوون. ویستی تۆڵە سەندنەوە دوای لێدانی بیرل هاربر زاڵ بوو بەسەر گەل و سەرکردایەتی ئەمریکیدا، دواتر کە قەسابخانەی هێرۆشیماو ناکازاکیان لە ژاپۆن ئەنجامدا لەژێر بیانووی بیرل هاربردا بوو.

پلانەکەی سەرۆکی ئەمریکی(ڕۆز فێڵد) بە پلەبەندی بەشێکی زۆری هێزە دەریاییەکانی لە قوڵای زەریایی هێمندا لە ناوبرد، بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی ئەتۆمی لەسەری ژاپۆنی ناچارکرد پاشەکشە بکات لە جەنگ لە پاڵ هیتلەردا، بەم شێوەیەش ژاپۆن شکست هێناو هیتلەریش هاوپەیمانێکی باش و بنەڕەتی لەدەستدا.

سەرۆکی ئەمریکی (ڕۆزفێڵد) پێش کاتی دیاریکراو بۆ لێدانی کەشتی گەلی ژاپۆنی کۆچی دوایکرد، بەڵام جێگرەکەی (هاری ترومان )توندتربوو لەسەر تۆڵەسەندنەوەی لەوەی پێش خۆی و بۆ ساتێکیش دوو دڵ نەبوو لە بەکارهێنانی بژاردەی ئەتۆمی، بۆ نمونە لە دوای ڕودانی قەسابخانەی هێرۆشیما لە یەکێك لە قسەکانیدا دەڵێت: (ئێمە تۆڵەی ئەمریکامان جێ بەجێکرد، کە چاوەڕوانیەکەی درێژەی کێشا لە بیرل هاربر )

سەرەڕای وەحشیەتی ئەو کارەساتە، بۆ ساتێکیش دوو دڵ نەبوو لە دووبارەکردنەوەی و دوای چوار ڕۆژ شاری (ناکازاکی ) یشی بە دوو بۆمبی ئەتۆمی بۆردوومانکرد، کە بووە هۆی ڕوودانی کاولکاریەکی فراوان و کوژرانی سەدان هەزار کەسی ژاپۆنی لەو شارە.

دوای ترساندنی ژاپۆن بە وێرانکردنی زیاتر، لە کۆنگرەی هاوپەیمانەکان ناسراو بە (کۆنگرەی بۆتسدام) ئیمپراتۆری ژاپۆن(هیرۆ هیتۆ) حکومەتی وڵاتەکەی هاندا بۆ خۆبەدەستەوەدان و دواجارلە (١٤) ئوغستس حکومەتی ژاپۆن ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر کۆتای پێهێنانی جەنگ بەو هۆیەشەوە ژمارەیەك لە سەرکردە سەربازیەکانی ژاپۆن خۆیان کوشت. لە دەرئەنجامی ئەو هەڵوێستەوە لە (٢دیسەمبەری ١٩٤٥) ز هیرۆ هیتۆ بەیاننامەی فەرمی خۆبەدەستەوەدانی واژۆکرد لەسەر کەشتی جەنگی ئەمریکی (میسور) ی لە کەنداوی تۆکیۆ، لەگەڵ ئامادەبوونی نوێنەرانی دەوڵەتە سەرکەوتووەکان. هاوپەیمانەکانیش لە ڕۆژی (٢) سێبتەمبەری هەمان ساڵدا سەرکەوتنیان بەسەر ژاپۆنیەکاندا ڕاگەیاند و بەو شێوەیەش جەنگی جیهانی دووەم کۆتای هات.

کۆنگرەی (بۆتسدام) لە نێوان هەریەکە لە (هاری ترومان) سەرۆکی ئەمریکاو (وینستۆن چرچڵ) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیاو (جۆزێف ستالین) سەرۆکی رووسیا بەسترا. ئەوەش کۆتا کۆبوونەوە بوو کە لەنێوان ئەو سێ سەرکردەیەدا ئەنجامدرا لە میانەی جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەو کۆنگرەیە لە (بۆتسدام) نزیك پایتەختی ئەڵمانیا (بەرلین) ئەنجامدرا لە (١٧ یولیۆ تا ٢ ئوغستسی ساڵی١٩٤٥) ز.

ڕێکەوتنامەکانی پێشتر ئەڵمانیای دابەشکردبوو بەسەر دوو ناوچەی داگیرکراوی بەریتانی فەرەنسی سۆڤیەتی ئەمریکی، بەڵام ئەندامانی ئەم کۆنگرەیە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە لەوەو دوا وەك یەك وڵات مامەڵە لەگەڵ بەشە جیاوازەکانی ئەڵمانیادا بکەن.

ئەوەی کە پەیوەندی بە لایەنی ئابوریەوە هەیە، یەکێتی سۆڤیەت سێ یەکی کەشتیە ئەڵمانیەکان و هەندێك کەل و پەلی پیشەسازی بۆخۆی هەڵگرت وەك قەرەبوویەك بۆ ئەو

زیانانەی کە لەکاتی جەنگەکەدا لێی کەوت بوو. لەلایەکی ترەوە ئەندامانی کۆنگرەکە ڕێکەوتن لەسەر دادگایکردنی سەرکردە ئەڵمانیەکان بە تۆمەتی ئەنجامدانی جەنگ.

ئەندامانی کۆنگرەکە لە بۆتسدام خۆیان لە زانیاریەکانی سەرۆکی ئەمریکی (هاری ترومان ) گێل کرد، لە هەواڵی سەرکەوتنی یەکەم تاقیکردنەوەی بۆمبی ئەتۆمی، ئەمەش بووە هۆی دەرچوونی بەیاننامەی بۆتسدام، کە هەڕەشەی لە ناوبردنی ژاپۆنیەکان دەکرد، ئەگەر جەنگەکەی لەدژی هاوپەیمانان ڕانەگرێت و بەبێ مەرج خۆی نەدات بەدەستەوە.

بەم شێوەیە (هیرۆ هیتۆ ) پیاوی بە هێزی ژاپۆن لە جەنگی جیهانی دووەم خۆیدا بەدەست ئەمریکیەکانەوەو، هەر خۆگرتنێکی تری ئەم پیاوە ژاپۆنیە لەبەرامبەر ئەمریکیەکانەوە توشی هێرشی زیاتری بۆمبی ئەتۆمی دەکرد لە دوای هێرشەکانی هەردوو شاری (هیرۆ شیماو ناکازاکی ).

بەم شێوەیەش هێرشی ژاپۆنیەکان بۆ سەر بەندەری (بێرل هاربر ) کاریگەری زۆری سیاسی و سەربازی لە دوای خۆی بەجێ هێشت، کە بووە هۆی گۆڕانی گەورە لە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو کردیە لایەنێك لە جەنگی جیهانی دووەمدا، هەروەها بووە هۆی پێداچوونەوەیەکی ورد لە ئاستی ئەدای هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا.

ئەمریکا ئەو بارودۆخەی بەسەخت ئەژمارکرد، بەڵام لە هەمانکاتدا بەسود بوو بۆ دەست پێکردنی نوێ کردنەوەی ئامێرە سەربازیەکانی و، سەرلەنوێ بنیادنانەوەی جبەخانە سەربازیەکانی بە شێوەیەك گونجاو بێت لەگەڵ بارودۆخی سیاسی و سەربازی نوێ لەسەر ئاستی گۆڕەپانی جیهان.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هێرشە بۆ سەر بنکەی زەبەلاحی ئەمریکی ژمارەیەك وانەی سودبەخشی بە دوای خۆیدا هێنا، کە تائێستاش بە بەردەوامی لە ژمارەیەك ئەکادیمیاو پەیمانگای تایبەتمەندی سەربازی وەك وانە دەخوێنرێت و سودی لێوەردەگیرێت.

لە ڕۆژی (١٥ ئوغستسی ساڵی ١٩٤٥) ز ئیمپراتۆری پێشووی ژاپۆن (هیرۆهیتۆ ) خۆبەدەستەوەدانی وڵاتەکەی ڕاگەیاند، بەو پێ یەش سەرۆکی ئەمریکی (هاری ترومان)

سەرکردەی باڵای هاوپەیمانەکانی ژەنەڕاڵ (ماك ئارسەر) ی وەك حاکمی سەربازی لەو وڵاتە ڕاگەیاند.

لە ساڵی (١٩٤٦) ز پەرلەمانی ژاپۆنی دەستوری نوێ ی وڵاتەکەی پەسەند کرد، کە بە پێ ی ئەو دەستورە ژاپۆن گۆڕا بە وڵاتێکی دیموکراسی لە چەکداماڵراو. لە گرنگترین ئەو کارانەی کە دەستور بڕیاری لەسەردا دوورخستنەوەی ئیمپراتۆر بوو لە دەستەڵاتی سیاسی و دانی ئەو دەستەڵاتە بوو بە حکومەتێکی هەڵبژێراو لەلایەن پەرلەمانەوە.

تا ئێستاش ڕۆژی (٦ئوغستسی ساڵی ١٩٤٥) ئەو ڕۆژەی کە ئەمریکیەکان بە بۆمبی ئەتۆمی هێرشیانکردە سەر ژاپۆن و ژاپۆنیش خۆی دابەدەستەوە، پرسیاری گەورەی لەسەرە، کە ئایا ژاپۆن پێش بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی ئامادەی خۆبەدەستەوەدان بووە؟ یان ئایا بژاردەی تر هەبووە لەبەردەم ئەمریکیەکاندا بۆ خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆنیەکان، بەبێ بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی، یان هەرخۆیان سوربوون لەسەر تۆڵە سەندنەوەی بیرل هاربر؟

لە ڕاستیدا لە ساڵی (١٩٤٦) ز وەزارەتی بەرگری ئەمریکا ڕاپۆرتێکی ئامادە کردووە بە ناونیشانی (هەوڵەکانی ژاپۆن بۆ کۆتای هێنان بە جەنگ) ئەو ڕاپۆرتە کە لەساڵی (١٩٩٥) بڵاوبوویەوە،و دان بەوەدا دەنێت ژاپۆن ئامادەی خۆ بەدەستەوەدان بووە پێش هێرشە ئەتۆمیەکانی سەر هەردوو شاری (هیرۆشیماو ناکازاکی) لە دیسەمبەری ساڵی (١٩٤٥) ز، تەنانەت پێش ئەوەی ئەو دوو بۆمبە ئەتۆمیەیی بەربکەوێ، یان پێش ئەوەی ڕووسیا بچێتە جەنگەکەوە، یان پێش ئەوەی هەڕەشەی داگیرکردنی سەربازی لێبکەن. ئەی کەواتە بۆچی سەرۆکی ئەمریکی (هاری ترومان) پێداگری کردووە لەسەر بۆردومانکردنی (هێرۆشیماو ناکازاکی ) بە بۆمبی ئەتۆمی. ئەو کات ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی بووی ئاماژە نهێنیەکانی تایبەت بە ژاپۆنیەکان ئاشکرا بکات، لە (١٢ یولیۆی ساڵی ١٩٤٥) ز یەکێك لەو نامانە ئاشکراکرا کە باسی بڕیاری ئیمپراتۆر دەکرد لە دەست تێوەردانی ڕاستەوخۆی خۆی بۆ کۆتای هێنان بە جەنگ.

ژاپۆن زانی بووی کە دیکتاتۆری رووسیا (ستالین) بڕیاریداوە بچێتە جەنگەکەوە لە دژی ژاپۆن لە دوای سێ مانگ لە خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانەکان لە (٨ ئایاری ساڵی ١٩٤٥)ز، هەرواش دەرچوو لە هەشتی مانگی ئوغستسی هەمان ساڵدا جەنگی ڕاگەیاند، ئەوە بەتەنها بەس بوو بۆ کۆتای هاتنی جەنگ و خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆنیەکان لە بەردەم سێ دەوڵەتی گەورەی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیاو یەکێتی سۆڤیەت، بە تایبەتی دوای خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانەکان.

بەڵام ترومان سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا حساباتی تری هەبوو. ترومان ئەوەندە پێویستی بە بۆمبی ئەتۆمی نەبوو بۆ مل پێکەچکردنی ژاپۆنیەکان، ئەوەندەی کە پێویست پێ بوو بۆ تۆڵە سەندنەوەی بیرل هاربر و ترساندنی سۆڤیەتیەکان.

یەکەم ئەزموونی سەرکەوتووی بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی لە (١٦ یولیۆی ساڵی ١٩٥٤) ز تاقیکرایەوە، لە ڕۆژی دواتر ترومان سەرۆکی ئەمریکا لە (بۆتسدام) لەگەڵ هەریەکە لە (ستالین و چرچل) کۆبویەوە.

(ئەلن برووك) سەرۆکی ئەرکانی سوپای بەریتانی لە یاداشتەکانی خۆیدا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت : (چرچل سەرسام بوو بەو دەنگە بەرزەو هەڵوێستە دەستدرێژی کارانەی سەرۆکی ئەمریکی. ترومان سەرۆك ستالینی دەوروژاند و داواکاری موستەحیلی ئاڕاستەدەکرد، چرچڵ لەو گۆڕانکارییەی هەڵوێستی دانوسانی ترومان تێ نەگەیشت، تا ڕۆژی دواتر کاتێك زانی ئەمریکا ئەزموونی بۆمبی ئەتۆمی بەسەرکەوتووی تاقیکردۆتەوە)

دیکیۆمینتە ئەمریکیەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئەو کات بە سەرۆك ترومانی ڕاگەیاندوە :(بۆمبی ئەتۆمی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای خستووەتە هەڵوێستێکی بە هێزەوە، بە شێوەیەك کە دەتوانێت خۆی مەرجەکان بنوسێتەوە بۆ کۆتای پێهێنانی جەنگ)

زانای ئەتۆمی ئەمریکی (لی زیلارد)لە یاداشتەکانیدا کە بەناونیشانی (مێژووی تایبەتیم بۆ بۆمبی ئەتۆمی )بلاوی کردوونەتەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (وەزیری دەرەوە بیرنز لەگەڵم لە کۆشکی سپی کۆبوویەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا وەزیر باسی ئەوەی بۆ

نەکردم کە بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆی دژی شارە ژاپۆنیەکان پێویست بوو بێت بۆ بردنەوەی جەنگەکە،بەڵکو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە خاوەنداریەتیمان بۆ چەکی ئەتۆمی و دەرخستنی کاریگەریەکانی وا لە یەکێتی سۆڤیەت دەکات کە زیاتر گوێڕایەڵمان بێت لە کیشوەری ئەوروپادا)

لەو کاتەدا کەناڵی (سی. ئێن.ئێن) نەبوو، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندنیان لە ئاستێکی فراواند بەکارهێنا، بۆ ڕازیکردنی ڕای گشتی ئەمریکی بەوەی کە بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی پێویست بووە بۆ خێرا کۆتای پێ هێنانی جەنگ.

لە مانگی مارسی ساڵی (١٩٤٥) ز ئەمریکیەکان بۆمبیان وەك باران داباراند بەسەر تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن و بووە هۆی کوژرانی (٨٥) هەزار هاولأتی ژاپۆنی، ئەم بۆردوومانە وای لە ئیمپراتۆر (هیرۆ هیتۆ) کرد کە ڕەزامەندی دەرببڕێت لەسەر تەماشاکردنی مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمریکیەکان بۆمبی یەکەمیان بەکارهێناو دوای سێ ڕۆژیش لەوە بۆمبی دووەمیان بەکارهێنا، لە ڕۆژی شەشەمیدا ئیمپراتۆر (هیرۆ هیتۆ) ناچار بوو بەبێ هیچ جۆرە مەرجێك خۆبەدەستەوەدانی وڵاتەکەی ڕابگەیەنێت.

بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بۆ خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن شتێکی پێویست نەبوو، بەلأم ئامرازێك بوو بۆ خۆبەدەستەوەدانی سەرشۆڕکەری ژاپۆنیەکان. لە لایەکی تریشەوە هەڵوێستی ئەمریکیەکانی بەهێزکرد لە دانوسانەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا، لەسەر دابەشکردنی ئەو شتانەی کە لەدوای جەنگەکەوە بەجێ مابوون لە جیهاندا.

لە مانگی ئوغستسی ساڵی (٢٠٠٥) ز واتە دوای شەست ساڵ لە لێدانی وڵاتەکەی بە دوو بۆمبی ئەتۆم و ڕاگەیاندنی خۆبەدەستەوەدان و تێکشانی لەلایەن باوکیەوە (هیرۆ هیتۆ ) ئیمپراتۆر (ئەکیهیتۆ) لە یادی ئەو کارەساتەدا بەڵێنیدا بە نەگەڕانەوەی ژاپۆن بۆ جەنگێکی تری لەو شێوەیە.

ئیمپراتۆر و (میشیکۆی) ی هاوسەری بەشداریانکرد لە ئاهەنگێك کە لە هۆڵی شارەوانی تۆکیۆ رێکخرابوو، لەو ئاهەنگەدا زەنگی یاداشتنامەی خۆبەدەستەوەدان و ژاپۆن و کۆتای جەنگی لێدا. ..

ئەکیهیتۆ دوای باوکی هیرۆ هیتۆ بوو بە ئیمپراتۆری ژاپۆن واتە لە ساڵی (١٩٨٩)، بەلأم لەڕاستیدا لە ساڵی (١٩٩٠)ز بەتەواوی دەستەلاتی وەرگرت. حکومەت لە نیوەڕۆی یادەوەری ئەو تاوانەدا داوای لە هاولاتیانیکرد بەبیٚ دەنگی سلأو بۆ قوربانیان ئەو جەنگە بنێرن. هەر لەو ڕۆژەدا ڕێوڕەسمی فەرمیش بۆ وەزیرەکانی حکومەت ڕێکخرا و لەبەردەم ئیمپراتۆردا بەڵێنی پارێزگاری هەمیشەییان لە ئاشتی دووپات کردەوە.

لە هەمان کاتدا سەرۆك وەزیرانی ژاپۆنی ئەو کات (جۆن شیرۆ کیزۆمی) پۆزشی ولأتەکەی هێنایەوە بۆ ئەو ولأتانەی کە لەکاتی جەنگی جیهانیٚ دووەمدا کەوت بوونە بەر هێرش و داگیرکاری ولأتەکەی، گووتی ژاپۆن بە هیچ شێوەیەك ئەو (وانە نارەحەتانەی )جەنگ لە بیر ناکات. گووتیشی : (ولأتەکەی هۆکارێك بوو بۆ ئەو زیان و ئازارە زۆرانەی کە گەلانی زۆرێك لە ولأتان بەریان کەوت، بە تایبەتی ولأتە دراوسیٚ ئاسیاییەکانمان لە کاتی جەنگ و داگیرکاریەکاندا ) ئەوەشی بۆ زیاد کردوو گووتی: (ئێمە زۆر بە سنگ فراوانیەوە ئەو ڕاستیە مێژوویە قبولٚ دەکەین و سەر لەنویٚ ئەو کاریگەریانە لەسەر دلٚ و دەروونمان دووبارە دەکەینەوە و داوای لێبوردن دەکەین و سەرەخۆشی خۆمان لە قوربانیانی ناوەوە و دەرەوەی ولأت دەکەین )



بنکەی بیرل هاربر پێش هێرشەکە...



بەو شێوەیە دیمەنەکە دەستی پێکرد دوای هێرشەکە





ئاگر بەربووە کەشتی گەلی ئەمەریکی دوای هێرشی ژاپۆنیەکان



ئەوە وێنەی ئاسمانی هیرۆشمایە , دوای ئەنجامدانی هێرشی شەیتانی بەبۆمبی ناوەکی!!




تاکە رزگاربووی بۆمبی هێرۆ شیما , باس لەکارەساتەکە دەکات پێش مردنی



کۆنگرەی بۆتسدام : لەچەپەوە نستۆن چرچل,هاری ترومان,جۆزیف ستالین



یەکێك لەدانیشتنەکانی کۆنگرەکە



ژەناڕاڵ ماك ئارثەر بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدان واژۆ دەكات



هیرۆهیتۆ لەگەڵ ژەنەڕاڵی ئەمەریكی مارك ئارثەر حاكمی سەربازی ژاپۆن دوای واژۆ كردنی بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدان

# INSTRUMENT OF SURRENDER

We, acting by command of and in behalf of the Emperor of Japan, the Japanese Government and the Japanese Imperial General Headquarters, hereby accept the provisions set forth in the declaration issued by the heads of the Governments of the United States, China and Great Britain on 26 July 1945, at Potsdam, and subsequently adhered to by the Union of Soviet Socialist Republics, which four powers are hereafter referred to as the Allied Powers.

We hereby proclaim the unconditional surrender to the Allied Powers of the Japanese Imperial General Headquarters and of all Japanese armed forces and all armed forces under Japanese control wherever situated.

We hereby command all Japanese forces wherever situated and the Japanese people to cease hostilities forthwith, to preserve and save from damage all ships, aircraft, and military and civil property and to comply with all requirements which may be imposed by the Supreme Commander for the Allied Powers or by agencies of the Japanese Government at his direction.

We hereby command the Japanese Imperial General Headquarters to issue at once orders to the Commanders of all Japanese forces and all forces under Japanese control wherever situated to surrender unconditionally themselves and all forces under their control.

We hereby command all civil, military and naval officials to obey and enforce all proclamations, orders and directives deemed by the Supreme Commander for the Allied Powers to be proper to effectuate this surrender and issued by him or under his authority and we direct all such officials to remain at their posts and to continue to perform their non-combatant duties unless specifically relieved by him or under his authority.

We hereby undertake for the Emperor, the Japanese Government and their successors to carry out the provisions of the Potsdam Declaration in good faith, and to issue whatever orders and take whatever action may be required by the Supreme Commander for the Allied Powers or by any other designated representative of the Allied Powers for the purpose of giving effect to that Declaration.

We hereby command the Japanese Imperial Government and the Japanese Imperial General Headquarters at once to liberate all allied prisoners of war and civilian internees now under Japanese control and to provide for their protection, care, maintenance and immediate transportation to places as directed.

The authority of the Emperor and the Japanese Government to rule the state shall be subject to the Supreme Commander for the Allied Powers who will take such steps as he deems proper to effectuate these terms of surrender.

بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوە دانی ژاپۆن

له یەکێك له ڕۆژەکانی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی(١٩٦٧)ز جەستەیەکی تێکچوویان خستەنێو گۆڕێکی بەکۆمەڵەوە، بکوژەکان هیوایان دەخواست کەس ڕێگەی نەکەوێتە سەر ئەو گۆڕە نادیارە. ئەوان بڕوایان وابوو بە تێك شکاندنی ئەو پیاوە، ئەفسانەکەشی تێك دەشکێنن، بەلأم لەڕاستیدا بەهەڵەدا چووبوون.

ساڵی (١٩٦٨)ز گەنجان تورەبوون و هاتنەسەرشەقامەکان و، ڕایانگەیاند ئەوان دەتوانن کۆتای بەجەنگ بهێنن و شێوەو دیمەنی دنیا بگۆڕن، ئەو گەنجە شۆڕشگێڕە دوای مردنی بووە شەهیدێك بۆ دۆزەکانیان، بووە نیشانەو هێمایەك بۆ خەون و حەزەکانی ملیۆنەها خەڵك. ئەوانەی کە بەدەستیانەوەو لە دڵیشیاندا وێنەکانی ئەویان هەڵگرت بوو.

دوای زیاتر لە چل ساڵ لە تیرۆرکردنی تا ئێستاش جەنگەکانی ئەو پیاوە (سەرخەری هەژاران و سەرکردە خەبات گێڕەکانیان ونیشانەی یاخی بوون لە دژی وەحشیەت و ستەم و داگیرکاری )بەردەوامە لە دژی ئەمریکیەکان، بە پێچەوانەشەوە جەنگی ئیمپریالیزمەکان لە دژی ئەویش بەردەوامە.

ئەگەر کات بگەڕایەتەوە بۆ ئەمریکیەکان، پێداگریان لەسەرَ ئەو تاوانەیان نەدەکردو و (گیڤارا)یان تیرۆرنەدەکرد، دوای ئەوەی لەگەڵ تێپەڕبوونی کات ئەو تاوانە گیڤارای گۆڕی و کردیە هێماو ئەفسانەیەکی مێژووی و شۆڕشگێڕێکی نێودەوڵەتی کە ڕێڕەوی مێژووی گۆڕی.

لە دوای مردنی گەلانی کیشوەری ئەمریکای لاتینی توانیان داگیرکەرە ئەمریکیەکان لە خاکی وڵاتەکانیان دەربکەن.

- ئەرنستۆ جیڤارا دلا سیرنا..ناسراو بە جی گیڤارا یان(جی) شۆڕشگێڕێکی کووبی بەڕەگەز ئەرژەنتینی و هاوڕێ ی کاسترۆ بوو. ..دادەنرێت بە بەناوبانگترین شۆڕشگێڕی هەڵکەوتوو لە مێژوودا!!.کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی (بۆینس ئایرس)خوێندووەو ساڵی(١٩٥٣) تیایدا دەرچووە. توشی تەنگە نەفەسی بووە و خزمەتی سەربازی نەکردووە. لە کۆتا ساڵی خوێندنی لە کۆلێژی پزیشکی لەگەڵ هاوڕێ یەکیدا گەشتێکی بە ماتۆڕسکیل کردووە بەنێو کیشوەری ئەمریکای باشوردا.ئەو گەشتە کەسایەتی ئەوی بنیادناوەو هەستی بە یەکگرتووی ئەمریکای باشور و ئەو ستەمە زۆرەی ئیمپریالیزمی جیهانی کردووە لەسەر جوتیارە هەژارەکان. دواتررووی کردۆتەوڵاتی (گواتیمالا)،کە لەو کاتەدا سەرۆکەکەی سەرکردایەتی حکومەتێکی چەپڕەوی جەماوەری دەکرد، لە میانەی چاکسازیەکانی بە تایبەتی لە چاکسازیەکانی لەڕووی زەوی و کشتوکاڵەوە، گۆڕا بە شۆڕشگێڕێکی سۆشیالیستی. دواترلە ساڵی (١٩٥٤) ز ئەو حکومەتەی گواتیمالایا بە هۆی کودەتایەکی سەربازیەوە ڕوخێنراکە لەلایەن ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکیەوە پاڵپشتی دەکرا.

ساڵی (١٩٥٥)ز گیڤارا لە وڵاتی پیرۆ چاوی کەوتووە، بە کچە تێکۆشەرێکی چەپڕە بەناوی (هیلدا ئەکۆستا)و ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵیدا پێکهێناوەو بەرهەمی ئەو هاوسەرگیریە منداڵێك بووە، ئیتر لەو کاتەوە هیلدا بۆ یەکەمجار هەندێك شتی سەرەتای مارکس و لینین و تروتسکی و ماوتسی تونگی خوێندۆتەوە.

جیڤارا دواتر گەشتی کرد بەرەو مەکسیك، دوای ئەوەی باڵوێزخانەی ئەرجەنتین ئاگاداریکردەوە کە ئەو داواکراوە لە لایەن دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکیەوە. لەوێ چاوی کەوت بە (رائول کاسترۆ) ی برای( ڤیدڵ کاسترۆی )سەرۆکی کوبا کە خۆی ئەو هاوڕێ یانەی کە لەگەڵیدا بوون دورخرابوونەوە بۆ ئەو وڵاتە و لەوێ خۆیان ئامادە دەکرد بۆ شۆڕش و چاوەڕێ ی بەربوونی (ڤیدڵ کاسترۆ) یان دەکرد لە زیندان.

کاتێك ڤیدڵ کاسترۆ لە زیندان بەربوو گیڤارا بڕیاریدا پەیوەندی بکات بە شۆڕشی کوباوە.ڤیدڵ کاسترۆ وایدەبینی کە لە داهاتوودا زۆر پێویستیان بەو پیاوە دەبێت.

لەساڵی (١٩٥٩)ز پیاوانی جەنگی پارتیزانی بە سەرکردایەتی (ڤیدڵ کاسترۆ) هاڤانای پایتەختیان بڕی و حکومەتە دیکتاتۆریە سەربازیەکەی (لڤولجنسیو باتیستا) یان ڕوخاند، ئەوە سەرەڕای پڕچەککردنی حکومەتەکەی باتیستا لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو و پارمەتیدانی باتیستا بە کرێ گرتەکانی (سی. ئای.ئەی) ئەمریکی لە نێو ئەندامانی جەنگاوەرە پارتیزانەکانی کاسترۆدا.

شۆڕشگێڕە کوبیەکان لەسەر پشتی بەلەمێك چوونە کوبا، ئەوان ژمارەیان تەنها(٨٠) کەس دەبوو، دواتر تەنها (١٠) کەسیان لێ دەرچوون لە نێو ئەو( دە )کەسەشدا کاسترۆ و براکەی رائول و چیڤارای تیابوو، بەڵام ئەو هێرشە شکست خواردووە، زۆرێك لە لایەنگری بۆ دروستکردن، بە تایبەتی لە ناوچە گوندنشینەکاندا. لەلایەکی ترەوە بووە هۆی مانەوەی ئەو کۆمەڵەیەیی کە جەنگی پارتیزانیان دەکرد لە ماوەی دوو ساڵی پێشووتردا لە ناوچەکەدا،کە لە دەرئەنجامی جەنگەکانیان نیوەی ئەندامەکانیان لەدەستدابوو.

وتارەکەی کاسترۆ هۆکاربوو بۆ مانگرتنی گشتی،بەهۆی پلانەکەی جیڤاراش بە دابەزین لە چیاکان بە ئاراستەی پایتەختی کوبا (هاڤانا) شۆڕشگێران توانیان لە مانگی ینایەری ساڵی (١٩٥٩)ز بچنە نێو پایتەختی وڵات بە سێسەد شۆڕشگێڕەوە، ئیتر لەو کاتە بەدواوە توانیان سەردەمێکی نوێ دەست پێبکەن و حکومەتە دیکتاتۆرەکەی (باتیستا)بروخێنن.

لەو کاتەدا جیڤارا نازناوە (جی) ئەرجەنتینی وەرگرت و لەگەڵ هاوسەری دووەمیدا بە ناوی(ئەلیدا مارش) ژیانی هاوسەرگیری پێکهێناو چوار منداڵی لێ بوو، ئەمە دوای جیابوونەوەی لە ژنی یەکەمی.

جیڤارا وەك سەرکردەو جەنگاوەرێکی زۆر ئازا کە لە مردن سڵ نەکاتەوە، بە خێرا دەرکەوت و لە کاتی قەیرانەکاندا زۆر بە باشی هەڵسوکەوتی دەکرد، جیڤارا تەنها پزیشکێك نەبوو، بەڵکو بوویە سەرکردەیەك بە پلەی (عقید)هاوبەشی ڤیدڵ کاسترۆی کرد لە سەرکردایەتی شۆڕشدا. کاسترۆ سەرپەرشتی ستراتیژیەتی جەنگەکانی دەکرد و جیڤاراش پلانی دادەناو سەرپەرشتی جەنگەکانی دەکرد.

دواتر له پاش ئازاد کردنی ولآت یاسایەك له کوبا دەرچوو، که بەپێی ئەو یاسایه ڕەگەزنامەو مافی هاولآتی بوونی تەواوی دەدایه هەرکەسێك کە بە پلەی(عقید) لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا جەنگابێت لەکاتی شۆڕشدا، ئەو مەرجەش لە کەسدا نەبوو تەنها (جیڤارا) نەبێت، بەو پێیەش مافی تەواوی هاولآتی بوونی کوبی درا بە جیڤارا.

بۆیه وەك بەڕێوەبەری بانکی ناوەندی و سەرپەرشتیاری دادگایکردنی دوژمنانی شۆڕش و بنیادنانەوەی دەوڵەت دیاریکرا،لەو ماوەیەی کە شۆڕش شوعی بوونی خۆی ڕانەگەیاندبوو، بەڵام کاتێك شۆڕش بەتەواوی جڵەوی کارەکانی گرتە دەست بەتایبەتی سوپا، شۆڕشگێڕان حکومەتێکی شوعیان دروستکردو و چیڤارا لەو حکومەتەدا بووە وەزیری پیشەسازی و نوێنەری کوبا لەدەرەوەو وتەبێژی حکومەتەکە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، دواتر سەردانی هەریەکە لە چین و یەکێتی سۆڤیەتی کرد،هەرچەندە جیاوازی هەبوو لەگەڵ سۆڤیەتدا بە هۆی کشاندنەوەی مووشەکە بەرگریەکانی لە کوبا، دوای ئەوەی ئەمریکا واژووی لەسەر ڕێکەوتنامەیەك کردبوو بە ئەنجامنەدانی دەستدرێژی بۆ سەر کوبا.

دوای جێگیربوونی حکومەتی شۆڕشگێری نوێ بە سەرکردایەتی ڤیدڵ کاسترۆ لە کوبا، جیڤارا ئەم پۆستانەی لای خوارەوەی بەڕێوەدەبرد:بالۆێزی نێردراو بۆ دەستە نێودەوڵەتیه گەورەکان،ڕێکخەری میلیشیاکان، بەرێوەبەری بانکی ناوەندی،بەرپرسی پلاندانان و وەزیری پیشەسازی.

لە میانەی ئەو پۆستانەی کە وەریگرتن جیڤارا بەهەموو هێزو توانایەوە بەرەنگاری دەستێوەردانی ئەمریکیەکان دەبوویەوە، لەو چوارچێوەیەدا بە ڕێکەوتن لەگەڵ کاسترۆ بڕیاری خۆماڵیکردنی سەرجەم بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتیدا،ئەمریکاش گەمارۆکانی بۆسەر کوبا توندترکردەوە، ئەم کارەی ئەمریکاش بووە هۆی ئەوەی کە کوبا هەگاو بەهەنگاو لە یەکێتی سۆڤیەت نزیك ببێتەوە و یارمەتی و پاڵپشتی خۆی بۆ بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی هەریەکە لە ولآتانی چیللی و ڤێتنام و جەزائیر ڕابگەیەنێ.

جیڤارا هەوڵیدا بۆ دروستکردنی کۆمەڵەیەکی پارتیزانی لە وڵاتی (کۆنگۆ) بۆ بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیروبۆچونەکەی ڕەنگدانەوەیەکی فراوانی لای هەندێك لەسەرکردەکان لێ نەکەوتەوە، بەڵام جیڤارا سوربوو لەسەر هەڵوێستەکەی و بە پۆشینی جل وبەرگی دەوڵەمەندانە فکرەی خۆی داپۆشی و دەستیکرد بە گەشتە درێژەکەی، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتیکی ترو لە ناڕەحەتی و نەهامەتیەکەوە بۆ ناڕەحەتی و نەهامەتیەکی تر.

جیڤارا بەسەرکردایەتی (١٢٥)شۆڕشگێڕی کووبی چووە کیشوەری ئەفریقا، بۆ یارمەتیدانی شۆڕشگێڕە ئازادیخوازەکان، بەڵام ئەزموونی ئەفریقی شکستی هێنا لەبەر چەند هۆکارێك، لەوانە نەبوونی هاوکاری لە نێوان سەرکردەی شۆڕگێڕە ئەفریقیەکان و جیاوازی کەش و هەواو زمان. دواتر لەیەکێك لە نەخۆشخانەکانی شاری (براگ) خەوێنرا بۆ وەرگرتنی چارەسەر،لەوێ کاسترۆ بۆخۆی سەردانیکرد و دوای لێکرد کە بگەڕێتەوە کوبا، بەڵام مایەوەو لەوێوە ڕۆشتە (کۆماری کۆنگۆی دیموکرات) بۆ جەنگان لە پاڵ سەرکردەی شۆڕشگێڕی کۆنگۆی(باتریس لومومبا) ی، بەڵام دواتر لە (پۆلیڤیا) دەرکەوتوو لەوێ سەرکردایەتی شۆڕشێکی نوێ ی کرد.لەو ماوەیەدا هیچ جۆرە بەڵگەنامەیەك تۆمارنەکراوە، جگە لەو نامانە نەبێت کە بۆ کاسترۆی ناردووە، کە تا ڕۆژە کۆتاییەکانی تەمەنی پەیوەندی لەگەڵ نەپچڕاندو پەیوەندیان بەردەوام بوو.

پرۆژەی گیڤارا دروستکردنی بزوتنەوەی چەکداری پۆلیڤە نەبوو، بەڵکو ئامادەکاری بوو بۆ ڕێکخستنی ڕیزی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی کیشوەری ئەمریکای لاتینی، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی مەرامی ئەمریکیەکان لە بردن و تاڵانکردنی سەروەت و سامانی گەلانی کیشوەری ئەمریکای لاتینی.

لەسەرەتای ساڵی(١٩٦٧)ز گیڤارا خۆی و بیست جەنگاوەرەکەی بە تەنها بینییەوە لە ڕووبەڕوبوونەوەی جەند یەکەیەکی سوپای پرچەککراو بە بە سەرپەرشتی (سی. ئای.ئەی) ئەمریکی لە (بەراری پۆلیڤیای کەمەرەی ).جیڤارا دەیویست هەندێك کات

بکوژێت بۆ کۆکردنەوەی هێزو کارکردن لە پێناو کۆکردنەوەی جوتیاران و هیندیە سورەکان لە دەوری خۆی، بەڵام ناچاربوو جەنگەکە پێشوادەی خۆی دەست پێبکات.

جیڤارا بەسەرکردایەتی کۆمەڵێك شۆڕشگێڕ شۆڕشی ئەنجامدا لە پێناو جێ بەجێکردنی ئامانجەکانی. هەر لەو ماوەیەشدا واتە لە (٧ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٦ تا ٧ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٧)ز یاداشتەکانی ڕۆژانەی جەنگەکانی دەنوسیەوە.

لە ڕۆژی (٨ ئۆکتۆبەری ساڵی١٩٦٧))ز هەواڵێکی ناخۆش و وێرانکەر بڵاوبوویەوە بە ڕاگەیاندنی کوژرانی جیڤارا لەوڵاتی بۆلیڤیا لە جەنگێکی سەختی خۆی و هاوڕێ پاڵەوانەکانیدا لە دژی هێزە بۆلیڤیەکان، ئەو هێزانەی کە پڕچەککرابوون لە لایەن مارێنزە ئەمریکیەکانەوە.

بە درێژای ئەو نۆ مانگەی شۆڕشی بۆلیڤی بەسەرکردایەتی جیڤارا نەیان توانی بوو زاڵ بن بەسەریاندا و شۆڕش درێژەی کێشا تا کوشتنی جیڤارا. بە پلانە زیرەکەکانی جیڤارا هەزاران سەربازی ئەمریکی و بۆلیڤیان لە ناوبرد و دەستیانگرت بەسەر ڕووبەرێکی فراوان لە جەنگەڵەکان و دەچوونە نێو ئەو گوندانەی کە لە جەنگەڵەکانەوە نزیك بوون، بۆیە تا دەهات ژمارەی شۆڕشگێڕان زیادی دەکرد. ئەو شارەزایەکی تەواوی لە جەنگدا هەبوو، دەیزانی کەی هێرش دەکات و کەی پاشەکشێ دەکات و دەنگی تفەنگەکان بێدەنگ دەکات، بەڵام ئەوەی کە بە خەیاڵی جیڤارادا نەدەهات ئەوە بوو کە نزیکترین هاوڕێ ی کۆنی ناپاکی لەگەڵ بکات. ناپاکی نزیکترین هاوڕێکان شتێکی نوێ نیە لە مێژوودا، بۆیە کوشتنی ئەمیش شتێکی نامۆ و دەگمەن نیە لە مێژوودا. قیسەری ڕۆما ساڵانی پێش زایین لە لایەن نزیکترین کەسیەوە کوژرا و کۆتا قسەکانیشی چوونە مێژووە وە، کاتێك پێش ئەوەی بمرێت بە بکوژەکەی گووت:(تەنانەت تۆش ئەی بروتس)!!

جیڤارا لە وڵاتی بۆلیڤیا کوژرا لە کاتی هەوڵەکانی بۆ ڕێکخستنی شۆڕشێك لە دژی حکومەتی ئەو وڵاتە، کردەی دەستگیرکردنی بە هەماهەنگی بوو لەگەڵ دەزگای هەواڵگری ئەمریکی. دوای کردەی تیرۆرکردنی قەیرانێك سەریهەڵدا، کە بەقەیرانی (وتەکانی گیڤارا)ناسرا، واتە یاداشتەکانی، دوای ئەوەی بکوژەکانی و سەرکردە

ئەمریکیەکان کردیانە ئەفسانەیەك لە جیهاندا،بە شێوەیەك کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت باجەکەی دەدەن.

ئێستا زۆرینەی ڕژێمەکانی حکومڕانی لە وڵاتانی کیشوەری ئەمریکای لاتینی پەیڕەوی فەلسەفەو بەرنامەو تێگەیشتنەکانی گیڤارا دەکەن، بەڵکو سەرەڕای مردنیشی دوای چەندین ساڵ، پاڵنەرێکی باشە بۆ سەرکردەی ئەو سیستەم و ڕژێمانەی ئەمریکای لاتینی تادەنگی خۆیان بەڕووی ستەم و زۆرداری ئەمریکیدا بەرز بکەنەوە.

یاداشتەکانی ئەم پیاوە دوای پێنج ساڵ لە کوشتنی بڵاوکرانەوە، دوای ئەمە بوویە نیشانەیەك لە نیشانەکانی شۆڕشگێڕی لە دژی ستەم و نادادی

فلیکس رودری جیس سیخوری پێشوو لە دەزگای هەواڵگری ئەمریکی (سی.ئای.ئەی) وێنەی لە سێدارەکانی گیڤارای بڵاوکردەوە، ئەو وێنەیە کۆتا ساتەکانی ژیانی ئەو شۆڕشگێڕە ئەرژەنتینیە نیشاندەدات پێش لە سێدارەدانی لە (لاهیگویرا) لە دارستانی (ڤالی گراندی) لە پۆلیڤیا لە (٩ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٧)ز. وێنەکە چۆنیەتی دەسگیرکردنی گیڤاراو دانی بەزەویدا نیشاندەدات. لە،وێنەکەدا وادەردەکەوێت کەچاوەکانی نیمچەداخراون و دەم وچاوی ئاوساوەو شوێنەکە خوێناوی بووە بە ڕژاندی خوێنی ئەو. ئەو وێنەیە هەموو ئەو ئاماژەو قسانەی کۆتا پێهێنا کە لەمەڕ کوژرانی ئەو هەبوون لەو جەنگەی کە لەگەڵ پۆلیڤیەکاندا کردی.دوای چەند مانگێك لە کوژرانی ئەم نوسەرە پەردەی لەسەر ئەوە لاداو ئەوەی ئاشکرا کرد کە پەنجەکانی گیڤارا بڕاون بۆ ئەنجامدانی کاری توێکاری بۆ ناسینەوەی.

چیرۆکی دەستگیرکردن و کوشتنی گیڤارا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە دووان لە شۆڕشگێڕەکان دەستگیرکران و لە ژێرئەشکەنجەیەکی زۆردا دانیان بەوەدانا کە گیڤارا سەرکردەی شۆڕشەکەیان، ئیتر لێرە بەدواوە ڕاوەدوونانی تاکە کەسێك دەستی پێکرد. سی. ئای.ئەی ئەمریکی بە درێژای شاڵاوەکەی کە لە سەروی هەوڵەکانی سوپای پۆلیڤیەوە بوون، بە هەزاران سەربازی بڵاوە پێکرد بۆ پشکنینی ناوچە سەختەکان وگەڕان بەدوای چل کەسی لاوازو برسی.

له رۆژی (٨ ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩٧٦٩ ز له یەكێك له باخچه تەنگەكانی پۆلیڤیا هێزەكانی سوپای پۆلیڤی كه پێكدەهاتن له (١٥٠٠)ز سەرباز هێرشیانكردە سەر كۆمەڵەكەی گیڤارا كه پێكدەهاتن له (١٦)كەس، گیڤاراو هاورێكانی شەش كاتژمێری تەواو شەڕیانكرد، ئەوە شتێكی دەگمەن بوو ڕوویدا له شەڕی پارتیزانیدا له ناوچەیەكی بەردەڵانی سەختدا، به شێوەیەك كه تەنانەت پەیوەندی نێوانیان بوو بووە شتێكی نیمچه حەتمی.

گیڤارا بەردەوام بوو له جەنگ، تەنانەت دوای كوژرانی سەرجەم ئەندامانی كۆمەڵەكەی، سەرەڕای بریندابوونی قاچی بەسەختی و له دەستدانی تفەنگەكەی دوای شكانی مەخزەنی دەمانچەكەی، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی كه به زیندووی بكەوێتە دەستیان و به دیلی بگرن و بیگوێزنەوە بۆ گوندی(لاهیجیرا). پاش دەستگیركردنەكەی بیست و چوار كاتژمێر به زیندووی هێشتیانەوە، بەڵام ڕەدی كردەوە كه تەنانەت یەك وشەش لەگەڵ ئەو كەسانەی دەسگیریانكردوە قسەبكات.

له قوتابخانەی گوندەكەدا، ئەفسەری ڕیزكردن (ماریو تیران) ڕێنمای هەردوو ئەفسەرەكەی خۆی به ناوی (میجیل ئەیوروا) و (ئەندرێس سیلینش) ی جیّ به جێكرد به تەقەكردن له گیڤارا.

ماریۆ به دوو دڵیەوە دەستیكرد به كارەكەی، لەو كاتەدا گیڤارا پیّ ی گووت:تەقە بكە مەترسە،تۆ به سانایی تەنها كەسێك دەكوژی، لەم كاتەداكەمێك گەڕایەوە دواوە، بەڵام دواتر پاش ئەوەی هەردوو ئەفسەرەكە فەرمانەكەیان دووبارە كردەوە دەستیكرد به جیّ بەجێكردنی فەرمانەكەو له خوار كەمەریەوە له سەرەوە بۆ خوارەوە دایە بەردەسترێژی گولله، ئەوە ڕوون بوویەوە ئەو فەرمانه بۆ ئەوە بووە كه فیشەك بەر سەری یان دڵی نەكەوێت و ماوەی گیانەڵای درێژتر بێتەوە. دواتر چاودێری سەرخۆش لەلای چەپیەوە به دەمانچەكەی خۆی تەقەی لێكردو كۆتای به ژیانی هێنا.

دەستەڵاتدارانی پۆلیڤی ئەوەیان ڕەدکردەوە کە جەستەکەی ڕادەستی براکەی بکەنەوە،تەنانەت ڕازی نەبوون کەس شوێنی گۆڕەکەشی بزانێت، تا نەبێتە نزرگەیەك بۆ شۆڕشگێڕانی هەموو جیهان.

**+لە گرنگترین ئەو ووتە نەمرانەی گیڤارا کە تائێستاش سەرکردەکانی وڵاتانی ئەمریکای لاتینی دەیڵێنەوە:**

–من هەست بە ئازار دەکەم لە ڕوخسارمدا، کاتێك هەر زللەیەك بەر ستەم لێکراوێك دەکەوێت لەم جیهانەدا. لە هەر شوێنێك ستەم هەبێت ئەوە نیشتمانی منە.

–شۆڕش بە هێزە وەك پۆلاً، سورە وەك سکلّ، ماوەیە وەك دار بەڕوو، قوڵە وەك خۆشەویشتی شێتانەی ئێمە بۆ نیشتمان.

–ئەوەندە لام گرنگ نیە کە لە کویّ و کەی دەمرم، بە ئەندازەی گرنگی مانەوەی نیشتمان.

–شۆڕشگێڕان دنیایان پڕکرد لە هاوار، تا جیهان بە قورسای خۆی لەسەر جەستەی هەژاران نەخەوێت.

–بێگومان ڕێگەکە زۆر تاریك و ڕەشە،ئەگەر من و تۆ نەسوتێین ئەی کێ ڕێگەکە ڕووناك بکاتەوە.

بەم شێوەیە دوای زیاتر لە چل ساڵ لە تیرۆرکردنی، تا ئێستاش جەنگی گیڤارا(سەرخەری هەژاران و سەرکردەو شەهیدەکانیان، نیشانەو هێما بۆ یاخی بوون لە دژی وەحشیەتی ستەم و زۆرداری )بەردەوامە لە دژی ئەمریکیەکان، جەنگی ئیمپریالیزمیش لە دژی گیڤارا(گیڤارای وێنەو هێماو ڕۆشنای شۆڕش ) بەردەوامە.



بەو شێوەیە جەستەی تێکۆشەری شۆڕش گیڤارا دۆزرایەوە ئەو پیاوە ڕۆشت, بەڵام ئەفسانەکەی مایەوە تا ئەمەرییکیەکان باجی ئەنجامدانی ئەو تاوانە نەخوازراوەیان بدەن, تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان .



گیڤارا بووەتە ووشەی نهێنی بۆ هەر کەسێك بیەوێت وڵاتەکەی ڕزگار بکات له هەیمەنە و دەسەڵاتی ئەمەریکا

ڕۆژگارێك كه گەردەلوولی شەڕوخراپەی هیتلەر ئەوروپای گرت بووەوە و هێزەكانی بە ئاراستەی سنورەكانی ژێردەستەلاتی فەرەنسا دەكشان، لەو ڕۆژەدا فەرەنسا بەربەستەكەی بنیادنا، لە كاتێكدا كە ناچارنەكرابوو بە زۆر بیكات، ناوی بەربەستەكەشیان بە ناوی وەزیری بەرگری ئەوكاتەی ولأتەكەیان (ماجینۆ)وە ناونرا، هەموو خەونەكانی فەرەنسا لە پشت هێڵی بەرگری ماجینۆوە مۆڵیانداو چەند ڕۆژو مانگێك بگرە چەند ساڵێكیش زۆرێك لە توانا لۆجستیەكان و سەرچاوەكانی هێزیان لەسەر دامەزراند.

بەلأم كات هەموو شتێكی لەگەڵ خۆی ڕامالی و سەرجەم بەربەستەكانی ماجینۆی فڕێدایە نێو مۆزەخانەكانی مێژووەوە، كاتێك ئەڵمانەكان گەمارۆی فەرەنسایاندا لە بەرەی بەلجیكاو هۆڵنداوە بە تێپەڕبوون لە ڕووباری (وار)بەرەو پاریس، بەمەش توانیان پچڕانێكی تەواو دروست بكەن لە نێوان سوپای فەرەنسادا. بەم شێوەیەش لە فەرەنسا نزیكەی سێ ملیۆن مرۆڤ بوونە قوربانی لە كوژراو بریندارو دیل كراو، ملیۆنەها هاولأتیش توشی پەنابەری و دەربەدەری و ماڵ وێرانی بوون.

لەوانەیە وانەكەی ماجینۆ ئەو وانەیە بووبێت كە ئیسرائیلیەكان لێیەوە فێرنەبوو بن، لە پێش هەمووشیانەوە (حاییم بارلییف) كە واگومانی دەبرد ئەو هێڵەی كە بەناوی خۆیەوە بنیادی نابوو هێڵێكی پۆلأیینەو ناكرێت كە ببەزێنرێت. ئەمە لە نێو هات و هاوارێكی بانگەشەی ڕاگەیاندندا، لەمەڕ تێگەیاندنی ئەوەی ئەگەر میسریەكان هەوڵی هێرشكردنە سەر ئەو هێڵەبدەن وانەیەكیان پێدەدرێت كە بیریان نەچێتەوە، بەلأم وەك چۆن هێڵەكەی ماجینۆ تێكشكێنرا بە هەمانی شێوەش هێڵەكەی (حاییم)یش تێكشكا.

لە ڕاستیدا نەماجینۆ و نە بارلیف لە وانەکانی مێژوو هیچ فێرنەبوون. ڕۆم و ئەغریقیە کۆنەکان لە دێر زەمانەوە گرنگیەکی زۆریان بە قەڵاو دیوارە خۆپارێزیەکان داوە و چەکێکی زۆریشیان بەکارهێناوە بۆ لێدانی ئەو قەڵایانە. دیواری چین لە بەناوبانگترین هێڵەکانی خۆپاراستنە لە مێژووی کۆندا، کە درێژیەکەی (٢٢٤٠)کم و بەرزیەکەشی (٥) م دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەی توانی چین بپارێزێت لە داگیرکاری و پەلاماری وڵاتانی داگیرکەر.

هەر دووهێڵی (ماجینۆ)ی فەرەنسی و (بارلیف) ی ئیسرائیلی لەسەر بنەمای بیروباوەڕێکی کۆنی سەربازی بنیادنران، کە دەڵێت هێڵی بەرگری جێگیر ئامرازێکی نمونەییە بۆ پارێزگاریکردن لە سنوری وڵات و هێرشە دەرەکیەکان بە بێ زیانی گەورەی گیانی، بەرگری لە دوژمن دەکات، تەنانەت لەوەی کە بیر لە هێرش کردنیش بکاتەوە.

لێرەدا ئەو دوو هێڵە شرۆڤە دەکەین، کە پشتیان بەو فەلسەفەیە بەستووە ولە هەمان کاتیشدا شکستیان هێنا لە بەردەم ستراتیژیەتە گۆڕاوەکاندا.

دوای کۆتای هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم، فەرەنسا پشتی بە ستراتیژیەتێکی بەرگری نێگەتیف بەست بە دامەزراندنی هێڵی (ماجینۆ)کە بە نموونەیەك لە هێڵە خۆپارێزیەکانی بەرگری جێگیر دادەنرێت، لە ڕوانگەی ئەو باوەڕەی کە سەرکردە سەربازیەکان هەیان بوو بە توانای ئەو هێڵە بۆ وەستاندنی هێرشی هێزە ئەڵمانیەکان و ماندوکردنیان، دواجاریش کارئاسانیکردن بۆ هێرشی هەڵگەڕاوەو لە ناوبردنیان.

ئەوەی جێگەی باسکردنە لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا، هەندێك بیروباوەڕی سەربازی دەرکەوتن لە نێو دەوڵەتە گەورەکاندا، بۆ نموونە عەقیدێکی رووسی وای دەبینی کە ئامانج لە دروستکردنی بەربەستەکان ناچارکردنی هێزی هێرشبەرە کە لەیەك شوێنی دیاریکراوەوە هێرش بکات، بەوەش دەتوانرێت بەرپەرچ بدرێتەوەو لە ناو ببرێت.

فەرەنسا پشتی بە تیۆرێکی بەرگری دەبەست کە بنیادنرابوو لەسەر بەربەستە جێگیرەکان، بۆ ئەوەی سەربازەکان بپارێزێت. ئەڵمانەکانیش باوەڕیان بە جەنگی کت

وپڕ هەبوو لە چوارچێوەی ستراتیژیەتێکی هێرش بردن کە پشتی بە دووانەی فرۆکەو هێزی دەریایی دەبەست، بە شێوەیەك کە پەیوەندیەکی توند لە نێوانیاندا هەبێت.

بە نسبەت هۆکارەکانی بنیادنانی هێڵی ماجینۆ، دەبینین دوای ساڵی (١٩١٨)ز سەرکەوتنی فەرەنسا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە بۆ دورخستنەوەی فەرەنسا لە دوژمنکاریەکی چاوەڕوانکراو، بە تایبەتی لە سنوری باکوری ڕۆژهەلات لەگەڵ ئەڵمانیا، بە دیاریکراوی لە هەردوو ناوچەی (ئەلزاس و لۆرین). دوای لێکۆڵینەوە لە ستراتیژیەتی ئەڵمانی کەلەسەر تیۆری جەنگی کت وپڕ بنیادنرابوو، لە دەرئەنجامی کاریگەری ڕژانی ئەو خوێنەی کە فەرەنسا لە نێوان ساڵانی (١٩١٤–١٩١٨) ز بە خۆیەوە بینیی، بووە هۆی دروست بوونی هەستیاریەك لە نێو ڕای گشتی فەرەنسیدا بەرامبەر لە دەستدانی ملیۆنەها هاوڵاتی.

دوای پڕبوونی بیروهۆشی سەرکردە فەرەنسیەکان بە هەندێك بیروبۆچوونی ناشاز لە کەمی لە دایك بوون لە فەرەنسا و نەبوونی هاوسەنگیەك لە نێوان ژمارەی هاوڵاتیانی فەرەنسی و ئەڵمانی.

وەزیری بەرگری فەرەنسی (ماجینۆ ١٨٧٧–١٩٣٢)ز پەرلەمانی فەرەنسی ڕازیکرد بە بیرۆکەی بنیادنانی هێڵێکی بەربەست کە نەبەزێنرێت، بۆ قەرەبووکردنەوەی کەمی هێزی مرۆیی و پاراستنی گیانی هەزارەها سەربازی فەرەنسی، ئەمە سەرەڕای پێدانی هەلێك لەبەردەم هێزەکانی فەرەنسادا لە کاتی ڕوودانی هەر هێرشێك بۆ وەرگرتنی ڕێوشوێنی پێویست لە بەردەم هێرشی ئەڵمانیەکاندا.

ئەنجومەنی پیرانی فەرەنسی دەنگی لەسەر (یاسای ماجیینۆ)داو (٢,٩)ملیار فرەنکی فەرەنسی بۆ تەرخانکرد. بۆ پتەوکردنی بەربەستەکان کە بەدرێژای سنوری ئەڵمانی و ئیتالی بنیادنرابوو لە نێوان ساڵانی (١٩٢٩–١٩٤٠)ز، بەم شێوەیەش بەشێکی زۆری بودجەی بەرگری فەرەنسی بۆ بنیادنانی بەربەستەکان بە درێژای سنورەکان تەرخانکرا. بە تایبەتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەڵمانەکان، کە لە باکورەوە لە سویسرا درێژدەبوویەوە بۆ باشور لە دەریایی سپی ناوەڕاست.

فەرەنسیەكان هیوایەكی زۆریان لەسەر ئەو هێڵە هەڵچنی بوو و بڕوایان وابوو كە ژمارەیەكی زۆر لە ئەڵمانەكان دروێنە دەكات. لەو باوەڕەدابوون ئەو كارەش دەوەستێت لە كاتی سنوری بەیەكەوە گرێدانی فرقەی پیادەی ئەڵمانی بە فرقەی پیادەی فەرەنسیەوە.

هەرچی دەبابەو فرۆكەكانن، سەركردایەتی فەرەنسی وای دەبینی كە ئەوانە شتگەلێكی ناوەندین، لێرەدا ئەوان بیریان لەوە نەكردەوەو پلانیان بۆ دانەڕشت، لە كاتێكدا كە پێویست بوو ئەوە بكەن، ئەگەر هێڵەكەش نەبەزێنرایە. ئامانجی سەرەكی بنیادنانی ئەو هێڵە بەجێ هێنانی بەرگریكردن بوو لە سنورەكانی فەرەنسا بە كەمترین قەبارەی هێز بە هاوكاری لە نێوان هێزی پیادەو تۆپ هاوێژو ڕەگەزەكانی زانیاری.

## +بەنسبەت قەلآبەندیەكانی هێڵەكە خۆی دەبینێتەوە لە :

گونجاوی لە كاتی دروستكردنی قوللەكاندا،بە شێوەیەك توانای بەركەوتنی ڕاستەوخۆی هەبێت و نەڕوخێت. تا ئاستێك كە ئەستوری دیواری كۆنكرێتیەكەی بگاتە سێ مەترونیو، بەو شێوەیەش دەتوانێت لەیەك كاتدا سێ گوللە تۆپ وەربگرێت لەگەڵ سود وەرگرتن لە دەرئەنجامەكانی (دەستكەوتەكانی )چاڵەكەی، بە شێوەیەك كە ئەستوریەكەی لە سەروی چاڵ و سەنگەرەكانەوە (٢٠)م كەمتر نەبێت.

+هەروەها گونجاوی لە كاتی هەڵبژاردنی شوێنی قوللەو قەلآبەندیەكاندا، بۆ سود وەرگرتنی تەواو لە سروشتی زەوی، ئەمەش دەبێتە پەیدابوونی بوارێكی زۆر باش بۆ چاودێری و تەقەكردن، ئەمە لەگەڵ سودوەرگرتن لە بەربەستە سروشتیەكان، تا ببێتە بەرگریكارێكی باش بۆ دەبابەكان و سەرپەرشتی ناوچەكانی جەنگی دەبابەكانی دوژمن بكات.

لەسەر قوللە سەربازیەكان تاوەری زرێ پۆشیان دروستكرد بۆ چەكی ڕەشاشەكان، هەموو قوللەیەكی سەربازی خەندەقێك و مۆلیدەیەكی كارەباییان تێدا دانا بوو، كە دەورەدرابوو بە تەلی دڕكاوی وهێڵی ئاسنی شەمەندەفەر. لە پاڵ قوللەكان و

قەلأبەندیەکاندا کۆگاو شوێنی حەوانەوە بۆ هێزە کارکەرەکان و خزمەتگوزارەکان دروستکرابوون. ئەمەجگە لە لە گۆرەپانی ڕاهێنانی سەربازی و تۆڕی پەیوەندی لە نێو خەندەقەکاندا بۆ بەستنەوەی بەشەکانی قەلأبەندیەکە و هەڵگرتنی سوتەمەنی و ئاو خواردنی پێویست بۆ ماوەی سێ مانگ.

گونجاوی لە کاتی پڕچەککردنی خاڵەکانی هێڵەکە، بە شێوەیەك کە چەکەکان هاوتابن لەگەڵ ئەو ئامانجانەی کە لە پێناویا دروستکراون، ئەمە لەگەڵ توانای هەڵبژاردن لە قەلأو سەنگەرەکاندا.

گرنگترین چەکێك کە هەبوو چەکی(رابیل) بوو کە لە یەك خولەکدا (٥٠٠)فیشەکی دەتەقاند بە دوری(٢٤٠٠)م، هەروەها چەکی دژە دەبابە لە ئەندازەی (٣٧،٤٧)میللیمترکە دورییەکەیان (٨٠٠)م مەتری دەبڕی، ئەمە سەرەڕای چەکی هاوەن و هاوتزر لە جۆرو ئەندازەی جیاواز.

هێڵەکە بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی تێکشکا، لە کاتی دەستپێکردنی جەنگی جیهانی دووەم، فەرەنسا بە ڕادەیەکی گەورە ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەڵمانیا بوو،ئەو خاوەنی هێزو جبەخانەو هێڵی ماجینۆ بوو بۆ پاراستنی وڵاتەکەی بە درێژای سنورەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا، بەلأم گیانی شەڕکردنیان لە دەستدابوو، کە هەر لە ساڵی (١٩١٤)ز هەموو لایەکی پڕکردبوو. تەنها بەوە ڕازی بوون لە پشت هێڵەکەوە بمێننەوە، بە شێوەیەك بڕوایان بە هێڵی بەرگریەکەیان هەبوو تا ڕادەی بیروباوەڕی ئایینی، ئەو هێڵەی کە بەتواناترین و زیرەکترین سەرکردەکانی فەرەنسا دروستیان کردبوو.

لە (١٧یونیۆی ساڵی ١٩٤٠)ز هێزەکانی ئەڵمانیا توانیان سنورەکانی فەرەنسا ببەزێنن و بچنە نێو خاکی فەرەنساوە، دوای ئەوەی فرقەی (بانزر)ی ئەڵمانی توانی هێڵی بەرگری لە هێڵی ماجینۆ دوربخاتەوە و ئاراستەی هێرشەکەی بەرەو باکوری ڕۆژئاوا بگۆڕێت.

هێزەکانی ئەڵمانیا ئەوەیان دەزانی ئەو هێڵە تا سنورەکانی بەلجیکا و دەریایی باکور درێژدەبێتەوە و توانای ئەوەشی نیە بە تواناکانی خۆی خۆی ڕابگرێت و بمێنێتەوە.

سوپای فەرەنسی بە تەواوی تێکشکا و خۆیاندا بەدەست هێزەکانی ئەڵمانیاوە لە نیوە شەوی (٢٥یونیۆی ساڵی ١٩٤٠)ز جگە لە هێزەکانی هێڵی ماجینۆ نەبێت کە خۆبەدەستەوەدانیان ڕەدکردەوە تا کۆتای ئەو مانگە ، بەڵام دواجار خۆیاندا بەدەستەوە، دواتریش دەرکەوت کە خۆبەدەستەوە دانیان بە هۆی فشاری ئەڵمانەکانەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی ئەو ئاگادارکردنەوەیەوە بووە کە حکومەتی فەرەنسی بۆخۆی داوای لێکردوون.

شکستی فەرەنسیەکان دەرئەنجامێکی حەتمی بوو، بۆ سوپایەك کە پەیڕەوی ستراتیژیەتێك بکات بنیادنرابێت لەسەر جەنگ لە گۆڕەپانێکی جێگیردا، لە بەردەم سوپایەکدا کە پەیڕەوی هۆکاری میکانیکی نوێ بکات، و بنیادنراوبێت لەسەر هاوکاری و هەماهەنگی توندی نێوان فرۆکەو دەبابەکان. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هێڵی ماجینۆ بە درێژای سنوری فەرەنسی درێژنەبووبوویەوە، و لە سنوری بەلجیکادا وەستابوو و حکومەتی ئەو ولاتە ئەوەی ڕەدکردبۆوە لە باکورەوە بە ئاراستەی زەویەکانی درێژبکرێتەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە (هیتلەر )لەو ئاراستەو شوێنەوە دەستی خۆی بوەشێنێ.

قەلابەندیەکانی هێڵی هێزە فەرەنسیەکان نەیاندەتوانی پرەنسیپی هێواشکردنەوەی جوڵەو توانای هێرش بردن کەم بکەنەوە، وەك چۆن خۆیان ڕانەگرت لەبەردەم هێرشی ئاسمانی ئەڵمانەکاندا.

ئەڵمانەکان سەرکەوتووبوون لە خێرای و هێزی بۆردوومانکردن، ئەوان دوو سوپایان هەبوو، هێزی پیادەو تۆپ هاوێژ هێزی دەبابەو فرۆکەوانی، هەردووکیان لە چوارچێوەی یەك پلانی یەکگرتوودا کاریاندەکرد، کە ناسرابوو بە خێرای بڵاوبوونەوە لە هەستان بە جوڵەی ڕاپێچ کردن و گەمارۆدان. بەو شێوەیەش توانیان قوربانی بدەن بە قەلابەندیەکانی هێڵی ماجینۆ. لە زەویەکراوەکاندا جوڵەیاندەکرد و هێزەکانی مودەڕەعەو پیادە خێراییان دەبەخشیە ئەو جووڵەیە، بە هاوکاری چەکی پێشکەوتووی ئەڵمانی.

هێزەکانی ئەڵمانی چوونە فەرەنساوەلە دەرگای باکوری ڕۆژهەلأت،بەبێ ئەوەی هێڵی ماجینۆ هیچ گرنگیەکی جەنگی هەبێت، سەرەڕای بوونی قەلأبەندیەکی بەرگری زۆر و تۆکمە.

شارەزاکان لە هەڵسەنگاندنی ئەو هێڵە بوونەتە دووبەشەوە. ڕای زۆرینەیان وای دەبینی کە ئەوە کارێکی شکست خواردووبووە. لەبەر ئەوەی کە سەرکەوتوو نەبوو لە دورخستنەوەی فەرەنسا لە خراپترین تێکشکانی سەرشۆڕکەر لە ساڵی (١٩٤٠)ز.

هەندێکی تریان وای دەبینن کە ئەو هێڵە هۆکاری سەرەکی تێکشکانەکە نەبوو، و ئەو هێڵە مەبەستی سەرەکی بنیادنانەکەی هێناوەتەدی، کە بریتی بووەلە وەستاندنی هەر هێرشێکی ئەڵمانی چاوەڕوانکراو لە بەرەی ڕۆژهەلأتەوە.

سوپای فەرەنسی توانی جوڵە بکات و بلأو ببێتەوە و توانی زۆر بە باشی ئەو هێڵە بەکاربهێنێت بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەمی هێزی مرۆیی فەرەنسی. بەڵکو هۆکاری سەرەکی شکستەکە دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەوکردنی هێڵی ماجینۆ بۆ بەرگری جێگیر و پەیڕەونەکردنی سەرکردە فەرەنسیەکان بۆ شێوازی جەنگی نوێ لە جەنگی دەبابەو فرۆکەکان.

لە ساڵی (١٩٤٤)ز هێڵەکە بووبە شوێنەوارێك،دوای ئەوەی ئەڵمانەکان دیاریانکرد و بەکاریانهێنا وەك کۆگا. لە پەنجاکان و شەستەکاندا هەندێك شوێنی ئەو هێڵە نۆژەن کرانەوە تا ژەنەڕاڵ(دیگۆل)دەستەلأتی لە فەرەنسا وەرگرت و پشتی بە هێزی ناوەکی بەست لە پاراستنی فەرەنسادا.

### بە نسبەت هێڵی بارلییف:

هەموو وەردبوونەوەیەکی ئیسرائیلەکان دوای شکستەکەی ساڵی(١٩٦٧)ز وەستا بوو لەسەر نەهێشتنی هەر برینێك کە ڕوویدات لە هێڵەکانی پێشەوەی بەرگریکردن، لەبەرئەوەی ئەگەر ئەوە ڕوویدات ئەوە بەمانای شکستی تیۆری ئاسایشی ئیسرائیلی دێت کەلە سەر سنورەکان بنیادنراوە. لێرەوە ئیسرائیل دەستیکرد بە بەهێزکردنی هێڵی

بەرگری ئارام و بەهێزو جێگیر بەرامبەر نۆکەندی سوێس، وەك جێ بەجێکردنی تیۆری هێڵی بەرگری جێگیر.

(حاییم بارلیف)سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئیسرائیل، پشتگیری بیرۆکەی بنیادنانی ئەو هێڵەی کردوو، هەربە ناوی خۆشیەوە ناوی دەرکرد.ئامانج لە بنیادنانی هێڵی (بارلییف) بەتەنها سەربازی نەبوو، بەڵکو دەرونیش بوو، کاریگەریەکی قوڵی دەروونی هەبوو لەسەر متمانە بە خۆبوونی ئیسرائیلیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا بەرجەستەکەرێکی کُرداریش بوو لەسەر متمانە بە خۆبوون، بەو شێوەیەك کە گەیشتە ئاستی جەنگی کوێرانە و خۆبەزلزانینێکی هەڵخەڵەتێنەرانە، دوای ئەوەی دڵنیابوونەوە لە هێزو خۆپارێزی بەرگریەکانیان و توانایان لە تێکشکاندنی هەر هێرشیکی میسری لە ڕێگەی نۆکەندی سوێسەوە، لە کاتێکدا هەستی میسریەکان بەرامبەر ئەو هێڵە تێکەڵەیەك بوو لە نێوان سەرشۆڕکردن و مەیدانخوازیدا.

هێڵی بارلیف بە هێزترین هێڵی بەرگری بوو لە مێژووی نوێدا، لە نۆکەندی سویسەوە دەستی پێدەکرد تا قوڵای (١٢)کم لەناو نیمچەدورگەی سینا، بە درێژای کەناری ڕۆژهەلاتی نۆکەندەکە. هێڵەکە لە دوو هێڵ پێکهات بوو، کە پێکدەهاتن لە پێداویستیە ئەندازەییەکان و گۆرەپانی وەستانی دەبابەو تۆپەکان و یەدەکی مودەڕەعەو یەکەکانی تۆپە میکانیکیەکان، بە درێژای (١٧٠)کم بە درێژای نۆکەندی سویس.

ئیسرائیل دوای ساڵی (١٩٧٦)ز هێڵی بارلیفی بنیادنا، لەسەر پێشنیاری (حاییم بارلیف)ی سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئیسرائیلی، دوای جەنگی ساڵی(١٩٧٦)ز لە پێناو دڵنیابوونی سوپای ئیسرائیل لە بەرەی نیمچەدورگەی سیناوە.

هێڵی بالیف (٢٢) شوێنی بەرگریکردن و (٢٦)قەلابەندی لەخۆ دەگرت، بیناکانی پارێزراوبوون بە چیمەنتۆو پارچەی کۆنکرێتی گەورەو سکەی ئاسنین بە شێوەیەك کە دەیان پاراست لە هەر کارێکی بۆردوومانکردن. هەر قوللەیەك یان نوکتەیەکیش (٢٦)کونی لە خۆدەگرت بۆ ڕەشاشەکان و (٢٤)سەنگەریش بۆ سەربازەکان، ئەمە

سەرەڕای ژمارەیەك كونی تایبەت بە چەكی دژە تانك و پاركی وەستانی دەبابەو دانانی چەكی هاوەن و (١٥) ڕیزی تەلی دڕكاوی و كێڵگەی مین.

هەر خاڵێكی قەڵابەند پێكدەهات لە دامەزراوەیەكی ئەندازەی ئاڵۆز، كە ئەویش لە چەند چینێكی ناوەوەوسەرەوەی زەوی پێكدەهات و ڕووبەرەكەی بەگشتی (٤٠٠٠)م چوارگۆشە دەبوو. هەر خاڵێكیش ژمارەیەك لە سەنگەرو كونی تێدابوو، هەر قوللەیەكیش چەند كراوەیەكی لەخۆ دەگرت بۆ چەكی دەبابەو تۆپهاوێژەكان ، ئەم قوللانەش هەندێكیان بە هەندێكی تریانەوە بەخەندەقی ژێرزەمینی بەسترابوونەوە.

هەموو خاڵێك تەواوی پێداویستیەكانی بۆ دابینكرابوو، بە شێوەیەك بتوانێت كە بەرگری بازنەیی بكات، لە حاڵەتی شكستی هەربەشێك لە بەشەكانی تری هێڵەكە.

هەرشوێنێك دەیتوانی پەیوەندی بە شوێنێكی ترەوە بكات بە ئامێری سلكی و لاسلكی، ئەمە سەرەڕای پەیوەندی كردن بە سەركردە ناوچەییەكانەوە لەگەڵ پەیوەست بە هێڵی تەلەفۆنی مەدەنی ئیسرائیلی، تا سەربازەكان بتوانن لە هێڵی بەرگری بارلیفەوە پەیوەندی بە خێزانەكانیان بكەنەوە لە ماڵەوە.

هێڵی بارلیف بە بەرزیەكی گەورە جیادەكرایەوە تا ئاستی (٢٠–٢٢)م بە گۆشەی (٤٥) لەسەر ڕووی نۆكەندەكە. ئەمە جگە لە (٢٠)خاڵی قەڵابەند كە ناسرابوون بە قوللە بە دوری نزیكەی (١٠–١٢)كم لە یەكترەوە و هەرخاڵێكیش (١٥) سەربازی لەخۆدەگرت، ئەمانە بەرپرسیابوون لە ئاگاداركردنەوە لە هەر هەوڵێكی پەڕینەوە لە نۆكەندەكە و تەقەكردن لەو هێزەی كە هەوڵی پەڕینەوەكە دەدات. ئەمە جگە لەوەی لە هەر بنكەیەكدا بۆری پڕ لە گازی سوتێنەر هەبوو كە بە درێژای كەناری نۆكەندەكە جێگیركرابوون، بۆ ئەگەری ڕوودانی هەر هەوڵێكی پەڕینەوە تا لە ڕێگەی ناپاڵمەوە گڕیان تێبەردرێت و بەرگری لەهاتنی هێزە میسریەكان بكەن.

بەڵام پێش ئەوەی هێزە هێزە میسریەكان بپەڕنەوە، كیسەڵە دەریاییەكان كە پێكدەهاتن لە هێزێكی دەریایی تایبەت، دەمی سەرجەم ئەو بۆرییانەیان بەست وەك پێشەكیەك بۆ دەست پێكردنی هێرشەكانیان و پەڕینەوەیان لە ڕۆژی دواتردا.

ئیسرائیلیەکان ماوەیەکی درێژ گرنگیان بەو هێڵەداو، لەو باوەڕەدابوون کە پەڕینەوە لەو هێڵە شتێکی موستەحیلە و دەتوانێت سوپای میسری لەناو ببرێت ئەگەر هەوڵی هەر جۆرە پەڕینەوەیەك بدات لەو هێڵە لە ڕێگەی نۆکەندی سویسەوە، ئەمە جگە لەوەی کە بانگەشەی ئەوەیاندەکرد کە ئەم هێڵە زۆر لەو هێڵەی کە فەرەنسیەکان بنیادیان نابوو لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەهێزترە.

سوپای میسری لە ڕۆژی (٦ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٢)ز توانی لە نۆکەندی سوێس بپەڕێتەوەو ئەو بەربەستە خۆڵیە کە دروستکرابوو لە هەشت شوێنەوە کون بکات و سێ ملیۆن مەتر موکەعەب خۆڵ لابەرێت لە ڕێگەی بەکارهێنانی ترومپای ئاوی پەستان بەرز، ئەم ترومپایانە پێشتر وەزارەتی کشتوکاڵ کڕیی بوونی بۆ مەبەستی بەکارهێنانی سیاسی و سەربازی.

دواتر توانیان دەست بەسەر زۆرینەی خاڵەکانی قەڵابەندیەکەدا بگرن بە کەمترین زیانی مرۆیی کە دەگەیشتە(٤٤)کەس، ئیسرائیلیەکانیش لەبەرامبەردا (١٢٦)کوژراو (١٦١)دیلیان لێگیرا، هیچ خاڵێکی قەلا بەندیەکە خۆی ڕانەگرت جگە لەیەك دانەیان نەبێت بەناوی (بۆدابێست)لە ئەوپەڕی باکوری بۆرسەعید.

تێچونی هێڵی بارلیف لەو کاتەدا (٥٠٠)ملیۆن دۆلار بوو، بنیادنانەکەشی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیی بوو، تا کۆتای هات بە گۆڕانی قەڵابەندیەکان بە دامەزراوەیەکی ئەندازەی تەیار بە سەرجەم هۆکارەکانی ژیان و مانەوەو جەنگ کردن. شوێنی هەڵکەوتەی هێڵی قەڵابەندیەکە بڵاوبووبوونەوە بە درێژای هێڵی بەرگری کە زیاترلە (١١٠)کم دەبوو، لە سەروی نۆکەندی سویسەوە درێژدەبوویەوە تا کەنارەکانی دەریایی ناوەڕاست. شوێنی بەرگریەکان زیاتر لە (٢٢)شوێن دەبوون، کە زیاتر لە (٣٠)خاڵی

قەلأبەندیان لەخۆدەگرت و زاڵ بوون بۆ بەرگری کردن لە پێش و دواوە بۆ ڕوماڵکردنی هەموو ئەو شوێنانەی کە شیاوبوون بۆ پەڕینەوە و ڕێگەیان دەدا بە پێشکەوتنی هێزەکان لە بیابانی سینا،لە مەوداکانی نێوان ئەو خالأنەشدا گۆڕەپانی دەبابەکانی لیَ بوو کە زیاتر لە (٣٠٠)گۆڕەپانی پارك کردن مەزندە دەکران.

هەردامەزراوەیەکی ئەندازەیی زیاتر لە نهۆمێکی لەخۆدەگرت، یەکەمیان لە ژێرزەویەوە دەستی پێدەکرد تا سەروی بەربەستە خۆڵیەکە لەسەرەوە. بیناکان پارێزراوبوون بە چیمەنتۆ و پارچەی کۆنکرێتی، یان بە سکەی ئاسنین و ڕملّ و خۆلّ، بە شێوەیەك کە خۆپارێزی تەواوی تێدا ڕەچاوکرابوو لە بەرامبەر بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی تۆپی تۆپ هاوێژەکان و بۆمبی فڕۆکەکان، جگە لەمەش گەنجینەی سوتەمەنی و کەرەستەی گڕگرتوو و حەوزی ناپاڵمی تێدابوو بە شێوەیەك پاڵیدەنا بە سوتەمەنیەکەوە لە میانەی بۆریە تایبەتیەکان بۆ کەناری ئاوی نۆکەندی سوێس، بە گڕگرتنیشی کەناڵەکەی دەگۆڕی بە کەناڵێك لە بڵێسەو ئاگر و بە خێرای پلەی گەرمی دەگەیاندە (٧٠٠)پلەی سەدی.

ئەمە جگە لەوەی هەرخاڵێك گەنجینەیەکی تێدابوو کە پێداویستیەکانی دابیندەکرد. بینین لە نێو هێڵەکەدا لە ڕێگەی (جیروسکوبات)وە ئەنجامدەدرا، وەك ئەوانەی کە لە نێو ژێردەریایەکاندا بەکاردەهێنرێن، کە دەتوانرێت بەهۆیانەوە بەرگریەکی بازنەی بکرێت لە سەرجەم لاکانەوە.

خاڵەکان بە شێوەیەك پڕچەککرابوون کە تەنها یەك خاڵیان لە توانایدا هەبوو بەرگری هێزێك بکات بە ئەندازەی کەتیبەیەك بۆ ماوەی یەك هەفتە، بە شێوەیەك کە خاڵەکانی هێڵەکە زیاتر لە (سێ )خاڵ دەبوون، واتە بە هەموویانەوە لەیەك کاتدا توانای وەستاندنی هێرشی زیاتر لە (٣٠)کەتیبەی پیادەیان هەبوو. سەرەڕای ئەمانە سەدان دەبابەی

ئامادەباشی لێبوو تا بچنە سەنگەرەکانیان لە نێو بەربەستە خۆڵاویەکان، بە پێچەوانەی ئەوانەی لەناو قولآیدا هەبوون لە یەدەکی مودەڕەعەکان، ئەوانیش دەورەدرابوون بە تەل و بەربەستی دڕکاوی و کێڵگەی مینی چڕ، بە هەمان شێوەش لە ئاوەکانی کەناری ڕۆژهەلآتی نۆکەندەکەش جێگیرکرابوون.

ئەو هێڵە بەتەواوی پارێزبەندی بۆکرابوو، بە شێوەیەك نۆکەندی سوێسی خستبۆوە بارێکی دەگمەنەوە لە مێژووی سەربازیدا، بۆیە کردەی بڕینی(وەك بەشێك لە کردەی هێرشی سەربازی سەر نۆکەندەکە )نموونەیەکی شازو دەگمەن بوو لە شێوازی شکاندنی بەربەستە ئاوی و قەلآبەندیەکان لە یەك کاتدا.

ڕۆژی (٦ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٢)ز هات و پێکدادانی ڕاستەوخۆو ڕووبەڕووبوونەوە ڕویدا بە درێژای درێژبوونەوەی بەرەکە، نەك لە نزیك هێڵەکە بەڵکو دوژمن بەتەواوی دورکەتبووەوە لە هێڵەکە، شکستەکە لەسەر دەستی هێزەکانی پیادە هاتە ئاراوە بە پلەی یەکەم، چونکە ئەوان قەلآکانیان پارێزراوبوون لە بۆردوومانی تۆپە قورسەکان و چەکەکانی تر ئەمەش هۆکاری یارمەتی دەربوو بۆیان.

سەرەتای بۆردوومانەکە بە چوار هەزار هاوەن و لێدانی ئاسمانی چڕ بە نزیکەی (٢٢٠)فرۆکەی جەنگی دەستی پێکرد.

داستانی تێك شکاندنی هێڵی (بارلیف)لەناو ئاخنی خۆیدا ململانێ بوو لە نێوان ئازایەتی بەرگریدا، ئازایەتی جەنگاوەری ڕووت و بەرگری تاوەرو قەلآبەندیە دروستکراوەکان، وەك ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان فەلسەفەی هێڵی جولآو تیۆری هێڵی قەلآبەندی جێگیر.

تێکشکانی هێڵی بارلیف ڕاستی ئەو وتەیەیی ژەنەڕاڵ (بوفر)ی سەلماند کە دەڵێت: (بەرگری هەرچەندە پتەو قەلأبەندیش بێت وەك هێڵی بارلیف، بەلأم دواجار هەر دەکەوێتە بەر بڕین و وێرانکردن، مادام هێزی هێرش بەر خاوەنی هێزی زۆر و ڕێکخراو بێت، بە ئەندازەیەك کە سەرکەتنی لە خۆگرت بێت. )

ئەوە سەلمێنرا لە پلانە سەربازیەکانی ئیسرائیلیەکان کە بنیادنراوی هێڵی جێگیری قەلأبەندی بوون لە سەر نۆکەندی سوێس، پشتیان بە بیرۆکەی دەروونی بەست بوو لەڕوی سەربازیەوە و نە گەڕابوونەوە بۆ پرس و ڕاکردن بە کەسانی ستراتیژی کە لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا وەریانگرت بوو.

دوای ئەو تێکشکانە گاڵتەجاڕیەیی کە بەسەر هێڵەکەدا هات، لێدوانی بەرپرسە ئیسرائیلیەکان بەتەواوی پێچەوانەی ئەو وتانایان بوو کە پێش جەنگەکە دابوویان، تۆمەت و پەنجە درێژکردن بۆ یەکدی لە نێو سەرکردە ئیسرائیلیەکاندا زۆر بوو، هەر کەسە دەیویست خۆی بێتاوان بکات لێ ی و بیانوویەك بدۆزێتەوە بۆ ئەو شکستە خێراو کت و پڕەی کە بەسەر هێڵی بەرگریەکەدا هات بوو.

بالیف ئەوەی لە بیرکردبوو یان لەبیری خۆی بردبۆوە کە لەکاتی دوای تەواو بوونی پرۆژەکە گوت بووی: (میسریەکان ئەو دۆزەخە ناناسن کە بەسەریاندا دەکەوێت، ئەویش بەتەنها بە پێ خستنیان بە دەرەوەی کەناری خۆرئاوای نۆکەندەکە)

سەرۆك وەزیرەکەشیان ئەو قسانەی خۆی لەبیر کردبوو کە پێش جەنگەکە گووت بوونی بەوەی : (هەر بیروبۆچونێك ڕێگا بە خۆی بدات لە بەرامبەر ئەوەی کە هەیە لە قەلأبەندیەکاندا بە پەڕینەوەی هێزە میسریەکان لە کەناری ڕۆژهەلأتەوە بۆ نۆکەندەکە، ئەوە گاڵتەو سوکایەتی بە ژیری و عەقڵ دەکات!!)

بەو شێوەیە کە پێشتر باسمانکرد هێڵی (ماجینۆ) دوای ئەوەی بوویە شوێنەوارێك ئەڵمانەکان وەك کۆگایەك بەکاریان دەهێنا، دوای ئەوەش (دیگۆل)دەستەڵاتی فەرەنسای وەرگرت، بوویە هێڵێکی چۆڵ و هەندێك خاڵی لە زیادکردنێکی ئاشکرادا فرۆشران و بەشەکانی تریشی بوونە شوێنی ژیان و هێلانەی قەلەڕەشەکان و هەندێکیشی وەك شوێنی گەشتیاری لێهات و خەڵکی بۆ تەماشاکردنی سەردانیان دەکرد.

هەرچی هێڵی (بارلیف) یش بوو بۆ هەتاهەتای لەسەر ڕووی سەر زەوی سڕایەوە، ئەو هێڵەی کە ئیسرائیل وا گومانی دەبرد ڕووی مێژوو دەگۆڕێت، بەڵام چووە مێژوەوە لە دەروازەی شوێنەوارە مێژوویەکانەوە. پاشماوە تێکشکاوەکانی هێڵەکەش دوای ئەوەی کەوتە دەست میسریەکان، گۆڕا بۆ مادەی خاوو بەکاریان هێنا بۆ دروستکردنی بنکەو بارەگا نوێکانیان. میسریەکان بە شەش کاتژمێر تێکیان شکاند،لە کاتێکدا کە ئیسرائیلیەکان بە شەش ساڵ بنیادیانا بوو.

World's Greatest Underground Fortifications Guard France

INVISIBLE and sunk beneath the rolling and wooded terrain in Lorraine is a great underground fortification system, 200 miles long, guarding France's vital industrial area.

The forts, which cost 150 million dollars, are the greatest in the world and defy attack by gas, infantry, artillery, or air bombs. Living quarters, magazines, power stations, and control stations are out of reach of all means of attack. Bulkheads in the underground passages shut out both gas and invaders and armored posts at various points bring additional protection.

German Rises Six Miles in Rocket

IN HISTORY'S first successful rocket flight, Otto Fischer, brother of the inventor of the rocket plane, was shot 32,000 feet into the air in a shining 24-foot steel projectile.

With a blinding flash the rocket ship shot out of its steel framework and disappeared into the sky. It reappeared a few minutes later, dangling from a parachute, its pilot maneuvering to land on the little island of Rugen in the Baltic Sea, where the flight started.

The pilot was quoted as saying, "I left the ground in a deafening roar and lost consciousness for a moment. When I came to my senses the altimeter was flickering at 32,000 feet. It began to drop rapidly. I pulled the parachute release ring."

Moisture Fan Beats Tropic Heat

NEW air conditioning fans, tiny but wonderfully efficient, are being installed in every French government office in the tropics.

A drum filled with ice water or other liquid revolves inside the unit, throwing liquid out through short capillary tubes into blades of two fans turning at 4000 r.p.m. Large halls can be cooled and humidified in 10 min.

54 Modern Mechanix and

هێڵی ئەندریە ماجینۆ کەناوی خۆی هەڵگرت بوو , سەر دەستەی قەڵا بەرزە جێگرەکان بوو , شکستی هێنا وەك چۆن هێڵی بارلیف لەدوای خۆی شکستی هێنا لەبەردەم ستراتیژیە سەربازیە گۆڕاوەکاندا




هێڵی حایم بارلیف سەرکەشی و لەخۆبای بوونی خاوەنەکەی حایم بارلیف و هاوڕێ ئیسرائیلیەکانی چەسپاند , دوای ئەوەی کە بەشەش ساڵ بنیادیان نا, میسرییەکان بەشەش کاتژمێر تێکیان شکاند.



سەربازە ممیسریەکان هێڵی بەرگریەکەیان تێکشکاند و لەکەناڵەکە پەڕینەوە



سەربازە ئیسرائیلییەکان لەبەردەم ئەو کون و دەلاقانەی کەسوپای میسری کردیە هێڵەکە خۆیان ڕانەگرت و خۆیان دابەدەستەوە

## 6-بۆریس یلتسن... ئیمپراتۆریەتەکەی تێکشکاند و کلیلەکانی جیهانی ڕادەستی ئەمریکیەکان کرد!!



له (٨ دیسەمبەری ساڵی ١٩٩١)ز له باخچەی (بیلوفین) له نزیك (مینسك) سێ سەرۆك لە كۆی پانزە سەرۆك كۆمار لە كۆمارەكانی یەكێتی سۆڤیەت كۆبونەوە، بە سەركردایەتی بۆریس یلتسن سەرۆك كۆماری رووسیا، بۆ واژۆكردنی بەڵگەنامەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو هێزە مەزنەی كە تەمەنی گەیشتبووە (٧٤) ساڵ، یەكێتی سۆڤیەت.

ئەو ساتە جیاكەرەوە بوو نەك تەنها لە مێژووی ئەو یەكێتی یەیی كە سزای لە سێدارەدانی بۆ دەرچووبوو، بەڵكو لە مێژووی جیهاندا بەگشتی، لە دەرئەنجامی نەمانی هێزی دوو جەمسەری و نەمانی هاوسەنگی هێز و دەرچوونی یەكێتی سۆڤیەت لە هاوكێشەكەو بەجێ هێشتنی سەری پەتەكە بۆ ئەمریكیەكان، تا ئەوە پێیان خۆشە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بەبێ هیچ بەربەست و مەرجێك ئەنجامی بدەن.

یەكێتی سۆڤیەت بە شێوەیەكی فەرمی لە ساڵی (١٩١٧-١٩٩١)ز درێژەی كێشا. ڕاگەیاندنی كۆتای هاتنی بە شێوەیەكی فەرمی وەك یەكێتیەك یان دەوڵەتێكی زلهێز پێشوەختە ئاماژەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لێ دەركەوت بوو، سەرەتاكانی بە مردنی سەرۆك ( لیونید بریجنیف) لە ساڵی (١٩٨٢)ز دەستیان پێكرد، ڕووداوەكان خێرابوون دوای ئەوەی سەرۆك (میخائیل گرۆباشۆف) دەستەڵاتی وڵاتی وەرگرت لە ساڵی (١٩٨٥)ز هەوڵیدا چاكسازی بە ڕێگەیەكی هەڕەمەكی بكات، ئەو چاكسازیانە بەخێرای لێیان دەركەوت كە زیانێكی زۆرتریان هەیە لەوەی كە قازانج و سودیان هەبێت، هەرچەندە دواتریش ئەوەی ڕەدكردەوە كە تۆمەتباربكرێت بە بەرپرسیاریەتی داڕوخانی. ... ئەوەی كە هەڵەكەی ئەنجامدا سەرۆكی رووسیا(بۆریس یلتسن) بوو، ئەو كاتێك هات سوربوو لەسەر لەناوبردنی ئەو دەوڵەتە بە خێرای، ئەویش بە هەڵگەڕانەوەی لە (گرۆباشۆف).

دوای ئەوە زۆری بەسەردا تێنەپەڕی زۆرینەی دانیشتوانی کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، بە تایبەت ڕووسەکان هەستیان بە قورسی و گەورەی ئەو تاوانە کرد کە سەرۆکی ڕووسی (یلتسن) ئەنجامی دابوو، بەدەرکردنی دەوڵەتەکەیان لە مێژوودا دوای هەڵوەشاندنەوەی.

زۆرینەی شیکەرەوانی سیاسی ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی کە ئەوەی ڕویدا لەسەروی خەیاڵەوەی بوو، مەزنترین سەرۆکی ئەمریکی نەیدەتوانی ئەو کارەبکات کە سەرۆك یلتسن بۆی ئەنجامدا بوو، تا ئێستەش ئەمریکیەکان باس لەو سەرۆکەی ڕووسیا دەکەن و دەڵێن: (خزمەتی ژیانی )پێشکەش کردوون، لە کاتێکدا زۆرینەی چاودێرانی جیهان لەو باوەڕەدان ئەو (هەڵەی ژیان)ی ئەنجامداوە، تەنانەت هەندێك کەس بە گەورەترین هەڵەی سەدەی بیستەمی ئەژمار دەکەن.

بیریاری بەناوبانگی ڕووسی دکتۆر زیکییف دەڵێت: (ساڵەکان تێپەڕین و چەندین ساڵ تێپەڕی بەسەر توێژینەوەیەکی قوڵ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت : کێ بوو وڵاتەکەی هەڵوەشاندینەوە لەسەدەی بیستدا؟ هەوڵی زۆردراوە بۆ شرۆڤەکردنی ئەو حاڵەتە نامۆو نادیارە لە مێژووێ نزیکماندا و بیروبۆچون و تیۆری زۆر لەو بارەیەوە خراونەتە ڕوو، بەڵام هیچ کام لەوانە لە ئاستی ئەو ڕووداوە مەزنەدا نەبوون. هیچ کەسێك بە شێوەیەکی دروست نەیتوانیوە ئەو لێکبداتەوە کە بۆچی وڵاتەکەمان بە شێوەیەکی خێرا هەڵوەشایەوەو نەما.ئەو وڵاتەی کە لە ڕووی بوژانەوە و پێشکەوتندا گەیشتبووە ئاستی دەوڵەتە مەزنەکان، وە چۆن ئەو گەلە پاڵەوانە گۆڕا بە گەلێکی براوی کەرتکراوی جێگەی پێکەنین و قەشمەجاڕی. کە(بیرەیەك) گرنگترین حاڵەتی پیشەسازی و کشتوکاڵی و ئابوری وڵاتەکەی بێت. )

تەنانەت ئەوەی کە یلتسن بۆی ڕۆشت لە لە لەناوبردنی ئیمپراتۆریەتەکەدا بریتی بوو لە کردەی هەڵوەشاندنەوە بۆ چاککردنی شتە خراپکراوەکان، ئەوانەی کە شیوعیەکان هۆکاربوون بۆیان. هەرچەندە ئەو کردەیە بە شێوەیەکی بەرچاو دیکتاتۆریەتی حزبی

شیوعی هەڵوەشاندەوە، بەلاَم ئەوە گرگرتنێکی بیَ ئاگربوو، بۆیە یەکێتی سۆڤیەت لە دەرئەنجامی نەبوونی جێگرەوەیەکی گونجاودا مرد.

تەنانەت زۆرینەی پسپۆرە ئەمریکیەکان لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و ئەو حاڵەتە کارەساتبارەی کە دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا بەسەر مرۆڤایەتیدا هات پرسیاردەکەن کە ئایا ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت بەخششێك بوو بۆ مرۆڤایەتی یان نەهامەتیەك بوو بۆ جیهان؟ تەنانەت گەلی ئەمریکاش بۆخۆی هەمان پرسیاردەکات کە دوای ئەوە ئیدارەی (بۆش) ڕای کێشایە نیو جەنگەکانەوە دوای دروست بوونی تاك جەمسەری لە ئاستی جیهاندا.ئەو ئیدارە توندڕەوەی کە خەونی دەبینی بە دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانیەوە کە بنیادنراو بێت لەسەر هێز، ڕۆشت و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت نقوم بووە لە نێو هەردوو زۆنگاوی عێراق و ئەفغانستان، تەنانەت ئەوەی بەسە کە ڕق و قینی جیهان زیادی کردووە بەرامبەر ئەمریکیەکان بەهۆی ئەو سیفەتەیان کە بە بانگەشەکەری مردن و تێکدان و وێرانکردن ناسراون.

لە هەمان کاتداو تا ئێستاش بەردەوام زۆرینەی زۆری گەلی ڕووسی لە ڕێگەی ئەو ڕاپرسیانەوە کە بەشێوەیەکی ڕێکخراو ئەنجامدراون لە دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت بەداخن بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی یەکەیان، نەك لەبەر خۆشەویستیان بۆ بۆ شیوعیەت، بەڵکو لەبەر لەدەستدانی ئەو دەوڵەتەی کە خویان پێوەگرت بوو و ڕێگەیەکی ئارامیش بوو بۆ ژیانیان.

لەگەڵ ڕەدکرنەوەیەکی تەواوی ئەوەی کە ڕۆژئاوا دەیڵێت لە دارمانی یەکێتی سۆڤیەت کە (کارێك بوو دەرچوونی لیَ نەبوو) بە هۆی ئەو هەڵە کوشندەو میراتیانەی کە هەی بوو. رووسەکان خۆیان باوەڕیان وایە کە سیَ هۆکاری خودی یەکێتی سۆڤیەتی تەقاندۆتەوە :

یەکەم ئەو ڕێگەیەیی کە گرۆباشۆف گرتیەبەر بۆ چاکسازی سیاسی ئابووری. دووەم ململانیَ ی دەستەلاَت کە یلتسن یەکێتی سۆڤیەتی پیَ ڕوخاند لە پێناو ڕزگاربوون لە گرۆباشۆف. سێهەم پەیوەندی بەو بژاردە بیرۆکراتەی یەکێتی سۆڤیەتەوە هەبوو کە

دەستیان بەسەر موڵکیەتی گشتی یەکێتی سۆڤیەتدا گرت بوو، ئەوان بەشبەشکردنی سەروەت و سامانی زۆری دەوڵەتیان لە ساڵی (١٩٩١)ز پێ باشتربوو لە بەرگریکردن لێی.

تا ئێستاش زۆرینەی روسەکان دیسەمبەری ساڵی (١٩٩١)ز بە کارەسات ناودەبەن لە ڕوانگەی ئەو گوتەیەی کە دەڵێت : (هەرکەسێك بەداخەوە نەبێت بۆ تێکشکانی یەکێتی سۆڤیەت، کەسێکە دڵی نیە ).

پسپۆڕانی سیاسی تەنانەت ئەمریکیەکانیش کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەمیشە جێگرەوە هەبووە لە مێژوودا، بۆیە دووبارە دامەزراندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت و چاککردنی یەکێکە لەو جێگرەوە لەدەست چووانە وەك هەلێك بۆ دیموکراتیزەکردنی رووسیا و بنیادنانی بازاڕی نوێ، بە هۆی ئامراز گەلێکەوە کە پلەبەندی زیاتری تێدا ڕەچاوکرابێت، هەروەها لە ڕێگەی کۆدەنگی کەمترین ئازارو دروستکردنی ناڕەحەتی و کێشەکان، بەو شێوەیەش زۆرترین سودو کەمترین تێ چوونی دەبێت و زۆر باشتریشە لە هەڵوەشاندنەوەو لە لەناوچوون ! !

لە ڕاستیدا ئەو ڕێگەیەی کە یەکێتی سۆڤیەتی بە کۆتا هێنا، لە بارودۆخێکی کارەسات باردابوو و تێڕوانینێکی هەڵەش بوو بۆ داهاتوو ، یەکێك لەو قسانەی کە لایەنگرانی یلتسن جەختیان لەسەر دەکردەوە و بانگەشەیان بۆدەکرد ئەوەبوو کە دەیانگووت : (وڵات ڕزگارکە لە چارەنوسێکی خوێناوی وەك یوگۆسلاڤیا، بۆیە هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت با بە ئاشتی بێت ).ئەو بەرگریکردنە لە یلتسن پێچەوانەی واقع بوو، بۆیە بووە هۆی ڕودانی جەنگی ئیتنی و ئەهلی و ململانێ ی توندوتیژەکان سەراپای ئاسیای ناوەڕاست و قەوقازیان گرتەوە و بووە هۆی کوژرانی سەدان هەزار هاوڵاتی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و سەربڕینی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە، کە تائێستاشی لەگەڵدا بێت ئەوە بەردەوامی هەیە. کردەی هەڵوەشاندنەوەکە لە ڕوانگەی بیروبۆچوونی رووسەکانەوە گۆڕا بە تاوانێکی گەورە، وردە وردە باسکردن لە ناپاکی گەورە بە ئاشکرا دەرکەوت لە نێو تۆمەتبارکردنی یەکدی بە ناپاکی.

لە مانگی دیسەمبەری ساڵی (١٩٩١)ز لە کاتێکدا کە یەکێتی سۆڤیەتیان هەڵوەشاندەوەو تێکیان شکاند بە یەکجاری و پارچە پارچە بوو، بۆ یەکەمجار یاخی بونێکی سەربازی شکست خواردوو دژی گرۆباشۆف ڕوویدا، کە وەزیرەکان خۆیان پێی هەستا بوون لە ناوەڕاستی مۆسکۆی پایتەختدا، دووەمیش لەوە لەناوبردنی دەوڵەت خۆی بوو لەسەر دەستی یلتسن خۆی لە باخچەی (بیلوفیزە).

سەرەڕای هەموو کێشەوگیروگرفتەکانی ئەو وڵاتەش، بەڵام تا ئێستا هەر وەك دەوڵەتێکی مەزنی ئەتۆمی ماوەتەوەو (٢٨٦)ملیۆن هاوڵاتی تێدا دەژی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕای زۆرینەی خەڵکی و تانەنەت ئەوانەش کە هاوسۆزی هەنگاوەکەی یلتسن بوون هەنگاوەکەی بە ڕێگەیەکی ناشەرعی و نادیموکراسی لە قەڵەم دەدەن.

یلتسن و هاوکارەکانی بەڵێنیاندا بیرکردنەوە توندەکەیان بیرکردنەوەیەکی جیاواز بێت، بەڵام لە ڕاستیدا سۆڤیەتیان بە ڕێگەیەك ڕووخاند کەهیچ شەرعیەتێکی جەماوەری و یاسای نەبوو.لە ڕاپرسیەکدا کە دوای (٧)مانگ ئەنجامدرا لە سەدا (٧٦) دەنگدەران لە بەرژەوەندی مانەوەی یەکێتیەکەدا دەنگیاندا بوو.

ڕووسە دیموکراتخوازەکان دەیانگوت دەکرا یەکێتی سۆڤیەت بمێنێتەوە، ئەگە شتگەلێکی وەك بوونی پەرلەمانێکی ئازادی هەڵبژێردراو دابەزین لە دەستەڵات و سەرکەوتن بۆی نەبوایەتە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە، دوای ئەوەی یلتسن بە خێرای بە زەبری چەك پەڕلەمانی رووسی ڕووخاند.

دەرهاویشتە ئابوریەکانی (بیلوفیزە)دوای دەرئەنجامەکانی ناشارێتەوە، هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیەك بەبێ هیچ قۆناغێکی ئامادەکاری بووە هۆی تێکشکانی ئابووری وڵات لەسەر ئاستێکی بەرزی تەواو کاری، ئەمە سەرەڕای تێکشکانی قەوارەی دەوڵەت خۆی.

بڕیارەکانی (بیلۆفیزە)هۆکارێکی گەورەبوون بۆ دارمانی بەرهەم لە هەرێمەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا، سەرئەنجام بەرهەم گەیشتە نیوەی ئەوەندەی پێشوو بە درێژای ساڵانی نەوەدەکان، ئەوەش ڕۆڵی خۆی هەبوو لە پەیدابوونی هەژاریەکی بەکۆمەڵی

فراوان و سەرهەڵدانی نەخۆشی کۆمەڵایی، کە تائێستاش بە شێکن لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی رووسیا و بۆ ئابووری ناسەکانیش ئەوانە ڕاستیەکی گەورەن.

چینی دەستڕۆیشتوو و بژاردەی یەکێتی سۆڤیەت، لە ژێر سەرکردایەتی یلتسن دەستیانگرت بەسەر زۆرێك لە سەروەت و سامان و دارای دەوڵەتدا، کە لە یاساو ئایدۆلۆژیای ئەو وڵاتەدا چەند دەیەیەك جێگەی کرابۆوە بە ناوی (موڵکداریەتی هەموو گەل)بەبێ هیچ بایەخپێدان و گوێدانێك بە ڕێوشوێنی دادپەروەرانەو ڕای گشتی.

ئەو چینە بژاردەیە کە ئاماژەمان پێکرد کاری بۆ پارێزگاریکردن لە بارودۆخی دەست ڕۆیشتووی خۆی و دەوڵەمەندکردنی خۆی دەکرد، ئەوان دەیانویست موڵکە بەبەهاکانی دەوڵەت لە نێوان خۆیاندا دابەشبکەن، بەبێ بەشداریی پێکردنی هەر دەستەیەکی یاسادانان، یان هەر دەستەیەکی تر کە نوێنەرایەتی کۆمەڵگە بکات.

ئەو ئامانجە یەکەمجار تایبەت بوو بە خۆیان لە میانەی (بەشبەشێنەی خۆی ) پاشان دوای ساڵی (١٩٩١)ز لە کۆشکی (کرملین)لە میانەی ڕێوڕەسمێکدا بە فەرمی ئەوەی دەرکرد. بەڵام وەك دەرئەنجامێك بۆ ئەوە، هەر لەسەرەتاوە بەشبەشێنە مەشروعیەتی خۆی لە دەستدا لە بەرچاوی یاساو گەلدا.

ئەوکات ئاسان بوو کە پێشبینی دەرئەنجامە سیاسی و ئابووریەکانی ئەو ڕووداوە بکرێت لە دواتردا....خاوەن موڵکە نوێکان ترسیان لە سامانەکانیان هەبوو کە بەڕێگەیەکی نا مەشروع دەستیان خستبوو، تەنانەت ترسیان لە ژیانی خۆشیان هەبوو، بۆیە بڕیاریاندا لە سەرووی هەمووشیانەوە یلتسن کە بە پێچەوانەی ڕێڕەوەی دیموکراسی و پەرلەمانی هەڵبژێردراوەوە هەنگاو بنێن، ئەو ڕێڕەوەی کە سەرۆکی پێشوو (گرۆباشۆف) گرتبوویە بەر.

ئەو دەستە بژاردەیە هەوڵیان دەدا جۆرێك لە ڕژێمی سیاسی (باوکی) دروست بکەن لە جیاتی دیموکراسی و هەڵبژاردن، وەك ئامرازێك بۆ خزمەت کردن و پاراستنی سامانەکانیان. لێرەوە (فلادیمیر پۆتین)یان هەڵبژارد (وەك کەسی ئامادەکراوی دەزگای

هەوالگری یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو، بۆ جێگەگرتنەوەی سەۆرك یلتسن دوای تێك چوونی تەندروستی لە ساڵی ١٩٩٩ز ).

لەبەر هەمان هۆكارئەو بژاردەیە دڵنیا نەبوون لەگەڵ تێپەڕبوونی كاتدا پارێزگاری لەو سەروەت و سامانە زۆرەیان بكرێت، بۆیە زۆر گرنگیان بە وەبەرهێنانی ناوخۆیی نەدەداو سامانەكانیان بردە دەرەوەی وڵات، لە دەرئەنجامی ئەمەشدا لە سەدا هەشتای وەبەرهێنان لە ئابووری رووسیادا لە نەوەدەكانی سەدەی ڕابردوودا كەمی كرد، ئەمەش وای كرد كە وڵات بەرەو دواكەتنێكی ڕاستەقینەی هەنگاو هەڵبنێت.

بە تەماشاكردنی ئەو بارودۆخە ناهەموارە كە هاتە ئاراوە، پرسیارێك دروست دەبێت كە دەڵێت: بۆچی زۆرێك لە خەڵكی هەلهەلەیان لێدەدا بۆ ڕوخانی یەكێتی سۆڤیەت، لە ژێر بیانووی دەسپێكردنی چوون بەرەو دیموكراسی و سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد؟ وەڵامەكەی لەسەر زاری بیریاروفەیلەسوفێكی ڕووسیەوە وەردەگرین كە دەڵێت:ئەو كارە پەیوەندی بە رووسیاوە هەیە، پەرچەكرداری ئەو كەسانە كە وەك سەرخۆش وان، لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژایی دژە شیوعیەت و ئەفسانەی گەشبینی بنیادنراوە، نەك بنیادنرابێت لەسەر ڕاستیەكی سەردەم یان مێژووی. ئەوان لە هەوڵ وپێشبڕكێدابوون بۆ ڕووخانی یەكێتی سۆڤیەت و بەرەو لای شیوعیەت چوون، بەڵام لە ڕاستیدا رووسیایان پێكا.

بەم شێوەیە یەكێتی سۆڤیەت لەسەر دەستی یلتسن هەرەسی هێنا، بەبێ هیچ یاسایەك و هەڵبژاردنێكی نەتەوەیی و ڕاپرسیەكی نیشتمانی كە پیرۆزبای لە هەرەسەكە بكات.

ئەوەی كە تایبەتە بە یلتسن، تەنانەت زۆرینەی ئەو سەركردانەی كە دروستكەری ڕوداوەكانن پێویستیان بە پاڵپشتی و لایەنگری هەیە بۆ جێ بەجێكردنی ڕووداوە مێژوویەكان.

یلتسن ساڵی (١٩٩١)ز یەكێتی سۆڤیەتی هەڵوەشاندەوە بە هاوكاری هاوپەیمانیەتیەك كە بەرژەوەندی تایبەتی هەبوو لەو هەڵوەشاندنەوەیەدا، سەرجەمی ئەو كۆمەڵە و گروپانەی ناو هاوپەیمانیەتەكە ناوی خۆیان نابوو (دیموكراتی خوازو چاكسازی خوان).

بەلام زۆرینەی ئەو رۆشنبیرە خاوەن جەماوەرانەی کە لایەنگری یلتسن بوون رۆڵی پێشەنگیان دەبینی لە حکومەتەکەی یلتسندا لە دوای روخانی یەکێتی سۆڤیەت، ئەوان هەر لەخۆوە نەبوو بوونە هاورێ ی گەشتەکەی یلتسن و لە راستیشدا دیموکراتخوازێکی راستەقینەش نەبوون .

لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوو پێداگریاندەکرد لەسەر ئابووری بازاری ئازاد و خاوەنداریەتی تایبەت و گەورە و وایان بەباش دەزانی بە سیاسەتی (مشتەکۆڵەی ئاسنین ) بسەپێنرێت بەسەر کۆمەڵگای رووسیدا. لە دەرئەنجامدا تورەی بە کۆمەڵی بەدوای خۆیدا هێنا،لەو جۆرە بارانەشدا پێداویستی وەرگرتنی هەنگاو بیرکردنەوەی نادیموکراسیانە دەبێتە شتێکی پێویست. نمونەشیان وەك ئەو گروپەی کە بەدوای موڵکداریەتی تایبەتیدا وێڵ بوون، ئەو رۆشنبیرانەی کە لە دامەزراوەی یاسادانانی هەڵبژێردراوی نوێ رووسیادا دەبینران سەرسام بوون بە ژەنەراڵ (ئوغستۆ بینوشیە ) کە بەشێوەیەکی درندانە گۆرانکاریە ئابووریەکان بەسەر (چیللیدا) سەپاند، بە یلتسن یان دەگوت وازی لێ بهێنن بابێتە دیکتاتۆر، کاتێك یلتسن ساڵی (١٩٩٣)ز دەبابەکانی بەکارهێنا بۆ رووخاندنی پەرلەمانی هەڵبژێردراوە رووسیا ئەوان لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هۆکارەکانی راگەیاندن چەپڵەیان بۆ لێدەدا.

تا ئێستاش بەردەوام جێگرەوەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە رووسیا دوای ساڵی (١٩٩١)ز هەن، بەردەوام لەبەردەمیاندا خەبات و بریاری چارەنوسساز هەیە، هیچ هۆکارێك لەو هۆکارانەی کە یارمەتی رووخانی یەکێتی سۆڤیەتیاندا بای ئەوەندە نین کە تێك نەشکێن، یان سروشتێکی حەتمیان هەبێت، بە ڵکو تەنانەت مەسەلەی دیموکراسی و بازاری ئازادیش لە نێو ئەو هۆکارانەدان، تەنانەت هەموو ئاروزوو ئاواتە سەرسەختەکانی دەستەلات و کودەتا سیاسیەکان و چاوچنۆکی بژاردەکان و بیرە توندرەوەکان و ئەو هەستکردنە بلاوەی بە نەبوونی رەوای و ناپاکی هەموویان لە چوارچێوەی ئەو هۆکارانەدان، هەموو ئەو هۆکارانە کە ئاماژەمان پێدان بەردەوامن لە بینینی رۆڵی خۆیان لە دوای ساڵی (١٩٩١)ز.

بەلآم تاوانبار لێرەدا (یلتسن)ە بەڕادەیەك کە تۆمەتبارکردنی لای رووسەکان گەیشتە ئەوەی کە بە (کرێ گرتەی ئەمریکیەکان) ناوی ببەن لە پای ئەوەی کە ئیمپراتۆریەتێکی مەزنی ڕوخاند بە بەرژەوەندی ئەمریکیەکان.

ڕای گشتی جیهان ئەوەی بینی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت چۆن هەڵسوکەوت دەکرد لە جیهاندا، عێراقی داگیرکرد بە بێ هیچ جۆرە مۆڵەت و ڕێگەپێدانێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، بەڵکو سوکایەتی و گاڵتەشی دەکرد بەو دەوڵەتانەی کە دژی بوون لە داگیرکردنی عێراقدا، لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی وەك فەرەنساو ئەڵمانیا، وەزیری بەرگری ئەو کاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا(دۆناڵد ڕامسفێڵد) وەك گاڵتەپێکردنێکی ئاشکرا بەو وڵاتانە بە (ئەورووپای کۆن ) ناوی بردن.

بینیمان کە ئەمریکا چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ زیندانیانی (ئەبو غرێب و گوانتانامۆ ) دەکرد و بەندی دەکردن بەبێ ئەوەی دادگایەکی دادپەروەرانەیان بکات، بەڵکو لەوەش زیاتر بە خراپترین جۆرەکانی ئەشکەنجەدان ئەشکەنجەی دەدان.

ئەگەر لەلایەکی تریشەوە باس لە کۆمەڵەی وڵاتانی بێلایەن بکەین کە لە دیسەمبەری ساڵی (١٩٦١)ز لە (بەلەگراد) دامەزرا، گرنگترین سەرکردەکانی ئەو کاتەشی بریتی بوون لە (جەواهر لال نەهرۆ) لە (هند)، (سۆکارنۆ) لە (ئیندەنوسیا)، (جمال عبدالناصر) لە(میصر)، (کوامی نکروما) لە (غانا)، (سیکوتوری)لە (غینیا)، (جۆزێف بروز تیتۆ) لە (یوگوسلاڤیا) بەو شێوازە لە گەشەکردندا بوو تا ژمارەی ئەندامەکانی گەیشتە (١١٠) وڵاتی ئەندام.ئەو کۆمەڵەیە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەسەر شانۆی جیهانی و مومارەسەی بێ لایەنیەکی باشی دەکرد، ئەوەش بەواتای ئەوەی ڕاو بیروبۆچونی تایبەتی خۆی هەبوو لەسەر ئەو شتانەی کەلەسەر ئاستی جیهاندا دەگوزەران، ئەو دژی جەنگی ڤێتنام و داگیرکردنی ئەفغانستان بوو، هەردوو جەمسەرەکەش ئەمریکاو رووسیاش پەیوەندیەکی باشیان لەگەڵیدا هەبوو، بەلآم ئێستا لە سایەیی تاك جەمسەریدا، ئەو کۆمەڵەیە هیچ جۆرە ڕۆڵێکی نەماوە، بەڵکو هەر ئەسڵەن بوونیشی

نەماوە، لە سایەیی سیاسەتەکانی ئەمریکا،وەك چۆن (بوشی کوڕ) لە کاتی جەنگەکاندا ڕایگەیاند (ئەوەی لەگەڵمان نەبێت دژمانە)!!

دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئایینی پیرۆزی ئیسلامی بە دوژمن ناساند و سەرۆك بۆش باسی لە جەنگی خاچ پەرستی دەکرد و پاپای ڤاتیکانیش هێرشیکردە سەر ئیسلام و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئایینی ئیسلام هیچی بۆ سەر شارستانیەتی مرۆڤایەتی زیادنەکردووە، تەنها توندوتیژی و تێکدان نەبێت. ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەکان هێرشیانکردە سەر پێغەمبەری خوداو (د.خ) سوکایەتیان پێکرد، هەموو ئەمانە تەنها لەبەر ئەوەبوو کە ئەوان بڕوایان وابوو دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت، ئایینی ئیسلام گونجاوە بۆ پێشکەشکردنی جێگرەوەیەکی باش و نموونەی بۆ جیهان.

هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت، بە یەکەم پرۆژە دادەنرێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەوڵەتانەی کە لەسەر بنەمای ئیتنی دروست بوو بوون لە سەردەمی نوێدا. دوای ئەوەی پرۆژەی هەڵوەشاندنەوەی یۆگۆسلاڤیا جێ بەجێکرا بۆ چەند دەوڵەتێکی بچوکی جیاواز، دواتر جیاکردنەوەی کۆسۆڤۆ لە سربیا. بە شێوەیەك نەخشەی جوگرافی ئەوروپای کۆن گۆڕا دوای داڕشتنەوەی نەخشەی سیاسی نوێ بۆ ئەوروپا.

لە دەرئەنجامەکانی تری ئەو کارە دەستگرتنی ئەمریکا بوو بەسەر جیهانداو نزیك بوونەوەی بوو لە سنورەکانی رووسیا دوژمنە کلاسیکیەکەی ڕۆژئاوا. هاتنی بەرەو ڕۆژهەڵات بە ڕاستەوخۆی بۆ سنورەکانی رووسیا، بە پرۆژەوە بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتەکانی تر، لەوانەش رووسیا، هانی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی دەدا لە ناوچەی قەفقاز بۆ جیابوونەوە لە یەکێتی رووسیاو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان.

ئەوەی کە شایەنی باسە سەرۆکی پێشووی رووسی (میخائیل گرۆباشۆف) بەرپرسیاریەتی تەواوی خۆی لە هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت ڕەدکردەوە و ڕایگەیاند ئەوە ڕەد دەکەمەوە کە دەگوزەرێت و یلتسن تەواوی بەرپرسیاریەتەکە هەڵدەگرێت.

ئەمەی خوارەوەش دەقی وتارەکەی گرۆباشۆفە کە دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت بلاوی کردەوە (ئێوارەی ڕۆژی (٢٦) دیسەمبەری هەموو ساڵێك مێژووی فەرمی هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەتە. لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بیانیەوە ژمارەیەکی زۆر پرسیا پەیوەست بەو ڕووداوە مێژوویە ئاراستە کراون، بە شێوەیەك بنەڕەتی ئەو پرسیارانە پەیوەستن بە سێ بابەتەوە :دوای دە ساڵ لە هەرەسهێنانی ئەو یەکێتیە ئەو ڕووداوە چۆن هەڵدەسەنگێنم؟ ئایا هەڵوێستی من چیە دەربارەی قۆناغی ئەم دە ساڵەی دوای لە مێژووی رووسیای نوێدا، کاتێك یلتسن لە دەستەلاتدا بووە؟ ئایا هەڵسەنگاندنەکانی من چیە بۆ چالاکیەکانی سەرۆکی ئێستای رووسی (ڤلادیمێر پۆتن)؟ دەڵێم :من هەڵوێستی ڕەخنە گرانەم هەبوو دەربارەی هەرەسی یەکێتی سۆڤیەت.

لە ساڵی (١٩٩١)ز لە کاتی دەسپێکردنی ڕووبەڕووبوونەوەی جەنگەکە، پرۆژەیەکی چاکسازی نوێ لەدایك بوو، بۆ دارشتنەوەی سۆڤیەت لەسەر بنەمای دەوڵەتی فیدڕاڵی. من هەمیشە جەختم لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە بەشدار نەبووم لە تێکشکانی یەکێتی سۆڤیەتدا.

من بۆخۆم خاوەنی بیرۆکەی ڕاپرسی یەکێتیم کە لە (١٧ مارسی ساڵی ١٩٩١)ز ئەنجامدرا و هاولاتیان وەلامی ئەو پرسیارەیان دایەوە :ئایا بڕواتان بە پێویستی پارێزگاریکردن لە یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەت هەیە، وەك یەکەیەکی چاکسازی بۆ کۆمارە سەربەخۆ و چاکسازەکان، کە تیایدا گرنتی تەواوی ماف و ئازادیەکانی مرۆڤی تێدا کرابێت. لە دەرئەنجامدا لە سەدا حەفتاو شەشە و پۆینت چوار لە وانەی کە بەشداری ڕاپرسیەکەیانکردبوو، دەنگیان بە مانەوەوە پارێزگاریکردن لە یەکێتیەکە دابوو. سەرەڕای ویست و ئیرادەی گەل بەلاّم ئەو دەوڵەتە مەزنە هەڵوەشێنرایەوە.

ئەو شێوازەی هەرەسهێنان و شکستە گەورەیە، کۆمارەکانی پێشووی یەکێتی سۆڤیەتی توشی بارودۆخێکی ناهەموارو گران کرد و ماوەیەکی درێژ پێیانەوە نالاّند پێش ئەوەی بتوانن لێ دەربازبن.

ئایا دەکرا یەکێتی سۆڤیەت ڕزگار بکرێت؟ ئەو کێشانەی کە لەو دەوڵەتەدا کەڵەکە بوو بوون و زۆر بوون و چارەسەریشیان بۆ نەدۆزرا بوویەوە، یەکێتی کۆن هەموو توانان و وزەکانی کۆتای پێهێنابوو، یان بڵێین سەرجەمی بەکار هێنا بوو. لەوانەیە یەکێتی سۆڤیەت بەو شێوازە ماوەیەك بەردەوامی هەبوایە، بەڵام لە ڕاستیدا دۆخەکە پێویستی بە گۆڕان هەبوو.

ڕێگەی بە هێزو ڕاست لە پلەی یەکەمدا بریتیە لە بەرژەوەندی گەل،ئەوەش پێویستە لە ڕێکەی چاکسازی و لامەرکەزیەتەوە ئەنجامبدرێت، نەك لە ڕێگەی جوداخوازی و پەرت پەرت بوون، لێرەشەوە ئامادەیەك دروست دەبێت بۆ پەیماننامەیەکی نوێ ی یەکێتی. بە هۆی سیاسەتی (بریسترویکا)هاوڵاتی سۆڤیەت ئازادی و سەربەستی بەدەست دەهێنێت و سەرەتاکانی بانگەشەی دیموکراسی و چاکسازی بازاری ئابووری دەست پێدەکات، بەو هۆیەشەوە لە دوایدا دەتوانین جەنگی سارد لەناو بەرین.

ئەوە ئاشکرایە کە بەهۆی جەنگی ساردەوە ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت نزیکەی (١٠) تریلیۆن دۆلاریان لە بواری پێشبڕکێ ی خۆ پڕچەککردندا بە خەرجدا، لە هەمان کاتدا ئێمە لە یەکێتی سۆڤیەت نەمان توانی پێداویستیە سەرەتای و ئاساییەکانی هاوڵاتیانی خۆمان دابین بکەین، ئەوە تا ڕادەیەکی ئیجگار زۆر نەنگی بوو بۆمان کە لە فرۆشگاکانی وڵاتدا سابوونی و هەویری ددان شۆڕین دەست نەدەکەوتن. دەبینین تەنها ڕێژەی (٪١٠-٩) پیشەسازی وڵات کاری لە بەرهەمهێنانی شمەکە سەرەکیەکانی ژیاندا دەکرد، کە لە هەمان کاتدا دەکرا هەموو ئەو دوو دڵی و کورت هێنانە لە بازاڕە بەکاربەریەکاندا نەهێڵرێت بەوەی کە وەبەرهێنان ڕووبکاتە بەرهەمهێنانی کاڵای پێویستی ڕۆژانەی گەل،لە باتی ئەوەی ڕووبکەنە ئامانجە بەرگریەکانی وڵات. دەکرا(٪١٠-١٥) ئەو خەرجیە بەرگریانە وەربگێرێنەوەو بدرێننەوە بە بازاڕەکانی بەکاربەر لە بوارەکانی شتومەکی بەکاربەردا، بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیە بنەڕەتی وسەرەکیەکان، بەڵام ئێمە لەوەدا سەرکەوتوو نەبووین.

ئێمە دەمانویست دەستەڵاتی پارتی شیوعی سۆڤیەتی بەکاربهێنین لە پێناو بەرجەستەکردنی ڕێڕەوی (بروبستروکیا) لە ژیان و ئامازە دیموکراسیەکان لە ژیانی پارتایەتیدا. هەڵەمانکرد لە چاکسازی یەکێتیەکەدا، بەڵکو دواکەوتین، کەس لە جیهاندا نادۆزینەوە جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت کە باوەڕیان وابێت یەکێتی سۆڤیەت خۆی بەدەستی خۆی کۆتای بە خۆی هێنابێت.

کاتێك پرسیارم لە خۆم دەکرد :ئایا بەڕاستی بە تەنها من پێویستیم بە یەکێتی سۆڤیەت هەیە؟ ئەمە ناچاری کردم کە زۆر بیربکەمەوە، بەڵام بۆچی وڵات هەموو بێ دەنگە؟ من لەو باوەڕەدام دامەزراندنی پەیوەندی دەوڵەتە سەربەخۆکان فێڵە. ئەوان سەرکەوتوو بوون لە بەڵگەنامەی دامەزراندنی ئەو پەیوەندیەیی کە دامەزرابوو لەسەر پارێزگاریکردن لە بواری ئابووری و دراوی هاوبەش و سیستەمی بانکی هاوبەش و هێزی چەکداری یەکگرتوو و ڕێکەوتن لەسەر سیاسەتی دەرەوە.

لای کەسە ئاساییەکان ئەوانەی کە تێکەڵی سیاسەت نەبوون، ئەوانەشوێن کەوتە دەبن، چونکە وڵات پارێزگاریان لێدەکات، بەڵام بژاردەی سیاسی حساباتی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەوە ڕوونە کە پەیوەندی دەوڵەتە سەربەخۆکان وەك سیستەمێك ناشێت بۆ ژیان. بەڵام سەرکردایەتی رووسیا بیری لەوە کردەوە کە بەهەر جۆرێك بێت بارودۆخەکە لە رووسیا تێك نەچێت، لەبەر ئەوەی هاوڵاتیان بە کردەوە و بەدەست ئەنقەست هەڵیان خەڵەتاندوون لە میانەی ئەو پێچ و پەنا ڕامیاریەدا، واتە دامەزراندنی پەیوەندی دەوڵەتە سەربەخۆکان.

## سەردەمی یلتسن :

رووسیا ڕۆژی (١٢ دیسەمبەری ساڵی ١٩٩١)ز سەربەخۆ بوونی خۆی ڕاگەیاند. پرسیار دەکرێت لە چی سەربەخۆ بوو؟لە خودی خۆی؟! یان لە رووسیای گەورە؟! من بەشداری لە جەژنەکانی سەربەخۆی روسیا ناکەم، ئەو ڕۆژە بە نسبەت منەوە نە ئاهەنگەو نەڕۆژی خۆشی و شادی.

لە کاتی ئاهەنگەکانی یادی دە ساڵەی دامەزراندنی پەیوەندی دەوڵەتە سەربەخۆکان، کە لەم دواییەدا لە کۆشکی (کرملین) ڕێکخرابوو، سەرکردەکانی دەوڵەتە سەربەخۆکان بیستیان کە یلتسن بانگهێشت کراوە بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەکەیاندا. سەرۆکی کازاغستان(نور سوڵتان) بە توندی پرسیاریکردوە بۆچی یلتسن ئامادەیە؟ لەو باوەڕەدام زۆرینەی سەرکردەکانی وڵاتانی سەربەخۆ بە هەمان شێوە پرسیاریان لە بانگهێشتکردنی کەسێکدا کردووە کە رووسیای تێك شکاندووە و دواتریش کاری کردووە بۆ تێکشکاندنی پەیوەندی وڵاتانی سەربەخۆ.

لە ڕاستیدا زۆرێك لە هاوڵاتیانی یەکێتی سۆڤیەت لە یەکەی نیشتەجێ بوونی هاوبەشدا پێکەوە دەژیان کە لە (٥) نهۆم پێکدەهاتن و بە (گرۆباشۆفەکان ) ناسرابوون وەك ئاماژەیەك بە بنیادنەرەکەیان سەرۆك(گرۆباشۆف)، بە کورتی دەتوانین بڵێین ماوەی فەرمانڕەوایەتی یلتسن بریتی بوو لە ماوەی شکستی وڵات.

بە چاوێکی رەخنە گرانەوە دەرئەنجامەکانی ئەم دە ساڵەی داواییم هەڵسەنگاند دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت. من خۆشحاڵم بەوەی کە سەرەڕای تێکشکانی زانست و ڕۆشنبیری و فێرکاری و ئابووری تەنانەت تێکشکانی ژیانی مرۆڤیش لە سەردەمی

یلتسندا، بەڵام رووسیا توانیویەتی بە ڕادەیەکی زۆر باش پارێزگاری لە توانا عەقڵیەکانی بکات و لە پێشەوەی ئەو دەوڵەتانەوە بێت لەسەر ئاستی جیهاندا، ئەمە جگە لەوەی کە توانیویەتی پارێزگاری لە سامانە سروشتیە زەبەلاحەکەی بکات سەرەڕای بە تاڵانبردنی ڕێژەیەکی زۆر لێی.

لەوەش گرنگتر دانیشتوانی تا ئێستاش بە زیندووی دەژین بەرگری دەکەن وئامادەن بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك کە پێویست بکات و بەردەوامن لەسەر ژیانی خۆیان و خەریکی خوێندنن. ئەمە جگە لە دەرکەتنی چینێك لە پیاوانی کار کە بەکردەوە گرنگی بە ئازادی و دیموکراسی بازاڕ دەدەن.

رووسیا ئێستا لەگەڵ سەرکردایەتیە داناو دوربینەکەیدا (مەبەستم سەرۆك پۆتینە) خاوەنی هەلێکی زۆر باشە بۆ دەرچوون لە شتە کەڵەکە بووەکانی سەری.

**دەربارەی سەرۆك ڤلادیمێرپۆتین :**

بە گرنگیەوە چاودێری کارەکانی سەرۆك ڤلادیمێرپۆتین دەکەم و هیوایەکی گەورەم هەڵچنیوە کە بتوانێت رووسیا دەربکات لەو قەیرانەی کە تێی کەوتووە. ئەو سەرکردەیەکی پێگەیشتووە دڵکارە، لە سەرەتای چالاکیەکانیدا پەیڕەوی لە سیاسەتێکی ژیرانە و زیرەکی دەکرد لەسەر ئاستی گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا، ئەوەش بە شێوەیەکی تایبەت پەیوەست بوو بە دامەزراندنی هێڵێکی پەیوەندی نوێ بۆ پەیوەندی هاوبەش لەگەڵ دەوڵەتانی دەوروبەرو ئەورووپای ڕۆژئاواو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەوە شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە جولآن بەرەو پێشەوە لە ڕێگەی نەهێشتنی جیاوازی و ناکۆکیە گەشەکردووەکان دەبێت (کە ژمارەشیان کەم نیە)لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەلآم ئایا جیاوازیەکانی نێوان ئەوروپاو ئەمریکا کێشەو لەمپەر بۆ ڕێڕەوی تەواوکاری دروست ناکەن؟

## 7-بیلّ کلینتۆن. ...کەوتن دوای کەوتن ؟ !



هەڵەی زیرەك بە هەزارە.... لێرەدا کە سەرۆکی ئەمریکی کلینتۆن نازناوی زیرەکی وەرگرتووە تەنها لەبەر ئەوە نیە کە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو گەورەترین وڵاتی جیهان بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەو سەرکردە کەمانەیە لە مێژووی ئەمریکادا کە توانیوەیەتی گەشەسەندنێکی ئابووری بەرفراوان لە ئەمریکادا بهێنێتە ئاراوەو ئەمریکا بباتە نێو سەردەمێکی خۆشگوزەرانی کە لەوەو پێش شتی وای بەخۆوە نەبینیوە.

ئەو هەڵە گەورەیەی کە سەرۆکی ئەمریکی تێی کەوت، ئەوەی لە بیرکرد یان لە بیری خۆی بردەوە کە دەڵێن:گرنگترین شتێك کە بۆ کەسی سیاسی هەبێت بە تایبەتی لە ڕۆژئاوا ئەوەیە کە دەڵێت: (هەموو شتێك دەکرێت کە ڕووبدات، تەنها ئابڕووچونی سێکسی نەبێت، هەر کەسێك توشی نەفرینی ئەوە بوو بە هیچ شێوەیەك لێی پاك نابێتەوە ).هەرچەندە سەرکردە سیاسیەکان بە شێوەیەکی ئاسای توشی ئابڕوچوونە سێکسیەکان نابن، بە هۆی سوربوونی خۆیان بۆ قوربانیدان. ئەوەی کە زیاتر تووشی ئەم جۆرە کارانە دەبن ڕیزی دووەمن لە بەرپرسەکان لە وەزیرەکان وخوارتریش لەوان واتە یاریدەدەرەکانیان.

کلینتۆن تێوەنەگلاوە لە دروستکردنی پەیوەندی نا مەشروع لەگەڵ ڕاهێنەرەکەی کۆشکی سپی، کە ڕاستەوخۆ کارەکانی لەگەڵ هەڵدەسوڕاند لە کۆشکی سپی کە کچ و هاوسەرەکەشی لەگەڵیدا دەژیان، تا ببێتە ئابڕوچەنێکی خراپ و بە کەوتنێکی گەورە بیخات لە لوتکەی سەرکەوتنی کارەکانیدا؟ !

مونیکا صامویل لوینسکی وەك ڕاهێنەر کاریدەکرد لە کۆشکی سپی لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، کاتێك تێوەگلا لە ئابڕوچوونە سێکسیەکەیدا لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکی

کلینتۆن کە بە (ئابڕوچوونەکەی مۆنیکا) لە جیهاندا ناسرا و تیشکێکی زۆری ڕاگەیاندن و سیاسەتی چووە سەر.

ئەو لە دایك بووی (٢٣ یۆلیۆی ساڵی ١٩٧٣)ز شاری (سانفرانسیسکۆی )یەلە باشوری کالیفۆرنیای ڕۆژئاوای لوس ئەنجلوس و لە فرلی هیلز گەورە بووە. باوکی لە سلڤادۆر لە دایك بووە، بەڵام لەو خێزانە جوولەکە ئەڵمانانە بوو کە کۆچی کردبوو بۆ ئەمریکا و دایکیشی لە جوولەکە رووسیەکانە. سەرەتا لە کۆلێژی (سانت مۆنیکا)دواتر لە کۆلێژی (لویس ئەندەر کلارك)لە بورتلاند لە ویلایەتە ئەریگۆنیا لە ساڵی (١٩٩٥)ز خوێندویەتی،دواتر گواستیەوە بۆ واشنتۆن لەو کاتەی کە لە کۆشکی سپی کاریدەست کەوت لە کاتی سەرۆکایەتی کلینتۆن. پەیوەندی نادروستی ماوەکورتی دروستکرد لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکی کلینتۆندا، کە دواتر ئەو بابەتە لە هەواڵ و دۆسیەکانی لێکۆڵینەوە دا بە (ئابڕوچونەکەی مۆنیکا)ناسرا.

لیندا تریب هاورێ ی نزیکی مۆنیکا کە (٢٤) ساڵ لە مۆنیکا تەمەنی زیاتر بوو، هەستا بوو بە تۆمارکردنی نهێنی پەیوەندیە تەلەفۆنیەکانی نێوان مۆنیکاو سەرۆك، کە وردەکاری پەیوەندیەکەی مۆنیکاو کلینتۆنی تێدا تۆمارکرابوو. ئەو بابەتە ڕاستەوخۆ بلاْونەبوویەوە، تا دوای ئەوەی کە مۆنیکا شاهیدی درۆیدا لە کێشەی (بۆلا جونز)کە ئەوەی ڕەدکردەوە کە هیچ جۆرە پەیوەندیەك لە نێوان خۆی و کلینتۆندا هەبوو بێت، مۆنیکا هەوڵیدا (لیندا)ش ڕازی بکات بە شاهیدی درۆ لە هەمان کێشەدا، بەڵام لیندا ڕازی نەبوو،و تۆمارە دەنگیەکانی پێشکەش بە ڕاوێژکاری سەربەخۆ (کینیس ستار) کردن، ئەوەش یارمەتیدا لە بەردەوامیدان بە لێکۆڵینەوەکانی لە کێشەی ئابڕوچوونەکەی (وایت واتر)دا. ستار لێکۆڵینەوەکانی فراوانتر کرد بە شێوەیەك کە هەریەکە لە مۆنیکاو کلینتۆن و کەسانی پەیوەندیدار بەو کێشەیەوە گرتەوە، وەك هەوڵێك بۆ ئاشکراکردنی ڕاستیەکانی پەیوەندیدار بە کێشەی (بولا جونز).

ئەوەی کە جێگەی سەرسوڕمانە ئەو پڕوپاگەندانەبوون کە باسیان لەوە دەکرد کە لیندا تریب هەندێك زانیاری تری دزە پێکردووە بۆ ڕۆژنامەکان کە گوایا(جنیفر فیتز

جیراڵد) پەیوەندی سێکسی سۆزداری لەگەڵ سەرۆکی پێشووی ئەمریکی (جۆرج بۆشی باوکدا) هەبووە، بەڵام لە ڕاستیدا هەموو ئەو پڕوپاگەندانە ڕەد کرانەوەو،بەوە وەصفکران کە سەراپایان قسەی هەڵبەستراوی تەواون.

مۆنیکا دانینا بە بوونی پەیوەندی لەگەڵ کلینتۆن لە نوسینگەی بەیزاوی و ژوورە پاشکۆکان لە کەرتی ڕۆژئاوا، ئەم دانپێدانانانەش بە فەرمی لە ڕاپۆرتەکەی (ستا)دا تۆمارکران، کە دواتر بوونە هۆی دادگایکردنی سەۆرکی پێشووی ئەمریکی بیل کلینتۆن بە تۆمەتی لەمپەر دروستکردن بۆ ڕێڕەوی دادپەروەری و شاهیدی درۆ.

کلینتۆن پێشتر تۆمەتباربوو بە چەندین پەیوەندی نادروست، لە گرنگترینیان پەیوەندی لەگەڵ گۆرانی بێژی پێشوی لای خۆی لە ویلایەتی ئەرکانیسکا (جنیفر فلاورز).هەروەها ئەو پەیوەندیەی تری لەگەڵ فەرمانبەرێکی تری لای خۆی لە ویلایەتی ئەرکانیسکا بە ناوی (بولا جونز) لە ژورێکدا لە هۆتێلی (لیتڵ ڕۆك)،کاتێك کە کلینتۆن حاکمی ویلایەتی ئەرکانیسکا بووە، لە دوایشدا مەسەلەی مۆنیکاشی هاتە سەر کاتێك پارێزەی بولا جونز هەوڵی دەستخستنی بەڵگەی لابەلای دەدا لەسەر ڕاستیەکانی ڕوداوەکە.

دواتر کلینتۆن لەکاتی دادگایی کردنەکەدا ئەوەی ڕەد کردەوە کە پەیوەندیەکی تەواوی هەبوو بێت لەگەڵ مۆنیکادا. بەڵام دوای فشارەکانی ستاری لێکۆڵەر بەوەی کە بە جلەکانی مۆنیکاوە (سپێرمی ) کلینتۆنی دۆزیی بوویەوە، کلینتۆن لە ڕۆژی (١٧ ئوغستسی ساڵی ١٩٩٨)ز دانیبەوەدانا کە درۆی کردووە لەگەڵ گەلی ئەمریکی و پەیوەندی نادروستی هەبووە لەگەڵ مۆنیکادا، بەڵام نکوڵی لەوەکرد کە شاهیدی درۆی دابێت، چونکە پەیوەندیەکەی بە گوێرەی وتەی خۆی پەیوەندیەکی تەواو نەبووە؟ !

هیلاری لە یاداشتەکانیدا کە لە ژێرناونیشانی (مێژووی ژیانی)بڵاوی کردنەوە، بۆمان دەگێڕیتەوە کە هاوسەرەکەی کلینتۆن ڕاستیەکانی لە مەڕ پەیوەندیەکەی لەگەڵ مۆنیکا بۆ ماوەی حەوت مانگ لێ شاردۆتەوە، تا ئەو کاتەی کە ئابڕوچوونەکەی لە ساڵی (١٩٩٨)زبووەتە سەردێڕی زۆرینەی زۆری ڕۆژنامەکانی ئەمریکا. هیلاری لە کتێبەکەیدا

دەڵێت :بیل جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە بەڕاستی سەرسامی مۆنیکا بووە، ئەو کچە گەنجەی کەلە ویلایەتی کالیفۆرنیاوە هات و داوای پارمەتیکرد بۆ دۆزینەوەی هەلێکی کارێك. باس لەوە دەکات کە چەندین جار قسەی لەگەڵ کردووە، بەڵام لەهەمان کاتدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کێشەکەی زیاد لە ڕادەی خۆی گەورەکراوە.

سیناتۆر هیلاری ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو لە هاوینی داهاتوودا بە ڕاستی شتەکەی زانیووە، پێش تەنها دوو ڕۆژ لە شاهیدیدانەکە کە هاوسەرەکەی دای لە سوێندخواردنەکەیدا لە بەردەم دەستەی تۆمەتبارکردنەکە، کە لەسەر داوای داواکاری گشتی سەربەخۆ (کینیس ستار ) ڕێکخرابوو. هیلاری ئاماژە بەوە دات کە هاوسەرەکەی بەیانی ڕۆژی (١٥ ئوغستس) لە خەو هەستاوەو بۆ یەکەمجار پێی گوتووە :(بارودۆخەکە زۆر لەوە مەترسیدارترە کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە ).

هیلاری بەردەوام دەبێت و دەڵێت : (ئەو دەیزانی دەبێت بچێت شاهیدیەکەی بدات، ئەو پەیوەندیەکی گەرم وگوڕی بنیادنابوو کە لە شوێنی خۆیدا نەبوو، بە منی دەگووت ئەوەی لە نێوانیاندا ڕوویداوە خێراو دیاریکراو بووە. )

هیلاری بەردەوام دەبێت و دەڵێت : (من خەریك بوو هەناسەم بۆ نەدرێت، دەستمکرد بە گریان و هات و هاوار، دەتەوێت چی بڵێیت؟بۆچی درۆت لەگەڵ کردم؟لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا تا دەهات زیاتر تووڕە دەبووم، ئەو لێرەدا وەستاو وەڵامی دایەوەو گوتی :من بە داخەوەم، بە ڕاستی بە داخەوەم،من هەوڵمدەدا پارێزگاری لە تۆو تشیلسی کچمان بکەم.

لەو ماوەیەدا گرنگترین دوو بڕیاری قورس لە ژیانی هیلاریدا بریتی بوون لە: مانەوەی وەك هاوسەری کلینتۆن و خۆپاڵاوتنی بۆ ئەنجومەنی پیران لە ویلایەتی (نیویۆرك).

هیلاری یەك ملیۆن دانەی لە یاداشتەکانی بلاّو کردەوە، کە باسی ئەو هەشت ساڵەی تەمەنی دەکرد کە لە کۆشکی سپی بەسەری بردبووە لە ماوەی سەرۆکایەتی هاوسەرەکەیدا، کە بە هۆیەوە هەشت ملیۆن دۆلاری ئەمریکی دەستکەوت. ئەوە جگە لە فرۆشتنی مافی بلاّوکردنەوەی کتێبەکە لە (١٦) وڵاتی ئەورووپی و ئاسیایی و ئەمریکای لاتینی، هۆکاری ئەمەش ئاشکراکردنی نهێنیەکانی پەیوەندیدار بە سەرۆکەوە هەبوو، دوای بلاّوبوونەوەی ئابڕوچوونەکەی لەگەڵ مۆنیکادا.

هیلاری لە کتێبەکەیدا دەڵێت :ئێمە لەسەر ڕێگەی گەڕانەوە بووین بۆ واشنتۆن لە دۆخێکی نویَ لە جەنگێکی سیاسی کە کۆتای نەبوو، دوای ئەوەی کە بڕیارم نەدا،کە ئایا بجەنگێم لە پێناو هاوسەرو ژیانی هاوسەریەتیمدا دوای ڕوودانی بلاّوبوونەوەی پەیوەندیەکان، یان ئاشتی لە نێوان ئەندامانی خێزانەکەمدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە بێدادی و نائومێدی دەکرد بەرامبەر بیڵ، چەندین کاتژمێر بە تەنها مامەوە تا خودی خۆم ڕازی بکەم کە ئەوم خۆش ئەویَ، بەلاّم نەمتوانی هەڵی بخەڵەتێنم، ئەگەر توانیمان یان پێویست بوو درێژە بە ژیان هاوسەریەتیمان بدەین، لە ڕاستیدا پێشبینی کردن بۆ ژیانی ڕۆژانە ئاسانترە لە پێشبینی کردن بۆ داهاتوو. بەلاّم سوربووم لەسەر جەنگ کردن لە پێناو سەرۆکەکەم، پێویست بوو لەسەرم کە بەسەر هەستەکانمدا زاڵبم و جەخت بکەمەوە لەسەر ئەوەی کە پێویستە چی لەگەڵ خودی خۆمدا بکەم، بە پشت بەستن بە وەلاّمدانەوەی ئەرکە تایبەتی و گشتیەکانم بۆ گەنجینەی هەستە دژ بەیەکەکانم، کە ئەوەش پێویستی بە بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندنی جیاواز هەیە.

بیڵ زیاتر لە بیست ساڵ هاوسەرو هاوڕیَ ی باشم بوو،هاوبەشی خۆشی و ناخۆشیەکانم بوو، باوکێکی خۆشەویست بوو بۆ کچەکەمان، بۆیە هەستە کەسیەکانم و

بیروباوەڕە سیاسیەکانم لە دوو بەرەی هاودژدابوون، وەك ئەوەی کە هاوسەرم بوو حەزم دەکرد لە گەردنی بدەم، بەلاّم ئەو تەنها هاوسەری من نەبوو بەلّکو سەرۆکیشم بوو.

لەو باوەڕەدا بووم کە بیلّ سەرەڕای هەموو شتێك، سەرکردایەتی ئەمریکاو هەموو جیهان دەکات بە ڕێگەیەك کە تائێستاش بەهرەبەردارە بە پالّپشتی من. بە چاوپۆشی لە هەرچیەك کە ڕویداوە، لەو باوەڕەدانیم کە هیچ کەسێك شایستەی ئەو هەلّسوکەوتە توندە بێت کە ئەو تووشی بوو کە سوکایەتی بە تایبەتمەندیەکانی و تایبەتمەندی مۆنیکاو خێزانەکەشمان کرا، بە ڕێگەیەکی ستەمکارانە کە هیچ بیانوویەك هەلّناگرێت.

لەو باوەڕەدام ئەوەی کە هاوسەرەکەم کردی هەلّەبوو لە ڕووی ئەخلاقیەوە، وەك ئەوەی کە درۆی لەگەلّ من کردو گەلی ئەمریکای هەلّخەلّەتاند، بەلاّم دەزانم ئەوەی کە کردی ناپاکی نەبوو بەرامبەر نیشتیمان.

هەموو ئەو شتانەی کە لە دەرئەنجامی لێکۆلّینەوەکەوە بۆم دەرکەوتن،گەیاندمیە ئەو باوەڕەی کە هیچ بیانوویەك نەبووە بۆ تۆمەتبارکردنی (بیلّ). ئەگەر پیاوانی وەك ستارو هاوپەیمانەکانی نەبوونایە کە توانیان دەستور پشتگوێ بخەن و دەستەلاّت خراپ بەکاربهێنن بۆ هۆکاری ئایدۆلۆژیاو ڕق و قینیان کۆتای بهێنن بە خستنی سەرۆك بیلّ، من لە نیشتیمانەکەم دەترسێم. سەرۆکایەتی بێلّ و دامەزراوەی سەرۆکایەتی و سەلامەتی دەستور لە تای تەرازوودایە،من دەزانم ئەوەی کە کراوەو گوتراوە لە چەند ڕۆژی داهاتوودا کاریگەری دەبێت، نەك تەنها لەسەر ئایندەی بیلّ یان ئایندەی من بەلّکو لەسەر ئایندەی هەموو ئەمریکا.

هەرچی دەربارەی پەیوەندی ژیانی هاوسەریمان هەیە، ئەویش لە تای تەرازودایە، دلّنیاش نیم لەوەی کە کام تای تەرازوەکە دەجولّێتەوە، یان پێویستە بجولّێتەوە.

ئێستا زۆر بە ئاسانی دەکرێت وەڵامی پرسیارەکەی هیلاری بدرێتەوە،بەڵام لە ڕاستیدا ئەو وەڵامە هەر بەپرسیاری دەمێنێتەوە، نەك تەنها بۆ هیلاری بە تەنها! بە ڵکو پرسیاری زۆرێك لە خەڵکیە لە سەرتاسەری جیهاندا،بە تایبەتی کە ئابڕوچوونی هاوسەرەکەی لەگەڵ مۆنیکا گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. سەرەڕای ئەوەی کە پرسیارگەلێکی زۆر هاتنە ئاراوە پەیوەست بە هیلاری و هاوسەرەکەی کەسی یەکەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا!!

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای مۆنیکا، ئەوە دەبینین سەرەڕای دەرچوونی کلینتۆن لە کۆشکی سپی بە چەند ساڵێك، بەڵام ئەوکاتەو تا ئێستاش هەر لە ژێر تیشکی کامێراو نوسینە ڕۆژنامەوانیەکاندایە و هەرچیەك وردوو درشت لەو ڕووبدات تۆماری دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە.

مۆنیکا دوای ئابڕوچوونەکەی لەگەڵ کلینتۆن چووە، لەندەن و لە زانکۆی لەندەن بڕوانامەی ماستەری بەدەست هێنا.

لوینسکی جارێکی تر چووەوە ناو مێژوو، دوای ئابڕوچوونە بەناوبانگەکەی، لە میانەی خستنە ڕووی وردەکاری ئابڕوچوونەکەی لە نوسینگەی سەرۆکایەتی کلینتۆن، شان بەشانی خستنەڕووی ئابڕوچوونی سەرۆکەکانی تری پێشووی ئەمریکا، وەك ئابڕوچوونەکەی (وترجیت).

لە ساڵی (٢٠٠٨)ز (تشیلسی) کچی پاڵێوراوی دیموکراتەکان لە هەڵبژاردنە بەرایەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکادا (هیلاری کلینتۆن) ڕووبەڕووی چەندین پرسیار بوویەوە لە میانەی بەشداریکردنی لە هەڵمەتەکانی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی دایکیدا، ئەو ڕووبەڕووی پرسیارگەلێك بوویەوە کە جێگەی خۆشی و شادی نەبوون بۆ ئەو.

له میانەی بەشداریکردنیدا له هەڵمەتی بانگەشەکردن بۆ دایکیدا له زانکۆی(بتلر) له ویلایەتی(ئەندیانا)یە کێك له ئامادەبووان که تەمەنی زیاتر له (٢٨) ساڵ دەبوو، پرسیاری له (تشیلسی) کرد دەربارەی ڕاهێنەرەکە کۆشکی سپی (مۆنیکا) که ئایا ئەو ئابڕووچوونە کاریگەری هەبووە لەسەر ناوبانگی دایکی، تشیلسی وا دەرکەوت که ئەو پرسیارە کت وپڕە سەرسامی کردبێت، بەڵام وەڵامی دایەوەو گوتی:(واو..له ڕاستیدا تۆ یەکەم کەسیت که ئەو پرسیارەم لێدەکەیت له میانەی ئەو حەفتا زانکۆیەیی که من سەردانم کردوون، دڵنیانیم، بەڵام لەو باوەڕەدانیم که ئەوە کاری تۆ بێت ) دوای ئەمە ڕاستەوخۆ ئامادەبوان هات وهاواری خۆشیان لێبەرزبووەیەوە بۆ ئەو وەڵامەی که دایەوە. بە ڕای ڕێکخەرانی کۆبوونەوەکە پێویست بوو که ئەوە کۆتا پرسیار بێت دەربارەی ئەو ڕووداوە، بەڵام تشیلسی بڕیاریدا پرسیاری تر بکات و گوتی : (لەو باوەڕەدانیم که پێویست بێت ئەوە پرسیاری کۆتای بێت )

لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەسەرەتای گەنجیەتی خۆیەوە ڕووبەڕووی پووچی و ناڕاستیەکانی ژیانی گشتی بوویەوە، تشیلسی دەینالاند بەدەست ڕوماڵێکی نوێ ی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە، له دوای ئەوەی ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی له هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی دایکیدا له تەمەنێکی وەها بچوکدا.

جارێکی تر ئابڕووچونەکەی مۆنیکا گەڕایەوە ناو کایەیی ڕاگەیاندن، دوای ئەوەی که خشتەی کاتەکانی کۆشکی سپی ئەوەیان دەرخست که بەلایەنی کەمەوە (هیلاری) حەوت جار له کۆشکی سپی بووە لەو کاتانەی که کلینتۆنی هاوسەری چاوپێکەوتنی سۆزداری هەبووە لەگەڵ مۆنیکادا.

مۆنیکا لە ساڵی (٢٠٠٥)ز دوای ڕودانی ئابڕوچوونەکەی لەگەڵ لەگەڵ سەرۆکی پێشووی ئەمریکا(کلینتۆن) دووبارە هەوڵی دەستخستنەوەی کاریدا لە کۆشکی سپی، واتە لەگەڵ سەرۆك (جۆرج بۆشی ) کوڕ، ئەمە دوای بەدەست هێنانی بڕوانامەی دیبلۆم لە بواری زانستی ئابوریدا لە زانکۆی لەندەن کە یەکێکە لە گرنگترین کۆلێژەکانی وڵاتی بەریتانیا.

لەو بارەیەوە ڕۆژنامەی (لوفیگارۆ)ی فەرەنسی لەسەر زاری بریکارەکەی مۆنیکاوە ئەوەی گواستەوە کە مۆنیکای تەمەن (٣٣)ساڵ سوربووە لەسەر داواکردنی ئەو کارە لە کۆشکی سپی ! !




کلینتون و مۆنیکا دوای تەقینەوەی ئابڕو چونەکە, بوونە جێگەی قسە و باسی ڕۆژنامەکان لێرەدا لەسەر بەرگی گۆڤاری (تایم ) ی ئەمریکی دەردەکەوت




بوونە بابەتێکی دەوڵەمەند و وورژێنەر ,بۆ وێنەکێشان و کاریکاتێریستەکانی جیهان





تارمـــایی کلینتـــۆن و مۆنیکـــا  بـــوو بەشـــتێك و هـــیلاری راونـــا, تەنانـــەت هەڵمـــەتی هەڵبژاردنـــەکانی ســـاڵی (٢٠٠٨)ز بـــۆ ســـەرکەوتن بـــەکارتی پـــاڵاوتنی پـــارتی دیمـــوکرات, تانوێنەرایەتی ئەو پارتە بکات لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکەی ئەمەریکا , دواجار کۆتایی هات شکست هێنانی لەبەردەم باراك ئۆبامادا .

## 8-هەڵبژاردنی بوش وەك سەرۆك هەڵەیەك بوو كە لێخۆش بوونی نیە بۆ ئەمریكیەكان!!



گەورەترین کارەساتێك کە توشی ئەمریکا بوو بە درێژای تەواوی مێژووی ئەو وڵاتە، بریتی بوو لەوەی کە ئەمریکیەکان کەوتنە تەڵەی هەڵبژاردنی بوشەوە و کردیانە سەرۆکی وڵاتەکەیان، سەرۆکێکی توندڕە و شێت و نەزان و هەڵگری بیروبۆچوونی شەیتانی و توندڕەو گێلانە و هەندێك جاریش تێك چوو.

لە گرنگترین بیروبۆچوونەکانی ئەو پیاوە، ئەوە بوو دەیگوت ململانێی چاکەو خراپە بەردەوامی هەیە وئەو ململانێیە بیروبۆچوونەکانی ئەمریکا دیاریدەکات، بۆیە لەسەرمان پێویستە بە ڕێگەپێدانی خودای هەستین بە لابردنی هێزی شەڕ لە جیهاندا، بە پیشاندانی ئەوەی کە گوایا خۆی نوێنەرایەتی هێزی چاکە دەکات لە جیهاندا.

جرینوولد پرسیار دەکات و دەڵێت: (کێ ئەو ڕێگە پێدانە خودایییەی پێبوخشیووە، ئایا دەکرێت ئەو هات وهاوارەی خۆی بە ڕاست بزانین، کە گوایا خودا داوای لێکردووە جیهان ڕزگار بکات، کە لە کاتی بانگەشەی خۆ پاڵاوتنەگەیدا جەند جارێك ئەوەی دووبارە کردبووەیەوە:من بانگەوازێکم بیستووە، کە لەو باوەڕەدام خودا دەیەوێت خۆم کاندید بکەم بۆ سەرۆکایەتی؟ !.

ئەوە بیریاری گەورەی ئەمریکی وا دەڵێت لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی (میراتی ناسۆری:چۆن بیروبۆچونەکانی بوش لەسەر ململانێ ی چاکەو خراپە سەرۆکایەتیەکەی لەناوبرد )کە لە ساڵی (٢٠٠٧)ز بلاَوکرایەوە و کەناڵی بەناوبانگی (فۆکس نیوزی) ئەمریکی بە باشترین کتێب لەسەر خراپترین سەرۆك وەصفی دەکات، لە هەمان کاتدا وەصفی دانەرەکەی دەکات کە ئەو کارەی ئەو تەنها نوسینی کتێبێك نیە،بەڵکو کارێکی نیشتمانیە کە جلین کردوویەتی.

ئەوەی کە تایبەتە بە شیکاری بواری ئایینی جۆرج بۆش و کاریگەریە کارەساتبارەکانی لە سەر ئێستاو ئایندەی ئەمریکا و هەوڵەکان دەربارەی تێڕوانینی

ئەمریکیەکان دەربارەی ئەوەی کە چاوەڕێ دەکەن لە سەرۆکێکی دیکتاتۆر، بریتیە لە شاردنەوەی نهێنی ئایینە مەسیحیەکەیان و داپۆشینی بە سروستێکی تەوراتی درۆینە و راکێشانیان لەگەڵ خۆی بۆ چاڵەکە ! !

دانەری کتێبەکە ئاماژە بەوە دەکات کە بوش بەدەست تێکچوونی عەقڵیەوە ناڵاندویەتی و هەڵگری میراتێکی ئایینی توندڕەو بووە وەی ئەوە نەبووە کە پۆستێکی گەورەی وەك پۆستی سەرۆکایەتی پێبدرێت. بۆیە پەنای بردۆتە بەر خۆدانە پاڵ سروشتێکی ئاینی لە هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکەیدا، بۆ ڕەواج پێدانی خۆی وەك ئامرازێك کە یارمەتی خودای لەگەڵ بێت و مەسیحیەکی پڕچەك بێت بە بیروبۆچوونی تەوراتی.

لە ڕاستیدا جرینوود ئەو ڕاستیەیی نە شاردۆتەوە لە کتێبەکی خۆیدا کە دەڵێت:جۆرج بۆشی کوڕ وەك هەموو دیکتاتۆرێك کە مێژوو بە خۆیەوە بینیویەتی خۆی ناساند بەوەی کە ئەو سەرکردەی یەکەمە، نێردراوێکە کە یارمەتی خودای وەردەگرێت، ڕزگارکەرو دڵسۆزە، ئاسمان ناردویەتی بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی لە سەرجەم خراپەکاری پاك بکاتەوە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە کە مێژوو سەلماندی بەوەی کە ئەو بۆ خۆی خراپەکاربوو. ئەوە هەمان ئەو بانگەشەبوو کە وەختی خۆی هیتلەر دەیکرد بۆ پاساودانەوەی ئەو کاولکاریەیی کە لە جیهاندا نابوویەوە لە ژێر ناونیشانی ڕزگارکردنیدا. ..

جۆرج بۆشی کوڕ دروشمی (ئەمریکای گەشاوە)ی بەرزکردبویەوە لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکاندا،دوای سەرکەوتنیشی وەك پاڵێوراوی پارتی کۆماری بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا فەلسەفەی (سۆزی پارێزگاری) پەیڕەوی کرد.

بۆش دروشم و فەلسەفەکەی وەها لێکدایەوە کە هەردووکیان پێدانی هەلێکە بە هەر هاوڵاتیەکی ئەمریکی بۆ بەدەستهێنانی ئەوپەڕی دڵنیایی، دەوڵەت هەوڵدەدات بۆ باشکردنی گوزەرانیان بە کەمکردنەوەی باجەکان و دابینکردنی بیمەی کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری تەندروستی و خوێندن بۆ هەمووان. ..بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو بەڵێنانە

هاولآتیانی ئەمریکی شکستیان هێنا لە دەرئەنجامی ئەو شتەی کە بەدەست ئەو دوو چەمکەوە چەشتیان ! !

لێرەدا شتێکی نامۆ نیە کە (١١١) مێژونوس لە بەناوبانگترین مێژوونوسەکانی ئەمریکا هاوڕابن لەسەر ئەوەی کە سەرۆك بوش لە خراپترین سەرۆکەکانی سەدەی (٢١) بووە و یەکێك بووە لەو خراپترین سەرۆکانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیویەتی. بۆیە هەر جۆرە گومانێك لەسەر ئەو حوکمدانە ڕەد دەکرێتەوە، بەو پێیەیی لە نێوان ئەو مێژوونوسانەی کە ئاماژەمان پێدان،ژمارەیەکی زۆریان لەو مێژوونوسە دانسقەو هەرەباشانەی ئەمریکا خۆینی. بۆ سەلماندنی ڕاستیەتی ئەوە تەنها ئەوە بەسە کە ئەو لایەنەی کە ڕاپرسی کردووە لەو بارەیەوە نە ئیسلامیەو نە رووسیەو نە عەرەبەو نەخەڵکی ئەمریکای لاتینیشە، بەڵکو دەزگایەکی ئەمریکا خۆیەتی بە ناوی :(ڕێکخراوی ڕای گشتی جیهان، سەربە زانکۆی میریلاند ی ئەمریکی ) کە ناسراوە بە بێلایەنی و ڕوونی لە ئەنجامدانی ڕاپرسی و وەرگرتنی بیروڕاکان ئەمە سەرەڕای شوناسەکەشی کەشوناسێکی ئەمریکیە.

هەروەها ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆستی)ئەمریکی دەرئەنجامی ڕاپرسیەکی خستەڕو کە لە مانگی (یونیوی ساڵی ٢٠٠٨)ز ئەنجامی دابوو، لە دەرئەنجامدابە پێی ڕاپرسیەکە بۆی دەرکەوت بوو، کە سەرۆك بۆش خراپترین سەرۆکێك بووە بە درێژای مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ڕۆژنامەکە ئاماژە بە ناوەڕۆکی ئەو هەوڵەچڕو بەردەوامانەی سەرۆك بوش و گەورە ڕاوێژکارەکانی دەدات، بۆ پەنا بردنە بەر (پێوانەو بەراوردکاری مێژووی) بۆ جوانکردنی وێنەی ڕاستیەتی چەسپاوی هەڵوێستە سیاسیەکان، کە لەماوەی هەردوو خولی سەرۆکایەتیەکەیدا لە کۆشکی سپی گرتوونیەتەبەر.

ڕۆژنامەکە ئەوەشی بۆ زیاد دەکات و دەنوسێت:کاتێك لەو ڕۆژانەدا بوش ڕووی کردە کۆشکی سپی ئەوە کۆتاییەکەی بوو، ئەو بە شێوەیەکی زۆر زیاد هەوڵیدەدا بۆ هەڵبژاردنی ڕووداوی مێژووی، بە ئامانجی گفتوگۆ و قسە لەسەرکردن، بەوەی کە لەدوایدا مێژوو بۆخۆی پاکانەی بۆدەکات، لە بەرامبەر ئەو هەڵە مێژوویانەی کە گەیشت بوونە

ئاستی (هەڵەی مەزن)کە دەتوانین بەوە پێناسەیان بکەین کە شورەیەك و نەنگیەکی گەورە بوون، لەو هەڵە گرنگانەش وەك دەرچوون لە دەستوری ئەمریکی و سیخورپیکردن بەسەر گەلەکەیەوە، دوای ئەوەی ئەمریکا گۆڕی بە دەوڵەتێکی پۆلیسی، هەروەها لە هەڵەکانی تری پەرپاکردنی هەردوو جەنگی عێراق و ئەفغانستان و جەنگی خوێن لەبەر ڕۆیی وی دژە تیرۆر و هەڵوێستەکانی دەربارەی بازرگانی جیهانی و پیس بوونی ژینگەی و سەرجەم هەڵەکانی تریشی.

هەروەها ڕۆژنامەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە لەماوەی ئەو ساڵەدا بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش و پێوانەی مێژووی گوتار و چاوپێکەوتنە مێژوویەکانی زیارد کردووە، ئیتر ئەو گوتارانە بێت کە لەبەردەم سەرکردە بیانیەکاندا خوێندبێتیەوە، یان لە میانەی قسەکردنی بێت لەبەردەم کرێکارە فەرمانبەرەکاندا لە یەکێك لە کەنارەکانی شاری سانت لویسی ئەمریکی.

ئاماژەش بەو سەردانەی دەکات کە بۆ ئەوروپا ئەنجامیداوە لەو ساڵەداو دوو گوتاری لە (بەرلین و پاریس )خوێندوەتەوە بە بۆنەی یادی شەست ساڵەی پلانی (مارشاڵ)کە ئەمریکا پاش جەنگی جیهانی دووەم داینا بۆ یارمەتیدانی بنیادنانەوەی ئەوروپا. ڕۆژنامەکە لە بەختی ڕەشی سەرۆك بوشدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە زۆرێك لە مێژوونوسان گەیشت بوونە دەرئەنجامێکی یەکلاکەرەوە کە تەواو پێچەوانەی هەوڵەکانی سەرۆك خۆی و ڕاوێژکارەکانی بوو بەوەی کە سەرۆك یەکێك بووە لە خراپترین سەرۆکەکان.

ڕۆژنامەکە ئەوەش ئاشکرادەکات کە بوش لە سەرەتای ماوەی سەرۆکایەتیەکەیدا، هیچ گرنگیەکە بەو گومانانە نەداوە کە دەربارەی میراتی سەرۆکایەتیەکەی هەبووە لە ماوەیەکی درێژخایەندا، کاتێك پەیامنێری بەناوبانگی ڕۆژنامەکە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست)(بۆب وودرد)لە مانگی دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٣ز پرسیاری لێدەکات و دەڵێت :مێژوو چۆن بڕیارت لەسەر دەدات، لەسەر جەنگەکەت لە عێراقدا؟لە وەڵامدا دەڵێت :مێژوو. ..نازانم کاتێك دەبێت هەمووان مردوون.

مێژونوس (دۆگلاس برینگلی)لە زانکۆی (رایس) دەڵێت:تاکە شتێك کە سەرۆك بوش بە سەرۆك هاری ترومان دەبەستێتەوە، ئەوەیە کە هەردووکیان کاتێك لە کۆشکی سپی دەرچوون بە کەمترین ڕێژەی پاڵپشتی جەماوەری بۆ سیاسەتەکانیان دەرچوون.

بەم شێوەیە ئەو ڕاپرسیەیی کە لە بیست وڵاتی جیاوازی جیهاندا ئەنجامدرا دەرکەوت کە ڕێژەی (٦٠٪) بەشداربووانی ڕاپرسیەکە باوەڕیان بە بووش نەبوو، بە هۆی یەکلای کردنەوەی ئەو گفتوگۆیانەی کە لە نێوان مێژوونوسە ئەمریکیەکاندا هەبوو، بەو شێوەیەش وەك چۆن (جیم لوب) دەڵێت:کۆدەنگیەکی جیهانی دروست بوو لەسەر بڕوانە بوون بە سەرۆك بوش، بەو شێوەش سەرۆك وێنەیەکی ناشیرینی بۆ خۆی و وڵاتەکەشی کێشا. جیم لوب ئەوەشی بۆ زیاد دەکات و دەڵێت :نەبوونی متمانە بە بوش بووە هۆی دروست بوونی بۆشایەك لە سەرکردایەتیدا لەسەر ئاستی جیهاندا. ئەم ڕاپرسیە لەلایەن ڕاپرسیەکی ترەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە، کە ناوەندی (بیۆ) لە (٢٤) وڵاتی جیاوازی جیهاندا ئەنجامی دابوو، تیایدا دەرکەوت بوو کە ڕوانینێکی نێگەتیڤانە هەبووە بەرامبەر بوش بە تایبەتی لە ڕۆژئاوای ئەوروپاو ئەمریکای لاتینی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەلایەکی تریشەوە ئەو ڕاپرسیە دژ بەیەکیەکی دروستکرد بۆ ئەوانەی کە گرنگی بە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا دەدن، بە واتای ئەوە کە خەڵکی متمانەی بە دیموکراسیەتی ئەمریکا نەما.

بە کۆی دەنگی مێژوونوسان بوش سەرکردایەتی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی کردووە لە کارەساتی جەنگی عێراق و ئەفغانستاندا، جەنگی عیراق ئەمریکای ڕاکێشایە نێو وێرانکاریەکەوە بە شێوەیەك لایەنی دەروونی سەربازە ئەمریکیەکان ڕوخاو و متمانە بەخۆبوونیان لەدەستدا و بووە هۆی ئەوەی کە گەلیش متمانەیان پێنەکات، لە توانا جەنگیەکانیاندا و سەربازەکانی کردە تاوانباری جەنگ بە وێرانکردی شارەکان بە بۆردوومانکردنی مووشەکە دورهاوێژەکانی سوپای ئەمریکا. ئەوان بۆمبی هەڵوەشێنەریان بەکاردەهێنا، بەڵام وەك جەنگکەری مەیدانی خۆڕاگرنەبوون لەبەردەم هێزی لاوازی

بەرگری عێراقیدا. ...کە خاوەن عەقڵێکی داهێنەربوون و پێداگربوون لەسەر ئازادکردنی وڵاتەکەیان.

مێژونوسان بەکۆی دەنگ ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی کە سەرۆك بوش ئەمریکای تووشی شکستێکی مێژووی کردۆتەوە، ئەو تموحی هەبوو بۆ بنیادنانی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی ئەمریکی کە زاڵ بێت بەسەر هەموو گەلاندا و دەست بەسەر نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سامانی گەلاندا بگرێت. بەو تەماحەی کە هەی بوو سیستەمی کۆماری و دیموکراسی و ئازادیەکانی گەلی ئەمریکی و شکۆمەندیەکەی لەدەستداو بووە هۆی داڕووخانی ئابوری جیهانی بە شێوەیەك کە نرخی خواردن بە ئاستێکی شێتانە بەرزبوویەوە، تا گەیشتە ئاستی ئەوەی کە خەڵکی لەسەر کولێرەیەك وەشەڕبێن، نەخۆشیەکانیش زیادیان کرد تا گەیشتە ئەوەی خەڵکی لەسەر شەقامەکان گیان لەدەست بدەن بە بێ خزمەتگوزاری تەندروستی و چارەسەرو دەرمانی پێویست، زیندانی نهێنی لەسەرجەم وڵاتانی دونیادا کرانەوەو شکۆمەندی و مافەکانی مرۆڤیان تێدا پێشێل کران. ئەمریکا بۆخۆشی ئەو وێنەیەیی کە هەی بوو بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ لەدەستیدا و لە چاو گەلانی دونیادا گۆڕا بە تاوانباری جەنگ.

هەروەها مێژوو نوسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گەلانی دونیا رقیان لەو سەرۆك وڵاتانە دەبوویەوە کە شوێنکەوتەی سیاسەتەکانی ئەمریکا بوون و فەرمانەکانی بوشیان جێ بەجێدەکرد، ئەوان ئەمریکا یارمەتی دەدان لە ستەم و گەندەڵیەکانیان، تا گەیشتە ئەوەی گەلانی ئەو وڵاتانە هەم ڕقیان لە سەرۆکەکانی خۆیان بێت هەم رقیشیان لە ئەمریکا بێتەوە بە هۆی ئەو پاڵپشتیەی ئەمریکا بۆ ستەم و گەندەڵیەکانیان.

گەورەترین زیانێك کە بەر ئەمریکا کەوت بریتی بوو لەوەی کە ئەمریکا لە وڵاتێکی دیموکراتی بەرگریکار لە مافەکانی مرۆڤەوە بوش گۆڕی بە وڵاتێکی دوژمنکارو خوێن ڕێژ خوێنی عیراقیەکان وئەفغانەکان و فەلەستینیەکان بە پشتگیری کردنی تاوانی ئیسرائیلیەکان بەرامبەر فەلەستینیەکان و پارێزگاریکردن لە جولەکەکان لە هەر مەسەلەیەکدا.

دەربارەی جەنگی عێراق ئەوەبوو پێش ماوەیەك بەر لەدەست پێکردنی جەنگەکە لە مانگە (مارسی ساڵی ٢٠٠٣)ز ژمارەیەکی زۆر لە سیاسەتمەدارە دیارەکانی ئەمریکا دەنگیان بەرز کردەوە و لە دژی بیرۆکەی ئەو جەنگە وەستانەوە، لە نێو ئەوانەشدا (برنت سکوکروفت)ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکی لەسەردەمی جورج بوشی باوکدا.

سکو کروفت تێڕوانینەکانی خۆی لە ڕۆژی (١٥ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٢)ز لە ڕۆژنامەی (وڵ ستریت جۆرناڵ )ی ئەمریکیدا بڵاوکردەوە لە گوتارێکدا بەناونیشانی (هێرش نەکەیتە سەر صدام حسین). لەبەر ئەوەی کروفت لە نزیکەکانی سەرۆکی (٤١) مینی ئەمریکا بوو ئەو گوتارە تا ڕادەیەکی زۆر چوارچێوەیەکی فراوانی هەبوو، وەك دەڵێن تا ڕێگەی بەیەك گەیاندنی باوك بوو کە هەستی بە دوو دڵی زۆر دەکرد بەرامبەر بە کوڕەکەی، ئەو کوڕەی کە هۆگری جەنگ بوو، بەڵام ئەو کوڕە بەرپەرچی (سکوکروفت)ی دایەوە، نەك بەوەی کە لە شوێنی مامیدا بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی جێگرەوەیەکی لایەنگری باوکی بوو و پێی گووت:سکوکروفت بووەتە بێزارکەر کاتێك کە بەتەمەندا چووە.

جاکوب واینزبریگ دانەری کتێبی (نەهامەتیەکانی بوش)لەو بڕوایەدایە کە بوش جیهانی بردۆتە نێو سیاسەتی نەتەوەپەرستیەوە و بووەتە دیزاینەری ئەو سیاسەتە، بە پێچەوانەی باوکیەوە کە بە سەرۆکێکی لاواز دادەنرێت لە کاتێکدا کە صدام حسینی لەسەر کورسی دەستەڵات هێشتەوە لە کاتی جەنگی داگیرکردنی کویت و، هەڵوێستێکی دیاریکراوی نەبووە بەرامبەر چین و شانازیشی بە سەرکەوتنی ئەمریکاوە نکردووە لە جەنگی ساردا.

نووسەری ئەم کتێبە دەڵێت:هەندێك شیکەرەوەی تایبەت بە مێژوو بڕوایان وایە کە هەموو کۆمەڵگاکان دەتوانن بە دیموکراتیزە بکرێن کاتێك کە ئازاد دەبن لە نارەحەتی و ترس و زۆرداری، بۆیە سەرۆك بوش و پارێزگارە نوێکان باس لە زۆرێك لەو نموونە مێژوویانە دەکەن، بەڵام لەڕاستیدا ئەوان جەخت لەسەر پێوەرێك یان نموونەیەکی هەڵە دەکەنەوە و پەخشیدەکەن بەسەر هەموو نموونەکانی تردا، وەك سەرکەتنی

بنیادنانەوەی ژاپۆن وئەڵمانیا و ناردنی دیموکراسیەت بۆیان پاش جەنگی جیهانی دووەم، هەروەها نموونەی ئەو شۆڕشانەی کە لە ئەورووپای ڕۆژهەلاتیدا بەرپابوون لە ساڵی (١٩٨٩)ز.

بەلام لە ڕاستیدا بوش و پارێزگارە نوێکانی هاوڕێ ی هیچیان دەربارەی عێراق نەدەزانی، سێ لەو پانابەرە عێراقیانەی تاراوگە تووشی شۆك و خورپە هاتن کاتێك لەسەرەتاکانی جەنگی عێراقدا لە ساڵی (٢٠٠٣)ز چاویان بە سەرۆك بوش کەوت تا زانیاریان لێوەربگرێت دەربارەی عێراق، کاتێك کە بینیان بوش سەرۆکی ئەمریکا هیچ جیاوازیەکی نێوان سونەو شیعە نازانێت. بۆیە پرسیار دەکات و دەڵێت :سەرۆك بۆش و ئەو پارێزگارانە چۆن لەوە تێدەگەن کە لادانی صدامی دیکتاتۆر لە خودی خۆیدا واتای بەهێزکردنی ئێرانە؟

نووسەر وەلامدەداتەوەو دەڵێت:باوەڕیان بە بوونی جێ بەجێکردنی کردەی گۆڕانی دیموکراسی و ڕەدکرنەوە یان پێداگری ڕاستیە تایبەتمەندیەکان بە ڕاگرتنی هاوسەنگی هێزەکان لە سیاسەتی دەرەکیدا وای لێکردن کە چاویان کوێر بێت لەوەی کە هەیە بە ڕوونی بیبینن، نووسەر ئاماژەش بەوە دەکات کە (برنت سکوکروفت) ئەو کات هۆشداری دابوو بەلام گوێکانی سەرۆك بوش کەڕبوون ە نەی بیست بوو.

دوای پێنج ساڵ لەسەرەتاکانی دەستپێکردنی جەنگی عێراق تا ئێستا زۆر شت نازانین، کە چۆن؟بۆچی؟ کەی؟ ئامادەبوو لە وەرگرتنی یەکێك لە گرنگترین بەڵکو خراپترین بڕیارەکان لە مێژووی هاوچەرخی ئەمریکادا. هەروەها ئەوەش نازانین ئەو جەنگە چ پەیوەندیەکی هەیە بە پەیوەندی ئالۆزی نێوان باوك و کوڕ کە هەردووکیان جەنگیان لە دژی صدام حسین بەرپاکردبوو.

هەروەها بە هیچ شێوەیەك ئەوەش نازانین کە بوش تا چ ڕادەیەك هەستی بە پێچەوانەی باوکی کردووە لە کاتێکدا کە بوش خۆی بە خاوەنی بڕیار دەزانی بە پێچەوانەی باوکیەوە کە دوو دڵ و بە وریابوو لە کاتی وەرگرتنی بڕیارەکاندا و بڕوای بە سیاسەتی هاوکاری نێوان دەوڵەتان هەبوو.

کتێبی (نەهامەتیەکانی بوش) هەوڵێکی دڵکارانەیە بۆ شیکردنەوەی ئەو دراما خێزانیە نا ئاساییە، ئەم کتێبە لەلایەکەوە پشتی بەستووە بە شیکردنەوەی ئەو ڕاپۆرتانەی کە بڵاوکراونەتەوە،لەلایەکی تریشەوە پشتی بەو کارە گونجاوانە بستووە کە شایەنی تێبینی کردنن.

مێژووی تایبەتی بوش و پەیوەندی بە خێزانەکەیەوە و باوەڕە تایبەتیەکەی و خێزانە جێگرەوەکەی لە کۆشکی سپی.نوسەر (وایز برگ)هەموو ئەمانەی کورت کردۆتەوە لەوەی بڕیاری جەنگی عێراق یە کێکە لە حەزو ئارەزوە تایبەتیەکانی بوش و پاککردنەوەی خێزانەکەی و بەرگریکردن لێی،هەروەها لەلایەکی تریشەوە سەرکەوتنە بەسەر باوکیدا لە ڕێگەی بەدەست هێنانی کارێك کە باوکی کاتی خۆی تەواوی نەکردبوو، کاتێك ڕێگەی دابوو صدام حسین لە دەستەڵاتدا بمێنێتەوە لە دوای کۆتای هاتنی جەنگی کەنداوی یەکەم، لەوانەشە ئەوەش شتێکی گەنجاو بێت کە پەیوەندی نێوان باوك و کوڕ و کارلێك کردنیان لەسەر یەکدی ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو بێت لە کردەی دروستکردنی بڕیاردا، بەڵام زۆرێك لە خەڵکی لەدەرەوەی خێزانی بوش هەبوون کە یارمەتی و پاڵپشتی خۆیان بۆ جەنگی عێراق دەربڕی بوو، لەسەر بنەمای ئەو زانیاریانەی کە گوایا ڕژێمەکەی صدام حسین جێگەی هەڕەشەیە. یەکێك لەوانە ناوی خۆی نابوو هەڵۆی لیبڕاڵەکان، ئەوانە لایەنگری جەنگ بوون و لەو باوەڕەدابوون لە پاش جەنگی عێراق تا ڕادەیەکی زۆر شوێنێکی ئارام و هێمن دروستدەبێت.

نوسەر لە باوەڕەدابوو کە لە نێو ئەو هۆکارانەی کە پاڵی بە سەرۆك بوشەوە ناوە بۆ هێرشکردنە سەر عێراق، ئەو حەزە بوو کە هەی بوو بۆ تۆڵە سەندنەوە لە بەرامبەر هەوڵی تیرۆرکردنی باوکی، لە پێش چەند ساڵێك لە کاتی سەردانیکردنیدا بۆ وڵاتی (کویت)، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە هۆکاری سەرەکی نەبوو، چونکە هیچ بەڵگەیەك نەبوو بۆ تێوەگلانی عێراق لەو پیلانە،یان بوونی پیلانێکی عێراقی بۆ تیرۆرکردنەکە، سوپای ئەمریکیش هیچ جۆرە بەڵگەنامەیەکی لە دەزگاکانی سیخوڕی و هەواڵگری عێراقی دەست نەکەوت پاش داگیرکردنی عێراق لەسەر ئەو بابەتە.

کتێبی (نەهامەتیەکانی بوش) لە ڕاستیدا بریتیتیە لە پیشاندانی وێنەیەکی ناشیرینی سەرۆك و ماوەی سەرۆکایەتیەکەی، بە پشت بەستن بە کردەی شیکاری دەروونی. (واین زیرگ) دەڵێت :بڕیاری جەنگ و داگیرکردنی عێراق بڕیارێکی هەڵەبوو، بە چاو پۆشی لەوەی کە ئەو دەوڵەتە چی لێدێت لە ئایندەدا.

نوسەر دەڵێت:ئەوەی کە پەیوەندی بەو سەرکێشیە کارەساتبارەوە هەیە بۆ چوونە ناو عێراق بریتیە لە چەسپاندنی ڕاستی و دروستی بڕیارەکانی باوکی، بە تایبەتی ئەو بڕیارانەی کە لە نێوان ساڵانی (١٩٩٠–١٩٩١)ز دەریکردوون، بە تایبەتی ناچارکردنی صدام حسین بە کێشانەوەی هێزەکانی لە کویت و لانەبردنی لەسەر دەستەلات، لە ترسی تەقینەوەی ململانێ ی دەستەلات لە نێوان کوردو شیعە و سونەکاندا، بەڵام بەڕاستی ئەوە هەر ڕویدا لە پاش داگیرکردنی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣)ز.

هەڵەی گەورەی بوش لە یەکەم ساتی دەستپێکردنی جەنگی عێراق و وێرانکردن و خۆهەڵکێشانی بەسەر لەنوێ بنیادنانەوەی کۆمەڵگەی عێراقی بە گوێرەی تێڕوانینی ئەمریکی بۆ ژیان دەست پێدەکات، ئەو نەهامەتیانە بە کۆتا هاتنی ماوەی سەرۆکایەتی خۆی کۆتاییان نایەت، بەڵکو دەگوازرێنەوە بۆ دوای خۆی و لە وێشەوە بۆ دواەی ئەو لە دوای ئەویشەوە بۆ ئەوی تر، تا هەرەسهێنانی خودی ئەمریکا خۆی، وەك چۆن مەغۆلەکان هەرەسیان هێنا کاتێك ساڵی (١٢٥٨)ز بغدادیان وێرانکردوو داگیریانکرد، دوای سەد ساڵ نەیان توانی خانمی شارەکانی جیهان بنیادبنێنەوە.

مێژوو ئەوە تۆمار دەکات و دەینوسێتەوە کە ئیدارەی بوش و پارێزگارە نوێکان، لە ماوەی هەشت ساڵدا سەرکەوتوو بوون لە گۆڕاندنی ئەمریکادا بە ئیمپراتۆریەتی ترس و بڵاوکردنەوەی ترس و بیم لە نێو ڕیزی هاوڵاتیانی ئەمریکیدا و ڕازیکردنی ژمارەیەکی هەرە زۆریان بە درۆ، کە گوایا جەنگ لە دژی تیرۆر جەنگێکە بەسەر ئەمریکادا سەپێنراوە و هەرەشە لە ئاسایش و شێوازی ژیانیان دەکات، بۆیە پێویستە تا کۆتای بجەنگین، سەرکەوتنیش تیایدا دەکرێت بەدەست بهێنرێت، بەڵام پێویستی بە قوربانیدانی جەستەی هەیە.

مێژوو ئەوە دەنوسێتەوە کە ئەو سەرۆکێکی لوت بەرز بووە، ئەو لووت بەرزیەشی یەکێکە لە ڕووە کارەساتبارەکانی خۆی و دەستەکەشی، ئەو خۆبەگەرەزانینەی ئەو پارێزگارە نوێکان وایلیکردن کە بەهەڵەدا بچن لە ئاستی ڕاستیە مێژوویەکان و پێکهاتەی گەلانی عێراق.

هەروەها مێژوو ئەوە دەنوسێتەوە کە سەرۆك بوش ڕۆڵێکی پیسی گێڕا لە تێکدانی ئارامیی و هێمنی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، کە هیچ کامێك لە پێشینەکانی خۆی ئەو ڕۆڵەیان نەگێڕابوو. ئیدارەکەی شوێنەوارێکی ڕوخێنەری زۆر کاریگەری بەجێهێشت، کە چارەسەرکردنی چەند دەیەیێك تێکۆشان و ئارەق ڕشتن و قوربانی دانی دەوێت.

ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی کابوس و نەهامەتیەك بوو بۆ ناوچەکە، ناوچەکەی نقومکرد لە دەریایەك لە خوێن و فرمێسك و تێکدان و وێرانکردن بەناوی ڕزگارکردنی جیهان و بلاوکردنەوەی ئازادی و دیموکراسی.

مێژوو ئەوەی تۆمارکرد و بۆ جیهان ئاشکرابوو دوای جەنگی عێراق و داگیرکردنی، کە بوش چۆن یەکێك لە خراپترین بڕیارەکانی لە مێژووی هاوچەرخی ئەمریکا داوە، وەچۆن ڕای ئەمریکاو ڕای گشتی جیهانی هەڵخەڵەتاندوە بە هەڵگیرسانی جەنگی عێراق بە بانگەشەی درۆینە لەسەر بنەمای زانیاری هەواڵگری ساختە.

مێژوو بە نارەزای و ناحەزی و بێزاریەوە چەندین لاپەڕەی درێژی نوسیوەتەوە لە ئابڕوچوون و ئابڕوچونەکانی ئەشکەنجەدانی زیندانیەکانی ئەبوغرێب و گوانتانامۆ، ئەو تاوانانەی کە ئیدارەکەی بوش ئەنجامیدان گیان و عەقلّ و شکۆی بنەماو پرەنسیپەکانی ئەمریکای لە ناوبرد، ئەو پرەنسیپانەی کە دەوڵەمەند بوو پێیان و لەسەریان دامەزرابوو.

مێژوو تاوانی کوشتنی ملیۆنێك هاولاتی عێراقی و هەڵهاتنی چوار ملیۆنی ترو پێنج ملیۆن منداڵی بێ سەرپەرشت و سێ ملیۆن بیوەژن و ڕفاندن و دەستبەسەرکردنی هەزاران منداڵ و ژن و پیرو لاو و بردنیان بۆ زیندانەکان بەبێ هیچ جۆرە تۆمەت و دادگایکردنێك لەسەر ئەمریکیەکان تۆمار دەکات. ئەمە جگە لە تیرۆرکردنی (٥٥٠٠)زاناو بیریاری عێراقی، کە دواجار بووە هۆی دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی هەلپەرست

و تەماع خوازی نوێ لە ولاتدا، کە ستەم و گەندەڵی و جەورو ستەمیان نایەوەو بووە هۆی ڕاکێشانی هەزاران لاوی ئەمریکی بۆ عێراق و نانەوەی کوشتارو شێواندنی هەزاران لە ڕۆڵەکانی گەلی عێراق،ئەمانە هەموو وایانکرد کە بوش و داروده‌ستەکەی شایانی ئەوەبن کە نازناوی تاوانباری جەنگیان لێ بنرێت.

مێژوو ئەوەی تۆمارکرد کە ئەمریکا لە جەنگی هەرەمەکیدا (٣)ترلیۆن دۆلاری بە هەدەرداوە، لە کاتێکدا ئەو ڕێژە لە داهات بەس بوو بۆئەوەی کە جیهان بگۆڕیت بە گۆڕەپانێکی ئارام و هێمن و برسیەتی و نەخۆشی پێ لە نابرێت و نرخی خواردەمەنی پێکەمبکرێتەوەو قوتابخانەو نەخۆشخانەی پێ بنیادبنرێت لە ئەفریقا و ڕۆشنبیری لێبوردەی پێدروستبکرێت و دڵ و دەرونی جیهانی پێکەمەندکێش بکرێت بۆ خۆشەویستی ئەمریکاو پرەنسپەکانی.

مێژوو ئەوەی تۆمارکردووە کە پاڵنەری سەرەکی داگیرکردنی عێراق بریتی بووە لە نەوت و ئاسایشی ئیسرائیل، وەك چۆن بەرپرسێکی بالای ئەمریکی بەناوی (کرین فیسباگ) وەزیری خەزێنەی پێشووی ئەمریکی جەختی لەسەر دەکاتەوە.

مێژوو بە سوکی و ڕسوایەوە کردەی هێزەکانی ئەمریکا تۆماردەکات لە پارێزگاریکردن لە وەزارەتی نەوتی عێراق و بە جێهێشتنی مۆزەخانەی نیشتمانی عێراق بۆ تالانکردن دزو جەردەو داخ لە دڵەکان و بە ناڕەوا وێرانکردنی شوێنەواری عێراق و بە دەست ئەنقەست بردنی دەبابەکان بەسەر شوێنەوارەکانداو گۆڕانی شوێنەواری حەوت هەزار ساڵی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بە خۆڵ، ئەو شوێنەوارەی کە دادەنرێت بە یەکێك لە گەنجینەو و میراتەکانی مرۆڤایەتی و سەرەتاکانی چیرۆکی دەستپێکردنی شارستانی ژیانی مرۆڤایەتیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

مێژوو ئەو سەرۆکە بەوە پێناسە دەکات کە سەرکەش و لە خۆبای بوو تا ڕادەی هستریا، وە هۆگربوو بە ڕشتنی خوێنی بێتاوانەکان تا ڕادەی سەرخۆشی.

مێژوو ئەوە دەنوسێتەوە، کە دەبێت ئەو ڕۆژێك لەبەردەم ئیفلیجی منداڵە فەلەستینیەکان و جەستەی ژن و پیرەکانیان ڕابوەستێت، هەروەها لەبەردەم کەلاوەی

خانووە ڕوخاوەکانیان کە دەبابەکانی ئیسرائیل وێرانی کردوون بوەستێت، لە پای ئەوەی کە پیرۆزبای و دەست خۆشی لێدەکردن بەرامبەر ئەو کارانەی کە ئەنجامیاندەداو هانی دەدان کە بەردەوام بن لەسەری، بەبێ گوێدانە هیچ جۆرە ڕێزێك بۆ ئەو خوێنەی کە لە جەستەی فەلەستینیەکان دەچۆڕا.

مێژوو بەبێ باکی ئەوەی تۆمارکردووە، کە سەرۆك بوش کەسێکی لوت بەرز بووە و ڕەدی کردۆتەوە دان بە هەڵەکانیدا بنێت، ڕقی لەوە بووەتەوە کە ڕەخنەی لێبگیرێت و نکوڵی لەوە کردووە کە گوێ بۆ هەواڵی خراپ بگرێت، هەروەها ئەوەی ڕەد کردۆتەوە کە ئامۆژگاری کەس وەربگرێت و، ترسی هەبووە لە بیروبۆچوون و ڕای شارەزا سیاسیەکان. دەتوانین بڵێین کە زیاتر بەلای کەسێکی ساویلکەدا دەشکایەوە، بە ڕادەیەك کە ڕقی لە ڕووبەڕووبونەوەی ڕاستیەکان بوو، هەموو ئەم تایبەتمەندیە خراپانەی کە ئاماژەکان پێدان (روبرت درایبر)لە کتێبی (ناکۆکیەکانی سەرۆك) باسیان لێوەدەکات.

مێژوو ئەوەی تۆمارکردووە کە سەرۆك بوش کەسێکی شکست خواردوو بووە، بۆ جەخت کردنەوە لەسەر ڕاستیەتی ئەمەش (زبگنیو برجنیسکی) ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکی لەسەردەمی سەرۆك (جیمی کارتەر)ژمارەی (ئێف)ی پێداوە لە حکومکردندا، واتە کەوتوو لە ئەزمونەکاندا یان شکست خواردوو، وشەی شکست خواردووش لە زۆرترین ئەو وشە ناڕەحەت و بێزارکەرانەیە لە فەرهەنگی ئەمریکیدا بەکار دێت.

مێژوو ئەوەی تۆمارکردووە وەك (برجینسکی) ئاماژەی پێدەکات کە ئەمریکا هەلی سەرکردایەتی جیهانی لەدەستداوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی بوشدا، ئەمە جگە لەوەی لە ئەگەری خراپتربوونی بارودۆخی عێراق و هێرشکردنە سەر ئێران و فراوان بوونی بازنەی جەنگەکە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە وانەیە تەمەنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك سەرکردەی جیهان زۆر کورت بێت و سەرکەوتنی سەربازی ئەمریکی و خەیاڵەکانی واشنتۆن لە فراوانکردنی دەستەڵاتی، بە شکستی لە جەنگی عێراقدا سەرجەمیان تێکدەشکێن.

هەروەها برجنیسکی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە جەنگی عێراق کارەساتێکی(جیۆپۆلیتیکی )بوو کە بووەتە هۆی وروژاندنی هەستی داگیرکاری لە جیهاندا لە دژی ئەمریکاو خاکێکی بەپیتیشی دروستکرد بۆ ڕاکێشانی زیاتری تیرۆریستان، و هەستی دژایەتی کردنی ئەمریکای کردۆتە ئامانجی هاوبەش لە نێوان زۆرینەی گەلانی جیهاندا.

مێژوو باس لەوە دەکات کە چۆن بوش جارێکی تر کەسایەتی سەرکەشی هیتلەری بەرجەستە کردۆتەوە، وەك ئەوەی کە ڕاوێژکاری سەرۆکی پێشووی ئەمریکی (ریچارد نیکسۆن) بە ناوی (جون دیت) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بە ناوی (پارێزگارەکان بێ ویژدانن) بوش بە هیتلەر دەچوێنێت و جێگرەکەشی (دیك جینی ) بە موسۆلینی دیکتاتۆری ئیتالیا دەچوێنێت.

جۆن دیت لە کتێبەکەیدا کە لەڕاستیدا بەڵگەنامەیەکی تەواوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بوشی کوڕ زۆر بە توندی هەوڵی ئەوەی داوە کە ئەمریکا بە شێوەیەکی تەواو بگۆڕێتە سەر شێوەی ئەڵمانیای نازی سەردەمی هیتلەر و ئیتالیای فاشی سەردەمی موسۆلینی. جۆن دیت لە کتێبەکەیدا جەخت لەسەر باوەڕبوونی خۆی دەکاتەوە کە بوش و پارێزگارە نوێکان لەسەروی هەموویانەوە جێگرەکەی (دیك چینی )و لە گەڵیشیاندا ژمارەیەك توندڕەو لە پارتی کۆماری ئەمریکی، دەیانویست وڵات بەهەمان ئەو ڕێگەدا بەرن کە وەختی خۆی هیتلەرو موسۆلینی ئەڵمانیاو ئیتالیایان برد و دوو دژێمی دیکتاتۆری نازی و فاشستیان دروستکرد.

نووسەر ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوەی مەترسیەکەی زیاتر کرد ئەوە بوو کە ڕێژەی (٢٣٪)کۆماریەکان و لەگەڵ نزیکەی (٣٥٪) توندڕەوەکان لەسەرجەم ئاراستە جیاوازەکان لە ئەمریکا چاویان داخست بوو بە شوێن بوش و پارێزگارەکانەوە دەچوون، ئەوانەی کە تۆمەتبار دەکران بە وێرانکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

نوسەر باس لە بەراوردی ئەو بارە دەرونیە دەکات کە بەسەر ئەڵمانەکاندا هات بوو پاش جەنگی جیهانی یەکەم و ئەو حەزو ئارەزوەیان بۆ شۆرش و وەلآمدانەوەی،یان پاش

ئەو شکست و سەرشۆڕییەیی کە لایەنی سەرکەوتووی جەنگەکە بەسەریدا سەپاندبوون، بە هەمان ئەوبارە دەروونیەیی کە بەسەر گەلی ئەمریکیدا هات بوو پاش ڕوداوەکانی (١١سێپتەمبەری )ئەمریکا.

دیت لە کتێبەکەیدا دەنوسێت وەك جۆن وەختی خۆی پارتی نازی بە سەرکردایەتی هیتلەر، ئەڵمانیای بردە نێو ئەو بارە دەرونیەوە بە زیرەکی خۆی، و دوای بەکاری هێنا بۆ تاکرەوی لە دەستەلاتدا و دەستەلاتێکی دیکتاتۆرانەی دامەزراند پێش ئەوەی جیهان بباتە نێو جەنگی جیهانی دووەمەوە، بوش و پارێزگارە نوێکانیش هەمان کاریانکرد و خەریکە جیهان بەرەوە جەنگی جیهانی سێهەم پەلکێش بکەن.

دیت هوشیاری دەدات و دەڵێت:پارێزگارە نوێکان لەسەرو هەمووشیانەوە بوشی دیکتاتۆر، وەك چۆن وەختی خۆی نازیەکان و هیتلەر کردیان، ئەمانیش کۆمەڵگەیان پرکردو و کردیانە کۆمەڵگەیەکی سەربازی لە پێناو قبوڵکردنی پرۆژە سەربازیەکانیان و دەستگرتنیان بەسەر جیهاندا، بە ڕادەیەك تا بگاتە ئاستی ئەوەی ڕێگەیان پێبدرێت بۆمبی ئەتۆمی بەکاربهێنن.

دیت دەڵێت :ئەوەی کە ستالین لە یەکێتی سۆڤیەتدا کردی بوش لەئەمریکا دەیکات، پارتی کۆماری گۆڕی بەوەی کە پارتی شیوعی دەیکرد لە ڕووسیا، پارێزگارە نوێکان لەسەر یەکێك لە دوو هێڵەکەی شیوعیەت دەڕۆن، بە مانای ئەوەی دەبینین پارتی کۆماری وەك چۆن شیوعیەت ئایدۆلۆژیای هەیە ئەمیش ئایدۆلۆژیایی فەرمی هەیە، کە دەستە بژێری فەرمانڕەوا باوەڕیان پێی هەیە و پایە سەرەکیەکانی سیاسەتی دەوڵەتی لە ناوەوە دەرەوە لەسەر داڕێژراوە، کە بریتیە لە چوارچێوەیەکی فکری تەواو، و مەبەست و ئامانجە کۆتاییەکانی کۆمەڵگە دیاری دەکات و شیکار بۆ واقعی کۆمەڵایەتی دەکات و پسپۆڕیەکانی تێکەڵی سەرجەم پسپۆڕیەکانی دەستەو وەزارەت و ئاژانسەکانی دەوڵەت بوون.

دیت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئەگەر پارێزگارە نوێکان پێداگربن لەسەر ئەوەی کە هێزی سەربازی نەك دیبلۆماسی یان دادپەروەری یان شەرعیەتی نێودەوڵەتی

تاکە ئامرازی بنەڕەتیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جەنگ و تیرۆر، ئەوا بەهەڵەدا چوون و ئەو کارە بە پێچەوانە دەشکێتەوە، بەڵکو هۆکارێکی سەرەکی دەبێت بۆ هەرەسهێنانی هەموو ئەو شتانەی کە لەسەرەتای دروست بوونیەوە بنیادی ناون.

دیت دەڵێت:ئەوە وا دەکات لە پارێزگارە نوێکان کە مارشە سەربازیەکان و سیاسەتی جوانکردن و قۆستنەوەی جەنگی دژە تیرۆرو جیاوازی ئایینی بوەستێنن، لە بەر ئەوەی دەبنە هۆی دروست بوونی گروپی تیرۆرستی نوێ وەك دەرئەنجامێك بۆ سیاسەتەکانیان.

دیت لە کتێبەکەیدا ئەو گوتارە سیاسی و ئایینەیی پارێزگارە نوێکان شرۆڤە دەکات کە بووەتە هۆی هەڵخەڵەتاندنی هاولاَتیانی ئەمریکی (وەك چۆن کاتی خۆی هیتلەرو داروودەستەکەی لەگەڵ گەلی ئەڵمانیادا کردیان) و یارمەتیدان دەست بەسەر هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا بگرن و خۆیان تێدا بچێنن بە پشت بەستن بە زمانی بەرژەوەندی هاوبەش لەگەڵ خاوەن و بەرپرسانی ئەو دەزگایانە.

دیت ئاماژە بەو لێکۆڵینەوە دەکات کە جەخت لەسەر چۆنیەتی سەرکەوتنی پارێزگارە نوێکان دەکاتەوە بە سەر تەواوی گروپەکانی تردا لە ئامادەکردنی ستراتیژیەکاندا،ئەوەش لە هەموو شتێکدا یارمەتی دەدان لە بلاَوکردنەوەی زانیاریەکان بە ئاڕاستەی ڕای گشتی و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن کە کاریگەریان هەبوو لەسەر بڕیارەکانی کۆنگرێسی ئەمریکی.

لێکۆڵینەوەیەك کە (کۆمەڵەی چاودێری هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکی ) بلاَوی کردۆتەوە، ئاماژە بەوە دەکات کە زیاتر لە نیوەی ئەو زانیاریانەی کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بلاَویان کردۆتەوە، لە بەرهەمەکانی ئەو گروپە بیرمەندانە بوون کە سەربە پارێزگارە نوێکان بوون، بە شێوەیەك کە کارگەریان زۆر بە خێرای دەرکەوت لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی جۆرج بوشدا. گروپەکانی بیرمەندە ڕاستڕەوەکانیش سودیان لەو پاڵپشتیە و یارمەتیەیی دامەزراوەو دەوڵەمەندە پارێزگارە نوێکان وەرگرت کە لەم ساڵانەی دوایدا پێشکەشیان دەکردن.

دیت دەڵێت:ئێستا دەیان دامەزراوە هەن کە پارێزگارە نوێکان بەڕێوەی دەبەن و کاریان بریتیە لە دانانی پلانی سیاسی، ئەوان بە ڕێژەیەکی چڕو زۆر بونیان هەیە لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، لەلایەکی تریشەوە ئەو دامەزراوانە بوونەتە ناوەندێك بۆ مل پێکەچکردنی بڕیاری سەرکردەکان و ڕاوێژکارە سیاسیەکانیان.

لە کتێبێکی تردا بەناونیشانی (تاکڕەوی لە دەستەلآتدا)نوسەرو زاناو مێژوونوسی سیاسی (جیمس ماجریجور بیرنز)جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سەرۆك بوش خراپترین دیکتاتۆر بووە لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەی دوایدا.

لەم کتێبەدا (بیرنز) هەوڵدەدات بنەڕەتی دیاردەیەك کەناوی لێناوە (ستەم وزۆرداری دەستەلآت) لە ئەمریکا بدۆزێتەوە کە ڕیشەی خۆی لەو سەردەمەدا لە کەسایەتی جۆرج بوشدا نمایش دەکات، کاتێك کە هاولآتیان و ئەندامانی پارتەکەی و نوێنەرانی گەلی لە کۆنگرێسی ئەمریکی لە چاو خۆیەوە گۆڕی بە فەرمانبەر یان (بەندە) کە جڵەوی کاری خۆیان بە هۆی هەڵبژاردنەوە داوەتە دەست ئەو، ئیتر هەرچیەك دەکات بۆی ڕەواو حەلآڵە، بەبێ ئەوەی مافی تانە یان ڕەخنەگرتنیان هەبێت.

بیرنز دەڵێت:ماوەی فەرمانڕەوایەتی بۆش چەندین کارەساتی بەخۆیەوە بینی لەوانەش کارەساتی عێراق و ئابڕوچوونی ئەشکەنجەدانی زیندانیەکان و سیخوڕی کردن بەسەر هاولآتیانی ئەمریکیەوە بە بیانوی پاراستنیان لە تیرۆر، کە بووە هۆی دروست بوونی قەیرانێك لە دیموکراسیەتی ئەمریکیدا. بیرنز هۆی دروست بوونی ئەو قەیرانە بە سەرۆکایەتی ئیمپریالیزمی بوش بەوە پێناسە دەکات کە خۆی لەگەشە سەندنێکی سروشتی سەرکردەکانی ئەمریکا دەبینێتەوە لە ماوەی ئەم سەدەیەیی دوایدا، کە هێڵێکی جیاکەرەوە دروست دەکات لە نێوان سەرکردە بە ڕێزو باشەکانی وەك ڕۆزفێڵد سەرۆکی بیست و شەشەمینی ئەمریکا کە خەلآتی نۆبڵی ئاشتی وەرگرت لەسەر ئەو ڕۆڵە نێوەند گیریەیی کە گێڕای لە کۆتای هێنان بە جەنگی نێوان رووسیاو ژاپۆن لە ساڵی (١٩٠٥)ز، هەروەها تۆماس جیفرسۆن و چەند سەرکردەیەکی تری باشی ئەمریکا بە

گوێرەی قسەی نوسەر، و سەرکردە خراپ و دەستەلأت خوازەکانی وەك (ڕیچارد نیکسۆن و بیل کلینتۆن و جۆرج بوش)

بیرنز دوای ئەوەی نەهامەتیەکانی فەرمانڕەوایەتی بوشی خستە ڕوو، گەیشتە ئەوەی کە ئاماژە بەوە بکات کە لە بەختی خراپی ئەمریکا بوو کەوتە تەڵەکەوە، کاتێك نمونەی ئەو جۆرە سەرۆکانەی بە خۆوە بینی کە بە تاکڕەوەی حوکمیان دەکرد و بڕیار گەلێکی کارەساتباریاندا،کە ئەمریکیەکان لە ماوەیەکی دوور مەودادا نرخێکی گەورەی دەدەن. لەو بارەیەوە دەڵێت:دەوڵەتێکی گەورەی وەك ئەمریکا و گەلێکی مەزنی وەك گەلی ئەمریکا شایستەی سەرکردەی زۆر لە جۆرج بوشی دیکتاتۆر باشتر بوون.

زانای بەناوبانگی دەروونی ئەمریکی (فرانك)دەربارەی بوش لە کتێبێکی تردا بە ناونیشانی (لەسەر تەختی شیکاری دەروونی)دەڵێت:(ئەگەر یەکێك لە نەخۆشەکانم لە بەردەممدا چەند شتێك دووبارە بکاتەوە و چەند شتێکی تر ئەنجامبدات، ئەگەر بمەوێ بزانم بۆچی وادەکات، ئەو کات دوو دڵیم زیاد دەبێت کە بۆم دەرکەوت کە ئەو خووی گرتووە بە بەکارهێنانی چەند وشەیەك کە مانا ڕاستیەکەیان دەشارێتەوە و و کاریگەریان لەسەر کەسایەتی ئەو بەجێ هێشتووە ناوەڕۆکی کارەکانی خۆی پێ پەردە پۆشدەکات، ئەو کات پرسیارێکم بۆ دروست دەبێت لە توانای ئەو لەسەر دەرککردنی ڕاستیەکان بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو یەکێك لە نەخۆشەکانم نیە، بەڵکو ئەو سەرۆکەکەمە )

فرانك لە کتێبەکەیدا ژیاننامەی تایبەتی بوشمان بۆ دەگێڕێتەوەو (پرۆفایلێکی سایکۆلۆژی) بۆ دروست دەکات، کە بنیاد نراوە لەسەر کۆمەڵێك وردەکاری و دەرهاویشتەو زانیاری و تێبینی.هەرلە سەرەتای منداڵیەوە ئەو پەیوەندیە خراپەی کەلەگەڵ دایك و باوکیدا هەی بووە، تاماوەی هەرزەکاری و چەقاوەسوی کە تا تەمەنی چل ساڵی خایاندوە، کاتێك دووبارە لە دایك دەبێتەوە لەسەر دەستی موژدەدەرێکی ئوسولی بەناوی (بیلی گراهام)و خوگرتنی بە مەی خواردنەوە وازلێدەهێنێت، کە کاریگەریەکی ئێجگار زۆری کردبۆوە سەر میانڕەوی لە هەڵسوکەوتەکانی.

فرانك لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیدا دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە بوش بە شێوەیەك تەماشای دونیای کردووە کە گوایا وێرانکراوە لە پێشتردا لە دەرئەنجامی دەستەڵاتی ئەوانەی کە پێش خۆی دەستەڵاتیان هەبووە، لە نێو ئەوانەشدا باوکی خۆی، ئەو تێڕوانینەی بووە هۆی لە دایك بوونی هێزێکی وێرانکەر تیایدا کە هەمیشە بە شوێن سەلماندنی خۆیدا بگەڕێت.

مێژووی تایبەتی بوش گەیشتە دەرئەنجامی ئەوەی کە خاوەنی مەیدانخوازیەکی دەروونی بەرزو شاراوەو بنەڕەتی بوو، ئەو مەیدانخوازیانەی کە لە هەڵسوکوتی گشتیدا ڕێگەیەك بوون بۆ چارەسەرکردنی ترسەکان، ئەو نەدەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە بزانێت چۆن پێدەکەنێ، یان ڕێدەکات، یان قسە دەکات، بەبەردەوامی بە ئاڕاستەی ئازاردان و چەوسانەوەی ئەوانی تردا دەڕۆشت، ئیتر لە ڕێگەی نوکتەبازی یان دەرخستنی هاوسۆزیەکی درۆین و دروستکراوەوە بێت ! !

لە ڕاستیدا بوش زیاتر بەلای نکوڵی کردندا دەشکایەوە، کەوای لێکردبوو حەزی بە خۆدەرخستن بێت و پێویستی بە ڕێکخستنی کاروباری دەرەوەی بێت بە ڕێگەیەکی ئاسان، کە ئەوەش تاکە وەڵامدەرەوەی بوو بۆ ئەو شەپۆلە ترسانەی کە لە ناخەوە بەگیریان هێنابوو، و ناڕەحەتی و خەفەتیان کردبوو بە هەستێکی تۆڵەسێنەر لەلای. بۆیە ناوەوەیی خۆی ڕەد دەکردەوەو خۆی دابوویە دەست دەرەوەی، و پەنای دەبردە بەر ڕێکخستنی درۆین بۆ دەرکردنی دوو دڵیەکەی، بە شێوەیەك ڕژێمێکی ستەمکار شوێنی مەی خواردنەوەکەی گرتبۆوە لە هێورکردنەوەی پەرچەکردارو هەڵچونەکانیدا.

پێش ئەوەی بوشساڵی (٢٠٠٨)ز کۆشکی سپی بەجێبهێڵێت شارەزایانی سیاسی ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکارەساتبارەکەیان هەڵسەنگاند و، کامانەن ئەو هەڵە سەرەکی و بنەڕەتیانەی کە بوونە هۆی شکستی ئیدارەکەی بوش؟

بۆ وەڵامدانەی ئەم پرسیارە سێ کتێب لە هەمان ساڵدا لە ئەمریکا بڵاوکرانەوە، واتەلە ساڵی (٢٠٠٨)ز، کە ئەو هەڵانەیان تێدا تۆمارکرابوو بوش و ئیدارەکەی لە ماوەی حەوت ساڵی دەستەڵاتەکەیدا ئەنجامیاندابوو.

فرید کابلان له کتێبەکەیدا بەناوی (باوەڕداره خەوبینەکان )دەڵێت:چۆن هەندێك فکرەی گەورە ئەمریکایان هەژاند).

شکستی بوش له خوێندنەوەی هەڵەی بوو بۆ هەریەکە ڕووداوی کۆتای هاتنی جەنگی سارد لە ساڵی (١٩٨٩)ز هێرشەکانی (١١سیبتەمبەری ساڵی ٢٠٠١)ز، ئەوانه هەڵەی بنەڕەتی بوون لە ڕێڕەوی ئیدارەی ئێستای ئەمریکیدا، بە پێچەوانەی زۆرینەی کتێب و ئەدەبیاتی ئەمریکیەوه ئەم نوسەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم دوو ڕوداوه، یارمەتی شان و شکۆ و دەستەڵاتی ئەمریکایان نەداوه و هێزی ئەمریکایان زیاد نەکردووه، بەڵکو بە پێچەوانەوه لاوازیان کردووه.

کابلان قسەکانی تەواو دەکات و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕووداوەکانی (١١ سێیتەمبەر)هەموو شتێکیان نەگۆڕی وەك جۆن ئیدارەی بوش ئەوەی چەسپاند، وەك چۆن بینیمان پەرچەکردای ئیدارەی ئەمریکی ئەو کات ئەوەی بەسەردا زاڵ بوو؟،لەگەڵ ئاراستەی بەرەو دروستکردنی سیاسەتێك کە پشت ئەستوربێت بە سەرکەوتنی ئەمریکی،بەلأم لە ڕاستیدا ئەوە ئەمریکای زیاتر لاواز کرد.

کابلان ئاماژە بەوە دەکات کە پەرچەکرداری زاڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا هی پارێزگاره نوێکان بوو، و لێکدانەوەی ڕووداوەکانی (١١سێبتەمبەریان)بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو، ئەو لێکدانەوەش بە ئاڕاستەیەکدا ڕێگەی گرت بوو کە لەگەڵ ئەو باره میزاجی و دەروونیەیی سەرۆکدا یەك بگرێتەوه.

کابلان کتێبەکی کۆتای پێدەهێنێت بە ڕەخنەگرتن لەوەی کەناوی دەنێت (ئەجێندای ئازادی )ئەو دەڵێت:ئەو ئەجێندایه سادەو ساویلکەیە کە لە عێراق و ئەفغانستاندا دەستی داوەتێ و تا ئێستاش نەی توانیوه لێی دەربچێت، ئەو ئەجێندایه گرنگی نەداوه بە ووردەکاری ئەوەندەی گرنگە داوه بە فکرەی گەوره. بەرپرسانی جێ بەجێکردنی ئەو ئەجێندایه دەستەوسانن لە گرنگیدان بە ووردی وردەکاریەکانی جەنگەکان لە ڕۆژهەلأتی ناوەڕاستدا، دەستەوسانن لە تێگەیشتنی ڕاستی ڕووداوەکانی ناوچەکە و تێگەیشتنی چۆنیەتی جێ بەجێکردنی ئازادی تێیدا.

کابلان قسە لەسەر ئەو ئەجێندایە دەکات و دەڵێت:ئەو پێکراوی ساویلکەی بوو، کاتێك بوش لە باوەڕەدابوو کە لادانی دیکتاتۆریەت لە عێراقدا ئازادی بە دوای خۆیدا دەهێنێت. بوش و هاوڕێکانی بەو دڵ پاکی و ساویلکەییە بەهاو بەرژەوەندیەکانی ئەمریکایان تێکشکاند.

کابلان دەسکەوتی ئەو حەوت ساڵەی بوش (ا ئەو کاتەی کە ئەم کتێبەی نوسیوە)وەرگێڕ. کورت دەکاتەوە لە دوو ڕاستی بنەڕەتیدا:دروست بوونی ڕەوتێکی پارێزگاری نوێ ی دەستەڵاتدار و سیاسەتێکی بەرژەوەندخوازی نا ئەخلاقی. بە سەرسوڕمانەوە پرسیادەکات :ئایا دەکرێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەدەی بیست و یەکدا لە ژێر سێبەری ئەو دوو ڕاستیە ڕەشەدا هەڵسوکەوت بکات؟ !

نوسەر (یعقوب هیلبرۆن) لە کتێبی (ئەوان وادەزانن لەسەر ڕاستین )ئاماژە بەوە دەکات کە هۆکاری سەرەکی لە پشت شکستی ئیدارەی بوشەوە بریتی یە لەو عەقڵیەتە یەهودیەیی کە پارێزگارە نوێکان هەیانە، ئەوانە کەهەر لەسەرەتای وەرگرتنی دەستەڵات لەلایەن بوشەوە لە ساڵی (٢٠٠٠)ز وە پەیمانیان لەگەڵیدا هەبووە.

نوسەر تیشك دەخاتە سەر ئەزموونی کۆچکەرە جولەکەکان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو گەشەسەندنیان لە کەش و هەوایەکی کەمینەیدا.

لەسەرەتادا (هیلبرۆن)جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە باڵی پارێزگارە نوێکان، نوێنەرایەتی ئایدۆلۆژیایەك یان پەرچەکرداری بێ ئومێدی چەپڕەوەکانی ئەمریکا ناکەن، بەڵکو نوێنەرایەتی عەقڵیەتی یەهودیەت دەکەن (کە لە لایەن پسپۆڕان و شارەایانی کۆچەرە جولەکەکانی ئەمریکاو هۆلۆکۆست و ڕەوتی تێکۆشانی سەدەی بیست دژە دیکتاتۆریەت دروستکران ).

هیلبرۆن وای دەبینێت کە جولەکە کۆچەرەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ژێر فشارو چەوسانەوەی ئەمریکیە سپی پێستەکاندا (ئەنگلۆساکسۆنەکان)دا دەژیان. دەیان ناڵاند بەدەست ئەو بارودۆخەی کە هەیان بوو، وەك کەمینەیەك لەدەرەوەی

کۆمەڵگەی ئەمریکی، ئەمەش وای لێکردن کە بیروباوەڕی یەهودیەت لە جیاتی ئایدۆلۆژیای دیموکراسی وەربگرن و بیکەنە تەوەری بنەڕەتی فکرەکەیان.

هیلبرۆن ئاماژە بە پرۆگرامی تلمودی دەکات کە (لیوشتراوس)لە رۆڵەی کۆچەرە جولەکەکانی سەدەی بیستی ئەمریکا دایناوە، باس لە چۆنیەتی دابەزاندنی ئەو پرۆگرامە بەسەر دەقە ئایینیە جیاوازیەکاندا دەکات. هەروەها باس لە نەوەی دووەمی پارێزگارە نوێکان دەکات، کە چیرۆکی پاڵەوانیەتیە مێژوویەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئیسرائیلیان گۆڕیووە بە چیرۆکی ڕووداوی مێژووی یەهودی، بروایان وایە کە ئەوان ئەو کەمینە چەکدارەن کە دەکرێت بەڕاستی مێژوو بگۆڕن، خۆیان بە شێوەی پێغەمبەر دەچوێنن، لە کەمی ژمارە و پەیامەکەیاندا کە گیسانەوەی ئاشتی هەمیشەییە.

ئەگەرچی پارێزگارە نوێکان لە شەستەکانی سەدەی ڕابردودا، کورت هەڵهات بوون لە پارتی دیموکراتی ئەمریکیدا، بەڵام لە حەفتاکان و هەشتاکانی هەمان سەدەدا بەرەو پارتی کۆماری ئاڕاستەیان گۆڕی، دوای لە دەستدانی هیوایان بە پارتی دیموکراتی، ئەویش ئەو کاتەی کە پارتەکە لە پرۆژە ناوچەییەکاندا بە ئاشکرا شکستی هێنا.

ئەگەر لە دەیەیی کۆتا لە جەنگی سارد هاوپەیمانی نێوان پارێزگارە نوێکان و ئیدارەی سەرۆك (رێگان ) ی بەخۆوە بینی تا دەرچوونی لە کۆشکی سپی، ئەوە قۆناغی دوای ڕووداوەکانی (١١سێبتەمبەر) هاوپەیمانیەتی نێوان پارێزگارە واقعیەکانی وەك (دیك چینی و دۆناڵد ڕامسفیلد) و پارێزگارە میسالیەکانی بە خۆوە بینی.

لە کتێبی (ترادیژیای بوش)ی(یعقوب وایزبیرگ) گریمانەی سەرەکی بریتیە لە :گەڕانەوەی شکستی بوش بۆ پەیوەندی قەیراناوی بە باوکیەوە، کە زیاتر پشتی دەبەست بە براکەی (جیب) لە ڕوانگەی سەرکەوتووی پرۆسەی خوێندنی ئەوەوە بەسەر بوشدا. شکستی بوش لە پرۆسەی خوێندنی و ژیاننامەی زانستی، هۆکارێك بووە بۆ ئەوەی باوکی متمانەی لێ بسەنێتەوە،ئەوەش وایکرد کە گرێیەکی دەروونی بۆ بوش دروست بکات. (جار فینگل) خۆی نادات بەدەست ئەم گریمانە شکسپیری و فرۆیدیەوەو

جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە (وایزبیرگ) لێهات و زیرەك نەبووە لە ڕووی ئەكادیمیەوە بۆ دەركردنی ئەو گریمانەیە.

وایزبیرگ ترادیژیای بوش دابەشدەكات بەسەر سێ بەشدا :بەشی یەكەمی خۆی دەبینێتەوە لە ململانێ ی بوش تا تەمەنی چل ساڵی تائەو كاتەی دەبێتە وەك باوكی. بەشی دووەمی خۆیدەبینێتەوە لە گەورەبوونی سەركەوتنەكانی بە درێژای ئەو پانزە ساڵەی دوای، دوای ئەوەی كە زانی لە باوكی جیاوازە. بەشی سێهەم و كۆتایشی خۆی دەبینێتەوە لە گەڕان بەدوای بیروباوەڕدا، كە كاروباری نێودەوڵەتی پێ لێكبداتەوە و شیكاری پێ بكات.

گرنگی پێدانی (جیب) بەسەر بوشدا لەلایەن باوكیەوە، وەك میراتگری خێزانە سیاسیەكەیان، هۆكاری سەرەكی و ڕاستەخۆ بوو بۆ ئاڕاستەكردنی بوش بەرەو دروستكردنی سەركەوتنەكانی بە ڕێگەی تایبەتی خۆی، بە شێوەیەك كە لایەنگری بۆ لقی خێزانی بوش نەبێت و لایەنگری زیاتری خێزانی (ووكر) بكات –ئەو خێزانەبوو كە زیاتر بوش لایەنگری بۆیان هەبوو– وەك چۆن (وایز بیرگ ) ئاماژەی پێدەكات.

ئەگەر خێزانی بوشی پرۆستانتی مەزهەب و بنەڕەتێكی ئینگلیزی ناسراوبن بە سنگ فراوانی و پلەبەندی لە پۆست و كارە گشتیەكاندا، ئەوە لە بەرامبەردا خێزانی ووكری كاتۆلیكی مەزهەبی سەر بە ویلایەتی میریلاندی ئەمریكی، ناسراون بە دەوڵەمەندێكی نوێ ی نارەسەن و خۆشەویست سەرپێ ی لە هەڵسوكەوتدا.

زۆرینەی بڕیارەكانی بوش كاریگەربوون بە لقی خێزانی ووكر، كاریگەری تەواوی باپیری (بیرت ووكر) بە ڕوونی بە كەسایەتیەوە دیاربوو وەك چۆن نوسەر ئاماژەی پێدەكات.

ئەو پەرچەكردارەكانی گێلانەبوون، بڕیارەكانی بە متمانەیەكی ڕادەبەدەر دروستدەكران، بەبێ هیچ جۆرە پلانێكی پێگەیشتوو باش، هەموو هەڵسوكەوتەكانی بۆ ماوەی بوون و بوش لەسەریان دەڕۆشت لەو خێزانەدا، بە پلەیەك كە خودی خۆی هەستا بە دروستكردنی خێزانێكی نوێ كە لەگەڵ پێوەرەكانی خێزانی ووكر گونجاو بێت.

نوسەر شکستی بوش دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو پەیوەندیە قەیراناویەیی کە لەگەڵ باوکیدا هەی بووە، هەروەها بۆ ڕێگەی ئایندارى تایبەتی خۆی کە بوش ئایینی کردبووە بە شێك لە ئیدارەدانی سیاسەتەکانی، یان ئامرازێکی جیاکاری بۆ بەکارهێنانی سیاسی. بە هەرحاڵ سەرەڕای پەسەندکردنی (جارفینکل) بۆ ئەو شیکاریە، بەڵام وای دەبینێت ئەوە بەس نیە، لەبەر ئەوەی بڕیارە سەرۆکایەتیەکان لەڕێگەی پەیوەندیەکی دینامیکی نێوان کوڕی سەرۆك و باوکەوە دیاریدەکرێن، بە شێوەیەك کە ڕووبەری سیاسەتی ناوچەی و نێودەوڵەتی جیاوازیەکی ڕاستەقینەییان هەیە.

بەو شێوەیە هەمووان ڕایان لەسەر ئەوەیە هەرچەندە جیاوازن لەسەر هۆکارەکان، بەڵام سەرجەمیان کۆکن لەسەر مەترسی لێکەوتەکانی هەڵبژاردنی بوش لەلایەن ئەمریکیەکانەوە.

بوشی خراپەکار و، بلیمەتەکانی شەڕی دەست و پەیوەندەکەی، هەمیشە هەوڵی هەڵخەڵەتاندنی هاوڵاتیانی ئەمریکی و جیهانیان داوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە بە ئامانجیان گرت بوون، وەك عەرەب و موسڵمانەکان، بەڵام هەموو جارێك شکستیان هێناوە، ،بە ڕادەیەك کە بەرپرسە ئەمریکیەکان ئەوانەی کە بوش هانای بۆ بردوون بۆ چاککردنی وێنەی خۆی و وڵاتەکەی هەموو بە هەوادا چوون، لەبەر ئەوەی زۆرینەیان دەستیان لە کارەکەیان هەڵگرت، هەرچەندە بە ئاشکرا ئەوەیان ڕانەدەگەیاند کە سیاسەتی سەرۆکەکەیان دەستەبەری لێدانی هەر جۆرە هەوڵێکە بۆ چاککردنەوەی وێنەی ئەمریکا لە جیهاندا.

پێش جەنگی عێراق و ئەفغانستان، شێوەکانی ستراتیژیەتی ئەمریکی بەدیارکەوتن بۆ هەڵخەڵەتاندنی ڕاگەیاندن لە دوو ڕووەوە :یەکەمیان مەدەنی، دووەمیشیان سەربازی، ئەم دوو ستراتیژیەتە بە شێوەیەکی سەرەکی ئاراستەی جیهانی ئیسلامی و دوای جیهان بەگشتی دەکرا، ئەمە سەرەڕای ڕووی سێهەمی(دەرەوەی ) ئەو ستراتیژیەتە کە پەیوەندنی بە دروستکردنی فشاری هەمە لایەنەوە هەبوو لەسەر هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و

کەناڵە ئاسمانیە عەرەبیەکان، ئەوانەی کە بە سواری ئۆتۆمبێلەکەی داگیرکەران نەدەڕۆشتن.

لایەنی مەدەنی ئەو ستراتیژیەتە کاتێك دەرکەوت کە ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی ئاشکرای کرد کە پلانێك هەیە بۆ چاککردنی وێنەی ئەمریکا لە جیهانی ئیسلامیدا دوای ڕووداوەکانی (١١ سیبتەمبەری ساڵی ٢٠٠١) ز و وەزارەتی دەرەوە سەرپەرشتی دەکات، لە وەزارەتیش شارەزاو پسپۆڕی پڕوپاگەندە و ڕاگەیاندنی ئەمریکی (شارلوتبیرز) سەرپەرشتی دەکات، بەڵام شارلوت دەست لەکارکێشانەوەی فەرمی خۆی لە سەرەتاکانی مانگی فبرایەری ساڵی( ٢٠٠٣ )ز ڕاگەیاند لە لیژنەی (چاککردنی وێنەی ئەمریکا). بە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆستی) ئەمریکی ڕاگەیاند لە مانگی (٧ مارسی ساڵی ٢٠٠٣)ز کە هەوڵەکانی بۆ بەرگریکردن لە سیاسەتەکانی ئەمریکا لە جیهانی عەرەبیدا قبوڵکراو نەبووە، وەك ئەوە وایە فیلێك بخەیتە نێو قتویەکی بچوکەوە، لەبەر ئەوە وێنەی ئەمریکا لای گەلانی دونیا زۆر لەوە خراپتر بووە کەلە خەیاڵی ئێمەدایە.

لەگەڵ چوونە نێو پلانی داگیرکردنی ئەفغانستان و عێراق، پلانەکەش چووە بواری جێ بەجێکردنەوە، هەوڵێکی تر درا بۆ چالاککردنەوەی ئەو ئیدارەیە، بە ئامانجی بلأوکردنەوەی بەرنامەی پڕوپاگەندەیی کە ئیدارەی ئەمریکی پشتی پێبەست بوو، بۆ چاککردنی وێنەی داگیرکاری و بەرگریکردن لە بلأوبوونەوەی ڕق لە دژی ئەمریکیەکان لە ناوچەکانی نیشتمانی عەرەبیدا.بەڵام دوای داگیرکدنی عێراق بە فعلی، بەرنامەی تری دانا، کە ئامانج لێ ی ڕازیکردنی عەرەب و موسڵمانان بوو بەوەی کە ئامانج لە داگیرکردنی عێراق بە تاڵان بردنی سەروەت و سامانی ئەوە وڵاتە نیە، بەڵکو ئامانج بلأوکردنەوەی دیموکراسیەتە لەو وڵاتەدا، لە بەرئەوەی هەستی دژایەتیکردن و ڕق لێبوونەوەی ئەمریکیەکان دوای ڕوداوەکانی (١١ سێبتەمبەر) تا دەهات پتر دەبوو.

ئاژانسی ڕۆیتەرز لە ڕۆژی (٩ ئەپریلی ساڵی ٢٠٠٤)ز جەخت لەسەر بوونی ئەو پلانە نوێیە دەکاتەوە، کە لە بەرپرسێکی ئەمریکی گواستووەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بەوە دەکات کە ووردەکاریەکانی ئەو پلانە بە نهێنی ماونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

ئیدارەی ئەمریکی چەند گرێ بەستێکی لەگەڵ ژمارەیەك کۆمپانیای بواری ڕاگەیاندندا بەستووە، بۆ دروستکردنی هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن، لەو دەستەو کۆمپانیانە (بل بوتینجر کومیو نیکیشنز) کە بنکە سەرەکیەکەی لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیایە، هەروەها (بیتس بان جالف) سەر بە گروپی (دەبلیو،بی، بی) و (بالوتش ئاند هو) کە بنکەکەی لە بغدادی پایتەختی عێراقە.

(مارك ترنبول) لە کۆمپانیای (بل بوتینجر کومیونیکیشنز) بۆ ئاژانسی هەواڵی ڕۆیتەرز دەڵێت: (ئامانج لە هەموو ئەوانە بریتیە لەوەی کە خەڵکی بگەنە ئەو باوەڕەی، کە بە فعلی دیموکراسی دروست بووە ).هەروەها دەڵێت: ئاڕاستەکردنی ئەو پەیامە بە شێوەیەك دامەزراوە کە دوورە بانگەشەی ڕاستەخۆی ئەمریکیەوە. ئەو هەڵمەتە بە ئیدارەو بودجەی تایبەتی ئەمریکیی بەڕێوە دەچوو، بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن و برەوپێدانی چەمك و سیاسەتەکانی واشنتۆن، لە ڕێگەی زنجیرەیەك لە گۆڤارو ڕۆژنامەوە کە لەلایەن ئیدارەی ئەمریکیەوە ڕاستەوخۆ پشتگیری دەکران، وەك گۆڤاری (های)، و ڕادیۆی (سەوا)، ئەمە جگە لە دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی (الحره ) شان بەشانی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی تر، ئەمە سەرەڕای میوانداریکردنی ڕۆژنامە نوس و ڕاگەیاندکارە عەرەبەکان لە بەرنامەکانی ڕاهێنانی ئەمریکیەکاندا.

ئەم هەڵمەتەش بۆ جاری دووەم شکستی هێنا، بە بەڵگەی ئەوەی کە زاناو پسپۆڕی پڕوپاگەندەی ئەمریکی (شارلوت بیرز)بۆ جاری دووەم دەست لە کارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد لە پۆستەکەیدا،دوای ئەوەی لە پۆستی یەکەمی وازی هێنا لە لیژنەی (چاککردنی وێنەی ئەمریکا )لە (مانگی مایۆی ساڵی ٢٠٠٤)ز لەبەر ئەوەی هیچی دەست نەدەکەوت کە بەرگری پێبکات لە وڵاتەکەی، لە بەرامبەر ئەو تۆمەتانەی کە ئاڕاستەی دەکران.

هەرچی دەربارەی لایەنی سەربازی پلانەکە هەیە لە ستراتیژیەتی ئەمریکیەکاندا، ئەوە وەزارەتی بەرگری (پنتاگۆن) سەرپەرستی ڕاستەوخۆی دەکرد، کە نارەحەتیەکی زیاتری لەسەر شان بوو، وەك برەودان بە دنیا بینی تاکڕەوی ئەمریکی _کە بابەتی بوونی خۆی

لەدەستدابوو_بۆ هەڵمەتە سەربازیەکانی ئەمریکا، لە میانەی پەیامنێرە ڕۆژئاوایەکانەوە، ئەوانەی کە هاوڕێیەتی هێزە داگیرکەرەکانیان دەکرد، شانبەشانی هەڵخەڵەتاندنی بوارەکانی ڕاگەیاندن لە ڕێگەی یەکەیەکی تایبەتەوە کە پنتاگۆن خۆی پێکی هێنا بوو، دواتر لەساڵی (٢٠٠٢)هەڵی وەشاندەوە، کاتێك کارەکانی توشی ئابڕوچوون هاتن، بۆیە پنتاگۆن لەو کاتەدا نوسینگەی کاریگەری ستراتیژی داخست، دوای ئەوەی کە ڕەخنەگران لە وەزارەتی بەرگری، تۆمەتباریانکرد بەوەی کە نوسینگەیەکی دامەزراندووە بۆ بڵاوکرنەوەی درۆ لەسەرتاسەری جیهاندا، بە بیانووی هەڵخەڵەتاندنی دوژمنانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

بەشی دووەمی پلانەکەی پەنتاگۆن بنیادنرابوو لەسەر پروپاگەندەی تەلەفزیۆنی وپارەدارکردنی کەناڵە ئاسمانیە عێراقیەکان. وەك نمونەیەکەی خێرا بۆ برەو پێدانی، بە کوژمەی (٨،٥)ملیۆن دۆلار بەمەبەستی یارمەتیدان لە ڕازیکردنی عێراقیەکان بە دروستی بڕیاری ئەمریکی بۆ بڕیاردانی دیموکراسی لە عێراقدا و نەبوونی ئارەزوویان بۆ مانەوە لە عێراق و داگیرکردنی،وەك چۆن بەرگریکارانی عێراقی دەیانگوت. ئەمە سەرەڕای جەخت کردنەوە لەسەر (ڕاگەیاندنی جەنگ)و کورت هەڵهێنانی بە تەنها کارکردن لە دەرهێنانی هەواڵەکان لە ناوچەی کردە سەربازیەکاندا (وەك ناوچەی فەلوجە) لە سەرچاوە سەربازیە ئەمریکیەکانەوە، و ڕێگە نەدان بە چاودێری سەربازی و بەدواداچوونی تایبەتی کەناڵەکان بۆ ڕاستیەتی بڵاوکراوە سەربازیەکان، وەك ڕاگەیاندنی بەدەستهێنانی پێشکەوتنی سەربازی خێرا لەسەر زەوی و سەرکەوتنی گرتنی شارەکان لەو کاتانەی کە دەستیشیان بەسەردا نەگرت بوو، بە ئامانجی ماندوکردنی دوژمن و وێرانکردنی گیانی مەعنەویەتی بەرگریکاران، ئەم ستراتیژیەتە کە ئاماژەمان پێدا لە جەنگی داگیرکردنی عێراقدا تاقیکرایەوەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا و عێراقی پێداگیرکرا، بەڵام دواتر هەمان ستراتیژیەت لەگەڵ بەرگریکاراندا تاقیکرایەوە بەڵام ئەمجارەیان شکستی هێنا.

بەشی سێهەمی ئەم ستراتیژیەتە، لەسەر شاردنەوەی ڕاگەیاندنی عەرەبی بنیادنرابوو، ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی پلانی ڕاگەیاندنی ئەمریکی بنیادنراوی برەوپێدان و بانگەشە

بوو بێت بۆ داگیرکاری، ئەوە ڕوویەکی تری ئەو پلانە بریتی بوو لە گەمارۆخستنە سەر ڕاگەیاندنی عەرەبی، کە ڕاستیەکانی دەخستەڕو، و وێنەی پێشێلکاریەکانی ئەمریکای لە عێراق و گوانتانامۆ و شوێنەکانی تر بڵاودەکردەوە، ئەوەش بە شێوەیەکی ئاشکرا لە هێرشکردنە سەر کەناڵی جەزیرەی قەتەری بەدیارکەوت لە چەند بۆنەیەکدا،دواتر داخستنی نوسینگەکانی و هێرشکردنە سەری لە ئەفغانستان و عێراق، هەروەها هەڕەشەکردن لە چەند کەناڵیکی تری ڕاگەیاندن بە ئاشکرا لەلایەن سەرکردە سەربازیە ئەمریکیەکانەوە.

هیچ بەڵگەیەك بۆ شکستی ئەمریکیەکان بە هەموو ئەو توانا ڕاگەیاندنەو داراییەوە کە هەیان بوو بۆ سپی کردنەوەی ڕووی ناشیرینی بوش و ئیدارەکەی لە جیهاندا، ئەوەندەی ئەو بزمارەی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (کارین هیوز) نەبوو کەدای لە تابووتی ئەو دیبلۆماسیەتە گشتیەیی کە کاری چاککردنی وێنەی ئەمریکا بوو لە جیهاندا، بەدەست لەکارکێشانەوەی لە پۆستەکەی، کە بووە هۆی شڵەژان و پەرێشان بوونی کۆشکی سپی، دوای ئەوەی دوو بەرپرسی تری ئەمریکی پێشترلە هەمان پۆست دەستیان لەکارکێشابوویەوە.

خاتوو کارین هیوز بە پێوەری مانەوە سێهەم بوو لە بەهێزیدا،لە پۆستەکەیدا نزیکەی (٢٥)مانگ مایەوە لەو کاتەوە کە ئەو پۆستەی وەرگرت بوو لە ساڵی (٢٠٠٥)ز، بۆیە ئەو پاڵەوانی ئەو پۆستە نەفریناویە بوو، بە نەفرینەکانی کوشتارەکانی جەنگ و داگیرکاریە عەنتەریەکانی ئەمریکا کە سەرۆك بوش ولآتەکەی تێوە گلاندبوو، کە دواجار بوو بوویە هۆی دروست بوونی ڕق لێبوونەوەی جیهان بەگشتی و عەرەب و موسڵمانەکان بە تایبەتی کە قوربانی دەستی جەنگ و داگیرکاریەکانی بوون.

پێش خاتوو هیوز دوو کەسی تر ئەو پۆستەیان بەڕێوەبرد بوو، یەکەمیان خاتوو (شارلوت بیرز) ناوێکی دیار لە جیهانی پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندندا،کە ماوەی مانەوەی لە پۆستەکەیدا زیاتر لە (١٨)مانگی نەخایاند لە دوای قۆناغی (١١ سێبتەمبەر).دووەمیان

بریتی بوو لە خاتوو (مارجریت تاتوایلر) باڵوێزی پێشووی ئەمریکا لە مەغریب، ئەمیش تەنها (٦)مانگ لەو پۆستە هەستیارەدا مایەوە.

جیاوازی نێوان ئەم سێ کەسایەتیە بریتی بوو لەوەی کە ئەو دووانەی پێشوو بە ئاشکرا ئەوەیان ڕاگەیاندبوو کە هۆکاری دەست لەکارکێشانەوەیان بریتی بووە لە شکستی هەوڵەکانیان بۆ جوانکردنی وێنەی ئەمریکا لەبەردەم جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا، بە هۆی لایەنگری کوێرانەی ئەمریکا بۆ ئیسرائیل و بەردەوامی دوژمنکاری ئەمریکا بۆ عەرەب و موسڵمانان.

بەڵام هیوز هیچی بە شێوەیەکی فەرمی ڕانەگەیاند و ڕزگارکردن و خەجاڵەت باری بۆ ئیدارەکەی بوش و وەزیرەکەی دەرەوەی بەجێ هێشت ، بەتایبەتی دوای دەستلەکارکێشانەوەی ژمارەیەك بەرپرسی ئیدارەکەی، بە شێوەی دراماتیکی یەك لە دوای یەك، وەزیری دەرەوەش هیچی نەدۆزیەوە لەو بارەیەوە کە بیڵێت تەنها ئەوە نەبێت کە ڕایگەیاند هۆکاری خێزانی لە پشت دەستلەکارکێشانەوەکەی (هیوزە)وە بووە.

ئەو کارە پێویستی بە لێوردبوونەوەیەکی گەورە نیە تا وێنەکە ڕوون ببێتەوە، بۆیە هەریەکێك لەو سێ خاتوونە بەرپرسانە یەکێك لە کارەساتەکانی ئیدارەکەی بوش لە ئەستۆ دەگرن :

یەکەمیان خاتوو (شارلوت )هەڵەی گەورەی هەوڵدان بۆ چاککردنی وێنەی وڵاتەکەی پاش ڕووداوەکانی (١١ سێبتەمبەر) و ڕووداوەکانی ئەفغانستان لە ئەستۆ دەگرێت. دووەمیش خاتوو (تاتویلر) هەڵەی بەرگریکردن لە سیاسەتە دوژمنکاریەکانی ئیدارەی ئەمریکی لە دژی جیهانی ئیسلامی و جەنگی عێراق لە ئەستۆ دەگرێت. هەرچی خاتوو (هیوز)یشە سەرجەم هەڵەو کەم و کورتیەکانی ئیدارەی ئەمریکی لە ئەستۆ دەگرێت، لەو تاوانانەی کە لەو ماوەیەدا لە گوانتانامۆ و ئەبو غرێب و شوێنەکانی تریش ئەنجامدران. بۆیە ئەستەمە پێشبینی ئەوە بکەیت کە هەربەپرسێکی تری ئەمریکی ئەو پۆستە وەربگرێت و خۆی بسوتێنێت لە کۆتا ساڵی ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی بوش، بۆیە لەوانەیە ئەو ساڵەی کە ماوە ئەو پۆستە بە بەتاڵی بمێنێتەوە !

له ڕاستیدا هیوز به ڕۆڵی خۆی داستانی تۆمارکرد، به هۆی ئەو هۆکارانەی که بوونه هۆی دەستلەکارکێشانەوەی ئەو دوو بەرپرسەی تری ئەمریکی لەو پۆستە، بەهۆی مەسەلەی لایەنگری ئەمریکا بۆ ئیسرائیل، که بووه هۆی ئەوەی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی متمانەیان به دادپەروەری ئەمریکا نەمێنێ، ئەمه سەرەڕای هەڵکشانی دەمارگیری ئەمریکی بەرامبەر عەرەب و موسڵمانەکان.

هەرچەندە (هیوز)پرۆژەیەکی نوێ ی پێشنیارکرد، بەڵام ئەویش ساختەو قەڵب بوو بۆ چاککردنی وێنەی وڵاتەکەی، پرۆژەکەی بریتی بوو له ڕاکێشانی گەنج و ڕۆشنبیرو ڕاگەیاندکارانی عەرب بەلای سیاسەتی ئەمریکادا،له چوارچێوەی ئەوەی که پێیان دەگووت پرۆگرامی گۆڕینەوەی فێرکاری و ڕۆشنبیری، به ئامانجی ڕاکێشانی مامۆستایان و ڕۆژنامەوانان و گەنجە سەرکردەکان و هەموو ئەوانەی که توانای کاریگەری دروستکردنیان هەبوولەسەر دەوروبەریان، هەروەها هەستان به چاککردن و ئاسانکاری پێدانی (ڤیزا)و ڕازیکردنی گەنجەکان بەوەی که ئەمریکا دەیەوێت بچن لەوێ بخوێنن، به مەرامی سڕینەوەی مێشکی ئەو دەستەبژێرە و بەکارهێنانیان وەك سەرەتایەك بۆ ڕێگەی سەپاندنی ڕۆشنبیری ئەمریکی نوێ. که کاریگەری کردەی لەسەر دەستدرێژیەکانی ئەمریکیەکان هەبوو له ئەفغانستان و عێراق و هاندانی دەستدرێژی و داگیرکاریەکانی جوولەکەکان له فەلەستین.

بەڵام له ڕاستیدا ئەو پرۆژەیەش شکستی هێنا، نەك تەنها به قسەی ئێمه بەڵکو ڕاپرسیەکی ڕای ئەمریکی پەیوەندار به چاککردنی وێنەی وڵاتەکەیان لەسەر ئاستی جیهان جەخت لەسەر شکستی ئەو پرۆژەیە دەکاتەوە.

به شێوەیەك ڕاپرسیەکی ناوەندی (بیو)دەربارەی جەماوەر بوونی بوش، دەریدەخات که ڕێژەی بێزاری له سیاسەتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەیشتۆته ڕێژەی (٧٥٪) لەسەر ئاستی جیهاندا له سەرەتای ئەو ساڵەوە، کەواته بەرزبوونەوەی بەڕێژەی (٧٪) دوای وەرگرتنی ئەو پۆسته لەلایەن خاتوو (هیوز)ە وە. ئەوەش جەخت لەسەر شکستی هەوڵەکانی ئەو دەکاتەوە بۆ چاککردنی وێنەی وڵاتەکەی لەبەرچاوی گەلانی

جیهاندا.سەرەڕای چەندین سەردانی بۆ ناوچەکەو دامەزراندنی نوسینگەی ڕاگەیاندن لە (دوبەی ولەندەن) بۆ پەیوەندی کردن بە ڕاگەیاندنی عەرەبی و گرێدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ لاوان و رۆشنبیرانی عەرەبی لە ژمارەیەك ولاّتی عەرەبیدا.

ئەوە ڕوونە کە ئەم خاتوونە زیاتر لەوانەی پێش خۆی شکست خواردوو بووە، هەریەکە لە (شارلوت ) و (تاتویلر)زۆرتر لەگەڵ خودی خۆیاندا راستگۆ بوون، کاتێك هەوڵیاندا بۆ چاککردنی وێنەی ئەمریکا لە ناوخۆدا لە ڕێگەی دواندنی لایەنی ناوخۆی ولاّت، بە هەوڵدان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی بەتایبەتی دۆسیەی عەرەبی (فەلەستین)، و وەستاندنی لایەنگری کوێرانەی دەوڵەتی (عیبری)جولەکە و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی ئەمریکی لە هەڵسوکەتی لەگەڵ جیهانی عەرەبی، کە بوو بووە هۆی دامرکانەوەی حکومەتەکان و ڕق لێبوونەوەی لاوان و ڕۆشنبیران لە ئەمریکا، کاتێك ئەم دوانە بەردەوامی لایەنگری کوێرانەی ئیدارەی بوشیان بینی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل دەستیان لە کارکێشایەوە، بە تایبەتی کاتێك زانیان ئیدارەکە بڕە لە پارێزگارە نوێکان، ئەوانەی کە لایەنگری فکرەی صەهیۆنی تەوراتین، هەروەها پڕە لەوانەی کە لایەنگری لۆبی صەهیۆنین.

بەلاّم هیوز بە پێچەوانەوە یاری بە کارتێکی هەڵە دەکرد، کاتێك کە هەوڵی گۆڕین و ئابلۆقەدانی عەقڵیەتی عەرەب و موسڵمانانی دەدا لە ڕێگەی فکرەی شالاّوی ڕۆشنبیری نوێ ئەمریکی، بە ڕاکێشانی گەنجان ولاوان ڕۆشنبیرو و راگەیاندکاران بۆ ئەمریکاو هەوڵدان بۆ شتنەوەی مێشکیان بە ڕۆشنبیری ئەمریکی، ئەمە سەرەڕای هەوڵی جێ بەجێکردنی ئەو هەڵمەتە لەسەر زەوی دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامیەکان لە ڕێگەی کۆنگرەو کۆنفرانسەکانەوە لەگەڵ گەنجان و ڕۆشنبیراندا. وەك چۆن لە ولاّتانی میسرو تورکیاو سعودیە دەیکرد، بە پشت بەستن و هاوکاری کەسانی بە ڕەچەڵەك عەرەبی وەك (دینا باول حبیب) بە ڕەچەڵەك عەرەبی میسری. ئەوەی کە شکستەکەی چەند بارەکردەوە بریتی بووە لەوەی کە ئەو وەها هەڵسوکەوتی دەکرد کە داواکراو لای ئەو

بريتيه لە گۆڕینی وێنەکە لە عەقڵیەتی عەرەب و موسڵمانەکاندا، نەك گۆڕینی وێنەکە لە خودی ئەمریکا خۆیدا.

کتێبی (کۆندا لیزا ڕایس و دامەزراندنی شەرعیەتی بوش) ڕۆژنامەنوس لە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) (گلین کسلر)، شان بەشانی شکستەکە ئاماژە بە( هیوز )خۆشی دەکات، لەبەر ئەوە دەڵێت:کارەکانی وەك کارەکانی زۆرێك لەوانەبوو کە بوش لەگەڵ خۆی لە تکساسەوە هێنابوونی کە خاڵی بوون لە پسپۆڕی و شارەزای.

ئەو نەزانی خۆی دەرخست بە ئەندازەی کاریگەری نەزانی ئەمریکی بۆ دۆسیەیی فەلەستین لەسەر وێنەی ئەمریکا لە شەقامی عەرەبیدا، وتەکانی وەك چۆن ڕۆژنامەنوسەکە دەڵێت :(نەزانانە بوون و کاریگەریان نەبوو لەسەر دۆسیەی فەلەستین لە شەقامی عەرەبیدا، کاتێك سەردانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی دەکرد).کە بوونە هۆی ورووژاندنی خۆپارێزی و تێبینی لە نێو ئەرکانی ئیدارەی ئەمریکیدا.

لەوانەیە لەبەر ئەوە بوو بێت کە لەم دوایەدا ڕاگەیاندنی ئەمریکی گرنگی بە دۆسیەیی فەلەستیندا و، بوش باسی لە چارەسەرکردنی ئەو دۆسیەیە دەکرد، واش دەردەکوێت کە کۆنگرەی (ئەنا بولیس) بە شێك بوو بێت لەو گرنگی پێدانە.

لەوانەیە ڕاستی لەمەسەلەی دەستلەکارکێشانەوەی (هیوز)ئەوە بێت کە خۆی لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا کە لەم دوایانەدا لەگەڵیدا ئەنجامدرا خستیە ڕوو کە دەڵێت:چاککردنی وێنەی ئەمریکا لە جیهاندا تەحەدیەکی ماوە درێژبوو، پێویست بە چەند ساڵێك هەبوو بۆ جیّ بەجێکردنی.

جەنگی عێراقیش دۆسیەی دووەم کە عەرەب و موسڵمانەکاندا ورووژاندیان لە کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵیدا،دۆسیەی دووەمیش کە ئاماژەمان پێدا بریتی بوو لە دۆسیەی ململانیّ ی فەلەستین –ئیسرائیلی.

هەروەها لە چاوپێکەوتنەکەدا ئەوەش ئاشکرا دەکات کە پێش دوو ساڵ ئامۆژگاری سەرۆك بوش و وەزیری دەرەوە (رایس)ی کردووە، بە پێویستی دۆزینەوەی چارەسەرێك

بۆ ئەو ململانێیە لە پێناو چاککردنی یان جوانکردنی وێنەی ئەمریکا لەسەر ئاستی جیهاندا.

ئەگەر بمانەوێت لە بارەی گرنگی ئەو پۆستەوە قسەبکەین واتە پۆستی دیبلۆماسیەتی گشتی ئەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە هەرکەسێك سەرپەرشتی ئەو پۆستە بکات، ئەوە سەرپەرشتی سێ نوسینگە دەکات لە وەزارەتی دەرەوە، کە ژمارەی فەرمان بەران تیایاندات دەگاتە (٨٦٠)فەرمانبەری پیاو ژن، ئەو نوسینگانەش گرێ بەستی دەرەکیان هەیە لەگەڵ (١٤٠)لایەندا،لە چوارچێوەی دابەشکردنی ڕۆڵ و کارەکاندا بەسەر لایەنەکانی دەرەوەی حکومەتدا، ئەم فەرمانگەیەش لەکاتی دروستکردنیدا لە ساڵی (٢٠٠٢) (٣٠) ڕاپۆرتی دەربارەی دیبلۆماسیەتی گشتی بۆ وڵاتەکەی ئامادە کردووە.

بەڵام لە ڕاستیدا کێشەکە بە دانپێدانانی ناوەندی توێژینەوەی ئەمریکی کە یارمەتی پێشکەش بە (هیون)دەکرد، بریتی لە هۆکاری یەکەم کە ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە تێکدانی وێنەی ئەمریکا لە جیهانی ئیسلامیدا، کەخۆی دەبینێتەوە لە پاڵپشتیە ستەمکارەکانی ئیدارەی ئەمریکی بۆ داگیرکاریەکانی ئیسرائیل.

بەپێ ی ئەو لێکۆڵینەوەیە کە گروپی (چارنی بۆ لێکۆلینەوە) لە مانگە (مایۆی ساڵی ٢٠٠٢) ئەنجامیداوە، ئەوە دەردەخات کە هەرکەسێك کە بەرپرسیاریەتی ئەو دۆسیەیی وەرگرت بێت، دانی بەوەدا ناوە کە پەیوەندی و یارمەتیەکانی ئەمریکا نامۆ و جێگەی سەرسوڕمانن بۆ (تل ئەبیب)،تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکاش بێت، بۆیە ئەوە گرنگترین هۆکارە بۆ ئەوەی موسڵمانان ڕقیان لە ئەمریکا بێتەوە.

یەکەم کەس کە پاش ڕووداوەکانی (١١ سێبتەمبەر)ئەو پۆستەی وەرگرت (شارل بیرز)بوو، دواتر دەستی لە پۆستەکەی کێشایەوەو، ڕەخنەی لە لایەنگرای ئیدارەی ئەمریکی گرت و بۆ ئیسرائیل گوتی:ئەو نهێنیە وێنەی ئەمریکای تێکداو تێکی شکان لە جیهانی ئیسلامیدا.

دووەم کەس کە ئەو پۆستەی وەرگرت (مارجریت تاتیلر) بوو بەهەمان تێکەڵ بوونی هەڵسوکەوتی ئیدارەی ئەمریکیەوە لەگەڵ عەرەب و موسڵمانان و ئیسرائیلدا دەی ناڵاند.

هەرچی سێهەم کەس بوو کە ئەو پۆستەی وەرگرت، لە کاتی توندترین ئابڕوچوونەکان و سوکایەتی کردن بە قورئانی پیرۆز و بوو، لە گرتووخانەکانی گوانتای نامۆ و تاوانەکانی ئەبو غرێب و شوێنەکانی دیکە. ئەو دانی بەوەدانا کە ناشیرین بوونی وێنەی ئەمریکا لە جیهانی ئیسلامیدا، تەنها بە هۆی دۆزیەیی فەلەستینەوە نەبووە، بەڵکو بەشێکیشی بە هۆی کاریگەری جەنگی عێراقیشەوە بووە، کە وێنەی ئەمریکای لە چاوی عەرەب و موسڵمانەکاندا تێك شکاندووە.

کاتێك رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) وردەکاریەکانی دەستلەکار کێشانەوەی یەکەم بەرپرسی ئەمریکی (شارلوت بیرن)ی لە(٧مارسی ساڵی ٢٠٠٣) بڵاوکردەوە دوای شکستهێنانی لە کارەکەیدا بۆ چاککردنی وێنەی ئەمریکا لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا، دەنوسێت:دەستلەکارکێشانەوەکە چاوەڕوان کراو بوو بە هۆی پاڵپشتی رەهای ئەمریکا بۆ ئیسرائیل و هەرەشەکانی بۆ لێدانی عێراق.رۆژنامەکە ئەوەشمان بۆ دەگوێزێتەوە کە شارلوت بۆخۆی دانی بەوەدا ناوە و گوتوویەتی:هەوڵەکانم بۆ بەرگریکردن لە سیاسەت گەلێکی پەسەند نەکراو لە جیهانی عەرەبی وەك ئەوە وەها بوو کە فیلێك بخەیتە نێو قوتویەکی بچوکەوە، لەبەر ئەوەی وێنەی ئەمریکا لای گەلانی دونیا زۆر لەوە ناشیرین ترە کە ئەمریکیەکان بیری لێدەکەونەوە.

هەروەها دەڵێت:کارەکە گەیشتبووە ئەو ئاستەی کە ئەمریکا چاودابخات لە بەرامبەر قەسابخانەکانی ئیسرائیل لە بەرامبەر فەلەستینیەکان و هەرەشەی ئەمریکا لە فەلەستینیەکان.

کارین هیوز باسی ئەو دیدارانەی خۆی دەکات لەگەڵ ئەو خوێندکارە کوڕ و کچانەی میسر و سعودیەو تورکیا ئەنجامی داون،کاتێك کە چووە بۆ چاککردنی وێنەی وڵاتەکەی لەو وڵاتانە لە بەرواری (٢٣–٢٨ سێبتەمبەری ساڵی ٢٠٠٥)ز، لە دیدارانەدا بە کچانی سعودیەیی گووت بوو :ئێوە بەختەوەرن بە پابەندیتان، ئێوە بەزۆر پێتان نەکراوە، وەك ئەوەی کە ڕاگەیاندنی ئەمریکی گەورەی دەکات. مەنجەڵەکە لای ئێوە پڕبووە بە هۆی

ئەو قسانەی کەلەسەر ئێوە دەکرێن، وەك ئەوەی کە ئێوە هیچ مافێکتان نەبێت، بەهۆی ئەوەی کە ڕێگەتان پێنادرێت شۆفێری بکەن و دەنگ بدەن.

هەروەها قوتابیانی قەتابخانەی ناوەندی میسری کە زەمالەی خوێندنیان لە زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە وەرگرت بوو و ژمارەیان (٥٤)خویندکاری کوڕ و کچ دەبوو، هیچ کامیان چاکەی سیاسەتی ئەمریکی و هیوز و هاوڕێ بە ڕەچەڵەك میسریەکەیان نەدەگووت، سەرەڕای ئەو هەوڵەی کۆتای بە گوتار و گەڕان بەدوای جوانکردنی وێنەی ئەمریکا، بەو جۆرە گووتانەی کە دەیگووت :حەزم لە خواردنی (ملوفیە)یە (ڕووەکێکە لێدەنرێت)و گەلآمێوی میسریە. سەرەڕای ئەوەش گوێ بیستی ڕەخنەی توند دەبوویەوە، لەسەر سیاسەتەکانی ولآتەکەی لەبەرامبەر فەلەستین و عێراق و ئێران و ئەفغانستان و ئەو تۆمارە ڕەشانەی ئەمریکیەکان لە ئەشکەنجەدانی گیراوانی گرتووخانەی گوانتا نامۆ و ئەبو غرێبی عێراقی هەیان بوو

هیوز بەدەست لەکارکێشانەوەی شکستی هێنا لەوەی کە لە یەکەم ڕۆژی دەست بەکابوونیدا ناوی لێ نابوو (جەنگی مێشك و دڵەکان )،ئەوەی سەلماند کە شکستی ئەمریکیەکان درێژخایەنە. ئەو توانایانەی بۆ لادانی ئەو لایەنگریەیی بۆ ئیسرائیل هەیە، یان ئەو بیرکردنەوانەی کە پارێزگارە نوێکان هەیانە، کارانێکن کە پێویستیان بە گۆڕانی کردەی هەیە لە عەقڵی دەستەلآتدارانی ئەمریکاو وبەرگریکردن لە دەستەلآتی بە هێزی لۆبی صەهیۆنی لەوێ.







خۆپیشاندانی ئەمەریکی لەبەردەم کۆشکی سپی ,وەك ناڕەزایتیەك بەرامبەر جەنگە بێ بەهاکانی بوش و ڕژانی خوێنی ڕۆڵەکانیان و بەهەدەردانی پارە و باجەکانیان.



تەرمی کوژراوە ئەمەریکیەکان لەعێراق , لەکاتی گەشتنیان بە واشنتۆن ...ئەوە دیمەنێکی دووبارە بووە بوو , هەر لەسەرەتاکانی داگیرکردنی ئەفغانستان و پاشان عێراق , ئەو دوو جەنگەی کە بوش بەرپای کردن بەخەیاڵی دروستکردنی ئیمپراتۆریێتیکی جیهانی ! !



بوش دەمامکەکەیی لێ کەوت,سەرەڕایی هەموو هەوڵەکانیَ بۆ ساختە کردنی راستیەکان و پاسا و دانەوەی تاوانەکانی کەبەرامبەر ئەمەریکیەکان و جیهانی ئەنجامیدان ! !



کۆلن پاول دوای دەست لەکار کێشانەوەی دان دەنێت بەپوچی پاساوەکانی بوش و ئیدارەکەی بۆ جەنگی عێراق و دەڵێت: کە ئەو هەلۆکانی کۆشکی سپی چەند جارێك هەوڵی ئەو جەنگەیان داوە هەر لەکاتی گەیشتنیان بەکۆشکی سپی !!




کارین هیوز یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا کەدەستی کێشایەوە لە پۆستەکەی لەبەرامبەر نارەزایی هەلوەشاندنەوەی هەوڵەکانی بۆ چاکردنی وێنەی ئەمەریکا لە جیهاندا , بەهۆی بەردەوامی لەسەر سیاسەتەکانی, بەتایبەت سیاسەتە دوژمنکارییەکانی بەرامبەر بە عەرەب و موسڵمانەکان , کەبۆتە هۆی زیادبوونی رق لێبوونەوەی جیهان لە وولأتەکەی!!

## 9-تۆنی بلێر. ...دوای درەوشانەی ئەستێرەکەی زبڵدانی مێژووی هەڵبژارد!!



له وڵاته دیموکراسیه کۆنه‌کاندا، ده‌کرێت یان ده‌شێت گه‌له‌کانیان له‌سه‌رکرده سیاسیه‌کانیان خۆش بن، له هه‌ندێ شتدا که ئاره‌زووی هه‌یه بیکات، ته‌نها شتێك نه‌بیت که بریتیه له (درۆ)،به تایبه‌تی ئه‌گه‌ر درۆکه‌ی له‌و جۆره بێت که ببێته هۆی ڕژانی خوێن و به‌هه‌ده‌ردانی سه‌روه‌ت و سامانی وڵات. ...

ئه‌و هه‌ڵه گه‌وره‌یه‌یی که تۆنی بلێری سه‌رۆك وه‌زیرانی پێشووی به‌ریتانیا ئه‌نجامیدا، له ماوه‌ی فه‌رمانڕه‌وایه‌تی خۆیدا بریتی بوو له شاردنه‌وه‌ی عه‌قڵی هاوڵاتیانی وڵاته‌که‌ی و ڕێگه‌دان به‌خۆی که درۆیه‌ك بکات، درۆیه‌کی کوشنده که له‌گه‌ڵ خۆیدا ڕژانی خوێن و به‌هه‌ده‌ردانی سامانی هه‌ڵگرت بوو، ئه‌وه‌ی که جێگه‌ی سه‌رسوڕمان بوو، ئه‌وه بوو که وه‌ك ئه‌وه‌ی ڕاستی گوت بێت و درۆی نه‌کردبێت به‌رگری لێده‌کرد تا خۆی کرده تاوان بارو جێگه‌ی گاڵته‌جاڕی له‌هه‌مان کاتدا. کاره‌که کۆتای هات به‌وه‌ی که ئه‌و درۆیه فرێیدایه زبڵدانی مێژوو، وه‌ك چۆن به‌ریتانیه‌کان خۆیان ئاماژه‌ی پێده‌که‌ن.

بلێر نازناوی (سیاسی زیره‌ك)و (سه‌رکرده‌ی گه‌وره‌ی کریکاران)ی هه‌ڵگرت بوو، که توانی پارتی کرێکارانی به‌ریتانی بگه‌ڕێنێته‌وه سه‌ر ده‌سته‌ڵات، دوای ئه‌وه‌ی ماوه‌یه‌کی درێژ لێ ی بێبه‌ش بوو بوو، له کێ برکێیه‌کی مێژووی له‌گه‌ڵ پارتی پارێزگارانی به‌ریتانیا.

بلێر هه‌لێکی باشی بۆ هه‌ڵکه‌وت بوو تا ناوی وه‌ك ئه‌ستێره‌یه‌ك بگه‌شێته‌وه و شوێنێك بۆخۆی داگیربکات له نێو سه‌رکرده سیاسیه نه‌مره‌کانی وڵاته‌که‌یدا، به‌ڵام ڕه‌دی کرده‌وه‌و ئه‌و هه‌له‌ی له‌ده‌ستدا، به ئه‌نجامدانی هه‌ڵه‌یه‌کی مێژووی گه‌وره، وه‌ك جێ به‌جێکردنێك بۆ ئه‌و وته‌یه‌یی که ده‌ڵێت:هه‌ڵه‌ی زیره‌کێك به هه‌زاره.

کاتێك (گوردن) هه‌واڵی پێدام له ڕۆشتنی بۆ عێراق، پرسیارم لێکرد ده‌رباره‌ی زانیاری بارودۆخی عێراق هیچ ده‌زانی؟ ،وه‌ڵامی دایه‌وه نه‌خێر،من نازانم ته‌نانه‌ت له عێراقدا چی

هەيە؟ئەمانە قسەی دايكی يەكێك لەو سەربازە بەريتانيانەن كە لە عێراقدا كوژراون لە پێناو جەنگێكدا كە بنيادنراوی درۆ بوو وەك چۆن ئەو دايكە دەڵێت.

لە كاتێكدا (روز جنتل)و چەندين دايكی تری خێزانی سەربازە بەريتانيەكان لە عێراق، داوايان لە سەرۆك وەزيرانی ئەو كاتەی بەريتانياكرد، بە كردنەوەی لێكۆڵينەوەيەكی سەربەخۆ لەبەردەم دادگادا، بەڵام لەبەرامبەردا بلێر پێداگری دەكرد لەسەر پێويستی جەنگەكەو ڕايگەياند ئەگەر ناچار بكرێت بۆ جاری دووەميش دەيكاتەوە، بلێر ڕايگەياند:من داوای لێبوردن ناكەم بۆ لادانی صدام....هەروەها داوای لێبوردن ناكەم بۆ جەنگەكە.....ئەوە بڕيارێكی ڕاست و گونجاو بووە ئەو كاتەو ئێستاش...پێويست بوو لە پێناو ئاسايشی ناوچەكەو جيهان!!

ڕۆز جنتڵ ئافرەتێكی بەريتانی بوو تەحەدای تۆنی بلێری سەرۆك وەزيرانی بەريتانيای لە گەردنی خۆی دانابوو، بە هۆی بڕياری بەشداريكردنی لە جەنگەكەدا، ئەو جەنگەی كە وەك ئەو دەيگووت كە سەراپای بنيادنراوی درۆ بوو.

لەو كاتەوە (ڕۆز)(گوردنی )كوڕی لە جەنگی عێراقدا لەدەستدا، نەگەڕايەوە بۆ ژوورە تايبەتيەكەی، وەك شوێنێك بۆ يادگاری سەردەمی منداڵی ئەو دايكايەتی خۆی، بەڵكو كرديە بارەگايەكی سەرەكی هەڵمەتی ئەو خێزانە بەريتانيانەی كە دژی جەنگ بوون، لە ميانەی پێداگری ئەو خێزانانە لەسەر ئەوەی كە بلێر بەرپرسياريەتی مردنی ڕۆڵەكانيان لە ئەستۆ دەگرێت، ئەمە جگە لە داواكاريەكانی پاكانەكردنی ئەو هۆكارانەی كە بانگەشەيان بۆ دەكات بۆ بەشداريكردنی بەريتانيا لە جەنگەكەدا.

روز دەيگوت:بە خۆشەويستی دەمێنينەوە، بە هۆی درۆكانی بلێرەوە دەربارەی بوونی چەكی كۆكوژ، كە بە هيچ شێوەيەك بوونی نەبوو، ئەو ڕۆڵەكانی بەكوشتداين، بۆيە پێويستە بەو ئاسانيە نەڕوات.

گوردن لە مانگی (يونيوی ساڵی ٢٠٠٤)ز كوژرا، كاتێك بۆمبێكی چێنراو لە تەنيشت ڕێگەيەكەوە لە شاری (بەصرە)ی باشوری عێراق تەقيەوە، بە كوژانيشی بووە يەكێك لەو سەربازانەی كە لە جەنگی عێراقدا گيانيان لەدەستدا، لە كاتی دەست پێكردنی

جەنگەکەوە لە بەهاری ساڵی (٢٠٠٣)ز یەوە، ئەو مرد کە هێشتا تەمەنی (١٩) بەهاری تێنەپەڕاند بوو.

روز جنتل دەڵێت: من لەو باوەڕەدا نیم، کە هەرکام لەو منداڵانەی کە پەیوەندیان بە سوپاوە کردووە ئاگاداری بارودۆخی خراپی عێراق بن،لەبەر ئەوەی کاتێك پرسیارم لە (گوردن)ی کوڕم کرد کە تۆ دەچیت بۆ عێراق تا چەند ئاگاداری بارودۆخی خراپی عێراق هەیت؟ وەك هەر کەسێکی تری منداڵ دەستەکانی ڕاوەشاندو گووتی:نازانم، بەڵکو تەنانەت نازانم چی لە عێراقیشدا هەیە.

روز دەڵێت: ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ئەو ساڵەی کە کوڕەکەمانی تێدا کوژرا کە هەینی بوو (گوردن) پەیوەندی پێوەکردین و پێی ڕاگەیاندین کە گوللەکان بەسەرو ئەملاو ئەولایدا تێدەپەڕن، هەر لەو تەلەفۆنەدا داوای لە باوکی کردکە ئەو هەواڵە بە من نەگەیەنێت، تا هەست بە ترس و پەژارە نەکەم. دواتر لە ڕۆژی دووشەممە هەمان هەفتەدا، کاتێك تەماشای تەلەفزیۆنمان دەکرد،بینیمان کە یەکێك لەسەربازە بەریتانیەکان بە کوژراوی وێنەکەی لە تەلەفزیۆنەکانەوە پیشاندەدرێت، جەستەی سەربازە کوژراوەکەمان بینی لەسەر زەوی کەوت بوو، بەڵام نەدەناسرایەوە لەبەرئەوەی سەری خەڵتانی خوێن بوو بوو، دواتر بۆمان دەرکەوت کە ئەو سەربازە بەریتانییەی کە جەستەکەی لەسەر زەوی و کەوت بوو، ئەوە (گوردن)ی کوڕمان بوو.

دایکی سەربازێکی تر دەڵێت:ژمارەیەکی زۆر لە گەنجەکان گیانیان لەدەستدا، بەبێ بەرامبەر، کە بووە هۆی ئەوەی ئەو ژمارە خێزانە بۆ هەتا هەتایە ژیانیان گۆڕانی بەسەردا بێت، من نامەوێت یەکێك بم لە خێزانانەی کە تەقە لە دەرگایان بدرێت و پێیان بوترێت کە ئیتر کوڕەکەتان ناگەڕێتەوە. کاتێك (بیتر)ی کوڕم پەیوەندی بە سوپاوە کرد، من شانازیم پێوە دەکرد و زانیاریشم هەبوو لەسەر بڕیارەکەی خۆم، بەوەی کە لە ئایندەدا بانگهێشتی جەنگ دەکرێت،بەڵام بە سانایییەکی باشتر ڕازی دەبووم بەو کارە ئەگەر جەنگەکە لە پێناو بەرگریکردند بوایە لە وڵاتەکەمان، نەك لە پێناو داگیرکردنی وڵاتێکی تر. من لەو باوەڕەدام کە ئەوە هەستی زۆرێك لەو خێزانانەیە کە ڕۆڵەکانیان لە

بەرەکانی جەنگن لە عێراق، ئەوە جەنگی ئێمە نیە کە بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر خەڵمان لەدەستدا،بەڵکو ئەوە جەنگی بلێر و بوشە.

دایکێکی تر ئەم وتەیە بۆ زیاد دەکات و دەڵێت:نامەیەکم نارد بۆ تۆنی بلێر و تیایدا پرسیم:بۆچی تێوەت گلاندین لە شتێك کە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە؟بۆچی جەنگی عێراقت کرد؟عێراقیەکان چەکی کۆکوژیان نیە. بەڵام وەك هەموو جارەکانی تر وەڵامی نامەکەی نەدامەوە.

بروس جۆرج ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیا دەڵێت:بڕیاری بلێر بۆ چوونی بۆ جەنگ بە ساختەکردنی ڕاستیەکان درۆیەکی گەورەبوو، بەوەی کە عێراق چەکی کۆکوژی هەیە و،ئەگەری هەیە بەو چەکە هێرشمان بکاتە سەر ئەگەر بیەوێت لە ماوەی (٤٥)خولەکدا، ئەوە ئەو هەڵەیە بوو کە کردی و جەماوەری بلێری نەهێشت و خستیە زبڵدانی مێژووەوە.

ئەوە هەڵوێستی خێزانی سەربازەکان بوو، ئەو سەربازانەی کە جەنگەکەیان دەکردو بەڕێوەیان دەبردلە عێراقدا،جەنگێك کە تاکە کەسێکی بیٚ عەقڵی وەك (بلێر) دەیوەیست، وەك وەڵامدانەوەی کەسێکی تری بیٚ عەقڵ بەناوی جۆرج بوش(سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا).

لێرەدا گەواهیدەرێکی گرنگ هەیە،ئەوەی لە جەماوەر بوون و نازناو شەرەفی بلێر هەیە تێکی دەشکێنێت و کۆتای دێت بە ناچارکردنی دەستلەکارکێشانەوەی و ڕاکردنی لە ئابڕوچوونەکەی جەنگ، تا کار گەیشتە ئەوەی لای پارتەکەی خۆشی (پارتی کرێکارانی بەریتانیا)کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد نەویستراوبێت وپێی ڕابگەیەنن کە سەرکردەیەکی نویٚ دیاریدەکەن بۆ پارتەکە، تا بەهۆی ئەوەوە قورسای پارتەکەیان لای دەنگدەرانی بەریتانی لەدەستنەدەن.

ئەگەر ئەوەی پێشەوە هەڵوێستی خێزانی سەربازە بەریتانیەکان بێت،ئەوە گەواهیدانی (کلیر شورت)وەزیری حکومەتەکەی بلێرخۆی لەو پەڕی مەترسیدا بوو، بە شێوەیەك کە ڕۆژنامەکان بلێریان بە (درۆزنی گەورە)و (دوو ڕوو)و (بکوژی سەربازەکان) ناو دەبرد، داتریش سەرەتای داواکاریە جەماوەریەکان بۆ دەرکردنی لەدەستەڵاتدا دەستی پێکرد.

تۆنی بلێر سەرۆکی حکومەتی پارتی کرێکارانی بەریتانیا، هاوپەیمانی لەگەڵ ڕاستڕەوە توندڕەوەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژارد بەسەرکردایەتی (جۆرج بوش) بۆئەنجامدانی جەنگی عێراق.

بەوەش هاولاتیانی بەریتانیا باجێکی زۆریاندا، پێش ئەوەی بتوانن سزای بدەن بەدەرکردنی لە دەستەلات و فرێدانی بۆ ناو زبڵدانی مێژوو، نەك بۆ تۆماری پیاوە گەورەکانی مێژووی بەریتانیا، ئەگەر ئەو هەڵە مێژوویەشی نەکردایە، ئەوە ناوی بە نەمری دەمایەوە، ئەو نازناوەی کە پێش جەنگ بەدەستی هێنا بوو لە ڕێزو جەماوەر بوون و پلەو پایەدا بەردەوامی دەبوو! !

کاریگەریەکانی ئەو جەنگە کارەسات باربوون، بەنسبەت ناوبانگ و کەسایەتی ئەو،و سیاسەتی دەرەکی بەریتانیا و پەیوەست بوونی بە ئەوروپا و ئاشتی و ئارامی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا.لەسەرو ی هەموو ئەوانەشەوە ئەو سزا درێژەیە کە گەلانی عێراق دەیکێشن، وە ئەو هەزاران کەسەی کە لەوێدا مردون، لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی کە بەش بەش بووەو لە لێواری هەرەس هێناندایە. ئەمە جگە لە تورەبوونی عەرەب و موسڵمانەکان لەبەرامبەر سیاسەتەکانی هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمریکا، تا ئاستێك کە هەموو جیهان کەوتۆتە مەترسیەوە.

بەڵگەی باشتر لە هەڵویستی (ڕۆبن کوك) وەزیری دەرەوەی بەریتانیا باشتر دەست ناکەوێت لەو بارەیەوە، کە دەستی لە پۆستەکەی کێشایەوە لە حکومەتەکی بلێردا لە بەرواری (مانگی مارس ی ساڵی ٢٠٠٣)ز لەبەر دژایەتی کردن و نەیاری بۆ جەنگی عێراق .

لە گوتارێکیدا لە ڕۆژنامەی (گاردیان) ڕۆبن کوك جەنگی عێراق بەوە وەصف دەکات کە هەڵەیەك بووە مەترسیەکەی لە جەنگی(سویس) (وەك ئاماژەیەك بۆ دوژمنکاری سێ قۆڵی شکست خواردو بۆ سەر میسر لە ساڵی ١٩٥٦)کەمتر نەبوو،کە بووە هۆی ئەوەی (ئەنتۆنی ئیدن)پۆستی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لەدەست بدات.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش هەلێکی کۆتای هەبوو دوای جەنگ، بە داننان بە هەڵەکەیداو هەڵوەشانەوەی پەیوەست بوونی بە سیاسەتی کارەساتباری ئەمریکاوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وەك پێویستی هەنوکەی. بەڵام بلێر ئەوەشی نەکرد!!

لە ئەنجومەنی لۆردەکان، لۆرد(ولاس) ناسراو بە پرۆفیسۆر(ولیام ولاس لە زانکۆی لەندەن بۆ زانستی ئابوری ) وتەبێژ بەناوی پارتی ئازادیخوازو دیموکراتەکانە پارتەکەی (بلێر) خۆی بەتوندی هێرشیکردە سەر بلێر، لە گوتارێکیدا لە ژێرناونیشانی (هەرەسهێنانی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا). لۆرد ئەو گوتارەی بلێر وەبیر دەهێنێتەوە کە لەکاتی وەرگرتنی پۆستەکەی لە ساڵی (١٩٩٧)ز خوێندیەوە و تیایدا گوت بووی :ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا بریتیە لەوەی کە لە ئەورووپا بەهێز بێت و، لە هەمان کاتدا لەگەڵ ئەمریکاش بەهێز بێت، بەبێ ئەوەی هیچ هەڵبژاردەیەك هەبێت لە نێوان ئەو دوو کارەدا (ئێمە پردین لە نێوان ئەمریکاو ئەورووپا) لۆرد قسە لەسەر ئەوە دەکات و دەڵێت:ئێستا ئەو پردە لە هەردوو لاوە تێکشکاوە، ناشتوانرێت دووبارە بنیادبنرێتەوە ).ئەوەشی بۆ زیاد دەکات و دەڵێت:پێویستە لەسەر مان ئەوە بزانین و دان بەوەدا بنێین، کە ئەوە خۆبەدەستەوە دانە کە سیاسەتی دەرەکی بەریتانیای لەسەر بنیادنراوە، بۆیە لەماوەی (چل)ساڵی ڕابردوودا هەرەسی هێناوە. وەهەرچی ئەو پڕوپاگەندە هەبوو، کە باسی لە دەستەڵاتی تایبەتی بەریتانیا دەکرد لە واشنتۆن، سەلمێنرا کە هیچ بنەمایەکی نیە.

ولاس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەنگاوی یەکەم بۆ دووبارە بنیادنانەوەی سیاسەتی دەرەکی بەریتانیا بریتیە :لەوەی کەپەیوەندی تایبەتی بە ئەمریکاوە بە مردوو بزانین. هەنگاوی دووەمیش بریتیە: لە دووبارە بنیادنانەوەی پەیوەندیەکان لەگەڵ هاوبەشە سەرەکیەکانی بەریتانیا لە ئەورووپاو کێشانی ئەجێندای یەکێتی ئەورووپا. هەنگاوی سێهەمیش بریتیە لەوەی کە ڕای گشتی بەریتانیا بگەیەنینە ئەو بڕوایەیی کە یەکگرتن لەگەڵ ئەورووپا لە بەرژەوەندی بەریتانیایە، وە هاوکاریکردن لەگەڵ حکومەتە

ئەوروپییەکانی تردا پێویستیەکی بنەڕەتیە بۆ دەستەڵاتی بەریتانیا لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا.

لەگەڵ ئەوەشدا ولاس پەژارەی خۆی دەردەبڕێت لەو بارەیەوە، لەبەرئەوەی ڕاستگۆی بەریتانیا لای هاوبەشە ئەوروپییەکانی لە بارێکدایە کە بنیادنانەوەی ناڕەحەت و ئەستەمە، دوای ئەوەی کە بلێر تێکی شکاند بە هاوبەشیکردن لەگەڵ بوشدا..ولاس گوتارەکەی بەوە کۆتای پێدەهێنێت و دەڵێت:بلێر شیاوی خۆی لەدەستدا، کە ڕێگەی دەدا دەنگدەری بەریتانی ڕازی بکات لە نێوان بەردەوام بوون لە پەیوەندی تایبەت بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو گەڕانەوە بۆ هاوبەشە بەهێزەکانی لە ئەوروپا دانەیەکیان هەڵبژێرێ. بە دەستە واژەیەکی تر بەریتانیا پچڕاوە لەسەر پردێك ناتوانێت بە هیچ لایەکدا بڕوات، لەبەر ئەوەی بلێر سەرکردایەتی سیاسەتی دەرەکی وڵاتەکەی کردووە بەرەو ڕێگەیەکی داخراو.

ڕۆبن کوك لە گوتارێکیدا کە لە ڕۆژنامەی گاردیان نوسیویەتی جەختی کردۆتەوە لەسەر درۆکردنی بلێرو نەبوونی هیچ جۆرە بناغەیەکی شەرعی بۆ هێرشکردنە سەر عێراق، بەوەی کە بەریتانیا پاساوی چونە نێو جەنگی بەوە دەدایەوە کە گوایا عێراق پابەند نەبووە بە داماڵینی چەکی کۆکوژەوە، بەڵام لە ڕاستیدا عێراق بە تەواوی پابەندی خۆی سالماند بوو بە بەڵگەی دەرئەنجامی گەڕان بەدوای چەکە کۆکوژەکانی، بەوەش هەرجۆرە شەرعیەتێکی بۆ جەنگ و داگیرکردنی عێرق پوچەڵکردەوە ! !

بلێر سەرکردایەتی پارتی کریکارانی بەریتانیای لە ساڵی (١٩٩٤)ز وەرگرت، پاش مردنی سەرۆکەکەی (جۆن سمیس)تا ئەو کاتەی بوو بە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا هەر تیایدا مایەوە. ئەو کەسایەتیە لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خولی یەکەم و دووەمیدا، زیاتر گرنگی بە مەسەلە ناوخۆییەکان دەدا و بوارەکانی ئابوری و کۆمەلآیەتی گرنگی زۆریان وەرگرت بوو، بەوەش سەرکەوتوو بوو لە هەڵخەڵەتاندنی گەلی بەریتانی تا جارێکی تر، بۆ جاری سێهەم لەسەر یەك پۆستی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بەدەست بهێنێتەوە.

بلێر لەماوەی خولی سێهەمی سەرۆكایەتیەكەدا، بە تەواوی چارەنوسی بەریتانیای بەستەوە بە ئەمریكاو جۆرج بۆشی سەرۆكیەوە. وەك كوێر پاڵپشتی سیاسەتی سەربازی نێودەوڵەتی كرد و لەگەڵ بوش تێوە گلا لە دۆسیەكانی ئەفغانستان و عێراق و صۆماڵ و چەندین دۆسیەیی تر كە خزمەتی بەرژەوەندیەكانی ئەمریكایان دەكرد، لەسەر حسابی بەرژەوەندی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و هاوپەیمانە ئەورووپیەكانی بەریتانیا ! !

سەرەرای دەرچوونی ملیۆنان بەریتانی لە دژی جەنگەكە، بەڵام ئەو ڕایگەیاند بڕیاریداوە بەشداری لە جەنگەكەدا بكات و لەگەڵ بوشدا بچێتە جەنگەكەوە، بۆیە سەربازەكانی ناردە باشوری عێراق و ڕاپسپاردن بە كارێك لەسەر حسابی ئەمریكا.

بلێر وای پێشبینی دەكرد، كە ئەو كارە سەربازیە لەعێراقدا ئاسان دەبێت و بە خێرای عێراق دەكەوێتە ژێرچاودێری هێزە سەركەوتووەكانەوە، بەم پێیەش دەستكەوتە ئابوریەكەی گەورە دەبێت. حساباتەكانی بلێر بە هەمان شێوەی بوش بوون، كە گوایا هەردوو دەوڵەتەكە هەندێك قوربانی دەدەن بەرامبەر نەوتێك كە هەرگیز وشك نابێت.

كاتێك هاوكێشەكە گۆڕا، دواتر بۆ تۆنی بلێر روون بوویەوە كە مەسەلەكە وەها نیە كە خۆی و هاوپەیمانەكەی (بوش) پێشبینیان بۆ كرد بوو، بۆیە بڕیاریدا پێش تەواوكردنی كارەكەی وازبهێنێت و دەستلەكار بكێشێتەوە، ئەوەش بۆ پاراستنی خۆی بوو بۆ لێپێچینەوەی یاسای لە ئایندەدا، دوای ئاشكرابوونی ژمارە ڕاستیەكانی زیانی سوپای ئەمریكا و بەریتانیا لە عێراق و سەرەتاكانی دەركەوتنی دەستدرێژی مەترسیداری هەردوو سوپای بەریتانی و ئەمریكی بەرامبەر هاوڵاتیانی سڤیلی عێراقی.

تۆنی بلێر یاسای خوێندووە لە بەریتانیا و كاری پارێزەرایەتی كردووە لە نێوان ساڵانی (١٩٧٦-١٩٨٣)ز، بەڵام ئەو ڕۆژەی بڕیاری تێكشكانی ئەفغانستان و عێراقیدا، و ئەو ڕۆژەی بڕیاری هاوپەیمانی چەكی بەریتانی و ئەمریكی و ئاراستەكردنی هەردوو چەكەكە درا بە ئاراستەی جوگرافیایی وڵاتانی ئیسلامی، وەك هەوڵێك بۆ دووبارە داڕشتنەوەی لەسەر بنەمای خەونی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای كۆن، هیچ جۆرە بنەمایەكی یاسای پەیڕەو ڕەچاو نەكردووە.

تۆنی بلێر بەتەواوی شکستی خوارد لەڕووی ناوخۆییەوە، بە شێوەیەك لە ناوبانگ و پلەوپایەکەی لەکەداربوو،کە ڕۆژنامە بەریتانیەکان بە شوێنکەوتووی تەواوی جۆرج بوش یان لەقەڵەم دەدا،ئەمەش بووە هۆی دابەزینی جەماوەر بوونی تا ئاستێکی زۆر نزم، لە ڕووی دەرەکیشەوە سوپاکەی لە عێراقدا شکست لە دوای شکست تووشی دەبوو لەسەر دەستی بەرگریکارە عێراقیەکان بە هەردوو باڵی سونی و شیعیەوە.

لە ڕووی کاری سیاسیەوە باری لاربوو (چارە ڕەش )بوو، دورکەوتەوە لە بازنەی بڕیاری سیاسی و سەربازەکانیشی تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەکوژرێن و بریندار دەبن (تا ئەو کاتەی کتێبەکە نوسراوە)وەرگێڕ.



بلێر سواری ئۆتۆمبیلەکەی بوش بوو , لەبەردەم چاوی گەلەکەی و جیهانیشدا شکا ! !



رۆژنامەکانی بەریتانیا بەو شێوەیە وێنەیان دەکێشا وەك پیاوی ئەمەریکا کەبوش لەژێر ئالاّی ولاّتەکەی دابنابێت ! !



DAILY Mirror

INSIDE TODAY
ALL the goals
ALL the action

Four-midable

Pete's not a pervert - says Jerry Hall

HOLD YOUR FIRE, TONY

Short warns Blair on Iraq war plan



DAILY Mirror

CHELTENHAM
8-PAGE GUIDE INSIDE

Blair's too scared to sack war rebel
Clare Short.. BECAUSE SHE'S RIGHT

WEAPON OF
Ms
DESTRUCTION

کلێر شورت سوکایەتی بەبلێر کرد ،
وەك چۆن لەسەر بەرگی گۆڤاری
( میرەر) دەردەکەوێت ! !



THE
NDEPENDENT

IOW WE WILL MISS HIM

ALISON JACKSON, ALISTAIR BEATON, JON CULSHAW, DAVE BROWN & MORE

As Tony Blair prepares to resign as Prime Minister and claim his place in political history ...

THE DAY OF JUDGEMENT

... these two men face jail over a secret memo that exposed the true relationship between Blair and Bush in the run-up to war in Iraq

Trevor Nunn's folly
The real tragedy of King Lear

Cooper Brown
Out on the town with Hugh Grant

PLUS
education & careers

هەواڵی دەست لەکارکێشانەوەی بلێـر رۆژنامـەی ئینـدی پێنـدنتی بەریتانی بـڵاوی دەکاتـەوە لەسـەر بەرگەکەی لەژێر ناونیشـانی (رۆژی لێپرسینەوە) !!



بلێر لە دەسەڵاتێك دەرچوو کە بەداخ نەبوو بۆی!!

له به‌یانی رۆژی( ١٥ یولیۆی سالّی ٢٠٠٣ )ز رۆژنامه‌ی (الشرق الاوسط) له لاپه‌ره‌ی یه‌که‌میدا چاوپێکه‌تنێکی له‌گه‌لّ (کرم زهدی) سه‌رۆکی ئه‌نجومه‌نی شورای کۆمه‌لّی ئیسلامی میسری بلّاوکردبوویه‌وه که له زیندانی (عه‌قره‌ب )له‌گه‌لّیدا سازدرا بوو، له چاوپێکه‌وتنه‌دا کرم زهدی شتێکی کت وپڕو له ناکاوی ورووژاند به‌وه‌ی که گووت بووی :ئه‌نوه‌ر سادات به شه‌هیدی مرد له جه‌نگی ئاشوبدا! !

زوهدی گوتی :ئه‌گه‌ر بکرایه کات بگه‌ڕایه‌ته دواوه به‌شداریم نه‌ده‌کرد له کوشتنیدا،ئه‌و لێدوانه‌ش دوای چه‌ند سالّێك له ده‌ستپێشخه‌ری وه‌ستاندی توندوتیژی هات که سه‌رکردایه‌تی کۆمه‌لّی ئیسلامی ڕایگه‌یاند بوو،و پالّپشت کرابوو به زنجیره‌یه‌کی چوار کتێبی که ڕایان گه‌یاند بوو چوونه‌ته‌وه به هه‌لّه‌کانی خۆیاندا که له ڕابردوودا ئه‌نجامیانداوه،به هۆی هه‌لّه تێگه‌یشتنیان بۆ چه‌مکی (جیهاد).

هه‌ندێك پێشوازیه‌کی گه‌رمیان له په‌شیمان بوونه‌وه‌که‌یان کردو، هه‌ندێکی تریش به گومان بوون له ڕاستگۆی نیه‌تیان، به‌لّام به‌بێ گومان کۆمه‌لّی ئیسلامی به‌و ده‌ست پێشخه‌ریه‌یی خۆی خسته‌وه بازنه‌ی تیشك خستنه سه‌ر دوای (٣٢) سالّ له ئه‌نجامدانی یه‌کێك له گرنگترین تاوانه‌کانی تیرۆرکردن له ناوچه‌که‌دا و یه‌که‌م جۆر له مێژووی ده‌سته‌لّاتداریه‌تی میسریدا...تاوانی تیرۆرکردنی سه‌رۆکی میسری ئه‌نوه‌ر سادات.

سه‌ره‌ڕای دلّنیایمان له ناشیرینی تاوانه‌که‌و ناشیرینی کوشتنه‌که‌ی و وه‌حشیه‌تی دیمه‌نه‌که و مانه‌وه‌ی ڕوداوی سه‌کۆکه وه‌ك گه‌واهیه‌ك له‌سه‌ر کۆتاییه‌کی نه‌هامه‌تبار،که سه‌رۆکێکی له قه‌باره‌ی ساداتدا کرده ئامانج،که ده‌ستکه‌وته‌کانی به تایبه‌تی سه‌رکه‌وتنه‌که‌ی (ئۆکتۆبه‌ری سالّی ١٩٧٣ز )سه‌رجه‌م تێبینی و تۆمه‌ته‌کانی ماوه‌ی فه‌رمانڕه‌وایه‌تیه‌که‌ی داده‌پۆشی، بۆ ئه‌وه‌ی وه‌ك گرنگترین که‌سێك له ده‌سته‌لّاتی

میسریدا بمێنێتەوە. .. سەرەڕای دڵنیایمان لەسەر ئەو ڕاستیە، بەلاَم ئەو ڕاستیە سادات نابورێت لە بەرپرسیاریەتی خۆی لەوەی کە لەسەر کورسیەکە یان سەکۆکە ڕوویدا!!

هەڵەکەی سادات گەورە بوو،لەبەر ئەوەی دەیویست لایەنگرانی جمال عبدالناصر و شیوعیەکان لە ناوبەرێت، کەسییشی باشتر لە ئیخوانەکان بۆ ئەو کارە نەدۆزیەوە، بەلاَم هەڵسەنگاندنەکەی باش نەپێکا، کە دواتر ژیانی خۆی لەسەر ئەو هەڵەیە دانا،کە نەدەکرا سەرۆکێکی زیرەك و چاوکراوەو وریایی وەك ئەنوەر ساداتی تێ بکەوێت.

بەڵێ هەڵەکەی سادات گەورە بوو، هەڵەکەی بریتی بوو لە بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ ئیخوان موسلمین، لەبەر ئەوەی وا پێشبینی دەکرد کە دەتوانێت هێز بە هێز لە ناوبەرێت، بۆیە هەریەکە لە ئیخوانەکان و ناصریەکان و چەپەکان ڕێککەوتن و هەر تیمەیان کاری خۆی وەرگرت، بە پێی توانای خۆی بۆ لە ناوبردنی.... ناصریەکان بە تیرۆرکردنی مەعنەوی لە ڕۆژنامەو دەزگاکانی ڕاگەیاندندا کە لەو بوارەدا دەستێکی بالاَیان هەبوو،ئیخوانەکانیش لە ڕێگەی کۆمەڵە توندڕەوەکانەوە، کە لە پشت پەردەکانەوەی ئیدارەی پیلان گێڕیەکانیان دەدان.

سادات خاوەنی پاڵەوانیەتیەکی جەماوەری بوو،ئەو بە زمانێکی سادەو سانا قسەی دەکرد کە هەموو کەسێکی سادەی سەر شەقام لێی تێبگات، بە گیانێکی گەورەی خێزانیەوە دەژیا بۆیە هەمیشە حەزی دەکرد بەوەوە ناوببرێت، بەڵکو هەمیشە حەزی دەکرد جلوبەرگی لادێ ی بپۆشێت، کاتێك دەچوو بۆ زێدی خۆی لە گوندی (میت ابو الکوم)لە پارێزگای (مەنوفیە)بۆ ئەوەی خەڵکەکە وا هەسبکەن کە تائێستاش یەکێکە لەوان.

بۆیە بە هیچ شێوەیەك پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، کە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەی کە هەرچەندە پلەی یاخی بوون و ڕقەکەی بگاتە هەرچی دەست درێژبکات بۆ کوشتنی، تەنانەت وا تەماشای گروپە ئیسلامیە توندڕەوەکانی نەدەکرد لە نمونەی کۆمەڵی ئیسلامی کە (تێگەیشتوو نین بۆ دیدگاکان لە کارەکاندا)بەو شێوەیەش وا هەڵسوکوتی لەگەڵ نەدەکردن کە ئەوان دوژمنن و بیر لە کوشتنی دەکەنەوە.

کت وپڕ دەم وچاوێکی تری ئیخوان موسلمین و هاوبەشەکانی تری دەرکەوت، لە ڕۆژی ڕووداوی سەکۆکەدا، کە بووە هۆی بوونە قوربانی سەرۆك سادات، کە پاداشتەکەی مردن بوو لەسەر دەستی یەکێك کە خۆی لە زیندان ئازادی کردبوو، ئەوە هەڵە گەورەکەی سادات بوو.

سادات چیرۆکێکی سەرکەوتنی درامی هەیە، پیاوێك کە خاوەنی کە سایەتیەکی کاریزمی زۆر زیرەك بوو، کە دواتر بوویە هۆی هەڵسەنگاندنێکی دژ بەیەکی ئێجگار زۆر.لای هەندێك پاڵەوانی تێپەڕاندن و شەهیدی ئاشتیە،لە کاتێکدا هەندێکی تر بە دیکتاتۆر و گەندەڵ و ناپاك و بەپیاوە بێگانەکان دەی بینن. ،بەلام لە ڕاستیدا جەماوەر بوونی سادات لە ماوەی فەرمان ڕەوایەتیدا هێڵێکی جیاکەرەوە دەکێشێت لە نێوانەدا.

سادات دوای چەند ساڵێك لە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی میسر، توانی خەونێکی گەورە بۆ گەلەکی بهێنێتە دی، ئەوەش شەرعیەتی دا بە فەرمانڕەوایەتیەکەی و شوێنی تایبەتی بۆ کردەوە لە دڵی میسریەکاندا،ئەو خاوەن بڕیاری جەنگی (ئۆکتۆبەر) و فەرماندەی بالای هێزە چەکدارەکانی میسر بوو، کە یەکەم سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە مێژووی ململانێ ی عەرەب–ئیسرائیلدا.

لەو کاتەی کە سادات سەرکردەیەکی سەرکەوتو بوو، و لە ئەوپەڕی لوتکەی هێزیدا بوو،ڕژێمە سیاسیەکەی پایەکانی خۆی لە دەستەلاتدا چەسپاند بوو، لەو لوتکەیەوە ڕیشەکانی قەیرانەکە دەستیان پێکرد.

دەستیان پێکرد کاتێك سادات لەو باوەڕەدا بوو، کە دەتوانێت بە کارتێکی ئاینی یاری بکات لە جەنگەکەیدا لە بەرامبەر ناصریەکان و شیوعیەکان، بۆیە دەزگای ئاسایشی میسری دەستیکرد بە پاڵپشتی ڕەوتی ئایینی و دابین کردنی ئازادی بۆیان بە شێوەیەك کە پێشتر ئەوەیان بە خۆوە نەبینی بوو. سادات نازناوی (سەرۆکی بڕواداران ) و دروشمی (دەوڵەتی زانست و باوەڕی )ڕاگەیاند.

هەندێك وای دەبینن کە سەرۆك سادات ویستوویەتی بەو شێوە نوێ یە خۆی وەك (وەلی الامر)ی موسڵمانان پیشان بدات، کە دوای خوداو پێغەمبەری خودا پێویستە

گوێڕایەڵ بکرێت، بەو پێیەش دەتوانێت هاوپەیمانیەتی زۆرینەی موسڵمانانی میسر بە دەستبهێنێت بۆ ڕژێمەکەی.

لە سەرەتای حەفتاکاندا سەرۆك جمال عبدالناصر کۆچی دوایکردوو، سەرۆك ئەنوەر سادات جێگەی گرتەوە، پەرچەکردای نسکۆی (یونیۆی ساڵی ١٩٦٧)ز هیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی لە کۆمەڵگەی میسریدا دروست نەکرد، بە لابردن یان گۆڕینی بیروباوەڕو فکر و بەهاکان، کە لە ماوەی ئەو دوو دەیەیی دوایدا زاڵ بوون بەسەر کۆمەڵگەی میسریدا.

سادات بە شێوەیەکی کتوپڕ دەستەلاتی وەرگرت، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە ڕێکخستنێکی لە ناودەستەلاتدا هەبێت، بۆیە دەستیکرد بە ئازادکردنی ئیخوانەکان لە زیندانەکانی میسر،و ئازادیەکی تەواوی کارکرنی بە ئاشکرای پێدان، گرنگترین ئەو شوێنانەش کە دیمەنی ئەو گۆڕانکاریانەیان بە خۆوە بینی بریتی بوون لە زانکۆکانی میسر.

بۆ سەرکەوتنی پلانەکەشی سەرەتا سادات، دوان لە پیاوەکانی خۆی ڕاسپارد بۆ بوژانەوەو زیندوکردنەوەی چالاکیەکانی کۆمەڵەکە...خوالێخۆش بوو(محمد عوسمان ئیسماعیل) لە پارێزگای (ئەسیوت)، (د.محمد جمعە) لە پارێزگای (تەنتا)، دواتر دەستیکرد بە ئازادکردنیان لە گرتووخانەکان و، نازناوی (سەرکردەی باوەڕداران)ی لە خۆینا.

کارگەیشتە ئەوەی کە بەرێز(مەرعی) ئەمینداری لیژنەی ناوەندی یەکێتی سۆسیالیستی لە سەرەتای حەفتاکاندا داوای پۆستی پارێزگاری ئەسیوت بکات بۆ (محمد عوسمان اسماعیل)، و داوای لێکرد قوتابیانی کۆمەڵی ئیسلامی تەیار بکات بە چەکی سپی (چەقۆ و خنجەر )،محمد عوسمان هەواڵەکە بە درۆ ناخاتەوەو زەمبیلەکەی پڕدەکات لە چەکی سپی و دابەشیدەکات بەسەر قوتابیاندا لە بینایەیی یەکێتی سۆسیالیستی لە ئەسیوت.

محمد عوسمان، هەر جۆرە کۆبوونەوەیەکی بەجێدەهێشت، ئەگەر گرنگیش بووایە، لە کاتی ئاگادارکردنەوەی (ناصح ابراهیم)ی ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی لە (ئەسیوت)ئەگەر بیویستایە یان داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکردایە. واگومانی دەبرد کە دەوڵەت جنۆکەیەکی ئامادەکردووە و ئەو دەتوانێت هەڵسوکەوتی پێوە بکات و بیجولێنێت، بۆیە بە تەواوی فەرمانی بەسەر قوتابیانی زانکۆی ئەسیوت دەکرد، و دواتریش ئەوە سەرجەمی زانکۆکانی تری ناوچەی (صعید)ی گرتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە حکومی بەسەر چالاکی خوێندکاریدا دەکرد،بە شێوەیەك کە هەندێك جار پرۆسەی خوێندنی پەکدەخست و ڕێگەی نەدەدا بە ئاسایی بوونەوەی تا داواکاریەکانیان جێ بەجێ نەکرایە، بەو شێوەیەش ڕیکخستنی چەکداری گروپە ئیسلامیەکان گەڕایەوە، ئەو ڕێکخستنەی کە جمال عبد الناصر لەبەریەك هەڵیوەشاندەوە و لە ناوی برد.

لەو کاتەشدا هەمان ئەو قسانە دەبیسترا، کە ئێستا هەندێك ڕۆشنبیرو دەیکەن، بەوەی کە ئەو توندڕەوانە حەقی خۆیانە بەرپەرچی توندوتیژیەکانی دەزگاکانی ئاسایش و حکومەت بدەنەوە، ئەو خوێندکارانە هەست بە ستەم دەکەن، ئەوەش دەربڕینێکی ڕاستەقینەیە بەرامبەر ئەو ستەمە، ئەوان ڕۆڵەی ئەم ولآتەن نەك ڕۆڵەی کۆمەڵی ئیخوان موسلمین، ئەوان لەسەرخۆ و هێمنن و زیانە خرۆش نین، لەبەر ئەوەی توند و تیژی لە ئەدەبیاتی ئیخوانیدا نیە، ئەو کەسانە داهێنەر بوون لە هێنانەوەی بیانووی درۆین بۆ بەرگریکردن لە ئیخوانەکان، بە گومانی ئەوەی کە ئەوان لە ئایندەیەکی نزیکدا لە دەستەلآت دەبن و ئەمانیش بەو کارەیان دەستی هاوکاریان بۆ درێژ دەکردن.

لە ڕووی باڵی خێڵەکی کۆمەڵەکەوە گرنگترین کەسە دیارەکانی ئەو کاتەی کارو چالاکی خوێندکاری بریتی بوون لە (کرم زهدی،ناجح ابراهیم،عاصم عبدالماجد، عاصم دربالە،فواد الدوالیبی،تلعت فواد قاسم،حمدی عبالرحمن،صلاح هاشم،اسامە حافن)ئەمانی توانیان دەستبگرن بەسەر کۆمەڵەیەکی ئاییندا، کە بە ئاماژەکانی دەزگاکانی دەوڵەت و ڕەزامەندی ئەو کاری دەکرد،و بیگۆڕن بۆ (کۆمەڵی ئیسلامی ).

له میانەی کارەکانیاندا، کاریان له کەش و هەوایەکی ڕێگەپێدراودا دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی نەهێشتنی ڕەوتی شیوعیەت، ئیتر بە زۆر بووایە یان بە خواستی ئەو کەسانەی کە وازیان لێدەهێنا.لەگەڵ گەورەبوونی دەسەڵاتی (کۆمەڵەی خوێندکارانی ئیسلام)ی ، دەستیانکرد بە گۆڕینی ئەو کەش و هەوایەیی کە لە زانکۆکان و کەمپی زانکۆکاندا هەبوو، سەرۆکی زانکۆکانیش ڕەزامەندیان نیشاندا لەسەر بڕیارەکانی ئەو کۆمەڵە خوێندکاریەوە،و دەستیانکرد بە جیاکردنەوەی خوێندکارە کوڕ وکچەکان لە هۆڵ و شوێنەکانی خوێندندا و قەدەغەکردنی تێکەڵ بوونیان، تەنانەت لە شوێنە گشتیەکانی زانکۆکانیشدا.

بۆ زیادکردن و فراوانکردنی بازنەی دەسەڵاتیان، سەربازگەو چادرگەی ئیسلامیان دەکردەوە لە پشوەکان و پشووە وەرزیەکاندا، کرم زهدی لە زانکۆ و شوێنە جیاوازەکانی زانکۆکاندا گووتاری دەخوێندەوەو حەماسەتی قوتابیانی بەرز دەکردەوە،دوای ئەمە لە دەوری سەرکردەکانی کۆمەڵی ئیسلامی کۆبوونەوەو کاریگەریەکی ئێجگار زۆریان لەسەر دانا.

کاتێك هەوڵەکانی ئیخوان موسلمین ئاشکرا بوون بۆ دەستگرتن بەسەر سەرکردەکانی جولانەوە خوێندکاریەکاندا لە نێو کۆمەڵی ئیسلامی لە زانکۆکانی میسردا، کرم زهدی دەست پێشخەریەکی کرد بۆ بە پیرۆزکردنی سەرکردەکانی، بە پشت بەستن بە دوو کەسی جیهادی لە پێش هەمووشیانەوە ئەندازیار(محمد عبالسلام فرج) خاوەنی کتێبی (الفریصه االغائبه) و موقەدەمی هەوالگری (عبد زمر).

گرنگترین بنەماکانی جیاوازی ڕەوتی کۆمەڵی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیخوان موسلمین بریتی بوو لە خواست و ئارەزووی شۆڕشگێڕیان بۆ بەرەنگار بوونەوەی دەسەڵاتی میسری بە هۆکاری ئەوەی کە گوایا شەرعیەتی لەدەستداوە.

کرم زهدی ئەوەی بە نارەحەت و ئەستەم نەدەزانی کە هاوەڵەکانی ڕازی بکات بە دروستکردنی ڕێکخستنێکی نوێ لە (صعید) کە سەربەخۆ و جیاواز بێت لە کۆمەڵی ئیخوان موسلمین.فکرەکەشی لە زۆر سەرچاوەو کتێبی جیاوازەوە وەرگرت لە

گرنگترینیان (تفسیری ابن کسیر،العقیده التنتاوی، معاریج القبول ی حافز بن الحکمی، نیل الاوتانی شەوکانی، ریاز الصالحین ی نەوەوی)ئەو سەرچاوانە فکرەی سەلەفی ئەویان تێکەڵ کردبوو بە فکرەی سید (قوتب) کەلە ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی میسر هەڵگەڕابوویەوەو بە نەزان وەصفی کردبوو . ئەمە سەرەڕای کتێبی (فەریزەت الغائبە) ی عبالسلام فرج.

ئەو تێکەڵەیە، گرنگترین بنەماکانی ئەو فکرەیە پێکدەهێنا کە کۆمەڵی ئیسلامی میسری لەسەر دامەزرا لە (صعید) میسری، کۆمەڵەکە هەستا بە تکفیرکردنی ئەنوەر سادات بە تۆمەتی ئەوەی کە حوکم بە فەرمانی خودای ناکات (لا یحکم بما انزل الله)، کە گوای ئەو کفری گەورەی کردووە بەپێ ی ئەو جیاکارییەی کە دەیانکرد لە نێوان کفر و ستەم و فسقی گەورەدا کە بکەرەکەی لە ئومەتی ئیسلامی دەردەکات، لە کاتێکدا کە کفر و ستەم و فسقی بچوك وەك ئەنجامدانی سەرپێچی و تاوان بکەرەکەی لە بازنەی ئیسلام دەرناکات، ئەوان بانگەشەی جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەتیان بە ڕووتکردنەوەی ئیسلام دەزانی لە ڕووحی ڕاستەقینەی خۆی و گۆڕینی بە وێنەیەکی کرچ و کاڵی بێ گیان.

ئەو کات ئەو ڕێکخستنە نوێ یە بۆ بەردەوامدان بە چالاکیەکانی دەستیکرد بە ڕاکێشانی ئەندامی نوێ، هەروەك چۆن دەستی برد بۆ ڕێگەی جیاوازتر بۆ پارەدارکردنی خۆی،وەك کردنەوەی بازاری خێری بۆ فرۆشتنی کالاّ و کتێبی پرۆگرامی خوێندن و ئایینی و جل وبەرگی ئیسلامی بۆ قوتابیە کچەکان، پڕکردنەوەی پارەدارکردنەکە گەشەی کرد لەسەر بنەمای ئەو فەتوایەی کە موڵك و ماڵی مەسیحیەکانی حەلاڵ کرد. یەکەم کردەی سەربازی ئەو ڕێکخراوەش لەو بوارەدا بریتی بوو لە دەستگرتن بەسەر ژمارەیەك دوکانی زێڕفرۆشی مەسیحیەکاندا لە شاری (نجع جمادی) لە (صعید)ی میسر بردنی زێرو پارەکانیان.

ئەو کردەیە (علی شریف) سەرکردایەتی کرد، کە توانیان دەست بەسەر دوو دوکانی زێڕفرۆشیدا بگرن لە ساڵی (١٩٨٠)ز دوای ئەوەی کە ئەوەی کوژا کوژراو ئەوەی ڕزگاری

و بوو ڕزگاری بوو، یەکەم دەستکەوت کە ئەو کۆمەڵەیە دەستی کەوت بریتی بوو لە (٤) هەزار جونەیهی میسری و پێنج کیلۆو نیو ئاڵتون، وەك دیاریەکیش بۆ سەرکەوتنەکەی، کەسێکی تر بە ناوی (نبیل المغربی) هەستا بە ئەنجامدانی کردەیەکی تری لەو جۆرە، بە هێرشکردنە سەر دوکانێکی تری زێرفرۆشی مەسیحیەکان لە ناوچەی (شبر الخیمە) لە قەیلولیە.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٧) سادات ئەنجومەنی یەکێتی قوتابیانی میسری بانگ کرد، تا لەگەڵیاندا تاوتویێ ڕوداوەکانی ڕاپەرینی جەماوەری ناسراو بە (ڕاپەڕینی حەرامیە) و شرۆڤەی بۆچوونی خۆی بکات دەربارەی بنیادنانەوەی میسر،لەو کاتەدا(عبالسلام ابو الفتوح) خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی و سەرۆکی لقی یەکێتی قوتابیانی زانکۆی قاهیرە، هەستایەوەو زۆر بە ڕوونی و ئازایانەو حەمماسی گەنجانەوە ڕووبەڕووی سادات بوویەوەو پرسیاریی لێکردو گووتی:جەنابت ئازارمان دەدەیت، بە وتەی دەوڵەتی زانست و باوەڕ و، دەوڵەتی دیموکراسی، کەچی هێزەکانی ئاسایشی ناوەندیمان تێبەردەدەیت تا ئازارمان بدەن وهێرش بکەنە سەرمان، لە بەرامبەر دەرچوونمان لە خۆپیشاندانێکی هێمنانەدا بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتیمان لە سوکایەتیکردن بە (شێخی غزالی)، ابو الفتوح درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت:سەرۆك ئەوانەی لە دەورت کۆبوونەتەوە دوو ڕوون، لەو کاتەدا سادات لێی تورە بوو داوای لێکرد کە بێدەنگ بێت، بەڵام ابوالفتوح ڕەدی کردەوەو قسەکانی خۆی تەواو کرد.

ابوالفتوح ئەو شاهیدیەمان بۆ دەگێڕێتەوە دوای تێپەڕبوونی (٣٠)ساڵ، کاتێك ئەندامی مەکتەبی ئیرشادی کۆمەڵی ئیخوان موسلمین بوو دەڵێت:هیچ کەسێك پێش سەرۆك سادات چاوی بە قوتابیان نەکەوتووە بەو شێوەیەو گویێ ی لە ناڕەزایەتی ئەوان نەگرتووە، وە کەسیش دوای ئەو ئەو ئەزموونە دووبارە ناکاتەوە.

جیاوازیەکی زۆر توند دروست بوو لە نێوان ئەو کۆمەڵەیەو سەرۆك ئەنوەر سادات، لەسەر هەڵوێستی دژایەتیکردنی ئیخوان بەرامبەر واژۆکردنی ڕێکەوتنامەی ئاشتی (کامپ دیڤد).

لە نەدوەی فکری ئیسلامی کە لە شاری ئیسماعیلیەی میسر رێکخرا بوو لە مانگی (اغستسی ساڵی ١٩٧٩)ز و (عمر تلیماسان)ی مورشیدی گشتی ئیخوان موسلمینیش لەوێ ئامادەبوو، لەو کۆنگرەیەدا سادات کۆمەڵێك تۆمەتی دایە پاڵ ئیخوان موسلمین،لەوانەش تۆمەتباریکردن بە دوژمنانی نیشتمان و تێکدەرانی وڵات، عمرر تلماسانی بەرامبەر سادات وەستایەوەو گوتەیەکی بەناوبانگی ئاڕاستە کردو کووتی:(ئەگەر هەرکەسێکی تر جگە لە تۆ ئەو تۆمەتانەی ئاڕاستە بکردینایە، سکاڵامان لەسەر تۆمار دەکرد؟ ،بەڵام تۆ ئەو محمد ئەی ئەنوەر ئەی سادات خاوەنیانی، بۆیە من سکاڵای خۆم لای دەستەڵاتداری دەستەڵاتدارەکان و دادپەروەری دادپەروەرەکان دەکەم، بەڕاستی ئازارتدایین ئەی پیاو ).

لەو ماوەیەدا سادات بەشێك لە باڵانصە جەماوەریەکەی لە دەستدا،دوای ئەوەی ڕژێم زنجیرەیەك بڕیارو ڕێوشوێنی تایبەتی گرتە بەر، کە بوونە هۆی دروست بوونی جۆرە بارێکی تێکچوو لەسەرجەم بوارەکاندا، کە دواجار بوونە هۆی دروست بوونی جۆرێك لە تورە بوون لە ڕژێمەکەی سادات. ئەو تورە بوونە چەندین هۆکاری جیاوازی هەبوون، کە جیاواز بوون بە ئەندازەی فکرەو ئامانجەکانی هەرلایەنێك لە لایەنە تورەکان....هەندێك لەبەر سەردانیکردنی بوو بۆ شاری قدس و واژۆکردنی رێکەوتنامەی ئاشتی بوو لەگەڵ ئیسرائیل. هەندێکی تر لەبەر دەرکردنی چەند یاسایەك بوو لە دژی ئازادیەکان و بنەماکانی دیموکراسی. هەندێکی تر لەبەر دارمانی بارودۆخی ژیانی ئابووری چینەکانی خوارەوە بوو، کە لە دەرئەنجامی جێ بەجێکردنی سیاسەتی هەرەمەکی کرانەوەی ئابوریەوە دروست بوو بوو، هەروەها دەوڵەمەند بونێکی گەندەڵانەی نامەشروعی ئەوانەی کە لە دەوری دەستەڵات کۆبوو بوونەوە، لە ژێر سێبەری گەندەڵی ئیداری و نەبوونی دەزگای چاودێری. ئەمە جگە لە بڕیاری لابردنی پاڵپشتی شمەکی بنەڕەتی کە بووە هۆی تەقینەوەی خۆپیشاندانەکانی ساڵی (١٩٧٧)ز، هەروەها تێکچوونی پەیوەندی نێوان سادات و پیاوانی کەنیسەی میسری و گرگرتنی فتنەو ئاژاوەی تائیفی، بە دروست بوونی

ڕووداوی توندوتیژی لە ناوچەی (زاویە الحمرا ) کە بووە هۆی ئەوەی شەقامی گشتی میسری تێبینی بۆ دروست بێت لەسەر ڕژێمەکەی سادات.

گروپە ئیسلامیەکان هەموو ئەمانەیان بەرهەم هێنا، بۆ وروژاندنی گەنجەکان، بە تایبەتی لە ناوچەو گەڕەکە هەژارنشینەکاندا دژی سادات و توانیان ژمارەیەکی زۆریان لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە.

لە کاتی دەرچوونی ئیخوانەکان لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە زیندانەکان،گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە گۆڕەپانی سیاسی وەك چۆن ئەزموونی حزبیان وێنەی کێشاوە گونجاو نیە بۆیان، بیناکردن لەسەری وەك ئەوە وایە بینا لەسەر ڕملی بیابان بکەیت،بۆیە سڵەمینەوەیان زیادی کرد، وەك میراتێکی مێژووی قورس لە نەبوونی متمانە و گومان لە نیەتی ڕژێمی سیاسی وڵات لە بەرامبەریان، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیان هەر دێت بەبێ گومان، بۆیە بڕوایان وابوو ڕێکخستنێکی تۆکمە تاکە چارەسەرە بۆ هاتنی بەرەنگاربوونەوەی ئەو ئەگەرە.

ئیخوان لە حەفتاکاندا دەستیکرد بە بنیادنانی ڕێکخستنێکی هەرەمی پتەو لە دەرەوەی دەستەڵاتی دەوڵەت و چاودێری دەزگاو دامەزراوە جیاوازەکانی دەوڵەت، بە ئیعتباری ئەوەی کە ئەو ڕێکخستنە بە هێزو پتەوە، تاکە گرنتی ڕاستەقینەیە بۆ مانەوەی کۆمەڵەکە، کە کاتی خۆی ڕژێمەکی جمال عبدالناصر بڕیارێکی ئیداری دەرکردبوو بە هەڵوەشاندنەوەو قەدەغەکردنی لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٥٤)ز، شتێکی واش لە ئارادا نەبوو کە سەرۆك سادات هیچ مەشروعیەتێکی یاسای بۆ بگەڕێنێتەوە، سەرەڕای ڕێگەپێدان و شەرعیەتی کاری کرداری کە درابوو بە سەرکردەکانی کۆمەڵەکە.

ئەو پەیامە گەیشتە کۆمەڵەکە کاتێك سەرکردەکەی (عمر تلماسان)ی داوەی لە سادات کرد کە کۆمەڵەکە بخاتە چوارچێوەیەکی یاساییەوە، بەڵام وەڵامی دایەوە بەوەی کە داوای کارکردنی کۆمەڵایەتی پێشکەش بکە.

ئەو ستراتیژیەتە دەستیکرد بە دووبارە بنیادنانەوەی ڕێکخستنەکان، و ئەو کارەشە لەلایەن ئەندامانی سەرکردایەتیەوە بەڕێوەدەبرا و ئەندامانی لەسەر پەروەردە دەکرا

لەسەر سیستەمێکی تایبەتی نهێنی کۆمەڵەکە کە پێش شۆرش هەبوو. گرنگترین ئەو مامۆستایانەی بریتی بوون لە (مستەفا مەشهور،ئەحمەد ملت،حوسنی عبدالباقی،کمال سەنانیری، ئەحمەد حوسنین، )سەرجەمیان بوونە ئەندامی نوسینگەی ڕابەر یان(ئەنجومەنی حوکمی کۆمەڵەکە) پێش ئەوەی کەهیچکامیان کۆچی دوای بکات، ئێستا هیچکامیان لە ژیاندا نەماون تەنها ئەوەی کۆتای نەبێت کە بەدەست نەخۆشیەوە دەناڵێنێت.

ئەو ستراتیژیەتە بەرهەمێکی باشی هەبوو، دەیەیی حەفتاکان تەواو نەبوو، ئەو کۆمەڵەیە بوویە بەهێزترین ڕێکخراوی ئایینی لە میسردا، دوای قوتدانی زۆرینەی ڕێکخراوە ئیسلامیەکانی تر، لە گرنگترین ئەو گروپانەش کۆمەڵی ئیسلامی لە زانکۆکانی میسر، کە ڕێکخراوێکی خوێندکاری ئیسلامی بوو زۆر بەخێرای پەرەی سەند بوو، ئەمە دوای ئەوەی کە سەرکردەکانی کۆمەڵەکە سەرکەوتوو بوون لە ڕازیکردنی ئەنجومەنی دەستەلاتدارانی کۆمەڵی ئیسلامی کە (عبدالمنعم ابو الفتوح) سەرکردایەتی دەکرد بە یەککگرتن لەگەڵیان، یان چوونە پاڵیان.

ئەو پەرەسەندنە فراوانەو پێشبڕکێ ی خێرای بنیادنانی ڕێکخراوەکە، سەرکردەکانی ئیخوانی توشی لەخۆبای بوون کرد،بەوەی کە باشتر وایە بۆ ڕێگەی ڕێکخراوەکەدەست پان نەکرێتەوە لە ڕژێم تا ڕێگەی کارکردنی یاسای بداتێ، نەك لەبەر ئەوەی کە باوەڕیان بە ڕەدکردنەوەی تەواوی هەبێت، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە متمانەیان بەوە هەبوو کە بارێکی نایاسای باشترە بۆ کۆمەڵەکە و دەیان بوێرێت لە ئەرکەکانی سەرشانیان، بەوەش زۆرێك لەبەربەستە یاساییەکان بەردەمیان دەبڕن.

ئەو باوەڕە ڕەگی داکوتاو جێگیربوو، ،ئەو لێبوردەیەیی کە سادات پیشانی دەدا لەگەڵ کۆمەڵەکە، لەگەڵ هاتنی (حوسنی موبارەك)گەیشتە ڕێگەی ئاوا بوونی خۆی، کاتێك حوسنی مبارەك سەرەتای دەستەلاتەکەی بە چاوپێکەوتنی هەموو سەرکردەکانی هێزە جیاوازەکانی میسر دەستی پێکرد لە کۆشکی کۆماری جگە لە ئیخوانەکان نەبێت.

بەو پەیامەش، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ڕێگەی یاسای بۆ ئەوان خەونێکی درێژخایەنە، سەرکردەکانی کۆمەڵەکە جەختیان لەسەر ڕێکخستنی نهێنی کردەوە، بە هیوای نەوەیەکی نوێ کە هیچ کێشەیەکی پێکهاتەی نەبێت بۆ ئەوەی بچێتە نێو دەرگا یاساییەکانەوە.

لەو ماوەیەدا ستراتیژیەتی کۆمەڵەکە ڕازی بوو بە چوونە نێو گەمەی سیاسیەوە، بەبێ هیچ پابەند بوونێك بە بنەماکانیەوە، هەڵوێستی خۆی لە بیرۆکەی حزبیدا لەوەدا کورت کردەوە کە هەماهەنگی بێت لەگەڵ ئەو حزبانەی کە لە گۆڕەپانەکەدا هەن وەك (حزبی وەفد ١٩٨٤) یان هاوپەیمانیکردن لە باشترین حاڵەتدا لەگەڵ (العمل والاحرار١٩٨٧)ز بەبێ هیچ جۆرە مەرجێك لەگەڵیاندا.

ئیخوان بە دەست ئەنقەست یان نا، کاری خۆی کورتکردەوە لە بنیادنانی ڕێکخستنێکی بەهێزی ئاسنین لە دەرەوەی یاسای ڕێکخراو پارتە سیاسیەکان، و توانی ببێتە بریکاری بەدەستهێنانی پرۆژەیەکی ئیسلامی بۆ گۆڕانکاری.

وردەکاری لایەنی پرۆژەکەیان زۆر لە یەکدی جیا نەدەکرایەوە، بەقەد ئەوەندەی کە جیادەکرایەوە بە تێکۆشان و وردەکاری تەواو، کەئیرەییان پێدەبرا لەسەر ڕاهێنانی زیرەکانەی ئەو ڕێکخراوەو گەشەپێدانی تواناکانی،خۆی وەك دەوڵەتێك پیشان دەدا تەنانەت لە وردی دابەشکردنی یەکە ئیداریەکانیشدا، کە گەیشت بووە ئاستی شێوازی دابشکردنی یەکە ئیداریەکانی دەوڵەت، نوشینگەی ڕابەری گشتی هاوشانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بوو، ئەنجومەنی شورا کارەکانی پەرلەمانی ئەنجامدەدا،نوسینگەکانی کۆمەڵەکە پارێزگاکان بوون،ناوچەکانی هاوتای بازنەی سنورە ئیداریەکان و بازنەکانی هەڵبژاردن بوون، بە شێوەیەك کە کۆمەڵەکە دەوڵەتێك بوو، بەلام بەبێ سوپاو دام و دەزگای ئاسایشی.

ڕێکخراوەکە چووە نێو سەرجەم وردەکاری و جومگەو دامەزراوەکانی کۆمەڵگەو دەوڵەتی میسریەوە، بێجگە لە کەرتی سوپاو پۆلیس و دەزگا سیادیەکان، کە سەرکردایەتی کۆمەڵەکە وەك هێڵێکی سور پێوەی پابەند بوو،لە بەر چاو ڕوونیان لە

بەرەنگاربوونەوەیەکی دوورودرێژدا کە لەگەڵ ڕژێمەکەی جمال عبدالناصردا هەیان بوو ، کە ئەوەش دیارترین هۆکارەکانی خوێناوی بوونی ئەو ڕژێمە بوو، کاتێك هەوڵی ڕیشەکێش کردنیدان لە دام و دەزگاکانی جێ بەجێکردندا ، کە دوای ڕوودانی شۆڕش خزا بوونە ناوی، کە دەکرا لەو ڕێگەیەوە کودەتایەکی هەڵگەڕاوە ئەنجام بدەن.

گرنگترین و دیارترین عەقڵی ئیخوان موسلمین بریتی بوو لە (پرۆژەی جێ نشینکردن) کە گرنگترین عەقڵ و سەرکردەکانی کۆمەڵەکە لە ڕیزی دووەم و سێهەمیدا (نەوەی حەفتاکان و هەشتاکان )کاریان تێدا دەکرد، پرۆژەکە بریتی بوو لە دووبارە بنیادنانەوە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵەکە لە ڕوی ئیداری و ڕێکخستنی پەیکەرەو دامەزراوە جیاوازەکانی، بە ڕێگەیەکی ئێجگار وورد ، وە دانانی هەنگاو پلانی ڕێکخراو بۆ دەستگرتن بەسەر دەزگای دەوڵەت و وەرگرتنی دەستەلات بە شێوەیەکی ئاشتیانە. دیکیۆمێنتەکانی ئەو پرۆژەیە لە سالّی (١٩٩٢)ز ئاشکرا کران کە لەسەر سیدی کۆمپیوتەرەکانی کۆمپانیای (سل سبیل) دۆزرانەوە، لە ڕۆژگارەدا بوونە گرنگترین ناونیشان و باس و خواسی ئەو کۆمەڵەیە. بە ئاشکرا بوونی ئەو بەڵگانە، هێزی ئەو کۆمەڵەیە بۆ دەوڵەت ئاشکرا بوو کە زیاتر نزیك بووبوونەوە لە دەوڵەتی هاوتا، دەوڵەتێك کە بە هیچ شێوەیەك کەم و کوڕی و خاوبوونەوەی تێدا بەدی نەدەکرا.

کۆمەڵەکە کۆتای هێنا بە بنیادنان و دامەزراندنی ڕێکخستنێکی زەبەلاح کە مەزندە دەکرا ئەندامەکانی لە نێوان (١٠٠–٥٠٠) هەزارا ئەندامی کارادا بێت، کە ئابوونەوەی مانگانەیان دەدات و لە ئوسرە ئیخوانیەکاندا ڕێکخرابوون (ئوسرە بچوکترین یەکەی ڕێکخستنەو هەفتانە وانە خوێندنیان هەیە) ئەمە سەرەڕای بازنەی پشتیوان و لایەنگران و دۆستانیان، کە ژمارەیان بە چەندین جار لە ژمارەی ئەندامانی ڕێکخستنیان زیاتر بوون. کە هەڵسەنگاندنیان جیاوازبوو بە گوێرەی لایەنی هەڵسەنگێنەرو پێگەی سیاسی و ئایدۆلۆژیان، لە هەموو بارەکاندا هەڵسەنگاندنەکە بە نزیکەی بوو، بە شێوەیەك کە ژمارەی ڕاستەقینەی دەرنەدەچوو، بە تایبەتی لە ژێر سایەیی ئەو سیاسەتەی بە ئەندامکردن و زۆر بوونەلە بازنەکانی پشتیوانان و هاوسۆزانیان، کە بەهیچ شێوەیەك لە

تواناادا نەبوو هەڵسەنگاندنێکی وردی ژمارەی ڕاستەقینەی ئەندامانیان بکرێت، تەنانەت لە لایەن دەزگای ئاسایشی میسریشەوە، بەڵکو لەلایەن دەزگاکانی کۆمەڵەکە خۆشیەوە، کە ڕەدی دەکردەوە هەر ئامارێکی ناوخۆی بکرێت، یان زانیاری لەسەر هەرجۆرە شتێکی نهێنی لەو بارەیەوە بکرێت، ئەگەرچی بە نزیك کراوەیش بێت، تەنانەت لەسەر ئاستی ناوخۆی خۆشی، ئەوە بوو بوویە هێڵێکی سور، و نەدەکرا ببەزێنرێت، ئەوەی هەوڵی بەزاندنی بدایە ئەوە بە ناپاك ئەژمار دەکرا، بە تۆمەتی ئاشکرا کردنی نهێنیەکانی ڕێکخستن.

لە ژێر ئەو هەڵچوون و ناکۆکیەی نێوان سادات و ڕەوتی ئیسلامی، سادات بەیاننامەیەکی بەناوبانگی خوێندەوە بۆ گەلی میسری لە (١٤ سیبتەمبەری ساڵی ١٩٨١)ز. لەگەڵ بەردەوام بوونی تێکچوونی پەیوەندی نێوان سادات و گروپە ئیسلامیەکان و دەرکردنی بڕیارەکانی دەربارەی قەدەغەکردنی چالاکیەکانی ژمارەیەك لە سەرکردەو ئەندامانی ئەو ڕێکخستنە، کردەی تیرۆرکردنی سادات هات لە مانگی (ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨١)ز لە ڕوانگەی ئەو بیروباوەڕەوە کە هەیان بوو.

هەرچەندە (خالید ئیسلام بولی ) بڕیارێکی تاك لایەنەی دابوو بۆ تیرۆرکردنی سادات، بەڵام بڕیارەکەی خستە بەردەم (علی محمد عبدالسلام فرج) ئەویش بە خێرای ئەنجومونی شورای بانگهێشتکرد بۆ تاوتوێکردنی ئەو پرسە.

لە ماڵی (عبدلحمید عبدالسلام)لە کەناری (عین شمس) لە ڕۆژهەڵاتی قاهیرە خالید ئیسلام بولی پلانەکەی خستەڕوو، دوای دابینکردنی کەسانی ترو هاوکاریکردنی کرد بۆ جێ بەجێکردنی پلانەکەی، (عبدالسلام فەرەج) یش بەڵێنی دابینکردنی ئەوانەی پێدا، هەروەها داوای لە باڵی خێڵەکی کۆمەڵەکە کرد بە سەرکردایەتی (زهدی) کە یارمەتی بدەن بە پێدانی چوار بۆمب کە پێیان بوو، بەڵام ئەوان دواتر ئەو بۆمبانەیان نەنارد.

دوای بەدەست هێنانی سەرکەوتن لەلایەن خالیدەوە هەریەکە لە عبدالحمید عبدالسلام و عەتا تایل حمیدە و حسین عباس دوای ئەوانیش (عبدالسلام فرج)، کە هەموویان

پێکەوە پلانیان دارشت و هاوکار بوون لە کردەی تیرۆرکردنەکەی ساداتدا. بەخێرای لە یەکێك لە گەڕەکەکانی (ئەسیوت) ئەنجومەنی شورای باڵی خێڵەکی بە سەرکردایەتی (کرم زهدی ) کۆبوویەوە و ڕێککەوتن لەسەر بەردەوامیدان بە کاری جیهادی لە دڵی ڕژێمەکەی دەستەڵاتی میسریدا،ئەویش بە ئەنجام گرتنی پێنج ئامانجی ئاسایشی لە ئەسیوت کە بریتی بوون لە :(بەرێوەبەرایەتی ئاسایشی شارەکە،بەشی دووی ئەو بەڕێوەبەرایەتیە،دەوریەیی لاسلکی دەزگای لێکۆڵینەوەی ئاسایشی دەوڵەت،دەزگای لێکۆڵینەوەی تاوانەکان،بنکەی پۆلیسی ئیبراهیم ) دواتر ڕۆشتن بەرەو پارێزگاکانی ڕووی دەریاو بەرپاکردنی شۆڕشی جەماوەری.

هەریەکەلە (علی شەریف و عاصم عبدالماجد) سەرکردایەتی کردەکەیان دەکرد، لە کاتژمێری سفری دەست پێکردنی کردەکەدا دەستیانکرت بەسەر بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی شارەکەداو ژمارەیەکی زۆر سەربازو ئەفسەریان تێدا کوشت، هەر لە هەمان کاتدا دەستیانکرد بە تەقەکردن لەو ئۆتۆمبێلانەی ئاسایشی ناوەندی کە سەربازیان بۆ گۆرەپان و شەقامە گشتیەکانی شاری ئەسیوت دەگواستەوە، هەروەها توانیشیان دەست بگرن بەسەر بنکەی پۆلیسی ئیبراهیمدا،بەڵام بەهۆی بریندار بوونیان بە سەختی بووە هۆی شکست هێنانی پلانەکەیان، و بە زیندووی دەستگیرکران، هەردوو ئەنجامدەری کردەکەو (کرم زهدی) بە فرۆکەیەکی تایبەتی کە وەزیری ئەو کاتەی ناوخۆی میسر یاوەری دەکردن گوێزرانەوە بۆ شاری قاهیرە.

پچڕانی پەیوەندی نێوان کۆمەڵی ئیسلامی و کۆمەڵی جیهادی، لە ساڵی (١٩٨٣)ز لە نێو زیندانەکاندا ڕویدا، لەبەر پێداگری هەڵوێستی توندڕەوی خۆی بەرامبەر دەستەڵاتی میسری. لە نامەیەکدا کە گۆڤاری (مرابتون) بڵاوی کردەوە بە ناوی وتە بێژەکەیەوە

(د.ناصح ابراهيم)له ژمارەی مانگی یولیوی ساڵی (۱۹۹۰)ز داوای پێویستی بەرەنگاربوونەوەی ئەوەی ئەو ناوی دەنێت ڕژێمی عەلمانی دەسەلأتدار دەکات، زیاتر ڕوونی دەکاتەوەودەڵێت:ئەو کەناڵە دەستوری و یاساییانەی کە ئەو کاری پێدەکات لەسەر هەندێك کەسی سادەو ساویلکە، هیچ نین جگە لە تراویلکەو خەیاڵ و خەڵەتاندن نەبێت!!

نامەکە بەوە کۆتای پێدەهێنێت و دەڵێت:ئەو گومڕایانە لە نانەوەی ئاشوبی نێوان موسڵمانان وازناهێنن و لەسەر کورسی دەبستەلأتەکەیان نایەنە خوارەوە، تەنها بە جەنگ نەبێت.

ئەو بە ڕوونی دەستی پێکرد تا ساڵی (۱۹۹۳)ز کاتێك نێوەندگیری ژمارەیەك لە زانایانی قبوڵکرد بۆ وەستاندنی ئەو توندوتیژیەیی کە لە نێوان ئەوان و حکومەتی میسریدا هەبوو، بەلأم بڕیاری تیرۆرکردنی وەزیری ناوخۆ (عبدالحليم موسى) ئەو هەولأنەی شکست پێهێنا.

تیرۆرکردنی (د.علا محی الدين)وتە بێژی فەرمی کۆمەڵەکە لە ساڵی (۱۹۹۰)ز پاڵنەرێکی بنەڕەتی بوو تا کۆمەڵەکە بەردەوام بێت لەسەر کردەی شۆڕشگێڕی و تۆڵە سەندنەوە لە دژی دەستەلأتی میسری. دەسپێکی چالاکیەکانیان بە تیرۆرکدنی (د.رفعت المحجوب)سەرۆکی ئەنجومەنی گەلی ئەو کاتەی میسری دەستیان پێکرد.

ممدوح علي يوسف یەکێك لە دیارترین سەرکردەکانی ئەو کۆمەڵەیەو تۆمەتباری یەکەم لە دۆسیەیی تیرۆرکردنی (محجوب)دا لە وتەیەکیدا لە هۆڵی دادگا لە یەکەم دانیشتنی دادگایی کردنیدا لە مانگی یولیوی ساڵی (۱۹۹۱) گوتی:ڕێو شوێنە حکومیەکان ناتوانن دامبڕن لە ڕۆشتن بە ڕێگەکەیاندا).

کادیرە چەکدارەکانی کۆمەڵەکە لە ناوخۆ و سەرکردەکانی لەدەرەوە، چوونە ڕوبەڕوبوونەوەیەکی توند لەگەڵ حکومەتی میسری لە نێوان ساڵانی (١٩٩٢-١٩٩٧)ز تا شێخەکانی ئەو کۆمەڵەیە لە (٥ یونیۆی ساڵی ١٩٩٧)ز دەست پێشخەریەکی تاك لایەنەی ئاشتیان دەستپێکرد بە وەستاندنی سەرجەم کردەوە توندو تیژیەکانیان لە دەرەوەو ناوەوەی وڵات، ئەوەی کە مابوویەوە لەو دەست پێشخەریەدا تێپەڕاندنی لە مپەری سزاکان بوو، جا ئیتر لەوانە بێت کە ئەوەیان ڕەد دەکردەوە (وەك ئەوەی کە ڕووداوی ئەقصەری بە دوای خۆیدا هێنا لە ساڵی ١٩٩٧)ز یان دام و دەزگاکانی دەوڵەت کە بەردەوام بوون لە گرتنە بەری ڕێ وشوێنی ئاسایشی تایبەت لە دژی ئەندامانیان. تا مکرم محمد احمد سەرپەرشتی گفتوگۆ و دیالۆگێکی فراوانی کرد لەگەڵ سەرکردەوە کادیرەکانی ئەو کۆمەڵەیەدا، لەسەر بنەمای نەرمی نواندن و گوێگرتن بۆ هەمووان، لە هەنگاوێکی ناوەڕۆك دڵسۆزانەدا، دوای ڕاستی ئەو چاوپێکەوتنانەو حەزو ئارەزووی سەرکردەکانی ئەو کۆمەڵەیە بۆ چاککردنی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ کۆمەڵگادا، ئەوەش بووە هۆی گۆڕینی هەڵویستی ئەرێنی حکومەت پاڵپشتی دەست پێشخەریەکەی کرد.

هەندێك کەس سەریان سوڕما لە دەست پێکردنی ئەو پەیوەندیەی نێوان دام ودەزگاکانی دەوڵەت و کۆمەڵی ئیسلامی، لە کاتێکدا کە دەوڵەت زۆر بە توندی ڕووبەڕووی ئیخوان موسلمین دەبویەوە، ئەوەش دژ بەیەکیەکی دروستکردبوو لە هەڵویستەکانی دەوڵەت لە بەرامبەر دۆسیەی ڕەوتی ئیسلامی لە وڵاتدا.

دامەزراوەی ئاسایشی وڵات بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دۆسیەیی کۆمەڵی ئیسلامیدا دەکرد، کە دۆسیەیەکی تەواو ئاسایشیە، بۆیە بوو بووە هۆی دروستکردنی دوو دڵیەکی زۆر لەسەر مەسەلەی توندوتیژی کە خراپ بەسەر ئارامی و ئابوری و کەرتی

گەشتیاریدا دەشكایەوە، لە كاتێكدا كە دۆسیەیی ئیخوان موسلمین بە پلەی یەكەم دۆسیەیەكی تەواو سیاسی بوو.

بەو شێوەیە هەرچەندە سەرۆك ئەنوەر سادات، دەرگایەكی فراوانی كردەوە لەبەردەم بزوتنەوە ئیسلامیەكانی وەك كۆمەڵی ئیسلامی و ئیخوان موسلمیندا، بۆ كاركردن بە شێوەی ئاشكراو بڵاوكردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی و تێڕوانینی تایبەتی خۆیان لە ناوخۆی میسردا، بەڵام پارێزراو نەبوو لە دژایەتی كردنیان بۆ دەستەڵاتەكەی، نەك هەر ئەوەش بەڵكو كۆتایەكەی بە دەستی یەكێك لە توندڕەوەكانی ئەو گروپانە بوو.





ئەوە دیمەنی ساتی تیرۆرکردنی سەرۆکی کۆچکردوو ئەنوەر ساداتە لەسەر شانۆکە ، لەکاتی ئاهەنگ گێڕانی بەبۆنەی سەرکەوتنی ئۆکتۆبەرەوە ! !



سەرۆك ئەنوەر سادات لەكۆتاییەكانی پێش تیرۆركردنی لەسەر شانۆكە  كۆتاییەكی پێش بینی نەكراو بۆ سەرۆكێكی سەركەوتوو! !

## 11-شاو مارکۆس...ئەوەی گرەو لەسەر ئەمریکیەکان بکات دەیدۆڕێنێت!!



هەر دەستەڵاتدارێك لە جیهاندا، دەكەوێتە هەڵەیەكی گەورەی مێژوویەوە، ئەگەر لەو باوەڕەدا بێت، ئەگەر چی بۆ ماوەیەكی كەمیش بێت هێزێكی دەرەكی دەتوانێت ماوەی دەستەڵاتەكەی درێژبكاتەوە، یان گرنتی مانەوەی لە دەستەڵاتدا بۆ بكات؟ ،لەبەر ئەوەی تاكە گرنتی بریتیە لە گەل نەك هەر هێزێكی دەرەكی تر.

مێژوو شاهیدە لەسەر ئەو هێزانەو چۆنیەتی فرۆشتنی دۆستەكانیان، تەنها بەوەی كەوا دەركەوتووە بەلای كەوتندا چوون. لەبەر ئەوەی بە سادەی گرەو لەسەر بەخشندەیەكی دۆڕاو ناكات، تەنانەت ئەگەر یەكێكیش بێت لە هۆكارەكانی كەوتنی، لەوانەشە تەنانەت ئەوە ڕەد بكاتەوە كە پێشوازی لێبكات لە ولأتەكەیدا، ئەگەر بۆ چارەسەری پزیشكیش بێت، لەبەر ئەوەی ئەو دەیەوێت گرەو لەسەر جێگرەوەكەی بكات، و یاریەكی نویێ دەست پێبكات.

سەرەتا شرۆڤەی كەوتنی ئەو سەركردانە دەكەین كە دۆست و هاوپەیمانی ئەمریكا بوون، و هەوڵیان دەدا خۆیان بەو بەهێز بكەن، یان خۆیانی لێ نزیك بكەنەوە لەسەر حسابی گەلەكانیان، دواتر بە كت وپڕی پشتی تێكردن لە پێناو بەرژەوەندیەكانی خۆیدا.

پاشان تێبینی ئەوە دەكەین كە ئەو كەوتن و پشت لێكردنانەی ئەمریكا لە زیاتر لە ولأتێك و سەركردەیەكدا وەدەر كەوتوون، ئەزموونی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە كودەتاو هەڵگەڕانەوە بەسەر دۆست و هاوپەیمانەكانیدا پێوانەییە،بریتیە لە (فریشتە بوون) و دواتر( بەشەیتانی بوون).

ئەو ئەزموونە دەوڵەمەندە بە ناپاكی كردن و ستەم لە دۆست و هاوپەیمانەكان و پشتكردنە دۆستەكانی دوای داكشان و كەم بوونەوەی دەستەڵات و هێزیان لەبەردەم

هێزە بەرهەڵستکارەکانیان، یان لە حاڵەتی دەرکەوتنی جێگرەوەی ئیسلامیدا، وازی لێدەهێنانِ لەبەرژەوەندی جێگرەوەیەکی تر لە هاوپەیمانەکانی لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا.

ئەوەی ئەمڕۆ لە پاکستان دەگوزەرێت، بواری کردۆتەوە بۆ هەندێك بیرۆکەو سەرپەرشتیکردنی ئایندەی وڵات و ناوچەکە، لە ژێر سایەیی ئەو ئەزموونەی پێشووی پاکستان خۆی. ڕێگەکان گۆڕاون لە نێوان شێوازەکانی دیموکراسی و کودەتای سەربازی و شۆڕشی جەماوەری، بەلاَم لە ڕاستیدا هیچ جیاوازیەکیان نیەو دواجار ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بیَ ڕەحمانە پشتدەکاتە دۆست و هاوپەیمانەکانی لە کاتی کەوتنی باریان.

بۆ نمونە ئەزموونی شای ئێران (محمد ڕەزا شای پەهلەوی) کاتێك کە پشتی تێکرد زەویەك نەبوو تیایدا بحەوێتەوەو شوێنێك نەبوو گۆڕەکەی لە خۆ بگرێت لە ساڵی (١٩٧٩)ز، یان ئەزموونی (فردیناند مارکۆس)ی فلیپینی، کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێداگربوو لەسەر بەجێهێشتنی کۆشکی کۆماری بە خۆی و ماڵ ومنداڵ و سەرجەمی ئەو خشڵ و زێڕو زیو شتە گران بەهایانەی کە کۆی کردبوونەوە لە ماوەی فەرمان ڕەوایتی خۆیدا،تا ئەمریکا هاوپەیمانی ببەستێت لەگەڵ دوژمن و نەیارەکی بەناوی (کورازون ئەکینۆ) لە ساڵی (١٩٨٦)ز.

محمد ڕەزا شا لە دڵسۆزترین هاوپەیمانەکانی ئەمریکا بوو، بەلاَم ئەوەی ڕەدی کردەوە پێشوازی لێبکات، کاتێك شۆڕشەکەی خومەینی لە دژی بەرپا بوو،بۆیە سەرۆك ئەنوەر سادات وەك هەڵوێستێکی مرۆیی پێشوازی لێکردو هەر لەوێش مایەوە تا کۆچی دوای کرد. هەروەها ئەزموونی (پەنەما) کە یەکەیەکی کۆماندۆی ئەمریکی سەرۆکی پەنەما (مانویل نوریگا) یان لە ساڵی (١٩٨٩)ز فڕاند، کە پێشتر سەربازێکی دڵسۆزی دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی بوو لە کشوەری ئەمریکای لاتینی.

هەروەها ئەزموونی پاکستان، کاتێك شۆڕشێکی جەماوەری لە دژی سەرۆکی وڵات (زولفەقار علی بۆتۆ) باوکی (بێنەزیر بۆتۆ) دروست بوو لە ساڵی (١٩٧٧)ز هەمان شت دووبارە بوویەوە.

لێرەدا شرۆڤەی سێ نموونەی گرەوی دۆڕاو دەکەین لەسەر ئەمریکیەکان :یەکەمیان تایبەتە بە محمد ڕەزا شای پەهلەوی لە ئێران،و دووەمیان بریتیە لە دیکتاتۆری فلیپینی (فەردیناند مارکۆس) و سێهەمیشیان(ئیدوارد)ی سەرۆکی وڵاتی جۆرجیایە.

لە تاران، بەدیاری کراوی لە کۆشکی نیاوەرانی ئیمپراتۆری شای ئێرانی محمد ڕەزا شای پەهلەوی و میوانەکەی سەرۆکی ئەمریکا (جیمی کارتەر) ئاهەنگیان دەگێڕاو کاسی مەییان ئاڵوگۆڕ دەکرد، بە بۆنەی ئاهەنگی شەوی سەری ساڵی زایینیەوە لە (٣١ دیسمبەری ساڵی١٩٧٧)ز، کاتێك کارتەر سەرۆکی ئەمریکا جامێك مەی بەرزکردەوە وەك سڵاوێك بۆ میوانداریکردنی ئیمپراتۆری ئێرانی گوتی:خاوەن شکۆ شای ئێران پیرۆزبایت لێدەکەم، بۆ ئەوەی کە توانیووتە پارێزگاری لە شانشینەکەت بکەیت وەك دەریایەکی هێمن و ئارام، لەو جیهانەی کە پڕ بووە لە شەپۆل و زریانی بەهێزو جیاواز.

دوای (دە) مانگ لەو قسە دڵخۆشکەرە بۆ شای فارسەکان، لە ئاهەنگێکی تری شاهانەیدا، کە بە بۆنەی سەری ساڵی زایینیەوە ڕێکخرابوو لەئیمپراتۆریەتی فارسی ئێرانیدا، بەدیاری کراوی لە مانگی (ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٨)ز لە هەمان ئەو کۆشکەدا شای ئێرانی محمد ڕەزا شا پێشوازیکرد لە نێردەی تایبەتی سەرۆکی ئەمریکی بەڕێز(ژەنەڕاڵ هایزر) و بەڕێز (ولیم سولیوان) باڵوێزی ئەمریکا لە تاران ، ئەم دووانە نامەیەکی ئیدارەی ئەمریکایان هەڵگرت بوو بۆ خاوەن شکۆ شای ئێران کە وڵات بەجێ بهێڵێت.

بەو شێوەیە محمد ڕەزا شای پەهلەوی ئێرانی بەجێ هێشت، وەك کەسێك کە خۆی ڕادەستی ئیدارەی ئەمریکی کردبێت، و لە دەرەوەی وڵات پاشماوەی تەمەنی بەسەربرد، مرد بەبێ ئەوەی ئەمریکا هیچ جۆرە یارمەتیەکی پێشکەش بکات، تەنانەت یارمەتی مرۆیش.

ئەو ئەزموونە سیاسیە خراپە،بە درێژای مێژوو دەمێنێتەوە، وەکوخراپترین دیاردەیەك بۆ ئەو تێگەیشتنە مرۆیی و ئەخلاقیەیی فەرهەنگی سیاسی داگیرکاری ڕۆژئاوای بەگشتی و ئەمریکا بە تایبەتی. تێگەیشتن و چەمکانێك کە ڕوانینی سیاسی ڕۆژئاوای بەرجەستە دەکەن و پرۆژە ستراتیژیە سیاسیەکانی ڕۆژئاوای لەسەر بنیاد دەنرێن. چەمکانێك کە قالّب دراوی ماددی گەرای وشکن و نەڕووح و نە گیانیان تێدایە. ...ئەمانە چەمکانێکن لە ئەلف بای زانستی سیاسی ڕۆژئاوای. ..ئەو چەمکانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە:لە عورفی سیاسی ڕۆژئاوایدا پرەنسیپی دۆستایەتی هەمیشەی و دوژمنایەتی بەردەوام بوونیان نیە، بەڵکو پرەنسیپی بەرژەوەندی هەمیشەی لە گۆڕاندایە بە گوێرەی بارودۆخەکان. جارێك ئەو بەرژەوەندیە لەگەڵ ڕژێمەکاندایە، جاری واش هەیە لەگەڵ گەلەکاندایە ! !

بە گوێرەی ئەو بەرژەوەندیانە، پەیوەندیەکان تێکدەدەن و هاوپەیمانیەتیەکان بنیاد دەنێنن لەگەڵ و لە دژی لایەنەکان و هاوسەنگی هێزەکان لە هەر گەمەیەکی سیاسی و پارچەیەکی گۆی ئەم زەویەوهەرکاتێك لە کاتەکانی ئەم جیهانەدا بێت. ..

لێرەدا کەمێك دەوەستین لەسەر ئەو کاتەی مێژووی نزیکی ئێران، مێژوویەك کە چیرۆکی بنیادنانی ئیمپراتۆریەتێك و هەرەسهێنانی دەگێڕێتەوە لە ژێر فشاری چەمك و تێگەیشتنی بەرژەوەندیەکانی داگیرکارو، لە چوارچێوەی ئەو پرەنسیپە سیاسیە ناتەواوەدا...بۆیە پێویستە لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا وەك نەتەوەی عەرەبی پەندو ئامۆژگاری گەورە وەربگرین لەو چیرۆکەی دەستەلاّتدارانی ئێرانی.

بەبێ گومان هەمیشە ئێران زەویەکی بەپیت بووە بۆ تاقیکردنەوەی سیاسەتەکانی بەریتانیاو ئەمریکا، بۆیە شتێکی سەیرنیە کە بەریتانیەکان (ڕەزا شای پەهلەو)ی باوکیان لەسەر کورسی دەستەلاّت لادا و دوریان خستەوە بۆ دەرەوەی وڵات لە ساڵی (١٩٤٢)ز، ئەمریکیەکانیش هەمان کاریان کرد لەگەڵ (محمد ڕەزا شای )کوڕدا لە ساڵی (١٩٧٨)ز دوریان خستەوە بۆ دەرەوەی وڵات، بە هەمان ڕیگەی بەریتانیەکان یان بەڕێگەیەکی تر، کە هیچ جیاوازیەك ناکات لە ڕێگەکاندا، بەڵکو گرنگ ئامانجەکانی ئەوانە کە بریتیە لە

بەرژەوەندیەکانی خۆیان، لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئامانجەکە جوامێرانە نەبوو، یان پەیوەندی بە بەرژەوەندی نیشتمانیەوە نەبوو، بە قەد ئەوەی کە پەیوەندە بە بەرژەوەندی داگیرکەرانەوە هەبوو، لە سەرجەم قۆناغە جیاوازەکانی ململانێ ی نێودەوڵەتی و هەرێمایەتیەکاندا.

بە درێژای ماوەی ئەو مێژووەی کە ئاماژەمان پێدا، ڕەگەزە سەرەکیەکانی پاڵپشتی و یارمەتیە دەرەکیەکانی ئەو ئەزموونە داگیرکاریە لەسەر زەوی ئێران، خۆی دەبینێتەوە لە مل کەچ پێکردنی ئیرادەی ئێرانی بۆ ئیرادەی داگیرکەرلەلایەك، وە بە بارمتە گرتنی ئیرادەی گەلی ئێرانی، بۆ هەمان ئیرادەی داگیرکاری لەلایەکی ترەوە. ..

بە پشت بەستن بەو ڕەگەزە ناوخۆییانە، پەیوەندی و هاوپەیمانیەتیەکان لە وڵاتی ئێراندا خۆی بنیادناوە، بۆیە داگیرکاری بەریتانی و دواتریش ئەمریکی توانییویەتی ئیدارەی گەمەی سیاسی و دابەشکردنی ڕۆڵەکان بکات و کەلێنەکان دروست بکات و پەیوەندی و هاوکێشەکان بجولێنێت بە نهێنی و ئاشکرا، لەگەڵ سەرجەم لایەنەکانی ململانێکە، بە گوێرەی ئارەزووەکانی خۆی. ...

بەو ڕێگەیەش داگیرکەر توانیویەتی، درێژە بەدەستەلاتی خۆی بدات و سەرکەوتوو بێت لە جێ بەجێکردنی چەسپاندنی بەرژەوەندیەکان. ...لە کاتێکدا کە ڕژێم و گەلی ئێران سەرجەم هەلەکانی گۆڕانکاری لەدەستدا بۆ گۆڕانکاری لە ڕژێمی حکومی ئێرانیداو، شکستی هێنا لە جێ بەجێکردنی بەرژەوەندیەکانی ئێراندا.

لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی (محمد مصدق)دا (ایت الله کاشانی) نەی توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و ببێتە سەرۆکی پەرلەمانی ئێرانی. سەرکەوتنەکە بۆ (مصدق) بوو کە خاوەنی دیدگایەکی لیبراڵی بوو، بۆ ئەوەی لەو کاتەدا پەرلەمان ئاراستەیەکی لیبراڵی وەربگرێت، ئەوەش ئاماژەیەکی گرنگ دەبەخشێت لە مەڕ ئەو کەلێنەی کە لەنێوان شێوازی ڕۆشنبیری جەماوەری کە شوێنکەوتەی دامەزراوە ئاینیەکان بوو، لەگەڵ ئاڕاستەی فەرمی وڵات، کە تەماعی هەبوو بۆ بنیادنانی دەوڵەتێکی دامەزراوەی لیبراڵی.

دواتر دەبینین کاتێك حکومەتەکەی مصدق بە کودەتایەکی سەربازی ڕوخێنرا کە (کیم روزفلت)ی پیاوی هەوالگری ئەمریکی ڕێکیخست بوو لە سالّی (١٩٥٣)ز، سەرجەم کەسایەتیە لیبرالّەکانی دەولّەت درانە دادگا سەربازیەکان.

ئەو کەلێنەی کەلە نێوان گەلی ئێرانی بەوجۆرە ڕۆشنبیریە و ، دەستەلاّتدارانی ئێرانیداهەبوو، کە هەولّی دەدا سود لەسەرجەم ئەزموونە جیاوازەکانی ڕەوتی سیاسی ئێرانی وەربگرێت، بە بەشداری پێکردنیان لە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکاندا،بووە هۆی یارمەتیدان و درێژەدان بە بوونی داگیرکەر لە ئێراندا، لەسەر ئەو شێوازەی کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئیمپراتۆریەتی شاهەنشاهیدا هەبوو.

لەو ماوە هەستیارەی مێژووی ئێراندا، لەگەلّ بەرزبوونەوەی داواکاریەکانی بەجێ هێشتنی ئێران لەلایەن شاوە، ئینجا شای ئێران زانی دوای ئەوەی کارلەکار ترازابوو، کە بووەتە قوربانی پیلانگێڕیەکی گەورە، قوربانی جم وجولّ و دەست تێوەردانی هاوکاری هاوپەیمانەکانی (ئەنگلۆ –ئەمریکی) لەگەلّ ڕۆلّەکانی گەلەکەیدا....لەو نێوەندەدا تەنها یەك هیوا مابوو کە خۆی و تەختی شاهانەکەی پێ ڕزگار بکات، کە ئەویش بریتی بوو لە گەیاندنی بەرەی نیشتمانی بەدەستەلاّت، واتە ڕادەستکردنی ئەنجومەنی وەزیران بە پیاوانی (محمد مصدق)، لەو چوارچێوەیەشدا (شاپور بختیار) هات کە سەرکەشی کرد بە سەرکەشیەکی چارەنوس سازەوە، بە ڕازی بوون بە وەرگرتنی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.

بەلاّم،سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی کە لەنێوان ئەو شادا هەبوون، لە نیەتی باش بۆ بنیادنانی شانشینێکی دەستوری، بەلاّم بڕیاری ئەمریکاو بەریتانیا ڕوون بوو بۆ ڕوخاندنی سیستەمی پاشایەتی لە ئێران و دەستیانکردبوو بە جێ بەجێکردنی....بەو شێوەیە هاوپەیمانە ئەمریکیەکە دەستیکرد بە بە دەرکردنی چەند فەرمانێك بۆ دۆستە ئێرانیەکەی، بە مەبەستی بەجێ هێشتنی ولاّت، بۆ هەر شوێنێك کە خۆی هەلّی دەبژێرێت.

بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمانیەکی زۆرە، ئەوانەی کە شای ئێران خزمەتی کردن هەر لەیەکەم ڕۆژی وەرگرتنی دەستەڵاتەکەیەوە لە ساڵی (١٩٤٢)ز لەسەر حسابی بەرژەوەندی باڵای وڵات و گەلەکەی، ڕێگەیان نەدا کە مافی بەنابەری سیاسی وەربگرێت نە لە ئەمریکاو نە لە بەریتانیاو نە لە فەرەنساش، کاتێکیش کە مرد، نەی توانی تەنانەت پارچە زەویەك بە هێندەی ڕووبەری گۆڕەکەی لە زێدی خۆیدا بەدەست بهێنێت، تا جەستەکەی تێدا بنێژرێت.

دەکرێت ئەو وێنە تاریکە هەندێك شتی لێوە وەربگرین، بەوەی کە ململانێ ناوچەی و نێودەوڵەتیەکان لەیەك بچن و، ئامازەکان لە شوێن و کاتی ترو لەکاتی بوونی قەیرانی تردا دووبارە ببنەوە.

نموونەی ئێران دیارترین و نزیکترینە لە واقعی جوگرافی و مێژووی و کۆمەڵایەتی ئێمەوە، بانگمان دەکات بۆ تێڕوانین و خوێندنەوەی ئەو دەرئەنجام و پەندانەی کە دەتوانین بیکەین، وەك ئەو کۆمەڵگایەیی کە دەکەوێتە هەمان بارودۆخی داگیرکاری ترسناکەوە،بۆ ڕزگاربوون هاوپەیمانی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەو لایەنانەی کە خاوەنی تێگەیشتنی هاوبەش و دۆستایەتی نین، تەنها لە چوارچێوەی بەرژەوەندیەکانیاندا نەبێت.

**هەرچی تایبەتە بە هاوپەیمانێکی تری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بریتیە لە سەرۆکی فلیپین (فردیناند مارکۆس)** ئەوە کارەکە زۆر لەوە جیاواز نیە کە شای ئێرانی پێ ڕۆشت. لە وانەیە لە وردەکاریەکەدا جیاوازی هەبێت، بەڵام سیناریۆکە هەر هەمان سیناریۆ بوو! !

دوای دوو خولی سەرۆکایەتی پێویست بوو مارکۆس بڕوات و دەستەڵات ڕادەستی سەرۆکی نوێ بکات، بەڵام جیهانی سەرسامکرد بە ئەنجامدانی کودەتا بەسەر دەستورو هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ڕاگەیاندنی حوکمی سەربازی و گۆڕینی سیستەی وڵات بە ڕژێمێکی دیکتاتۆریانە بۆ ماوەی (٢٢) ساڵی ڕەبەق،ساڵانێکی پڕ لە ستەم و زۆرداری تالانکردن و گەندەڵی.

ساڵی (١٩٦٥)ز مارکۆس وەك سەرۆك كۆمار هەڵبژێردرا، لە ساڵی (١٩٧٢)ز حکومی سەربازی ڕاگەیاند و ئازادی ڕۆژنامەگەری هەڵوەشاندەوە. هەرچی دەربارەی گەشەی ئابوریەوە هەیە، ئەوە بە پارەی قەرزی بیانی دەکراو ژمارەیەکی زۆریش لەو قەرزانەی خستبووە سەر ژمارە حسابی تایبەتی خۆی.

مارکۆس لە مانگی یەنایەری ساڵی (١٩٧٣)ز دەستورێکی نوێ ی ڕاگەیاند و خۆی کردە سەرۆکی وڵات، هەرچی هاوسەرەکەشی بوو (ئیمیلدا) لە ساڵی (١٩٧٨)ز دەستەڵاتێکی فراوانی بەدەست هێنا، و بووە سەرپەرشتیاری پلاندانان و گەشەپێدانی وڵات، دوای ئەمەش گەندەڵی سیاسی زیادی کردوو وڵاتی تەنیەوە.

لە ساڵی (١٩٨١)ز دەستەڵاتی سەربازی هەڵگرت، بەڵام مارکۆس هەر دەستەڵاتێکی گەورەی مایەوەو پارێزگاری لێکرد، لە ژێر سایەیی یاسای (نائاسای)دا گە دەیگووت وڵات پێویستی پێی هەیە، بۆ دژایەتی کردنی موسڵمان و شیوعیەکان، لە مانگی یونیوی هەمان ساڵدا جارێکی تر بۆ ماوەی شەش ساڵی تر بە سەرۆکی وڵات هەڵبژێردرایەوە.

لە ساڵی (١٩٨٣)ز سەرکردەی دیاری ئۆپۆزیۆنی (بینجنۆ ئەکینۆ()ی لە نێو هێزێکی زۆری حکومیدا، لە نێو فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی (مانیلا)دا تیرۆر کرد، ئەوەش بووە هۆی هەڵگیرسانی ئاگرێکی زۆری خۆپیشاندان، کە داوای دەستلەکارکێشانەوەی مارکۆسیان دەکرد.

ڕوداوەکەی مانێلا دەیان هەزار کەسی خستە سەر شەقامەکان، بۆ ناشتنی تەرمەکەی سیناتۆر(ئەکینۆ). ..بە خێرای ڕێورەسمی ناشتنەکەی گۆڕا بە خۆپیشاندانێکی بەرفراوان، جەماوەری تورە بۆ یەکەمجار دروشمی ڕوخانی مارکۆس و ڕژێمە فاشستیەکەیان بەرزکردەوە، جەماوەری خۆپیشاندەر دڵنیابوون لە بەرپرسیاریەتی مارکۆس لە کردەی تیرۆر کردنەکە.

ئەوە یەکەم ڕوداوی تیرۆری سیاسی نەبوو بەرامبەر ئۆپۆزیۆن ئەنجام بدرێت لەو وڵاتەدا لەلایەنە دەستەڵاتدارانەوە، هەر لەو ساتەوە لە ساڵی (١٩٧٢)ز کاتێك مارکۆس پەرلەمان و پارتە سیاسیەکانی هەڵوەشاندەوە و حوکمی سەربازی چەسپاند، و

قەدەغەکردنی هاتوچۆی لە مانیلای پایتەخت ڕاگەیاند، ڕۆژ بە ڕۆژ کردەکانی لەناوبردنی سەرانی ئۆپۆزیۆن لە پەرەسەندندا بوو.

ڕاپۆرتەکانی دەزگاکانی ئاسایش، کوژرانی ئەو قوربانیانەیان دەدایە پاڵ ڕووداوی لابەلا، یان دەیاخستە پاڵ دەرئەنجامی ململانێ و ناکۆکە ناوچەییەکانی نێوان بنەماڵەکان.

بەلام تیرۆرکردنی (ئەکینۆ) لە ڕۆژی نیوەڕۆ لە بەردەم کامێرای وێنەگران و ڕۆژنامەنوسان و ژمارەیەك لە لایەنگریدا بوو، کە ڕۆشت بوونە فرۆکەخانە تا پێشوازی لێبکەن لە ڕۆژی گەڕانەوەیدا بۆ نیشتیمان. ...بۆیە دەزگاکانی ئاسایش و پۆلیس توانای ئەوەیان نەبوو ڕاستیەکە بشارنەوە، بۆیە دەنگی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات بە خێرای بەرز بوویەوە، بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی خێراو ورد لە ڕوداوی تیرۆرکردنەکە، لەو نێوەشدا پەنجەی تۆمەت بۆ لایەنگرانی سەرۆك مارکۆس درێژ دەکرا لە هێزە چەکدارەکان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە کۆنگرێسی ئەمریکی داوای لێکۆڵینەوەیەکی خێراو سەربەخۆ بکات. ...بە تایبەتی ئەکینۆ وەك سەرۆکی ئۆپۆزیۆنی فلیپینی لە کۆنگریسی ئەمریکی میوانداری کرابوو، بۆ گوێگرتن لە زانینی ڕای ئەو لە ئاییندەی پەیوەندیەکانی فلیپین و ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا. ئەمریکیەکان نیگەران بوون بەرامبەر بنکە سەربازیەکانیان لە فلیپین، لە کاتی ئەگەری کەوتنی مارکۆس و دەستگرتنی شیوعیەکان بەسەر دەستەلاتدا...بۆیە ئەمریکیەکان بەدوای جێگرەوەیەکدا دەگەڕان، دوای ئەوەی بڕیاریاندا کە مارکۆسی هاوپەیمانی مێژوویان بفرۆشن.

**ئەمانەی خوارەوە کورتکراوەی خاڵە بنەڕەتیەکانی گوتارەکەی (ئەکینۆ)یە کە لەبەردەم کۆنگرێسی ئەمریکیدا خوێندیەوە، کە تیایدا هێرشیکردە سەر (مارکۆس)ی هاوپەیمانەکەی ئەمریکاو هەموو ئەو تاوانانەی کە ئەمریکا سودی**

**لێوەرگرت بوون، دوای ئەوەی کە واشنتۆن بڕیاریدا هاوپەیمانەکەی بفرۆشێت و (ئەکینۆ ) وەك جێگرەوەیەکی ئامادە بکات :**

– فلیپین بە قەیرانێکی سیاسی و ئابوری مەترسیداردا تێپەڕ دەبێت. ..سەرکوتکردنی ئەمنی، هەڵسوکەوتی زاڵە بەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ ئۆپۆزیۆنی نیشتیمانیدا.

– گەندەڵی بڵاوبووەتەوەو گەیشتۆتە بەرزترین پلەی سەرکردایەتی لە ولأتدا.

– خراپ ئیدارەدان لە ئابوری و سیاسەتدا،لەگەڵ سەرکوت کردنی ئەمنی، بووەتە هۆی ئەوەی کە پاڵ بە فلیپینیەکانەوە بنێت بەروە ئۆپۆزیۆن بوون بڕۆن، بەتایبەتی ئۆپۆزیۆنی چەکداری.

– حکومەت بە شێوەیەکی خراپ، لە چوارچێوەیەکی فراواندا سوپا بەکاردەهێنێت، لە سەرکێشی سەربازی دۆڕاودا بەکاری دەهێنێت دژی چەکدارە توندڕەوە شیوعیەکان، کە دەستیان بەسەر سێ یەکی زەویەکانی باکوری فلیپیندا گرتووە،هەروەها لە دژی موسڵمانەکان کە دەستیان بەسەر ناوچەکانی باشوری ولأتدا گرتووە، ئەو یاخی بوونە فراوانە بەو شێوەیە ڕووی نەدەدا، ئەگەر تێڕوانینێکی سیاسی ڕاست لە دەست نەچووایە بۆ ئەو ڕژێمە دەستەڵاتدارە ستەمکارەی کە شەرعیەتی لەدەستداوە.

ئەکینۆ گوتارەکەی بەو ڕاستیە کۆتای پێهێنا کە مارکۆس بە هەڵسوکەوتە کەللە ڕەقیەکەی دروستیکرد، بە داخستنی دەرگا لەسەر گواستنەوەی ئاشتیانەی دەستەڵات. ..گوتی ئەو بەوە یاخی بووە کە :دەستەڵاتێکی فراوانی هەیەو دەستی گرتووە بەسەر دەستەڵاتەکانی یاسادانان و ڕاگەیاندن و مامەڵە بە بەشێکی زۆری سامانی ولأتەوە دەکات. ..کە هەموو ئەمانە پاڵپشتیەکی زۆری سەربازی و سیاسی دەکرێت، لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە.

مارکۆس ئێستا نزیك بووەتەوە لە تەمەنی حەفتا ساڵی، و بەدەست نەخۆشی ترسناکەوە دەناڵێنێت، ئەوەی دەستەڵاتی ڕاستەقینەی بەدەستەوەیە هاوسەرەکەی

(ئیمیلدا)و ژمارەیەك سەرکردەی سەربازی و تیمێکی تەکنۆکراتی لایەنگری بنەماڵی (مارکۆس)ن. ..ململانێیەکی شاراوەش سەری هەڵداوە لە نێوانیاندا لەسەر جێگرەوەی ماکۆس....سوپاش سەرکەوتوو بووە لە دەستگرتن بەسەر دەستەلاتدا، تا وڵات بەرەو توندوتیژی و بێ سەروبەری زیاتر بەرێت.

ئەکینۆ وای دەبینێت کە تاکە جێگرەوەی هەموو ئەمانە بریتیە لە:مصالحەی نیشتمانی، کە سەرکردەکانی بزوتنەوەی بەرهەڵسکاری میانڕەو لە مانگی (یونیۆی ساڵی ١٩٨٣)ز لەسەر پرەنسیپ و هەنگاوەکانی ڕێکەوت بوون. کە دواتر هەوڵیاندا لای سەرکردەکانی ئۆپۆزیۆنی چەکدار، هەلێکی کۆتای بدەن بە پرۆسەی دیموکراسی و داوایان لە مارکۆس کرد کە لێبوردنی گشتی دەربکات، بۆ سەرجەم یاخی بووە سیاسیەکان و یاسای باری نائاسای و سەرجەم ئەو یاساو ڕێوشوێنە تایبەتانە لابەرێت و واز لە فشارخستنە سەر پارتە سیاسیەکان بهێنێت و دەستێوەردانی سەربازی لە کاروباری مەدەنیدا بوەستێنێت.

ئەکینۆ دڵنیای خۆی پیشاندا،کە ئەگەر ڕژێم لەسەر ئەو هەڵوێستە توندەی بەردەوام بێت، ئەوە شۆڕش ئایندەی مەحاڵ نیەوباجەکەشی قورس دەبێت....شۆڕش بە خوێن و قوربانی و کارەسات نەبێت دروست نابێت، لەو کاتەشدا سەرکەوتوو تێك شکاو نیە، بە ڵکو هەمووان تێکشکاون لە نیشتمانێکی تێکشکاودا.

ئەکینۆ هیچ میمبەرێکی نەدەبینی بۆ بانگەوازەکەیی و بۆ جێ بەجێکردنی پرۆژەی مصالحەی نیشتمانی و ڕازیکردنی مارکۆس بە وازهێنان لە دەستەلات بۆ حکومەتێکی هاوپەیمانی نیشتمانی، کە سەرپەرشتی هەڵبژاردنێکی ئازاد بکات. لە بەرامبەردا مارکۆس و دەست و پەیوەندەکەی دیدگایەکی تریان هەبوو بۆ چاکسازی و مەصالحەی نیشتمانی، کە بریتی بوو لە کوشتنی پەیامبەرەکە پێش ئەوەی دەست بکات بە ڕاگەیاندنی پەیامەکەی. ..بۆیە بەو شێوەیە دایانە بەردەست ڕێژی گوللەو کوشتیان، کاتێك لە فڕۆکەکە دابەزی لە فڕۆکەخانەی ماندێلا.

لەلێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان ئەوە ڕوون بوویەوە کە (٣) لە ئەفسەرانی هەواڵگری سەربە ژەنەڕاڵ (فابیان) لە بۆسەدا بوون بۆی لە فڕۆکەخانەکەدا، ئەوانە لەکاتی هات وهاوارو شپرزەی ڕوداوەکەدا پاش تەقەکردنەکەو کوژرانی (ئەکینۆ) بە تەواوی دیار نەمابوون و شاردرابوونەوە.

مارکۆس بە خێرای دادگایەکی تایبەتی دروستکرد بۆ لێکۆڵینەوە، لێکۆڵینەوەکان لیژنەی یەکەم و هێزە چەکدارەکانی بێ تاوانکرد لە ڕشتنی خوێنی ئەکینۆ و خستیە سەر کەسێکی ناتەواو لەرووی دەرونیەوە (عەقڵیەوە) کە سەر بە بزوتنەوە چەپڕەوی شیوعی بوو.

لە مانگی فەبرایەری ساڵی (١٩٨٦)ز مارکۆس سەرکەوتنی خۆی بەسەر (کورازون ئەکینۆ)ی بێوەژنی سەرکردەی کوژراوی ئۆپۆزیۆن ڕاگەیاند، لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی وڵاتدا، دوای هەڵمەتێکی هەڵبژاردنی گەرم لە نێوانیاندا، دوای ئەمە دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویەوە کە گوایا مارکۆس ساختەکاریەکی زۆری کردووە، بۆیە مارکۆس لەبەرامبەر ئەمەدا باری نائاسای لە وڵاتدا ڕاگەیاند،رکەبەرەکەشی خاتوو (کورازون) پەنای بردە بەر هێزی گەل و بووە هۆی ڕاکردنی مارکۆس لە وڵات لە بەرواری (٢٤ فەبرایەری ساڵی ١٩٨٦) ز، دوای ئەمە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وژمارەیەکی زۆریش لە دەوڵەتانی تر، دانیان بەوەدانا کە خاتوو (کورازون) سەرۆك كۆماری شەرعی فلیپینە، بەبێ ئەوەی نەپرس بە مارکۆسی دۆستیان و نەکەسیی تریش بکەن.

+ **هەمان شتیش ڕویدا لەگەڵ سەرۆکی جۆرجیا** (یەکێك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو). ئیدوارد شیفاردنادزە سەرۆکی جۆرجیا خەونی دەبینی بەوەی کە بچێتە نێو پەیمانی باکوری ئەتڵەسی و، بۆ ئەو مەبەستە سەردانی واشنتۆنی کرد و بۆخۆی داوای بوونی سەربازی ئەمریکی کرد لە وڵاتەکەیدا، هەر بۆخۆشی یەکێك بوو لەوانەی کە پشکی هەبوو لەگەڵ سەرۆکی سۆڤیەتی (میخائیل) لە بەریەك

هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆیەتی سۆڤیەتی لەسەر حسابی ئەمریکیەکان، لە ژێر دروشمی ئازادی و دیموکراسی.

ئیدوارد بۆخۆی ڕێگەیدا بە تیمێکی ئەمریکی، کە پێکهات بوون لە دەیان شارەزای سەربازی ئەمریکی، بۆ سەردانیکردنی وڵاتەکەی، بۆ تاوتوێکردن و باسکردنی کردنەوەی بنکەی ڕاهێنانی سەربازی، وەك پەردەیەك بۆ کردنەوەی بنکەی سەربازە ئەمریکی هەمیشەی لەسەر خاکی وڵاتەکەی.

دواتر ڕوداوەکانی کۆماری جۆرجیا هاتن کە ناسران بە شۆڕشی گوڵەکان و کۆتاییان هێنا بە دەسەڵاتی هاوپەیمانەکەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا(ئیدوارد) وهاوپەیمانێکی نوێ جێگەی گرتەوە بەناوی (میخائیل ساکاشڤیلی)،واشنتۆن دانی پێداناو ئیدواردی کۆنە دۆست و هاوپەیمانی فرۆشت، دوای ئەوەی کە زانی میخائیل دەتوانێت هەمان ڕۆڵی بۆ بگێڕێت.

ئۆپۆزیۆنی دیموکراتی لە جۆرجیا وانەیەکی قوڵی بە گەلانی جیهانی سێهەم و پارتە سیاسیەکانیدا،کاتێك سەرۆك ئیدواردی ناچار بەدەست لەکارکێشانەوەو شارش لەسەر دەسەڵاتکرد، بەبێ ڕژانی یەك دڵۆپ خوێن و تاڵانکردنی دامەزراوەیەکی گشتی و تایبەتی.

هەردوو دەزگای ئاسایش و سەربازی لایەنگریەکی تەواویان بۆ گەل تۆمارکرد، بە هەڵوێستی بێلایەنیان، سەرەڕای داواکاریەکانی سەرۆك ئیدوارد بە یارمەتیدان و دەستێ وەردانیان.

سەرکردەکان لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا دێن و دەڕۆن، بەڵام ئەوەی کە دەمێنێتەوە گەلە، کە تاکە سەرچاوەی دەسەڵاتە.سەرۆك ئیدوارد لە کۆتای ڕێگەکەدا ناچاربوو بە تەواوەتی ملبدات بۆ داواکاری و خواستەکانی گەل، وەك سوکارنۆ لە ئیندۆنیسیاو، مارکۆس لە فلیپین و، محمد ڕەزا شا لە ئێران و زۆرێکی تر لە دەستەڵاتدارانی دونیا کە گەلەکانیان ناچار بە ڕۆشتنایان کردن؟ !



پادشای ئێران و کارتر و پاشا حسین کۆتا چاوپێکەوتنی فەرمی لەگەڵ سەرۆکی ئەمەریکی پێش رووخانی شا ! !



کارتەر و هاوسەرەکەی روزالین و شا و هاوسەرەکەی لە واشنتۆن



شا و هاوسەرەکەی شابانۆ نەیان زانی کە گرەو کردن لەسەر ئەمەریکیەکان دۆڕانە ! !



شۆڕشی ئێرانی شای تێك شکاند , هاوپەیمانە ئەمەریکیەکانی نەیان توانی رزگاری بکەن ! !

صدام حسین بە هاتنی ئەمریکیەکان و داگیرکردنی بغداد لە ساڵی (٢٠٠٣)ز کۆتای نەهات،بەڵکو ئەو بە شێوەی کردەی لە داگیرکردنی کوێتی دراوسێیدا کەوت، هەموو ئەو شتانەی کەلە نێوان ئەو دوو ڕوداوەدا گوزەران، تەنها کردەی درێژکردنەوەی کۆتای ئەو بوون.

کاتێك صدام فەرمانیدا بە جوڵانی هێزەکانی، دوای جەنگێکی وێرانکەر لەگەڵ ئێراندا، بە ئاڕاستەی کوێت یەکێك لە گەورەترین هەڵەکانی ئەنجامدا لە ژیانیدا.

صدام حسێن و ڕژێم و دەستەلآتەکەی، سەرجەمیان کەوتن و خۆشی لە سێدارەدرا، لەسەر دەستی هاوپەیمانە کۆنەکانی (ئەمریکیەکان)،هەموو ئەمانە دەکرا بەسەریدا تێپەڕێت، ئەگەر نەکەوتایەتە هەڵە مێژوویە گەورەکەوە کە داگیرکردنی کوێتی دراوسێی بوو.

قۆناغی شێوانی ڕاستەقینەی، یارمەتی دەربوو لە دروستکردنی ڕژێمێکی دوژمنکاری کەلە خەیاڵێکی گەورەی دوژمنکاریدا دەژیا، کە وای بۆ دەچوو لە چوارچێوەی دەستگرتنی بەسەر کوێتدا، تەنها گەڕانێکی سەربازی خێرایە.

دەڵێن:نزیکەی بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر کاتێك هێزەکانی عێراق چوونە نێو کوێت، بووە هۆی دروست بوونی گرکانێك کە لە جیهانی عەرەبیدا تەقیەوە.

سوپای ئەمریکی و هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانی دەستیانکرد بە جوڵە بەرەو ناوچەی کەنداو، وەك ئامادەکاریەك بۆ ڕزگارکردنی کوەیت، ئەمەش بە شێوەی کرداری لە سەرەتاکانی ساڵی (١٩٩١)ز ڕویدا، لە و کردەی ئازادکردنەدا (٩٠)هەزار سەربازی عێراقی بە دیل گیران و پاشماوەکانی تری سوپای عێراقیش گەڕانەوە، یاخود کوژران لە گەورەترین هەلمەتی سەربازیدا کە گۆی زەوی بە خۆیەوە بینیی بێتی لە مێژووی خۆیدا.

(٢)مانگی اغستس گەورەترین نەهامەتی عەرەب بوو، پاش نەهامەتی ساڵی (١٩٤٨)ز، نەهامەتی ساڵی(١٩٦٧)ز، نەهامەتی داگیرکردنی لوبنان لە ساڵی (١٩٨٢)ز. لەو ڕۆژەدا هەموو هیواکانی یەکێتی عەرەبی لەناوچوون، جیهانی عەرەبی دابەش بوو بەسەر دەوڵەتی (لەگەڵ )و دەوڵەتی (دژ)، کێ پارمەتی صدام دەدات لە دوژمنکاریەکەی لە دژی کوێت و،کێ لە دژی دەوەستێتەوە و ئەوە ڕەد دەکاتەوە کە پیلانە شەیتانیەکەی جێ بەجێ بکات، هەروەها لە شوێنەوارە خراپەکانی تری ئەو داگیرکاریە، پەیدا بوونی سەربازو سوپای ئەمریکی بوو لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدابە شێوەیەکی چڕ.

کاتێك هەریەکە لە ئێران و عێراق کۆتای هاتنی شەڕیان بە شێوەیەکی فەرمی ڕاگەیاند، کە بۆ ماوەی هەشت ساڵ درێژەی کێشا بوو، بەلآم لە ڕاستیدا بۆ گەلی عێراق جەنگ بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی کۆتای نەهات بوو، تەنانەت دوای گەڕانەوەی ڕۆڵەکانیشی لە بەرەکانی جەنگ، جەنگ بووبوویە تارمایەك کە ژیانی عێراقیەکانی بەسەرجەم وردەکاریەکانیەوە ڕاودەنا، لەگەڵ لێدانی دەهۆڵەکانی دەست پێکردنیدا،چەند نەوەیەك لەو گەلە پێگەیشتن، نەوەیەك کە هاوچەرخی جەنگەکە بوو لەو کاتەی کە دەستی پێکرد ئەوان لە قۆناغی منداڵیدا بوون و چوونە قۆناغی لاویەتیەوە، بە هۆی درێژە کێشانی ماوەی جەنگەکەوە، جەنگێك کە هەزاران لەو نەوەیەیی خستە نێو گۆڕەوە دوای ئەوەی کە تەمەنیان گەیشتە ئاستی ئەوەی کە بانگ بکرین بۆ خزمەتی سەربازی، نەوەیەك کە لەگەڵ لەدایك بوونی جەنگدا ئەوانیش لە دایك بوون و گەیشتنە ئاستی هەستکردن بە هەواڵەکانی جەنگ، ئەوە لە بیر ناکرێت کە سەدان هەزار کەس لەوانیش، بە هەتیوی و بێ باوکی چاویان بە ژیان هەڵهێنا،دوای ئەوەی باوکیان لەبەرەکانی جەنگدا تیاچوو بوون، لەبەر ئەمانە خەڵکی باوەڕیان نەدەکرد کە جەنگ بۆ ئەوان کۆتای هاتبێت هەرچەندە ڕۆڵەکانیشیان لەبەرەکانی جەنگ گەڕابنەوە ! !

بەلآم لەڕاستیدا، خەڵکی نەیدەزانی کە وەستانی جەنگەکەش تەنها بۆ ماوەی چەند هەناسەدانێکە،نەك بۆ بوونی کاتی پێویست بۆ بنیادنانەوەی ئەوەی کە جەنگ وێرانی

کردبوو، لەو وێرانکاریەیی کە جەنگ نابوویەوە لە ژێرخانی ئابووری و دەرونی تاکی عێراقیدا.

جارێکی تر سەر لەنوێ دەهۆڵی جەنگێکی تر لێدرایەوە، ئەم جارەیان کەس چاوەڕێ ی ئەوی نەدەکرد و بە دڵی هیچ عەرەب و موسڵمانێکدا نەدەهات، کێ گومانی دەکرد کە عێراق کوێتی هاوڕێ و دۆست و دراوسێ ی داگیربکات ، کە لە خۆشترین و شەخترین کاتەکاندا لەگەڵ عێراق و عێراقیەکاندا بووە.

لە (٢ اغستسی ساڵی ١٩٩٠)ز کارەساتەکە ڕویدا، ئەمجارەیان نەك تەنها لەسەر عێراقیەکان بە تەنها،بەڵکو لەسەر هەموو عەرەب و موسڵمانان و تواناکانی ئومەت و ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیش بە تەواوی.

ڕۆژێك پێش ئەوە، باڵوێزی ئەمریکی لە بغداد ئەو تەڵەیەیی نایەوە کە صدام حسێنی تێکەوت،بە قۆستنەوەی ئەوەی کە صدامی پێناسرابوو لە هەڵەشەی و هەلپەرستی و تەماعکاری.

چاوپێکەوتنی کۆتای ئەو و صدام حسێن زەنگی هەواڵێکی خراپ و شومی لێدا،بە باسکردن لە نرخی نەوت و کێڵگەی نەوتی ڕومێلە.باڵوێزی ئەمریکا ژیرانە پاڵی پێوەنا بۆ بەقەیراناوی کردنی بارودۆخەکە، لە نێو ئەو دراوانەی کە ئامادەی کردبوو بۆ ئەنجامدانی هەڵەو سەرکەشیەکی بێ عەقلانە بۆ سڕینەوەی دەوڵەت لە نەخشەی جوگرافی و سیاسیدا،دوای دوو ساڵ لە کۆتای هاتنی جەنگێکی بێ ئەنجام کە هەشت ساڵی ڕەبەقی خایاند بوو.

بەم شێوەیە صدام حسێن دوای حەڤدە ساڵ گوررزێگی کوشندەی کێشا بە یەکێتی عەرەبیدا،کە خۆی دروشمەکەی بەرز کردبوویەوە، کاتێك کوێتی داگیرکرد،نەك گوررزێکی کوشندە بەڵکو کوشتی، کوشتی بە داگیرکردنی کوێت، بەڵکو لەبەر یەك هەڵیوەشاندەوە، ئەوەش بوویە ناونیشانی فراوان دوای ڕوداوەکانی (٢)مانگی اغستسی ساڵی (١٩٩٠)ز، وڵاتی دوو ڕووبار بوویە وێستگەی یەکەم بۆ ئەزموونکردن و تاقیکردنەوەی دەوڵەتی تائیفی و خێڵەکی و دواکەوتوو لەسەر شێوازی و نەفامی ونەزانی کۆن.

تا ئەندازەی ئەو هەڵە کارەساتبارە دەرخەین کە صدام حسێن ئەنجامیدا، بە داگیرکردنی کوێت کە بە هۆیەوە دوا بزماری لە تابوتی ژیانی خۆیدا و بووە هۆی ڕوخاندنی ڕژێمەکەی لەلایەن هاوپەیمانە کۆنەکەیەوە (ئەمریکیەکان)، دوای ئەوەی کە جەنگیان لەدژی بەرپاکردو توانیان دەستگیری بکەن و پاشدادگایکردنی لە سێدارەشی بدەن.

تا ئەوەمان بە تەواوی بۆ ڕوون ببێتەوە،پێویستە بوەستین لەسەر ئەو بارودۆخەو دیاردانەی کە پێش هێرشەکەی صدام هەبوون، بۆ هێرشکردنە سەر دەوڵەتێك کە گریمان عەرەب و موسڵمان و دۆستەو ئەندامە لە کۆمکاری عەرەبیدا، کە ئەوانە بەسن بۆ ناشەرعی بوونی ئەو تاوانەی گەورەیەیی صدام، ئەگەر چاویش بپۆشین لە هەموو ئەو شتانەی تر! !

بە گەڕانەوە بۆ ماوەی پێش جەنگەکە، دەبینین صدام حسێن عێراقی لە جەنگێکی وێرانکەر لەگەڵ ئێرانی دراوسێیدا دەرهێنا، کە بە هۆیەوە گەلانی عێراقی لە بنەوە هەژاندو تێکیدان، بە بارودۆخێکی ئابوری زۆر خراپ، کە سەرجەم یەدەکی دراوی نەختینەی و زێڕی وڵاتی بەهەدەردا کە زیاتر لە (٣٦) ملیار دۆلار دەبوو، لەگەڵ هەموو داهاتی نەوت لە ماوەی جەنگەکەدا کە بە بەهای (٢٠) ملیار دۆلاری ساڵانە مەزندە دەکرا،لەسەروی هەموو ئەمانەشەوە عێراق بە قەرزێکی ئێجگار زۆرەوە لە جەنگەکە هاتە دەرەوە، قەرزی هەریەکە لە وڵاتانی (کوێت،سعودیە،فەرەنسا،یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو،بەرازیل،)و چەند دەوڵەتێکی تریش کە کۆی قەرزەکانی لە (٩٠)ملیار دۆلاری ئەمریکی تێپەڕی کرد بوو. عێراق پابەند بوو بە دانی سودێکی زۆری بە شێك لەو قەرزانە کە دەگەیشتە نزیکەی (٪٣٠) ئەو قەرزانە، بە بەهای (٧) ملیار دۆلاری ساڵانە، ئەمە سەرەڕای داواکاری ئێران بە دانی قەرەبووی جەنگی، دوای ئەوەی کە لیژنەیەکی تایبەتی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانی بڕیاریدا کە عێراق دەستدرێژی کردۆتە سەر ئێران، ئێرانیش لە پای ئەو دەستدرێژیەوە زیانەکانی جەنگی داوای (١٦٠) ملیار دۆلاری قەرەبووی دەکرد.

بەو شێوەیە ئەو قەرزانە بارێکی گرانیان دروستکرد لەسەر شانی ئابوری عێراق، و بووە هۆی ئەوەی کە زۆرینەی پرۆژەکانی پەرەپێدانی ولآت بوەستێنرێن،ئەمە سەرەڕای ئەو تێچوونەی کە نۆژەنکردنەوەو بنیادنانەوەی ژێرخانی ئابوری عێراق دەیخواست، ئەو ژێرخانەی کە جەنگ وێرانی کردبوو.

+راپۆرتەکانی دوای جەنگەکە کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە باری ئابوری عێراق بەم شێوەیەیی خوارەوە بووە:

– باری ئابوری هەڵگری مژدەیەکی خۆش نەبوو،یەدەکی دراوی قورس لە ساڵی(١٩٨٨) گەیشت بووە (٢٥) ملیار دۆلار. ژێرخانی ئابوری عێراق لە ساڵەکانی حەفتاکاندا گەشەی کردبوو،و دواتر بارێکی ئابوری خراپ جێگەی گرتەوە و تێکچونێکی خراپ سەرجەم بەشەکانی ولآتی گرتەوە، بارودۆخی ئابوری ڕۆژ بە ڕۆژ لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەگۆڕا لە دەرئەنجامی سیاسەتە شکست خواردووەکانی صدام حسێندا.

وەك هەلێك بۆ دەرچوون لەو قەیرانە ئابوریەیی کە ولآتی پێدا تێپەڕدەبو و لە ژێر ڕۆشنای ئەوەی کە دەزانرێت لە کەسایەتی ئەو دەگەینە ئەم ڕاستیەی خوارەوە :

عێراق پاش جەنگی ئێران خاوەنی هێزێکی زۆر بوو، بەلآم لە هەمان کاتدا بەدەست ئابوریەکی ڕوخاو قەرزێکی زۆر قورسەوە دەینالآند،دراوسێکانیشی ولآتانێکی لاواز بوون لە ڕووی سەربازیەوە، بەلآم دەوڵەمەند بە ماڵ و سامان، سامانەکەیان خاوەن دەستەلآتەکانی توشی سەرکەشی کرد، بە تایبەتی ولآتێکی وەك عێراق، کە ڕژێمێکی دیکتاتۆری فەرمانڕەوایەتی دەکرد بە سەرکردایەتی صدام حسێنی دیکتاتۆر.

ئەو پیاوە توشی سەرکەشی و لەخۆبایی بوونێکی ئیجگار گەورە بوو بوو کە سنوری بۆ نەبوو.دوای تەواو بوونی جەنگەکەی لەگەڵ ئێران و بوونی سوپایەکی بێ شومار و جبەخانەیەکی زۆری چەکی کلاسیکی و کارگەی چەکی پێشکەوتوو، بەلآم لە هەمانکاتدا نەبوونی پارەو سامان بۆ دانەوەی قەرزەکانی و ئەوەی کە جەنگ وێرانی کردبوو لە ژێرخانی ئابووری ولآت و درێژەدان بە سوپاکەی و پڕچەککردنی بەردەوامی و ئەو

پارانەی کە پێویست بوون بۆ دەستپێکردنەوەی پرۆژەکانی گەشەپێدانی ولآت کە لە ماوەی جەنگەکەدا وەستێنرابوون.

بەبێ گومان ئەو بارە ئابوریە سەختەی کە صدام حسێن دروستی کردبوو، لە دەرئەنجامی هەڵەشەو هەڵچوونەکانی بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی، بە دروستکردنی جەنگ لەگەڵ ئێران،کەوا گومانی دەبرد چەند هەفتەیەك، یان چەند مانگێك دەخایەنێت لە درێژترین ماوەیدا، بەلآم ئیمپریالیزمی جیهانی دەیویست چەند ساڵێك بخایەنێت و بەردەوام جەنگی پێبکەن، بۆیە جارێك یارمەتی صدامیان دەدات، جارێکیش یارمەتی ئێران.

ئەو ڕاستیەش (هنری کیسنجەر) جەختی لەسەر دەکاتەوە لە یاداشتەکانیدا کاتێك باس لەو جەنگە دەکات و دەڵێت: (ئێمە دەمانویست چەند دەکرێت ئەو جەنگە درێژبکەینەوە،و کەس بەسەرکەوتووی تیایدا دەرنەچێت) بەو شێوەیەش لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویست بوو کە یارمەتی هەردوولای جەنگەکە بدات، تا ئاگری جەنگەکە بەردەوام بێت لە نێوانیاندا، کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی نیو ملیۆن کەس لە باشترین گەنجەکانی عێراق و پەیدابوونی دەیان هەزار بێوەژن و مردنی سەدان هەزار منداڵی عێراقی و سوتانی دڵی دایك و باوکیان.

بە هۆی ئەو بارودۆخە ئابوریە سەختەوە کە جەنگی عێراق —ئێران هۆکاری دروستکردنەکەی بوو، وای لە صدام حسێن کرد بیر لە بەدەست هێنانی ماڵ ودارای نوێ بکاتەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی عێراق لە جەنگەکەدا،بە هەموو عەقڵیەتێکی نەزانی خۆشیەوە بیری لە پرۆژەی داگیرکردنی کوەێت و خستنە پاڵ عێراقی کردەوە. واگومانی دەبرد کە بەوە دوو ئامانجی گەورە دەستەبەر دەکات:یەکەمیان دەستگرتن بەسەر ڕێژەیەکی زۆری سامانی نەوت، ئامانجی دووەمیش بریتی بوو لە دەستخستنی ڕوبەرێکی فراوانی کەنداو کە دەتوانێت لە ڕێگەیەوە بە ئاسانی نەوتەکەی هاناردەی دەرەوە بکات، ئەمە سەرەڕای فراوان بوونی ڕێگەکانی بازرگانی عێراق لە و ڕێگەیەوە.

بەو شێوەیە صدام حسێن دەستیکرد بە دروستکردنی ناکۆکی و کێشە لەگەڵ حکومەتی کوێتی و تۆمەتباریکرد بە کارکردن بۆ دابەزاندنی نرخی نەوت لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی نەوتی زیاترەوە، کە بوەتە هۆی زیان گەیاندنێکی گەورە بە ئابوری عێراق کە خۆی لە بنەڕەتدا توشی ئیفلیجی و داتەپین بوو بوو. ،هەروەها دوای لە حکومەتی کوێتی کرد کە لە قەرزەکانی سەر عێراق خۆش بێت کە زیاتر لە (١٠) ملیار دۆلاری ئەمریکی دەبوون، لە بەرامبەردا حکومەتی کوێتی ئەو تۆمەتانەی ڕەدکردەوە و ئەوەشی ڕەدکردەوە کە لە قەرزەکانی خۆی خۆش بێت و داوای دیاریکردنی سنوری نێوان هەردوو دەوڵەتی لە حکومەتی عێراقی کرد.

پەیوەندیەکانی نێوان عێراق و کوێت ڕێچکەیەکی مەترسیداریان وەرگرت، کوێت سوربوو لەسەر هەڵوێستەکانی خۆی، صدامیش فشارەکانی بەردەوام بوون و زیادیشی کردن بە هەڕەشەکانی، لە چوارچێوەی پلانێکی تاوانکاری بۆ دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامانی کوێت لە ڕێگەی هێزی سەربازیەوە.

هەریەکە لە لە وڵاتانی شانشینی عەرەبی سعودی و ئەردەن هەوڵی نێوەندگیریاندا لە نێوان هەردوو لایاندا،بەڵام ئەو هەوڵانە هیچ جۆرە بەرهەمێکیان نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە شتی نوێ دەرخست دەربارەی ڕووداوەکان. صدام باسی لە پارێزگاریکردنی خۆی کرد لە ناوچەی کەنداو بە جەنگی لەگەڵ ئێراندا بە درێژای هەشت ساڵ و ئەو باجە گەورەی کە دابووی لەو پێناوەدا،بەڵام کوێت ئەوەی ڕەدکردەوەو ڕایگەیاند کە ئەو یارمەتی عێراقی داوە لە جەنگەکەیدا، بە شێوەیەك کە پاش چەند هەفتەیەك لە دەستپێکردنی جەنگەکە قەرزێکی (٥) ملیار دۆلاری داوەتێ، هەروەها لەسەر حسابی عێراقی ڕۆژانە (١٢٥) هەزار بەرمیل نەوتی هەناردەی بازاڕەکانی جیهان کردووە، وەك وەفایەك بۆ پابەندبوونە دارایەکانی عێراق کە لەگەڵ دەوڵەتەکانی تردا بەڵێنی لەسەر هەبوو، بەمەبەستی پرچەککردنی.

لەبەرامبەردا صدام حسێن وەڵامی دایەوەو گوتی :ئەو داراییانە کە باسیان دەکات کەمترن لە تێچووەکانی جەنگ، ئەو قەرزە، قەرزە لەسەرمان پێویستە بیدەینەوە، عێراق

سەدان ملیار دۆلارو سەدان هەزار گیانی رۆڵەکانی لە دەستداوە لە پێناو بەرگریکردن لە کەنداو!

کوێت وەڵامی دایەوە بەوەی کە ئەویش بەهامان شێوە ئاگری جەنگەکەی بەرکەوتووە و دامەزراوە نەوتیەکانی و کەشتیە نەوت گوێزەرەوەکانی توشی بۆردومانی جەنگەکە بوونەتەوە، بۆیە ناچار بووە پارێزەر لە دەوڵەتەکانی تر بکرێت بۆ تێپەڕاندنی نەوت گوێزەرەوەکانی. عێرق وەڵامی دایەوەو کوێتی تۆمەتبارکرد بەوەی کە ڕەزامەند نەبووە لەسەر ئاسانکاری لە هەردوو دورگەی (بوربا،بوبیان) ئەگەر ئەو ئاسانکایەیی بکردایە ئەوە عێراق هەرلەکاتێکی زووەوە (فاوی) ڕزگار دەکرد.لە بەرامبەردا کوێت وەڵامی دایەوەو ڕایگەیاند :ئەگەر ئەو ئاسانکاریانەم بکردایە بۆ عێراق، ئەوە دەستی بەسەردا دەگرتن و ڕەدی دەکردەوە کە لێیان بکشێتەوە، صدام کاتێك کە ئەو قسەیە بیست ڕای گەیاند کە ئەو دوو دورگەیە عێراقین، دەستەلأتدارانی کوێت بە خێرای وەلأمی ئەو قسە ترسناکانەی صدامیان دایەوە و ڕایانگەیاند :کە ڕژێمی عێراقی بەو قسانەی پەردەی لەسەر نیازەکانی خۆی لادایەوەو ئاشکرایە کە چاوی بڕیوەتە داگیرکردنی کوێت.

بەو شێوەیە زمانی دەستەلأتدارانی هەردوولا لە دژی یەکتر پەرەی سەندو گەیشتە ئاستێك کە پێی دەڵێن ئاستی نا ئومێدی. عێراق دەستەلأتدارانی کوێتی تۆمەتبار دەکرد بە قۆستنەوەی سەرقاڵ بوونی عێراق بە جەنگەوە بۆ چوونە نێو خاکی عێراقی و گۆڕانکاری سنوری و دزینی نەوتی عێراق لە کێڵگەی نەوتی رومێلەی باشور بە بەهای زیاتر لە (٢٠٠٠) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

کوێت لەبەرامبەر ئەو تۆمەتانەی عێراق ڕایگەیاند کە عێراق بۆخۆی ئەوە ڕەد دەکاتەوە کە هێڵی سنوری نێوانیان دیاری بکرێت، لەبەر ئەوەی چاوی بڕیوەتە کوێت. بۆیە ئەو تۆمەتانەی دەستەلأتدارانی عێراق بە بەزاندنی سنورو دزینی نەوتی عێراقی هیچ بنەمایەکی ڕاستیان نیە.

لە ڕاستیدا هەمیشە عێراق خۆی دزیوەتەوە لەمەسەلەی دیاریکردنی سنوری نێوان هەردوو وڵات، بە بیان و جۆراو جۆر، بۆیە بە ئاشکراو بەبەرچاوەوە چاوی بڕیوەتە کوێت و جموجوڵە سەربازیەکانی لە نزیك سنورەکانی کوێت دەست پێکردووە.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بە ئارامگرتنێکی زۆرەوە تەماشای سەرکەشیەکانی صدامی دەکرد، ئامۆژگاری باڵوێزی وڵاتەکەی کرد کە چاوپێکەوتن لەگەڵ صدامدا سازبدات، ئامانج لە چاوپێکەوتنەکەش، ڕاگەیاندنی ئەوە بوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیازی نیە دەست وەربداتە ناکۆکیە ناوخۆییەکانی عەرەبەوە، پێویستە دەستەلاتدارانی عەرەب خۆیان کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەن، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیویست بەو هەڵوێستەی، ئاماژەیەك بە صدام حسێن بگەیەنێت کەدەستی کراوەیە لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کوێتدا.

بالوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق (کلاسبی) بۆ ئەو مەبەستە داوای چاوپێکەتنی کرد لەگەڵ سەرۆکی عێراق صدام حسێن، لە ڕۆژی دواتردا ڕەزامەندی لەسەر درا، واتە لە(٢٥یولیۆی ساڵی ١٩٩٠).

صدام حسێن دەیویست،پێش ئەوەی هەر هەنگاوێك بنێت بۆداگیرکردنی کوێت پەیامێك بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بگەیەنێت، دەیوەیست بە (بۆش) ڕابگەیەنێت کە عێراق نیازی نیە زیان بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا بگەیەنێت لە کەنداودا، بە تایبەتی بەرژەوەندیە نەوتیەکانی، تا لە ڕێگەی ئەو پەیامەوە بێلایەنی ئەمریکا گرنتی بکات!!

چاوپێکەتنەکە ئەنجامدرا، سەرەتا صدام حسێن دەستیکرد بە قسەکانی، بە خستنە ڕووی گەشەسەندنی پەیوەندیەکانی نێوان عێراق و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە لە بەرواری (٥ یۆنیۆی ساڵی ١٩٦٧)ز پچڕێنرابوون بەهۆی لێکەتەکانی جەنگی ئەو ساڵەوە،تا گەڕانەوەی لە ساڵی (١٩٨٠)ز پێش دەسپێکردنی دەستدرێژیەکەی بۆ سەر ئێران بە چەند مانگێگ.

صدام حسێن لە میانەی قسەکانیدا لەگەڵ باڵوێزەکەی ئەمریکا کە نزیکەی (٤٥) خولەکیان خایاند، هەوڵیدا کار لەسەر ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی عێراق بکات بەرامبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، داوای دروستکردنی پەیوەندیەکی نوێ ی کرد لەسەر بنەمای هاوکاری و متمانەی دوولایەنە و بەرژەوەندی هاوبەش.

ئەمە جگە لەوەی کە قسەی دەربارەی جەنگەکەی کرد لەگەڵ ئێران،و یادی ئەمریکیەکانی خستەوە، کە کاتی خۆی عێراق بەرامبەر ئێران وەستاوەتەوە، ئەگەر عێراق نەبووایە ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەی دەتوانی بەر بە دەستەلآتدارانی ئێران بگرێت، لە توانایدا نەبوو دەیان هەزار کوژراو پێشکەش بکات لەو ڕێگەیەدا، بەلآم عێراق توانی دەیان جار زیاتر لەو ژمارەیە قوربانی پێشکەش بکات بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا. زمانی حاڵی صدام حسین بە باڵوێزی ئەمریکای دەگوت، ئایا نەتان بینی هەشت ساڵ بە نوێنەرایەتی ئێوە جەنگاین لە پێناو خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانی ئێوە. لەو پێناوەدا گیانی نیو ملیۆن عێراقی کردە قوربانی، نرخی مرۆڤ لای ئەو دیکتاتۆرە وەحشیە، یەکسان بوو بە هیچ!!

دوای خستنەڕووی پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکاو عێراق، صدام حسێن گواستیەوە بۆ قسەکردن دەربارەی بارودۆخی ئابوری عێراق دوای جەنگی ئێران– عێراق و گوتی :ئەمڕۆ عێراق ڕووبەڕووی جەنگێکی ئابوری دەبێتەوە، هەندێك دەوڵەت هۆکاری ئەو جەنگەن و دەستدرێژیان کردۆتە سەر پشکی عێراق و بازارەکانی جیهانیان نقوم کردوە لە نەوت، بە شێوەیەك بۆتە هۆی دابەزینی نرخەکەی و عێراقیش بەو هۆیەوە زیاتر لە (٧) ملیار دۆلار ساڵآنە زیانی بەرکەوتووە، لە کاتێکدا کە زۆرترین پێویستی پێی هەبووە، بۆ دووبارە بنیادنانەوەی ئەوەی کە جەنگ تێکی دابوو وە بۆ بوژاندنەوەی پرۆژەکانی پەرەپێدان کە لە کاتی جەنگدا وەستێنرابوون، وە لەکۆتایشدا بۆ دانەوەی ئەو قەرزانەی کەلەسەر عێراق کەڵەکە بوون و سودەکەشیان، کە ساڵآنە بەهاکەی دەگاتە نزیکەی (٧) ملیار دۆلاری ئەمریکی، بۆیە ناکرێت عێراق ڕازی بێت بەو بارودۆخە، چونکە ئەوان ئامانجیان سەرشۆڕکردنی گەلی عێراقە.

صدام بۆخۆی ئەوەی لە بیرکردبوو کە خۆی هۆکاری سەرشۆڕکردنی گەلی عێراقە، هەر لە کاتی هاتنی بۆ سەرکورسی دەستەلاّت بە کودەتای سەربازی و تاوەکو دامەزراندنی رژێمێکی دیکتاتۆری وبەرپاکردنی هەموو ئەو جەنگانەی کە گەلی عێراقی تێوەگلان تیایاندا.

پاشان صدام چووە سەر مەسەلەی سنور، و بۆ باڵوێزەکەی روونکردەوە کە کوێت سەرقاڵ بوونی عێراقی بە جەنگی ئێرانەوە قۆستوەتەوە و سنورەکانی فراوانکردووە بەرووی خاکی عێراقیدا و هەستاوە بە دزینی نەوتی کێڵگەی رومێلەی باشور و نەوتی بە بەهای (٢٤٠٠) ملیۆن دۆلار فرۆشتووە. صدام درێژەی بە قسەکانیداو گوتی:مافەکانی خۆمان بەبێ گومان وەردەگرینەوە، ئیتر سبەی بێت،یان دوای مانگێک، یان دوای چەند مانگێکی تر،ئێمە سازش لەسەر هیچکام لەو مافانەی خۆمان ناکەین.

پاش ئەم قسانە صدام چووە سەر هەوڵەکانی بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەمریکا دەربارەی بەرژەوەندیە نەوتیەکانی لە کەنداو گوتی:ئێمە بە تەواوی لەسەر سوربوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێدەگەین، بۆ بەردەوام بوونی ناردنی نەوت، وە بۆ بەرۆشی ئەو لەسەر بوونی پەیوەندی دۆستانە لە ناوچەکەدا و فراوانی رووبەری بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا،بەلاّم لە هەوڵەکانی هاندانی هەندێك لایەن بۆ زیانگەیاندن بە ئێمە تێناگەین.

لە کۆتایدا صدام قسەکانی بە ناردنی سلاّو بۆ سەرۆك بوش کۆتای پێهێناو تکای کرد کە قسەکانی وەك خۆیی وبە خودی سەرۆك بۆش خۆی بیگەیەنێتە.

دوای ئەوەی کە صدام حسێن قسەکانی تەواو کرد، ئینجا رۆڵە باڵوێز(کلاسبی) دەستی پێکرد، کە سەرەتا سوپاسی سەرۆکی کرد بۆ ئەو چاوپێکەوتنەو، وەباسی سوربوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد بۆ دۆستایەتی لەگەڵ عێراق و پەرەپێدانی پەیوەندیەکانی لەگەڵیدا،لەسەرجەم بوارەکاندا، دواتر ئەوەشی بۆ زیاد کردوو گوتی:بەرێز سەرۆك رێگەم بدە کە باس لە دوو خاڵی سەرەکی بکەم کە لە قسەکانی بەرێزتاندا هەبوون :خاڵی یەکەم دەربارەی بابەتی جەنگی ئابوری کە باستکرد، دەمەوێت

بەناوی حکومەتەکەمەوە بڵێم کە سەرۆك بوش ناچێتە جەنگێکی ئابوریەوە لە دژی عێراق، بەڵکو دەمانەوێت پەیوەندیەکی باش هەبێت لە نێوان هەردوو وڵاتدا، بەڵام لە هەمان کاتدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێت نەوت نرخێکی بەرزی هەبێت، دەیەوێت جێگیری لە نرخی نەوتدا هەبێت، هەر زیانێك کەبەر بازاڕی نەوت و نرخەکەی بکەوێت، کاریگەری زۆری دەبێت، نەك تەنها لەسەر ئابوری ئێمە بە تەنها،بەڵکو لەسەر ئابوری سەرجەم وڵاتانی تریش بەگشتی. بۆ ئەم قسەیە صدام وەڵامی دایەوەو گووتی:نرخی (٢٥) دۆلار بۆ هەر بەرمیلێك زۆرە؟

دوای ئەمە باڵوێز چووە سەر خاڵی دووەم، کە دێرێکی درێژی داگیرکرد لە چاوپێکەوتنەکەداو باسی لە ناکۆکیەکانی عەرەب کردوو گووتی:ئەو شتانەی کە ئاراستەی ئێمەت کرد، ئەوە ئێمە نامانەوێت ڕای خۆمان لە بارەیەوە بخەینە ڕوو، ئەوە پەیوەندی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە نیە،ئێمە هیواخوازین کە چارەسەری ناکۆکیەکانی خۆتان، بە ڕێگەیەکی گونجاو چارەسەر بکەن، ئێمە نیازمان نیە دەست وەربدەینە ئەو کێشەیەوە.

باڵوێز دەیویست بەو قسەیە بە صدام بڵێت کە ئازادە لە چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن بەرامبەر ئەو قەیرانە لەگەڵ کوێتدا، بۆیە واتێگەیشت کە ئەمریکا لەبەردەمیدا گڵۆپی سەوزی هەڵکردووە بۆ جێ بەجێکردنی سەرکەشیەکەی.

صدام حسێن لەو بڕوایەدا بوو کە قسەکانی باڵوێز (کلاسبی) کارتی سەوزن بۆ داگیرکردنی کوێت، بەوەش کەوتە ناو ئەو تەڵەیەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی بۆی نابوویەوە، بۆ لێدانی گورزێکی کوشندە لە هێزو چەکە کۆکوژەکانی، کە لە کاتی جەنگەکەی لەگەڵ ئێراندا دەستی کەوت بوون.

لە کاتژمێرە سەرەتایەکانی بەرەبەیانی ڕۆژی (٢ اغستسی ساڵی ١٩٩٠) هێزەکانی عێراق دەستیانکرد بەجوڵەوە بەرەو شاری (کوێت) ی پایتەختی وڵاتی کوێت کشان،لە کاتێکدا کە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی سوپای عێراق بەسەر ئاسمانی شارەکەدا دەسوڕانەوە، لەو کاتەدا هێزێکی تایبەتی سوپای پەڕەشوتی عێراقی دابەزینە نێو

فرۆکەخانەی شارەکەوەو دەستیان بەسەریدا گرت، دەنگی تەقینەوە لە زۆربەی شوێنە جیاوازەکانی شارەکە دەبیسترا، فرۆکە جەنگیەکانی عێراق زۆر بە وردی بۆردومانی شوێنە هەستیاریەکانیان دەکرد لە شارەکەدا، دواجار هێزەکانی عێراق توانیان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بگەنە تەواوی شارەکەوداگیری بکەن.

دوای ئەمە میری کوەیت زۆر بەخێرای داوای یارمەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان کرد، بۆ دەرکردنی هێزە عێراقیەکان لە کوێت و گەڕانەوەی دەستەلاتی شەرعی بۆ ولاتەکەی.

لە بەرامبەردا ڕژێمی عێراق، لە بەیانی هەمان ڕۆژدا ڕایگەیاند، کە کودەتایەکی سەربازی ڕویداوە لە کوەیت!!لە لایەن ژمارەیەك ئەفسەری گەنجەوە بەسەر خێزانی دەستەلاتداریەتی کوەیت،لە ڕێگەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی فەرمی ولاتەوە ڕایگەیاند، کە سەرکردەکانی کودەتاکە داوای یارمەتیان لە عێراق کردووە بۆ بەرگریکردن لە دەستێوەردنی بیانی، عێراقیش چووە بەدەم داواکەیانەوەو هێزە سەربازی ڕەوانەی کوێت کردووە، ئەو هێزانە هەفتەیەك یان چەند هەفتەیەك دەمێننەوە، کاتێك بارودۆخەکە ئارام بۆوە و جێگیربوو دەکشێنەوە.

ئەمە جگە لەوەی وەك ئامادەکاریەك بۆ ڕودانی هەر حاڵەتێکی لە ناکاو حکومەتی عێراقی هێڵی ئاسمانی فرۆکەوانی مەدەنی عێراقی داخست و گەشتکردنی بۆ دەرەوەی ولات قەدەغەکرد و سەرجەم سنورەکانی ولاتیشی داخست.

لە ڕاستیدا پروپاگەندەکانی دەستەلاتدارانی عێراق بریتی بوون لە ڕێژەیەکی گەورەی گەوجی و گێلایەتی، چونکە هێزەکانی عێراق ماوەیەك لەوەو پێش لەسەر سنورەکانی کوەیت مۆڵیاندابوو چاوەڕێ ی فەرمانیان دەکرد و جگە لەوەش هەڕەشەکانی دەستەلاتدارانی عێراق هەموو ڕۆژێك لەسەر یەك درێژەیان هەبوو، هەموو ئەو شتانەی کە دەربارەی ڕودانی کودەتای سەربازی دەیگوتن تەنها هات و هاوارو قسەی پڕوپوچ بوون، چونکە ئەو ئەفسەرانەی کە ئەو باسی دەکردن ئەصڵەن هەر لە بنەڕەتدا بوونیان نەبوو و

ئەو جۆرە درۆیانە نەدەچوو بە مێشکی کەسدا، نە لە عێراق و نە لە کوەیت و نە لە هیچ شوێنێکی تری ئەم جیهانەدا.

صدامە حسێن نەی دەتوانی هەڵسەنگاندنێکی ڕاست و دروست بۆ کاروبارەکان بکات، بەوەش خۆی خستە نێو هەڵە گەورەکەوە و ڕای کێشایە خاڵێك کە گەڕانەوەی نەبوو.

صدام حسێن سوکایەتی بەو گۆڕانکاریانە دەکرد کە لە سەر ئاستی جیهاندا ڕوویاندابوو، دوای هەرەسهێنانی بلۆکی سۆسیالیستی و سەرەتای لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت و دەرکەوتنی ئەمریکا وەك تاکە زلهێزی گەورەی جیهانی بێ ڕکابەر.

صدام حسێن، سەرکەشی و مل هوڕیەکەی لە ژمارەی سەربازەکانی و چەکە کلاسیکی و کۆکوژیەکانی لە جۆری کیمیایی و بایۆلۆجی و ڤایرۆسی، و موشەکە دورهاوێژەکانی وەردەگرت، ئەمە سەرەڕای هەوڵە چڕوپڕەکانی بۆ دەستخستنی بۆمبی ناوەکی.

صدام وای دەزانی کە لەتوانایدا هەیە ڕووبەڕووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانی ببێتەوە، کە بەرژەوەندی گەورەیان هەبوو لە کەنداو، ئامادەبوون هەموو شتێك لە پێناو پارێزگاری کردن لەو بەرژەوەندیانەیان بکەن.،تەنانەت ئەگەر بە چەکی ناوەکیش بوایە. کارەکە گەیشتە ئەوەی کە صدام حسێن لەبەردەم زوومی کامێراکاندا گاڵتە بە هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووەکەی بکات و بڵێت: فڕۆکەی شەبەح کە بەو هەڕەشەمان لێدەکەن، نامان ترسێنێت، ،ئەو فڕۆکەیە شوانێکی ئاژەڵ دەتوانێت بە چەکی (برنەو) بیخاتە خوارەوە!؟

صدام ئەوەشی خستە سەرو گووتی: ئێمە زۆر بە دڵنیایەوە متمانەمان بە سەرکەوتن هەیە،ئەگەر جەنگەکە دروست بوو، ئێمە سوپای ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی تێکدەشکێنین و سەربازەکانیان دەنێرینەوە وڵاتەکانیان.

صدام حسێن بەو عەقڵیەتەوە بیری دەکردەوە،کە خۆی بە سەرکردەی پێویست دەزانی و وابیری دەکردەوە کە گەلی عەرەب پێش ئەو سەرکردەی لەو جۆرەی بە خۆوە نەدیوە.

سەرکەشی و مل هوڕیەکەی گەیشتبووە ئاستێك، تەنانەت نزیکترین دۆستەکانی خۆشی سەرسامکردبوو. لە مەسەلەی داگیرکردنی کوەیتدا کە پلانی هەبوو بۆ داگیرکردنی، پێویست بوو ڕاوێژو ڕاگۆڕینەوە هەبێت لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا، کە پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری ستراتیژیان پێکەوە هەبوو، بەڵام نەی کرد، بۆیە بە عەقڵی کەسدا نەدەهات، کە وڵاتێکی بچوکی وەك عێراق تەحەدای ڕۆژئاوا بکات، ئەگەر پاڵپشتێکی گەورەی وەك یەکێتی سۆڤیەتی نەبێت، بەڵام بە هۆی سەرکەشیەکەیەوە صدام تووشی سەرسوڕمان بوو، کاتێك بینی یەکێتی سۆڤیەت دژی سەرکەشیەکەیەتی و پاڵپشتی ناکات، بەڵکو داوای کشانەوەی بە پەلەی لێدەکات لە کوەیت و پاڵپشتی هەموو جۆرە بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکات کە لە دژی ڕژێمەکەی صدام دەربچێ بکات.

لە جیاتی ئەوەی صدام حسێن، چاو بە حساباتی تایبەتی خۆیدا بخشێنێتەوە، و کارەکە هەڵسەنگێنێت پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت، کەچی قەیرانەکەی زیاتر و زیاتر قوڵ کردەوە و داواکاری نوێ ی خستەڕوو، بە پەیوەستکردنی مەسەلەی داگیرکردنی کوەیت بە کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، داوای کشانەوەی ئیسرائیلی دەکرد لە زەویە داگیرکراوەکانی عەرەبدا، وە پاشەکشەی سوپای سوری لە لوبنان، زیاتر لەمەش چوو داوای دابەشکردنی داهاتی نەوتی کرد بەسەر وڵاتە عەرەبیە هەژارەکاندا، ئەم قسانە لە بنەڕەتدا، قسەری ڕاست بوون، بەڵام ئەو مەبەستی شتێکی پوچ بوو لە کردنیان.

ئەگەر صدام گرنگە بە بەرژەوەندیەکانی گەلی عەرەب بدایە، ئەوە گرنگە بە گەلەکەی خۆیدەدا لە پێش هەموو شتێکەوە، لە باتی ئەوە ئاستی گوزەرانی گەلەکەی خۆی دابەزاندو لە شەڕێکیەوە گلاند،بەبێ بیانویەك لەگەڵ دراوسێکەیدا وڵاتی ئێران بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە بەرژەوەندیەکی لە دروستکردنی ئەو شەڕەدا هەبێت، و ماوەی هەشت ساڵ درێژەی کێشاو گەلی عێراق، بە هۆی ئەو شەڕەوە نقوم بوو لە خوێنداو عێراقی لە سەوزاییەکی تەڕو جوانەوە هێنایە سەر وشکانیەکی ڕەق و تەق و خستیە ژێرباری

قەرزێکی ئێجگار زۆری ولاٌتانەوە، سەرجەم یەدەکی خەزێنەی ولاٌتی لەناوبرد،و ئابوری ولاٌتی توشی دارمانێکی تەواو کرد.

لە جیاتی ئەوەی صدام حسێن هەولٌی چاککردنی بارودۆخی خراپی ئابوری ولاٌت بدات، لە ڕێگەی وازهێنانی لە جەنگ و سیاسەتی خۆ پڕچەککردن، و بە هەدەردانی سامانی ولاٌت،کەچی ڕویکردە پەنابردنە داگیرکردنی کوەیت، بەوەش عێراقی خستە نێو قەیرانێکی نوێوە کە بە سەدان جار زیارت لە قەیرانی ئێران گەورە تر بوو، هیچ حسابێکی بۆ ئەوە نەکرد کە بەو سەرکەشیەی عێراق دەباتە نێو قەیرانێکەوە کە ئەو سەرەکەی دیار نەبێت.

هەمووان ئەو پرسیارە لە خۆیان دەکەن:کە صدام حسێن چۆن وێرای تەحەدای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکات؟ ئایا لێرە کەمترین گومان هەیە لەوەی کە صدام حسێن سەرکردایەتی عێراق دەکات لە جەنگێکی دۆڕاودا؟

لەو ڕۆژگارانەدا، خەلٌکی پرسیاریان دەکرد دەربارەی نهێنی هەلٌوێستی صدام لە وبارەیەوە، لە هەلٌسەنگاندنی خۆشیاندا گەیشت بوونە دوو شت: یان ئەوەتا صدام تووشی ئەوە بووە کە جنۆکە دەستی لێوەشاندووە،وای لێکردووە کە خۆی بەوە بزانێت دەتوانێت سوپای ڕۆژئاوا بشکێنێت، یان گەیشت بووە ئەو باوەڕی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کار ئاسانی بۆ دەکات بۆ ئەوەی سەرکەشیەکەی جێ بەجێ بکات، لە کاتی چاوپێکەتنەکەی بالٌوێزی ئەمریکا لە عێراق لەگەلٌ صدام حسێندا، وەك قەرەبوو کردنەوەیەك بۆئەو زیانانەی کە لە جەنگی ئێراندا بەری کەوت بوون، ئەوەشی کەئەمریکا دەیکات لە ئامادەکاری جەنگی،هیچ نیە و وەك گێژەلٌوکەی ناو فنجانە وەهایە و دەڕوات و هیچ کاریگەریەکی نابێت، وە تەلٌەیەك نیە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایێتەوە تا عێراقی تێبکەوێت، تا لەو ڕێگەیەوە گورزێکی کوشندەی لێبدات و توانای سەربازی و ئابوری عێراق تێك بشکێنێت و عێراق بۆ دەیان سالٌ بۆ دواوە بگێڕێتەوە.

بەو شێوەیە هەرچەندە چەکی عێراق بەوە نەناسرابوو، کە دژی عەرەب بەکارهێنرا بێت و بچێتە جەنگەوە لە دژی براکانی، وەك چۆن صدام خۆی بە لێنیدا بوو، دوای دەست پێکردنی جەنگی ڕاگەیاندن لەگەڵ کوەیتدا، بە تایبەتی کاتێك کە دەرگاکانی چارەسەری ئاشتیان بە کراوەی مابوونەوە، بە هۆی نێوەندگیری دۆستەکانی، وەك شانشینی عەرەبی سعودی و میسر و ئەردەنەوە، کەچی ئەو دنیای سەرسامکرد بە هێرشە دوژمنکاریەکەی بۆ سەر کوەیت بە سەدان هەزار سەرباز و زیاتر لە (٣) هەزار ئۆتۆمبێلی سەربازی و دەبابە، وەك تەحەدایەك بۆ هەموان. ڕژێمی عێراقی (١٢٠) گەورە ئەفسەری عێراقی لە سێدارەدا، بە هۆی ڕەدکردنەوەی بەشداریکردنیان لەو دوژمنکاریەدا لە وانەش(لیوا روکن نازم عمر توفیق،عمید عامر علی سعدون،عمیدروکن حسین علی سلیمان، عقید سعدون وصفی کامیل،عقید یحیی مراد صفوان)

+کۆمەڵێك هۆکار هەبوون بۆ ئەوەی کە صدام حسێن ئەو دەستدرێژە وەحشیانەیە بکاتە سەر ولاتێکی خاوەن قەوارە و، سەروەری تەواو،ولاتێکی ناسراو بە پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی ڕۆڵەکانی، چ لەسەر ئاستی ناوخۆ یان لەگەڵ سەرجەم ولاتانی عەرەبی و ئیسلامی، کە گرنگترین ئەو هۆکارانەی بریتین لە مانەی لای خوارەوە :

–صدام لە دەرئەنجامی سروشتی دەستەلاتخوازی و حالەتی خۆبەگەورە زانینی ئەو هەوەسە دڕندانەی کە هەی بوو، لە ماوەیەکی دووردا تەماعی هەبوو کە پاسەوانی ناوچەکە بەدەست بهێنێت و ببێتە پۆلیسێکی لێهاتوو، بۆ پارێزگاریکردن لە ئاسایشی کەنداو، بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی لە خۆش ویستنی دەستەلات و پلەپایەو دەستگرتنی بەسەر گەورەترین بەش لە ولاتانی عەرەبی و فراوانکردنی دەستەلات و هێزو گەرەی خۆی بەسەر کوەیت و دەوڵەتانی تری ناوچەکە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی.

–تالانکردنی سەروەت و سامانی کوەیت، ئەو دەوڵەتەی کە جێگەی ئیرەی بوولای ڕژێمەکەی صدام،لەسەر ئەو خۆشگوزەرانی و ئاشتی و گونجانی دەستەلات و شەقامەی کە هەبوو لەو ولاتەدا، ئەمە جگە لە نەبوونی هیچ کێشەکی ئابوری و هیچ جۆرە کێشەیەکی تریش، کە ئەو ولاتەی تەواو خۆشگوزەرانکرد بوو.

–بۆ تۆڵە سەندنەوە لە دەوڵەتە عەرەبییەکان لە ناوچەکەدا، بە بەردەوام بوونی لەسەر بیروباوەڕەکەی، کە گوایە هەشتساڵ جەنگاوەو بەرگری لێکردوون و ولاّتەکانی پاراستوون، لە درێژبوونەوەی شۆڕشی ئیسلامی ئێران بۆ ولاّتەکانیان، کە لەو جەنگەی کردوویەتی لە پێناو ئەواندا، خوێنی دەیان هەزار عێراقی ڕژاوە، بۆیە ئەو سەرکەشەی بغداد (صدام حسێن) وای دەبینی، کە لەسەر ولاّتانی کەنداو بە تایبەتی کوەیت پێویستە کە نرخێکی گەورە بدات، وەك پاداشتی پارێزگاری لێکردنی، یان پاراستنی لە دوژمنکاریەکانی ئێران. صدام حسێن وای دەبینی کە مافی خۆیەتی هەموو موڵك و ماڵ و سامانی ولاّتی کوەیت تالاّن بکات،بۆیە سوپای عێراقی لە کاتی داگیرکردنەکدا هەستا بە تالاّنکردنی موڵکە گوازراوەکانی کوەیت، کە بە بەهای زیاتر لە (٦٠) ملیار دۆلار مەزندە دەکران، ئەمە جگە لە ئۆتۆمبێل و شوێنە بازرگانیەکان و بازاڕە جیاوازەکانی زێڕ،کە کۆی گشتی بەهای هەموویان دەگەیشتیە زیاتر لە (٢٠٠)ملیار دۆلاری ئەمریکی.

– ناردنە دەرەوەی قەیرانە ناوخۆییەکان و کێشە کەڵەکە بووەکان، کە بوو بوونە هەڕەشە بۆ سەر دەستەلاّتەکەی صدام حسێن لە بغداد، بۆ ولاّتانی دراوسێ ی عێراق، تا ڕژێمەکەی لە ناوخۆدا بە جێگیری بمێنێتەوەو دوور بێت لە مەترسیە چاوەڕوان کراوەکان. هەروەها بۆ ئەوەی کە لە ناوخۆی عێراقدا ڕژێمەکەی بە ئاشتی و هێمنی بژین دوربێت لە هەر ڕوداوێکی نەخوازراو. صدام نەیدەتوانی بژیت، تەنها لە بارودۆخ و کەشێکی ناجێگیر و ناسروشتیدا نەبێت، ئەو هێمنی و ئاسایش و ڕێزگرتنی لە مافەکانی مرۆڤی نەدەویست.

–هۆکاری ئابوری،بە شێوەیەك کاتێك لە جەنگە ستەمکاریەکی لەگەڵ ئێرامی دراوسێیدا هاتە دەرەوە، بە دەستی بەتاڵ هاتە دەرەوە، و برسیەتی تەنگی بە گەلی عێراق هەڵچنی. بۆ بەدەستهێنانی داهات و چارەسەری حاڵەتی هەرەسهێنراو خنکاوی ئابوری ولاّت، کە ڕژێمەکەی بەدەستیەوە دەینالاّند دوای تەواو بوونی جەنگەکەی لەگەڵ ئێراندا.وەك هەوڵێك بۆ ڕزگاربوون لە چارەنوسێکی ڕوخێنەری نادیار،و بێکاری و ژمارەیەکی گەورەی هەڵئاوسان و قەرزە کەڵەکە بووەکانی سەری کە بە ملیارەها دۆلار

مەزندە دەكران، صدام كوەیتی داگیركرد، لەو بارەیەوە تاریق عزیز بۆخۆی دانی بەو ڕاستیەدا نا لە وەلامی رەخنەكانی وەزیری دەرەوەی شانشینی عەرەبی سعودی لە بارەی داگیركردنی كوەیتە گووتی:(ئابوری عێراق گەیشتبووە قۆناغێكی زۆر خراپ،هیچ بژاردەو ڕێگەیەكی تر لەبەردەمماندا نەبوو).

صدام ڕێگەی دەروونی بەكاردەهێنا، بۆ ئامادەكردنی ڕای گشتی عێراق بۆ پاساو دانەوەی هێرشەكەی بۆ سەر كوەیت، تەنها ڕۆژێك پێش هێرشەكەی بۆ سەر كوەیت تەلەفزیۆنی عێراقی تەنها لەو ڕۆژەدا بیست جار ئەم دەستەواژەیە دووبارە دەكردەوە: (ئەی عێراقیە بەشەرەفەكان، ئەوەی كە توشی بوون لە برسیەتی و هەژاری، لە كاتی جەنگ و دوای جەنگیش، هەموو هۆكارەكەی دەستەلاّتدارانی كوەیت بوون).

– صدام وای دەبینی كە مافی خۆیەتی هەركارێك ئەنجامبدات، كە یارمەتی جێ بەجێكردنی ئامانجە دوژمنكاریە فراوانخوازیەكانی بدات، لەبەر ئەوە ڕازی نەبوو بە حكومكردنی (١٨)ملیۆن كەس لە چوارچێوەی سنورێكی دیاریكراودا، بەڵكو صدام چاوی لە فراوانكردنی جوگرافیایی ڕژێمەكەی بوو،تا ببێتە پاڵەوانی نەتەوەی عەرەب و نەوتی كەنداوی بەدەستەوە بێت، بەڵكو كلیلەكەی بەدەستەوە بێت و سەركردایەتی نەتەوەی عەرەب بكات، بە شێوەیەك كە لە ئاستێكی دیاریكراودا نەوەستێت.

سروشتی صدام بریتی بوو لە ناپاكی و شكاندنی پەیمان و بەڵێنەكان لەگەڵ دراوسێكانیدا، هیچ شتێك بەرگری لێنەدەكرد لە جێ بەجێكردنی حەزە شەیتانیەكانی،ئەمە سەرەڕای حەزەكانی بۆ وروژاندنی قەیران و جولاّندنی، بە شێوەیەك كە خزمەتی دەرخستنی بدات وەك كەسێكی كاریگەرو هەستیار لە ناوچەكەدا.

دەتوانین بڵێین ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكای ئەوەی بە شێوینیدا دەگەڕا دۆزیەوە، بە داگیركردنی كوەیت لەلایەن صدامەوە، چونكە بە هۆی ئەو داگیركردنەوە هەلێكی بۆ هاتە پێش تا هێزو فرۆكە شەركەرەكانی بخاتە كار و كەنداو پربكات لە كەشتیە جەنگیەكانی، بە هاوكاری لەگەڵ هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەكانی، سەرەڕای لێدانی گورزێكی كوشندە لە عێراق، بە بەكارهێنانی سەرجەم ئامێرە سەربازیەكانی بەردەستی و

نوێترین بەرهەمهێنراوەکانی کارگەکانی تەکنۆلۆژیای سەربازی، بۆ گەیاندنی زۆرترین ئەوەی کە دەکرێت لە تێکدانی ژێرخانی ئابوری سەربازە عێراق و گەیاندنی زۆرترین ئازار بە گەلی عێراق،و سەپاندنی گەمارۆی ئابوری بەسەریدا،بەمەبەستی برسیی کردن و سەرشۆڕکردن و خاڵی کردنەوەی عێراق لە کادیر و زاناو پسپۆڕیە جیاوازیەکان و گەڕاندنەوەی بۆ پەنجا ساڵ لەوەو پێش.

صدام حسێن، سوپاو گەل و نیشتمانەکەی لە جەنگێکەوە گلاند،کە پێشتر دەرئەنجامەکەی یەکلای کرابوویەوە لە بەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانی، بە پێداگری کردنی مانەوە لە کوەیتدا.

کارەکە دەستی پێکرد وەك ئەوەی کەصدام بیەوێت کارەساتێك بەسەر گەل و نیشتمانەکەیدا بهێنێت، هیچ کەسێك گومانی لە نەبوونی توانای صدام نەدەکرد بۆ خۆڕاگری لەبەردەم گەورەترین دەوڵەتی ئیمپریالی جیهانیدا، بەو توانایەیی کە هەی بوو لە هەڵوەشێنەرترین و وێرانکەرترین جۆرەکانی چەك لە سەر ئاستی جیهاندا.

کارەساتەکە ڕویدا،کە هەمووان پێشبینیان دەکرد، گەلی عێراقیش سەرلە نوێ باجێکی قورسی دایەوە، لە خوێنی سەدان هەزار لە گەنج و لاوەکانی و وێران بوونی زۆرترین ژێرخانی ئابوری و سەربازی عێراق و سەرشۆڕبوونی سوپاو گەلەکەی.

ئەو دەرئەنجامەی جەنگ بووە هۆی گڕتێبەردانی ئاگری ڕق و تورەی بەرامبەر ڕژێم و سەرکردەکەی صدام حسێن،لەلایەن ئەو سەربازانەوە کە لە کوەیت پاشەکشەیان دەکرد، لە ژێر بارانی ئەو بۆمبانەی کە فڕۆکە ئەمریکیەکان بەسەریاندا دەباراندن، بە خستنەوەی زۆرترین زیانی مرۆیی لە نێو ڕیزەکانیاندا. ئەو تورەییە گەورەییەی سەربازە عێراقیەکان، زەنگی تەقینەوەیەك بوو،کەدواتر ڕژێم و سەرکردەی لەناوبرد، کە هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەو کارەساتە بوون کە بەسەر گەلانی عێراقدا هات، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو نەهامەتیانەش لەو قۆناغەداله دەستەڵاتدا مایەوە و بەرپرسیاریەتی هەموو دەرئەنجامەکانی جەنگەکەی کەوتە سەرشان.

ئەوەی کە بێ هیوای سەربازە گەڕاوەکانی لە جەنگ زیاتر کرد،ئەوەبوو کە هێزەکانی هاوپەیمانان، ڕژێمەکەی صدامیان نەڕوخاند، هەرچەندی جەماوەری گەل جولاو ڕاپەڕینی ئەنجامدا بۆ ڕوخاندنی ئەو ڕژێمەی کە هۆکاری سەرجەم نەهامەتی و مەینەتیەکانی عێراق و گەلەکەی بوو.

ئەوەی کە جێگەی سەرسوڕمانە لە بارەی نهێنیەکانی خۆ ئامادەکردنی ڕژێمەکەی صدام بۆ داگیرکردنی کوەیت، ئەوەبوو کە صدام فەرمانی کردبوو بە سەرکردە سەربازیەکان، کە ئەو هەواڵە لە نێو سەربازەکاندا بلاوبکەنەوە کە گوایا بۆ ئەوە ئامادەکاری دەکەین و مەشق دەکەین کە پرۆسەی ئازادکردنی قودس ئەنجامبدەین؟!

دوایی هەمان شت لای صدامەوە ڕویدا، لە چوارچێوەی بازرگانیەکی خوپێوەگرتوو بە دۆسیەیەی فەلەستینەوە، کە دوای داگیرکردنی کوەیت دەرکەوت، کاتێك بەڵێنی بە فەلەستینیەکاندا بە شێك لە داهاتی نەوتی فرۆشرای کوەیتیان بداتێ، لەوانەشە هەڵوێستی سەرۆکی قەوارەی فەلەستینی (یاسر عەرەفات) لەپشتگیری کردنی لە صدام لە دۆسیەیی داگیرکردنی کوەیتدا ئەو هەواڵە پشتڕاست بکاتەوە.

گوتارێکی گرنگی (محمد مەشات)ی باڵوێزی حکومەتی عێراقی هەیە لە واشنتۆن ، کە لە کاتی داگیرکردنی کوەیتدا بلاوی کردەوە، گرنگی ئەو گوتارە لەوەدایە کە باس لە دوو ڕاستی گرنگ دەکات: یەکەمیان لەمەڕ گۆڕانی ڕای بەرپرساکانی صدام لە بەرگریکردن لێ ی دوای ڕووخانی، دووەمیش هەندێك نهێنی ماوەی داگیرکردنی کوەیت و لایەنە پەیوەندیدارەکان ئاشکرا دەکات.

د.محمد مەشات باڵوێزی صدام بوو لە واشنتۆن لە ماوەی جەنگی داگیرکردنی کوەیتدا،ئەو زۆر بە توندی بەرگری لە داگیرکردنی کوەیت دەکرد لەلایەن ڕژێمەکەی صدامەوە و لە سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان ستایشی صدامی دەکرد. محمد مەشات دوای جەنگی کویت خانەنشین بوو، لە وڵاتی کەنەدا نیشتەجێ بوو، پاشان ئاماژەکان گەڕانەوە سەری دوای بلاوکردنەوەی گوتارەکەی لە ڕۆژنامەی (شرق الاوسط) و جنێودان بە صدام

و تۆمەتبارکردنی بە کرێ گرتەوە پیاوی ئیسرائیل. ئەمەی خوارەوەش دەقی گوتارەکە محمد مەشاتە کە لە ڕۆژنامەی شەرق ئەوسەت بلاّویکردەوە :

لەو کارە زۆر خەفەتبارو ناڕەحەتانە ئەوەیە،کە چینێکی گەورەی عەرەب، لە ناو ئەوانەشدا هەندێك یەکەی بەرگریکاری فەلەستینی دەبینی، کە تا ئێستاش لەو باوەڕەدان کە صدام حسێن، کار بۆ دۆسیەیی فەلەستینی دەکات و گرنگی بە خێرو ئاسودەی عەرەب و یەکێتی ئەو گەلە دەدات، بەلاّم لە ڕاستیدا صدام دۆسیەیی فەلەستینی بەکار دەهێنێت وەك بانگەشەیەکی سوك و نزم، کە لە پشتیەوە خزمەتی ئیسرائیلی پێبکات.

هەرچی دەربارەی سیاسەتی نەتەوەی عەرەبی هەیە،ئەوە باس لە یەکێتی و هەماهەنگی عەرەبی دەکات، بەلاّم لە ڕاستی کرداری و مەیدانیدا، کار لەسەر دورخستنەوەی عێراق دەکات لە بەرنامەو ڕێبازی یەکگرتووی عەرەبی، خزمەتی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا دەکات، ئیتر بەو جەنگەی بێت کە لەگەڵ ئێراندا سازیدا بە هاندانی ئەمریکا، یان بە داگیرکردنی کوەیت بێت، کە بەهۆیەوە کەشتیە جەنگیەکانی ئەمریکا و سوپاکەی توانیان بە شێوەیەکی فراوان بێنە ناوەوە، نەك تەنها بۆ کەنداوی عەرەبی، بەڵکو سوپای ئەمریکا هەموو دەوڵەتانی ناوچەکەی بە تەواوی داپۆشی. بەڵێ ئەو ڕوداوانە بەڵگەی پەیوەستن بە کارەکانیەوە، نەك هەڵوێستە سەر زارەکیەکانی.

بەبێ گومان دەیسەلمێنین بۆ ئەوانەی کە تا ئێستا چاوەکانیان پەردەی لەسەرە،و ئەوانەی کە بەرژەوەندی تایبەتیان نیە لەگەڵ ڕژێمەکەیدا، یان خۆیان نەداوە بەدەست بەرتیلەکانیەوە،کە صدام حسێن گەورەترین خزمەتکاری ئەمریکاو ئیسرائیلە لە ناوچەکەدا، بەڵێ ئەو ڕووداو بەڵگانەی کە هەمن و کۆمکردوونەتەوە لە میانەی کارەکەمدا، دەریدەخەن بە شێوەیەك کەهیچ گومانێکی تێدا نەبیت، کە صدام حسێن و بڕیارو ڕێنمایەکانی لە دواجاردا دەچنەوە خانەی خزمەتی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکاو ئیسرائیلەوە.

**+ئەو کاروکردەوانەی صدام حسێن کە پەیوەستن بە دۆسیەیی فەلەستین و نیشتمانی عەرەبیەوە:**

–صدام حسێن بە شان و باڵی دۆسیەیی فەلەستینیدا هەڵیدەدا بە قسە،نەك بە کردار، بەڵکو بە پێچەوانەوە کردەوەو سیاسەتەکانی دژی مافی گەلی فەلەستینی بوون. وەرن با پێکەوە ئەو شتانە بخەینە ڕوو کە پاش بەرواری (١٧ یولیوی ساڵی ١٩٧٩)ز وەرگرتنی دەستەلاتی عێراقی ئەنجامیداون لەو ڕووەوە :

١–یەکەم کارێك کە کردی بریتی بوو لە تیرۆرکردنی (ئەحمەد حسن بکر) بە پێدانی مادەی (ئەنسۆلین)ی زیاتر لە ڕێگەی دەرزیەوە، کە ئەو بۆ خۆی بە دەست نەخۆشی شەکرەوە دەینالاند، بەلاَم کە بە ڕێژەیەکی زیاتر پێیدا، بووە هۆی مردنی بە شێوەیەکی کت و پڕ.

٢–صدام بە خێرای ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی پارتەکەی خۆی لە سێدارەدا، کە کردەی لە سێدارەدانەکە هەریەکە لە (غانم عبالجلیل،عدنان حسین حمدانی،محمد عیاش،عبدالحسین الشمری،محمد محجوب) گرتەوە، ئەمانە هەموو ئەندامی قیادەی قوتری جزبی بەعس بوون، ،ئەوان هەموو پاڵپشتی سیاسەتەکانی سەرۆك (ئەحمەد حسن بکر)یان دەکرد لە ڕێگەو شێوازی یەکێتی عەرەبی لە کۆتا ڕۆژگارەکانی سەرۆکایەتی خۆیدا.

– لە کاتێکدا کە ئەدەبیاتی پارتی بەعسی، دۆسیەیی فەلەستینی بە کۆڵەکەی سەرەکی تێکۆشانی حزب و بنەڕەتی دۆسیەیی عەرەبی دانابوو، بەلاَم صدام حسێن هەستا جەنگی لەگەڵ ئێراندا هەڵگیساند و هەشت ساڵ درێژەی پێدا، کە بە هۆی ئەو جەنگەوە بەشێکی زۆری وزەو توانای گەلی عێراق بە هەدەردرا، لە ڕووی سەربازی و ئابوری و مرۆییەوە. بەبێ گومان ئەو جەنگە بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان لە

بەرژەوەندی دۆسیەیی فەلەستینیدا نەبوو، و کەسیش سود وقازانجی لێوەرنەگرت ئیسرائیل نەبێت، لەبەر ئەوە ئەو جەنگە تواناو وزەی عێراقی لاواز کرد و بەهەدەریدا، لە کاتێکدا دەبوایە ئەو تواناو وزەیە لە بەرژەوەندی دۆسیەی فەلەستیندا بە خەرج بدرایە.

– دوای وەستانی جەنگی عێراق–ئێرانیش کە هەشت ساڵی خایاند، صدام حسێن کوەیتی داگیرکرد، لە جیاتی هەوڵدانی بۆ دووبارە بنیادنانەوەی ئەوەی کە جەنگ وێرانی کردبوو.

ئەگەر باس لە دەرئەنجامی ئەو جەنگ و دەستدرێژیە بکەین بۆ سەر کوەیت، ئەوا هەمووان دەزانن، کە ئەو جەنگە بووە هۆی لەتکردنی ڕیزی عەرەبی و یارمەتی ئەمریکایدا کە جێ پێی خۆی قایم بکات لە سەرجەم وڵاتانی کەنداوی عەرەبیدا، ئەمە جگە لەوەی کە وایکرد هەندێك وڵاتی عەرەبی بچنە پاڵ ئەمریکا لە جەنگەکەیداو هێزەکانیان شان بەشانی هێزە ڕۆژئاوایەکان لە دژی عێراق بجەنگن،بۆ دەرکردنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت.

ئەوە ئاشکرایە، ئەو بڕیارانەی کە لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیەوە دەرکران بۆ کشانەوەی عێراق لە کوەیت، نەکشانەوەی عێراق و پشتگوێ خستنی بڕیارەکانی، وای لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی کرد، کە بڕیاری گەمارۆی ئابوری بخاتە سەر عێراق، گەمارۆیەك کە لەوەو پێش وێنەی نەبووە، کە بە پێی ئەو بڕیارە عێراق بۆی نەبوو هیچ شتێك هاوردەو ناردەنی بکات، لەوانەش نەوت و هاوردەکردنی هەرجۆرە کەرەستەیەکی جەنگی و مادەیەکی ئابوری.

– لە ماوەی داگیرکردنی کوەیتدا،صدام حسێن تەنها بە تاڵانکردنی کوەیت و هێنانی هەموو گەنجینەکانی زێڕی ئەو وڵاتە ڕازی نەبوو،بەڵکو ڕوونکردنەوەیدا بە سەرجەم وەزیرەکان، تا بچنە کوەیت و ئەوەی کە پێویستیانە بۆ وەزارەتەکەیان بیهێنن،واتە بەکورتی فەرمانی تاڵانکردنی کوەیتی دەرکرد، ئەمە سەرەڕای ڕێگەدان بە شوێنکەوتووانی بە بۆ تاڵانکردنی کۆگاو ماڵە کوەیتیەکان.

هەموو ئەمانە ڕویانداو صدامیش بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کوەیت پارێزگای نۆزدەهەمینی عێراقە، دوای ئەوەی کە بڕیاریدا کوەیت بخاتە سەر عێراق، لێرەدا خوێنەر ئەو پرسیارە دەکات، ئەگەر کوەیت پارێزگای (١٩)عێراقە بۆچی بڕیاری تاڵانکردنی دەرکرد بەو شێوەیە؟ لێکدانەوەی لۆژیکی ئەوەیە کە صدام نیازی هەبووە لە کوەیت پاشەکشە بکات، بەڵام نەیکرد تا دوای دەرکردنی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارە(٦٧٨) (٢٨ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٠)ز کە ماوەی یەك مانگ و نیو کاتیدا بە عێراق تا لە کوەیت پاشەکشە بکات، ماوەکە لە بەرواری (١٩٩١/١/١٥) کۆتای هات و صدام ڕەدی کردەوە پاشەکشە بکات، بۆیە ئەنجومەنی ئاسایش هەوڵی بەکارهێنانی هێزیدا بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت.

صدام حسێن لە ماوەی ئەو مانگ و نیوەی کە وەك مۆڵەت پێیدرا پاشەکشەی نەکرد، سەرەڕای ئامۆژگاریەکانی هەریەکە لە (یەکێتی سۆڤیەت و فەرەنساو ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ) بە پێویستی کشانەوە، تا عێراق پارێزراو بێت لە کارەساتێکی چاوەڕوان کراو.

من وەك باڵوێزێك لە واشنتۆن، ئەوەی کە لەسەرم پێویست بوو، وەك ئەرك و پەرۆشیم بۆ دورخستنەوەی عێراق لە نەهامەتیەکانی جەنگ، ئەوەبوو بروسکەیەکم نارد بە پێویستی پاشەکشێکردن، بەر لە تەواو بوونی ماوەی مۆڵەتی مانگ و نیوەکە واتە پێش بەرواری (١٥-١-١٩٩١)ز، بەڵام صدام گوێ ی بەو جۆرە قسانە نەدەدا.

کاتێك هەلێکم بۆ ڕەخسا، لە میانەی کۆبوونەوەی باڵوێزانی عێراق لە ولآتانی ئەندام لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەگەڵ صدام حسێن لە کۆتای مانگی دیسەمبەری ساڵی (١٩٩٠)ز زۆر بەروونی ڕای خۆم خستە ڕوو گووتم:ئامانجەکە عێراقە، واتە وێران دەبێت ئەگەر پێش بەرواری (١٥ ینایر ساڵی ١٩٩١) نەکشێتەوە.

صدام حسێن تورەی خۆی ڕشت بەسەرمداو گووتی : (دکتۆر...ئەگەر ئەمریکیەکان ئەوێرن هێرش بکەنە سەر عێراق، ئەوە عێراق لەبەر دەستیاندایە. ..جەنگی (ام المعارك)

ئەمریکاو ڕژێمە عەرەبیەکانی لایەنگری ئەمریکا لەناو دەبات و سەرکەوتن بۆ (ام المعاریك)ە، ئەوەش دەبێتە سەرەتای بوژانەوەو ڕاپەڕینی عەرەبی.

دوای ئەوەی صدام گوێ ی نەدا بە هیچ جۆرە ئامۆژگاریەك و ورياکردنەوەيەکی دۆستەکانی، هێزەکانی هاوپەیمانان بە فەرمانی ئەمریکاو لە ژێر سەرکردایەتی ئەودا، هەموو شتێکیان لە عێراقدا وێرانکرد،ژێرخانی ئابوری وکەرتی سەربازی و هۆکارەکانی پەیوەندی کردن و گەیاندن، تەنانەت بۆردومانکردنەکە وێستگەکانی پالآوتەکردنی ئاو تۆڕەکانی دابەشکردی لێ بەدەر نەبوو،کە بووە هۆی دزەکردنی ئاوی پیسی ئاوەڕۆکان بۆ نێو ڕووباری دیجلە.

کاتێك وێستگەکانی پالآوتەکردنی ئاوی خواردنەوە لە ناوبران، دانیشتوانی عێراق ناچاربوون، کە پەنا ببەنە بەر خواردنەوەی ئاوی ڕووباری دیجلە بەبێ پالآوتن، ئەوەش بووە هۆی بلآوبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی ترسناك لە ناو هاولآتیانی عێراقیدا.

ئەمریکیەکان خۆیان دانیان بەوەدانا کە عێراقیان گەڕاندۆتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، بە لەناو بردنی سەرجەم ژێرخانە ئابوری و پیشەسازیەکەی، واتە لە دەرئەنجامی ڕەدکردنەوەی کشانەوەی عێراق لە کوەیت لەلایەن صدامەوە، لەو ماوەیەیی کە ئەنجومەنی ئاسایش بۆی دیاری کردبوو، بووە هۆی وێرانکردنی عێراق لە باکورەوە بۆ باشور.دواتریش گەلی عێراق دوای وەستانی جەنگ،کەوتە بەر گەمارۆیەکی توندی ئابوری، کە تەنها نەبووە هۆی هەژاربوونی گەلانی عێراق، بەلکو بووە هۆی وێرانکردنی ژێرخانی کۆمەلآیەتی و بەهاکانیشی.

لەسەر ئاستی دەرەکیش، دەیان هەزار فەلەستینی لە ولآتە عەرەبیە جیاوازەکان دەیان نالآند، دوای ئەوەی کە لە کوەیت ئاوارە بوون.

– ئایا ئەوەی جێگەی داخ و پەژارە نیە کە صدام حسێن کردی، کاتێك ژمارەیەك موشەکی پوچی ئاڕاستەی خاکی ئیسرائیل کرد، ئەو موشەکانەی کە هەلگری هیچ جۆرە

مادەیەکی تەقەمەنی نەبوون، و بە هۆیانەوە ملیۆنەها دۆلاری ئەمریکی دا بە ئیسرائیل وەك قەرە بوویەك بۆ زیانەکانی ئەو بۆردومانە درۆیینەیە.

– ناپاکی و ساختەی صدام لە بەرگریکردن لە دۆسیەی فەلەستین، ئەو کاتە بە تەواوی بۆم ڕوون بوویەوە کە بوومە باڵوێزی عێراق لە واشنتۆن لە ساڵی (١٩٨٩)ز. پێش ئەوەی بچمە ئەمریکا، (تاریق عەزیز ) کە ئەو کات وەزیری دەرەوەی عێراق بوو بانگی کردم و ڕێنمایەکانی صدام حسێنی پیێ ڕاگەیاندم و گووتی:پێویستە نەچیت بەلای کێشەی فەلەستیندا، بە ڕەخنە گرتن لە ئیسرائیل.هەروەها پێی گووتم:کە واتاکەی ئەوەی دەگەیاند کە شەر بە ئیسرائیل نەفرۆشم واتە یەخەی پێنەگرم لەسەر ئەوە کارانەی کە دەیکات بەرامبەر فەلەستینیەکان، دواتر ئاماژەی بەوەدا کە ڕێنماییەکانی سەرۆك صدام حسێن بریتین لە چاوپۆشی، یان چاو داخستن لە ئاست دۆسیەیی فەلەستینی و ڕەخنەگرتن لە ئیسرائیل.

هەروەها (نزار حمدون) کە ئەو کات جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق بوو بانگی کردم و لیستێك ناوی خستە بەردەستم، کە ناوی ژمارەیەك لە کۆنگرێسمانی ئەمریکی بوو، داوای لێکردم کە پێویستە گرنگیان پێبدەم و بەردەوام چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا سازبکەم و پەیوەندیان لەگەڵدا پتەوبکەم، لەگەڵ پێویستی نزیك نەکەوتنەوە لە مەسەلەی باسکردنی ئیسرائیل لە کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵیاندا.،ئەمە جگە لەوەی کە جەختی کردەوە لەسەر دورکەوتنەوە لە هەر جۆرە ڕەخنەیەك لە ئیسرائیل لەو بارەیەوە. دواتر دوای چەند هەفتەیەك بە گەیشتنم بە واشنتۆن بۆم ڕوون بویەوە کە ئەو ناوانەی کە خستیە بەردەستم لەو کەسانەن کە لە ئیسرائیلەوە نزیکن.

– صدام حسین ڕێکخراوێکی نویێ ی فەلەستینی دامەزراند بە ناوی (بەرەی ئازادی فەلەستینی)، ئەگەر صدام دڵسۆزی دۆسیەیی فەلەستینی بوایە،ئەوە بە هەموو هێزو توانایەوە هەوڵی یەکگرتنی ڕێکخراوە فەلەستینیەکانی دەدا،نەك هەستێت بە دروستکردنی ڕێکخراوێکی تر وهێندەی تر پەرتیان بکات،من لەو باوەڕەدام کە

دروستکردنی بەرەیەکی نوێ، واتا ڕوخاندنی قەوارەی فەلەستینی و لاوازکردنی ڕۆڵی بزوتنەوەی فتح.

من دڵنیام کە صدام حسێن دۆسیەیی فەلەستینی بەکار دەهێنێت، بۆ تێرکردنی لە خۆبایی بوونە تایبەتیەکەی و جێ بەجێکردنی تاماعی سەرکردایەتیە خەیاڵیەکەی. ئەو پارمەتیە داراییانەی کە صدام پێشکەشی هەندێك فەلەستینی دەکات، ئامانج لێیان بنیادنان و دروستکردنی لایەنگرە بۆخۆی، لە نێو ڕیزی فەلەستینیەکان وگەلانی ژمارەیەك دەوڵەتی تری عەرەبی.

لە هەمان کاتدا صدام حسێن بنەماکانی کۆمەڵگەی عێراقی وێرانکردو سامانی عێراقی بەهەدەردا، بۆ تێرکردنی حەزە کەسیەکانی، لە بنیادنانی کۆشك و کڕینی ویژدان و گەردنی هەندێك عەرەب وکەسانی بیانی، لە پێناو جوانکردنی وێنەی ڕژێمەکەی لە دەرەوەی وڵات، جا ئیتر کەسانی ڕاگەیاندکاربن، یان کەسانی سیاسی، لە کاتێکدا کە گەلی عێراق بە دەست برسیەتی و نەخۆشیەوە دەیناڵاند، بە هۆی ئەو گەمارۆ ئابوریەوە کە خرابوویە سەری و صدام بەکاری دەهێنا بۆ زاڵبوون بەسەر گەردنی عێراقیەکاندا.

– ئایا ئەوە لادانێکی گەورە نەبوو لە پەیڕەو پرۆگرامی حزبی بەعسدا،کە صدام حسێن کردی، لە کاتێکدا کە ئەو کەسی یەکەم بوو لە سەرکردایەتی پارتەکەو، وە یەکێك بوو لە ئەندامی سەرکردایەتی نەتەوەی، کاتێك کە فەرمانیدا بە سەرجەم باڵوێزخانەکانی عێراق لەدەرەوە، بە پێویستی دەرکردنی سەرجەم کارمەندانی عەرەب و بیانی لە باڵوێزخانەکاندا و پڕکردنەوەی شوێنەکانیان بە کەسانی عێراقی. لە کاتێکدا کە زۆرینەی زۆری ئەو عەرەبانەی کە لە باڵوێزخانەکانی عێراقدا کاریان دەکرد ئەندامی پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بوون.

ئەو بڕیارە سەیرە بووە هۆی وەستانی ڕێژەیەکی زۆری کاری باڵوێزخانەکانی عێراق، چونکە عەرەبەکان ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو لە هەڵسوڕاندنی کاروباری باڵوێزخانەکاندا، ئەوان خەریکی وەرگێڕان و چاپکردن و کاری سکرتێری بوون. ئەو بڕیارە بووە هۆی ڕودانی بێسەروبەری و نادروستی لە کاری باڵوێزخانەکانی عێراقدا، بەتایبەتی ئەو

عەرەبانەی کە دەرکان ئەندامی پارتی بەعس بوون و بە باشی زمانی ئەو وڵاتانەیان دەزانی کە کاریان تێدا دەکرد، چونکە ئەوان پێشتر بڕوانامەی زانست یان لەو وڵاتانەدا بەدەست هێنا بوو.

وەزارەتی دەرەوە سەرجەم باڵوێزخانەکانی ئاگادارکردەوە، کە بڕیارەکەی سەرۆك صدام حسێن لەسەر بنەمای پاك کردنەوەی باڵوێزخانەکان دانراوە، واتە دەبێت هەموو فەرمانبەرەکان تیایدا لە چوارچێوەی ئەوانەش کە کاری خزمەتگوزاری دەکەن، وەك شۆفێرو کارگوزارەکان و سەرجەمی ئەوانی تریش دەبێت عێراقی بن.

بە ڕەسەنکردنی(خۆماڵیکردن)، یان پاککردنەوەی باڵوێزخانەکان، واتە هەموو ئەوکەسانە بکرێنە عێراقی کە لەو باڵوێزخانانەدا کار دەکەن، بەبێ وەرگرتنی هیچ جۆرە هاوکاریەك لە کەسانی بیانی. ئەو بڕیارە ئەندامە عەرەبەکانی جزبی بەعسیشی دەگرتەوە بەبێ جیاوازی، ئەوەش لادانێکی ترسناك بوو لە بنەما بنەڕەتیەکانی پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، کە یەکێتی عەرەبی کردبووە بنەمای یەکەم و سەرەکی پرەنسیپەکانی کارکردنی خۆی.

وەزارەتی دەرەوەی عێراق لێکدانەوەیەکەی تەواوی بۆ ئەو ڕێوشوێنانە کردوو ڕایگەیاند:کە ڕووی ئەمنی یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ئەو بڕیارەی لەسەر دراوە.

ئەوەش واتای ئەوەیە کە صدام و داروودەستەکەی گومانیان هەبووە لەوەی کە بەکارهێنانی عەرەب دەبێتە هۆی دروست بوونی کێشەی ئەمنی لە کاری باڵوێزخانەکاندا. بۆ زانیاریش سەرجەم باڵوێزخانەکانی وڵاتانی عەرەبی و جیهانیش، سەرجەمیان کەسانی ناوچەی بەکار دەهێنن لە ڕایکردنی کاروبارەکانیاندا، جگە لە وڵاتی (چین) نەبێت.



سوتاندنی بیره نەوتەکان لەمەترسیدارترین تاوانەکانی صدام بوو لەکاتی داگیرکردنی کوەیتدا!!!



هێزەکانی هاوپەیمانان لەکاتی چونیان بۆ نێو کوەیت دوای ئازادکردنی.



جەنگی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق و سەرەتای هەرەس هێنانی ڕژێمەکەی صدام!!



صدام لەچرکە ساتی دەست گیرکردنی لەحەشارگەیەك کەناوی (چاڵی چاڵ چاڵۆکە) ی لێنرا!!



صدام لەقەفەسی تۆمەتباریدا لەکاتی دادگایکردنەکەیدا کە بەلەسێدارەدان کۆتایی هات !!



ئەوە کۆتاییەکەی بوو, کەسەرەتاکەی بریتی بوو لە بڕیاری صدام حسین کەگەیشتە ئاستی هەڵەی مەزن بەداگیرکردنی کوەیت , وڵاتێکی عەرەب و موسڵمان و دۆست !!

## 13- ڕۆبسبێر.... هیچ وانەیەك فێرنەبوو

## هەڵەیەکی کوشندە لە سێدارەیدا!!



لەسەردەمی خۆیدا بە بلیمەتێکی کەم وێنە دادەنرا...سەرکردەی شۆڕش بوو لە جۆری یەکەم....شۆڕشێکی تر نا،بەڵکو شۆڕشی فەرەنسی، کە فەرەنساو ئەورووپاو بەڵکو هەموو جیهانیشی گۆڕی...لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت....ڕێزی لێگیراو....گوێڕایەڵی کراو....متمانەیان پێکردو....کاری خۆیان بۆ ئەو بەجێهێشت... بەڵام گۆڕا بە دیکتاتۆرێکی خوێن ڕێژو....هەڵەی تەمەنی ئەنجامدا. ..هەڵەیەك کە زۆرێك لە دیکتاتۆرەکانی پێش خۆی و دوای خۆی لەناوبرد، توشی پەتایەك بوو بەناوی (شێتی گەورەیی)پەتایەکی بکوژە، توش بووەکەی پاڵ پێوەدەنێت بۆ بەدەستهێنانی دەستەڵات و لوت بەرزی لە ڕێگەی تاوانکاریەوە،وای لێدەکات کە بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکات کە وابزانێت خۆی فەرمانڕەوای خاك و خەڵکی وڵاتەکەیەتی،تاکڕەوی دەکات لە دەستەڵاتیدا، هەموو ئەو شتانەی بیر دەچێت کە وانەکانی مێژوو مرۆڤایەتی فێر دەکەن، وا دەزانێت خاوەنی هەموو شتێکە، بەڵام کتوپڕ بۆی ئاشکرا دەبێت کە هەموو شتێکی لەدەستداوە تەنانەت گەردنی خۆشی.

ئەوە سەرکردەی شۆڕشی فەرەنسی بوو ڕۆبسبێر، کە گەردنی خۆشی چووە ژێر هەمان ئەو (مەصقەلەیەوە)کە گەردنی هەزارەها لە نەیارەکانی پێوەکرد، وە ئەوە هەمان ئەو گەلە بوو کە بەرزی کردەوەو خستیە سەر گەردنی خۆی و دواتریش داوای گەردنەکەی کرد،لە هەمان ئەو گۆڕەپانەی کە وەحشیەت و خوێنی ڕێژی خۆی تیا تاقیکردبوویەوە، کاتێك لە ڕێڕەوی سەرەکی شۆڕش لایدا!!!

کاتێك کارەکە وێران و خراپ بوو،کەسایەتی گۆڕا بە تێکەڵەیەکی نامۆ لە گومان و دوو دڵی و دەستەڵاتخواز و دوژمنێکی تەواو لە دژی هەر کەسێك کە جیاواز بووایە

لەگەڵیدا،هەمیشە لەو باوەڕەدا بوو کە بەهیچ شێوەیەك هەڵە ناکات، خۆی وادەبینی کە سەرچاوەی یاسایە، وەك هەموو دیکتاتۆرەکانی تری مێژووی کۆن و هاوچەرخ.

ڕۆبسبێر لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ووتە بکوژەکەی خۆی ئاشکرا کرد کە دەیگوت : (جەنگ هەمیشە حەزی یەکەمی حکومەتی بەهێزە،ئەو حکومەتەی کە دەیەوێت بەهێز بێت) لێرەدا جەنگ، مەبەستی جەنگی شۆڕشی فەرەنسی بوو لە دژی دوژمنانی شۆڕشی فەرەنسی.

لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا،بۆ هەموو ڕۆڵەکانی گەلی فەرەنسا ئاشکرابوو، کە لەوانەیەسەرجەم فەرەنسیەکان دادگای بکرێن لەسەر دەستی ڕۆبسبێر کە خۆیان متمانەیانن پێکردووە، بە تۆمەتی ئەوەی کە دژی شۆڕش بن، مەصقەلەکە جیاوازی نەدەکرد نێوان کەسی نشتیمانپەروەرو ناپاکدا، گەردنەکانی پێکەوە دەهاڕی.

دەتوانین بڵێین ڕۆبسبێر توشی هەندێك شت هات کەلە سەرەتادا ڕووبەڕووی بوونەوە، خراپترین هەڵەی خراپ ئەو کات بوو کە دەستەلاتی وەرگرت و ژمارەیەك هەڵەی کوشندەی ئەنجامدا، کە هیچ پاساوێك نەبوو بۆ ئەوەی دواتر بیانوی بۆ بهێنرێتەوە، یان بەرگری لێبکرێت.

ڕۆبسبێر لە ساڵی (١٧٥٨)ز لە ئاراس لە دایك بووو و هەر لەوێش گەورە بووە، هێشتا تەمەنی شەش ساڵان بووە دایکی مردوە، باوکی دەستی لەکار هەڵگرتووە و بە کەسێکی دەستبلاویش ناسراوە، ڕۆبسبێر کەسێك بووە کە بە تەمەنی لاویەتیدا تێنەپەڕیوە، کەسێکی زیرەك بووە، لە نێوان هەموو قوتابیەکانی هاوڕێیدا دیاریکراوە تا گوتارێك بخوێنێتەوە بە بۆنەی چوونە سەرتەختی پاشا(لویسی شازدە )پادشای فەرەنسا لە ساڵی (١٧٧٥)ز.

لە ساڵی (١٧٨٩)ز ڕۆبسبێر بوو بە پارێزە و نوێنەری چینی سێهەم لە کۆشکی ڤێرسای. ڕۆبسبێر دەم و چاوێکی ڕەنگ پەڕیی و بزرکاوی هەبوو، دەمارەکانی دەستی ڕەنگێکی سەوزیان هەبوو، لای خانە خوێکەی (مادام دی ستو) سروشتێکی باشی نەبوو.

کاتێك زیندانی (باستێل)ڕوخێنرا لە شۆڕشی فەرەنسیدا،ڕۆبسبێر بیانوی هێنایەوە بۆ ئەو لە سێدارەدانانەی کە لە کاتی شۆڕشدا ئەنجامدران، بەبێ دادگای کرد، وەك کەسێکی توندڕەو ئەو کوشتارانەی بە (دادگای گەل) ئەژمار کردن.

سەرەتا ڕۆبسبێر کەسایەتیەکی ڕادیکاڵی هەبوو،دواتر گۆڕا بە بوکوژێکی خوێن سارد،بە شێوەیەك کە زۆرینەی هەرە زۆری هاوڕێ نزیکەکانی خۆی لە سێدارەدا.

ڕۆبسبێر لە سەرەتادا داوای هەڵوەشاندنەوەی سزای لە سێدارەدانی دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی کە دەستەڵاتی وەرگرت، بوو بە یەکێك لەو کەسانەی کە زۆرترین پێداگری لەسەر ئەو سزایە دەکرد، ئەوەش بە گووتنی ڕستە بەناوبانگەکەی کە لە ڕۆژی لە سێدارەدانی پادشا لویسی شازدەدا گووتی: (پێویست لویس بمرێت،لەبەر ئەوەی گەل بژیت). .ئەو ڕستەیە بە پادشا لویسی شازدە دەستی پێکرد، بەڵام لەسەر هەموو ئەوانەش تاقیکرایەوە کە دژی بۆچوونەکانی ڕۆبسبێر وەستانەوە، لە هەژارو دەوڵەمەندەکان بەبێ جیاوازی.

بۆ نموونە لە ڕۆژی (٧دیسەمبەری ساڵی ١٧٩٤)ز یاسای (گومان)ی دەرکرد کە پەیوەست بوو بە مل قرتاندن یان کوشتنی خەڵك لەسەر گومان لێکردنی ، ئەو یاسایە تایبەت بوو بەو کەسانەی کە دەستگیر دەکران بە هۆی (هەڵسوکەوتیان،پەیوەندیان،قسەیان،نوسینیان)، بەتاوانی ئەوەی کە ئەو شتانەیان دژی شۆڕشە.

ئەو یاسایە بە واتای دانانی شمشێر بوو لەسەر گەردنی ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانی فەرەنسی، بە دەرکردنی ئەو یاسایە، پارێزبەندی یاسای لەسەر ئەندامانی کۆنگرە نەهێشت. ئامانج لە پشت دەرکردنی ئەم یاسایەوە، لە ناوبردنی هەر کەسێك بوو کە سەری لە بەرامبەر ڕوبسبێر بەرز بکردایەتەوە،یان پێچەوانەی ئەو بیری بکردایەتەوە!؟

لە پاش تێپەڕبوونی حەوت مانگ بەسەر ئەو یاسا تیرۆریستیەدا،بە فەرمی حوکمی لە سێدارەدان بۆ (١٦)هەزار کەس دەرچوو، لە نێویشیاندا ئەندامانی پارتی (گیرۆندیەکان) (کە گەورەترین پارتی لایەنگری کۆماری بوون، و یەکێك بوون لە گەورەترین پارتە

سیاسیەکانی ماوەی شۆڕشی فەرەنسی). هەروەها (جاك بریسو)ی نەیاری ڕۆبسبێر، کە لە ساڵی (١٧٩١)ز لەلایەن ڕۆبسبێرەوە تۆمەتبارکرا بە هەڵگیرساندنی جەنگ لە دژی.

هەرچەندە ڕۆبسبێر ماوەی (٣) ساڵ فەرمانڕەوایەتی فەرەنسای کرد، بەڵام تەنها یەك ساڵی توانی ئەو شێوازە دیکتاتۆریە توندەی بسەپێنێت.فەرەنسا لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەودا خراپترین، سەردەمەکانی تیرۆرو سەرکەشی و یاخی بوونی بە خۆوە بینی،لە سێدارەدان و بە مەصقەلەکردن لەو دیمەنە خوپێوەگرتوانە بوون کە ڕۆژانە دووبارە دەبوونە،بەبێ ئەوەی بۆ ساتێکیش ویژدانی ڕۆبسبێر بجوڵێنن.

مێژونوس هـ.ج.ویلز دەربارەی ئەو دەڵێت: (شۆڕش کەوتە بەردەستی سەرکردەیەکی دەستەڵاتخوازی خۆپەرست، کە بریتی بوو لە ڕۆبسبێر).

ڕۆبسبێر کەسێکی جەستەلاواز و ترسنۆك بوو بە فیترەت،هەژاربوو لە خۆبەگەورە زانینی خۆی،بەڵام ئەو بە پشت بەستن بە شتێك هاتە سەر دەستەڵات کە پێویستە بۆ بەهێزبوون، کە بریتیە لە باوەڕ.ئەو کاری لەسەر ڕزگارکردنی سیستەمی کۆماری دەکرد، لەسەر ئەو وێنەیەیی کە خەیاڵی خۆی دەیکێشا، وا گومانیشی دەبرد کە هیچ کەس ڕزگارکەری نیە تەنها خۆی نەبێت، دواتر باوەڕەکەی گەیشتە ئەوەی کە مانەوەی لە حوکمدا، ڕێگەی ڕزگارکردنی کۆمارەکەیەتی ! !

مێژوونوسێکی گەورە دەڵێت: (ڕۆژەکان تێدەپەڕین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و، هەفتە لە دوای هەفتە، ئەو ئامێرە دۆزەخیەش(مەصقەلە) سەری لە دوای سەر دەخوارد،وەك ئەوەی زمانحاڵی ڕۆبسبێر بڵێت ئایا زیاتر هەیە؟

مێژوونوسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە دەستەواژەی (تیرۆر) پێش شۆڕشی فەرەنسی، بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکار نەهاتووە، بەڵام لە کاتی ڕودانی شۆڕشەکەدا وەك دەستەواژەیەکی بەهێز بەکارهێنرا، و دواتریش لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو حکومەتەی کە بە سەردەمی (تیرۆر) ناسرا.

ڕۆبسبێر و هاوڕێکانی وایاندەبینی کە تیرۆر ناونیشانی سەربەرزی و گەورەییە، ڕۆبسبێر لە بەردەم لیژنەی تەندروستی کە سەر بە (دادگای ترس) بوو دەیگووت:

(پێویستە ئامانجی یەکەم لە سیاسەتەکەماندا بریتی بێت لە ڕێنمای کردنی گەل بە لۆژیك و دژایەتی کردنی بە تیرۆر،تیرۆر شتێك نیە زیاتر لە دادپەروەری خێرایی توندی بێبەزەییانە، بۆیە ناونیشانی سەربەرزی بریتیە لە، لەناوبردنی دوژمنانی ئازادی بە تیرۆر).

+ڕۆبسبێر ژمارەیەك تۆمەتی نوێ و ناوازەی داهێنا بۆ لە سێدارەدانی نەیارەکانی لەوانەش:

—دژایەتی نیشتمان پەروەری بە جنێو قسەی ناشیرین.

—بلاْوکردنەوەی گیانی نا ئومێدی لای هاولاْتیان.

—برەوپێدان و جوانکردنی هەواڵی ناڕاست.

—پێشێلکردنی ڕەوشتەکان.

—خراپکردنی ویژدانی گشتی.

—شێواندن و چەواشەکاری، بێتاوانی و پاکی شۆڕشگێڕی و لەمپەر خستنە بەردەم توانا و لێهاتوویەکانی حکومەت.

لە پێناو جێ بەجێکردنی خێرای ڕێوشوێنە یاساییەکان، یاسایەکی دەرکرد بە نەهێشتنی، پارێزەرو بەرگریکرن لە خۆ و بانگکردن و ئامادەبوونی هەر شاهیدێك.دوای ئەمە هەمیشە حوکمەکان دووان لەمانە بوون یان مردن، یان بێتاوانی، بۆیە زۆرینەی دادگایی کردنەکان بە واتای مردن دەهاتن، لەگەڵ هاتنی سەرەتاکانی ساڵی (١٧٩٣)ز ڕێژەی جێ بەجێکردنی حوکمە لە سێدارەدان ڕۆژانە بۆ (٣٠)کەس بەرز بوویەوە.

لەلایەکی تریشەوە، سوپای فەرەنسی بە شێوەی کاتی سەرکەوتوو بوو لە پاراستنی سنورەکانی فەرەنساو هەندێك سەرکەوتنی مەیدانی بەدەست هێنا بوو لە دورخستنەوەی مەترسیەکانی سەر سیستەمی کۆماری،بۆیە ژمارەیەك لە کۆماری خوازەکان، ڕایانگەیاند، کە چیتر ئەو یاساو ڕێوشوێن ودادگا سەرکوتکارانە پێویستیان نەماوە، لێرەدا جارێکی تر ڕۆبسبێر دەرکەوتەوەو وتەیەکی تری لەو بارەیەوە ڕاگەیاندو گووتی:هەر کەسێك لە دژی

ئەو ڕێوشوێنانەبێت کە گیراونەتە بەر، ئەوە دوژمنی شۆڕشەو، لە ناخی خۆیدا دوژمنایەتی شاردۆتەوە.

بۆ ئەو مەبەستەش دەستیکرد بە هەڵمەتێکی لێکۆڵینەوەو دەستگیرکردنی نوێ، بۆ زانینی ئەو شتەی کە لە دڵی خەڵکیدا هەیە،بەوەش مومارەسەی زیارتی ترس و تۆقاندنی کرد، هەمووان بە (بوونەوەری گەورە)بانگیان دەکرد، کە خۆی ئەو نازناوەی بۆخۆی داهێنا بوو، بەلأم لە پشتەوە لەسەر ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکرد گاڵتەیان پێدەکرد.

لە ڕۆژی (٢٦ یولیۆی ساڵی ١٧٩٤)ز ڕۆبسبێر گوتارێکی خوێندەوە،تیایدا جەختی لەسەر پێویستی لەسەر پابەند بوون بە شتە باشەکان و پەیڕەیَ کردنیان دەکردەوە، بەلأم لە میانەی گوتارەکەیدا، ژمارەیك لە ئامادەبووان بەحەماسەوە هوتافیان کێشاو گوتیان (بۆ مەصقەلە ئەی دوژمنی شۆڕش).

لە ڕۆژی دواتردا، دەستکرا بە ڕەخنە گرتن لە ڕۆبسبێر، و نەیارەکانی باسیان لە دەستدرێژیەکانی ڕۆبسبێرکرد بۆ بنەما پرۆتۆکۆلیەکان، لەبەر ئەوەی بەناوی کۆمەڵی سەرکردایەتیەوە قسەی نەکردووە، بەڵکو تەنها بە ناوی خۆیەوە قسەی کردووە، کە ئەوەش واتای ئەوەیە کە لە ناو دڵیدا دیکتاتۆرێکی تەواو بوونی هەیە. لەپاش ئەمە زۆرێك لە خەڵکی ترسیان نەما،بەوەی کە شوێنکەتنیان بۆ ڕۆبسبێر،یان لەگەڵبوونی و چوونە ژێرسەرکردایەتی ئەو، نایان پارێزێت لە دەرهاویشتە هەوەسبازیەکانی ئەو، بۆیە هەر کەسێك لەوانە کە هوتافی دەکێشاو ڕبسبێری تۆمەتبار دەکرد دەیان کەس پاڵپشتیان لێدەکرد، لە بەختی باشی ئەو هوتاف کێشانەش ڕۆبسبێر لە گووتارەکەیدا تۆمەتی ناپاکی دابوونە پاڵ، کە سزاکەی ڕاستەخۆ کوشتن بوو.پاش ئەوەی کە ڕۆبسبێر ئەم دیمەنانەی بینی، هیچ قسەیەکی بۆ نەمایەوە تا بەرپەرچی ئامادەبووانی پێبداتەوە و زمانی هات بەیەکداو توشی دڵەڕاوکێی و نائارامیەکی زۆر بوو، بۆ یەکەمجار هەستی بەترس کرد، بەتایبەتی لەو کاتەدا یەکێك لە ئامادەبوان بە دەنگی بەرز هاواری کرد: (تەماشاکەن:خوێنی دانتۆن، هەناسەی لێ بڕیوەو وشەکانی لێ قەدەغەکردووە کە بیانڵێت)!

دوای ئەمە نەیارەکانی بەخێرای لە دژی جوڵان،چونکە دەیانزانی ئەگەر یەکنەگرن و کۆنەبنەوە و هاوپەیمانیەتی نەبەستن بە خێرای، ئەوە مردن و لە سێدارەدانیان مسۆگەرەو سەرجەمیان لە سێدارە دەدات.

پێداگری دەستەلآتدارانی سەردەمی تۆقاندن لە فەرەنسا، لە ژێر سەرکردایەتی رۆبسبێردا سەیرو نامۆ بوو،هەموویان رێککەوت بوون لەسەر هەوەس و ئارەزووە رەشەکەیان. یەکێك لەو کەسانەی کە حوکمدرا بوو بە هەڵواسین، پێش ئەوەی کە لە سێدارە بدرێت خەنجەرێکی لە خۆ دابوو، خۆی کوشت بوویەوە، بەلآم جەلادی قەسابخانەکانی سەردەمی تۆقاندن لە فەرەنسا، رایانگەیاند کە ئەوان هەڵخەڵەتاندنی دادپەروەری رەد دەکەنەوە،بۆ جێ بەجێکردنی قسەکەشیان هەستان جەستەی مردووی ئەو کەسەیان بە مردووی خستە بەردەم مەصقەلەکەو سەریان لە لاشەی جیاکردەوە.

شۆڕش دەستیکرد بە خواردنەوەی خۆی، دوای قەلآچۆکردنی دوژمنەکانی، ئیتر هیچ لەبەردەم حەزی خوێنرێژی نەمایەوە، تەنها لەناوبردنی دۆست و هاوپەیمانەکان نەبێت، ئیتر هەکەسێك کەمترین دژایەتی بۆ رۆبسبێر نیشان بدایە، تۆمەتبار دەکرا بە پەکخستنی کۆمار، سزاکەشی لە سێدارەدان بوو (مەصقەلە).

بۆ نمونە کاتێك کە گەورەترین پاڵەوانی شۆڕشی فەرەنسی (جۆرج دانتۆن) هەوڵیدا کە کۆتای بە سەردەمی توندوتیژی و تۆقاندن بهێنێت و، ئەو هەموو لە سێدارەدانانە رابگرێت، دەستگیرکراو برایە بەردەم مەصقەلە ولەگەڵ خۆشیدا سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەشی لە سێدارە دران بە منداڵی شیرەخۆرەشەوە، لە ترس ئەوەی نەوەك و لە کاتی گەورەبوونیانتدا شۆڕش بەرپابکەنەوە لە دژی بکوژانی باوانیان، لە پرۆسەی لە سێدارەدانەکەشدا، لە بچوکەوە بۆ گەرە دەستیان پێکرد، تا ئەوانەی کە تەمەنیان گەورەترە، ئەو دیمەنە دڵهەژێنانە ببینن،دواتریش خۆیان دەبرانە بەر مردنی هەرەمەکی کە خوێن رێژە فەرەنسیەکانی سەردەمی تۆقاندن دایان هێنابوو.

رۆبسبێری گەورەترین خوێن رێژی،بە کەسێکی سالار و سەنگین بانگدەکرا، زۆر بە توندی دەستیان پێوەگرت بوو، بە شێوەیەك کە هیچ جۆرە سازشێکیان لەسەر نەدەکرد،

ئەوانی تری بە شێوەیەك سوك و ریسواكردبوو، خۆشی لەو باوەڕەدا بوو كە نێردراوی سۆزی خوداییە بۆ چاككردنی فەرەنسا،و مەصقەلەش تاكە ئامرازی سەرەكیە بۆ جێ بەجێكردنی ئەو چاكسازیە، ئەو هەستی خۆی لەدەستدابوو، وای دەزانی كە خۆی نوێنەرایەتی ئەو پەڕی چاكە دەكات، بۆیە دەستیكرد بە لەناو بردنی ئەو كەسانەی كە پەرەیان بەو فكرانە دەدا، كە دژی بیركردنەوەی رۆبسبێر بوون و سەرجەمیانی ناردە بەردەم مەصقەلەكانی مل پەڕاندن.

لێرەدا وەك دەڵێن: (بازنەكە لەسەر ستەمكار دەسوڕێتەوە) واتە بە مانایەكی تر ئەو بازنەیەی كەلەسەر نەیارەكانی دەسوڕێتەوەو یەك بە یەك سەرەیان دێت و دەكەوێتە سەریان، رۆژێكیش هەر دێت سەرەی ئەویش بێت و بكەوێتە سەری . بۆیە دەبینین ئەوە رۆبسبێر بوو كە برایە بەردەم مەصقەلە و لە سێدارەیاندا، لە میانەی سەركۆنەكردنی لەلایەن لیژنەی سوێندخۆرانەوە، هەر ئەو لیژنەیەش بوو دواتر، فەرمانی مردنی بۆ رۆبسبێر دەركرد.

كەوتنی رۆبسبێر لەو كاتەوە دەستی پێكرد، كە هاوڕێكانیشی ترسیان لێنیشت رۆژێك ئەوانیش بباتە بەردەم مەصقەلە.بۆیە پیلانێكیان لە دژی رۆبسبێرو یاریدەدەرەكانی دارشت،لەسەر هەمان رێگەی خۆی و هەریەكە لە (باراس) و(تالیان) سەرپەرستی ئەو پیلانەیان كرد.

ئەوان هەر دووكیان لە پیاوانی شۆڕش بوون و، ترسیان لەوە هەبووكە رۆبسبێر هەمان ئەو كارەی كەلەگەڵ هاوڕیكانیاندا كردی لەگەڵ ئەمانیشدا بیكات، بۆیە بڕیاریاندا خۆیان رزگاربكەن لەو دیكتاتۆرە....

بۆ ئەو مەبەستە، هەر یەكە لە رۆبسبێر وگرنگترین هاوەڵەكانی دەستگیركران لە دیارترینی ئەوانەش: (كیتۆن،سان جوست) ئەم دووانە خوینگرت بوو بە خوێن ڕشتنەوە و خراپەكاریەكی ئێجگار زۆریان نابوویەوە لە فەرەنسا، ئەمە شان بەشانی (١٥) خوێنرێژی تر، كە لە دیارترین و باشترین هاوكارەكانی رۆبسبێر بوون،ئەمانە سەرجەمیان

لە ژوورێکدا بەند کران، کەسیش داوای بەزەی وسۆزی بۆ نەدەکردن، ئەو سۆزو بەزەییەی کە خۆیان هەزاران کەسیان لیَ بێبەش کردبوو.

رۆبسبێر ویستی خۆی بکوژێت،بەلاّم هەوڵەکەی شکستی هێنا، کاتێك یەکێك لە پاسەوانەکان لێی راپەڕی و ئەو چەکەی لێسەند، کە لەگەڵ خۆی هەڵیگرت بوو، هەرچەندە لە کاتی هەوڵدانەکەیدا، فیشەکێك بەر شەویلگەی کەوت بوو بەو هۆیەوە خوێنێکی زۆری لەبەر رۆشت بوو، بە شێوەیەك کە هەموو دەم وچاوی و جلەکانی لە خوێن هەڵکێشرابوون، ئەمە سەرەڕای هەڵتەکینی شەویلگەی.

رۆبسبێرو حەڤدە کەس لە نزیکترین هاورێکانی برانە بەردەم صەمقەلە، هەمان ئەو ئامێرەی کە گیانی هەزارەها لە هاولاّتیانی فەرەنسای پیَ کێشرابوو بە فەرمانی ئەوان.

دیمەنی لە سێدارەدانی رۆبسبێر مشت و مڕ ئامێز بوو،کاتێك سەریانخست بۆ سەر قادرمەی تایبەتی مەصقەلەکە،ئەو قادرمەیە گەوزا لە خوێنی لەبەر رۆیی و شەویلگەی ئەو، کە پێشترلە کاتی دەستگیرکردنەکەیدا خۆی بریندارى کردبوو، شەویلگەی پارچەیەك قوماشی پێچەری پێوە بوو، لەو کاتەدا جەلادی لە سێدارەدانەکە وای گومانی دەکرد کە ئەو لەفافە لەمپەر بۆ کارەکەی دروستدەکات، بۆیە زۆر بە توندی پێچەرەکەی بە شەویلگەیەوە کردەوە،لەگەڵ کردنەووەشی رۆبسبێر هاوارێکی زۆر بەرزی کرد، کە تا مەصقەلەکە نەدرا بەسەر گەردنیداو کپی نەکردەوە بێدەنگ نەبوویەوە، ئەو بێدەنگ بوونەی کە ملیۆنەها هاولاّتی فەرەنسی ئاواتیان دەخواست چەند ساڵێك لەوەو پێش ئەوە رویدابایە.

ئیتر هەمووان هەناسەیەکیان هەڵکێشا بە مردنی رۆبسبێر و حەڤدە هاوەڵەکەی، زۆرێك گرەویان لەسەر ئەوە دەکرد کە بە مردنی رۆبسبێر بۆ هەتا هەتایە خوێنرێژی کۆتای دێت و ئارامی دەگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا بۆ بنیادنانەوەی ئەو شتانەی کە وێران بوو بوون، گرەوەکەیان راست دەرچوو، چونکە پێشتر بە مردنی هەریەکە لە (مارا، هیسبیر،دانتۆن) رێڕەوی خوێن ڕشتن لە ولاّتدا ڕانەگیرا بوو، بەلاّم بە مردنی رۆبسبێر سەرجەمی ئەو شتانە وەستێنران.

ئامارەکان بە شێوەیەکی گشتی جیاوازن لەمەڕ ڕاستی قوربانیەکانی شۆڕشی فەرەنسی، و ماوەی سەردەمی تۆقاندن(فەرمانڕەوایەتی ڕۆبسبێر و هاوڕێکانی) بە تایبەتی، بەڵام نزیکترین خەملاندن ئاماژە بە مردنی نیو ملیۆن کەس دەکات، کە بە خوێنی خۆیان خاکی ولاتیان شۆرد و بوونە ئاگاداریەك و وریاکەرەوەیەك لەو ولاتەدا، لە دژی پەیدابون و ئەگەری سەرهەڵدانی هەر دیکتاتۆرێکی تر.تەنانەت فەرەنسیەکان بوونە زۆرترین ئەو گەلانەی کەلە دیکتاتۆریەت بترسن و، دەستەلاتدارانی ولاتانیان هان ئەدا تا ماف بە گەلەکانیان ببەخشن، لە ئازادی و ڕادەربڕینی سەربەست و. ...

دوای کابوسی سەردەمی تۆقاندن، قسەکردن لەسەر کوژرانی سەرکردەکانی شۆڕش یەك لە دوای یەك بوویە باس و خواسی خەڵکی و ئەو گووتەیە سەلماند کە دەڵێت:شۆڕش هەمیشە ڕۆڵەکانی خۆی دەخواتەوە ! !

ڕۆبسبێریش لە هەمان ئەو کاسەیە چەشت، کە زۆرێك لە نەیارەکانی تیایاندا چەشت، تۆمەتی ناپاکی گەورەی درایە پاڵ، و هاوکار و پشتیوانەکانی لە دەوری بڵاوەیان لێکرد و بەجێیان هێشت بۆ چارەنوسێکی حەتمی. نەهامەتیەکانی گەلی فەرەنسا کۆتاییان هات، بە کۆتای هاتنی دەستەلاتە خوێنڕێژەکەی ئەو، و گیانی هیوا جارێکی تر گەڕایەوە، بۆ دوو بارە بنیادنانەوەی کۆمەڵگەی ئازاد و برایەتی دادپەروەری، دوای تاریکی شەوێکی درێژی سەردەمی تۆقاندن.

ئەوەی کە جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە،ڕۆبسبێر تا کۆتای تەمەنیشی دەیگوت :هیچ کەس لەوانەی کە لە سەردەمی تۆقاندندا کوژراون بێتاوان نەبوون، کاتێکیش مەصقەلەکە لە گەردنی نزیك بوویەوە، بە چاوێکی ڕیابازیەوە، سەری بەرزکردەوەو تەماشایەکی کۆمارەکەی کرد، ئەو کۆمارەی کە پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە گوایا لەسەر بنەمای (خاوێنی) و(چاکە) بنیادی ناوە.

هەموو ئەو خوێناتەی کە ئەو کەسە هۆکاربوو بۆ ڕشتنیان، لەگەڵ خۆیاندا کۆتای ئەویان هەڵگرت بوو، ئەوان بەبێ گومان زەنگی ئاگادارکەرەوە بوون، بۆ هەموو ئەوانەی

كە دەستەلآت و شان و شكۆی خۆیان بەتاوان بەرز دەكەنەوە و هەڵەی گەورە ئەنجامدەدەن و وادەزانن لەسەر ڕاستین.

ڕۆبسبێر پارێزەر بوو، و توانی دەستەلآتی خۆی بسەپێنێ، هەمیشە وەك شۆڕشگێڕەكانی تر، سوربوو لەسەر بیروبۆچوونە فەلسەفیەكانی خۆی، كە بەشێك بوون لە هۆكارەكانی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی، و لە هەریەكە لە فەیلەسوف و بیریارەگەورەكانی وەك (جان جاك ڕۆسۆ،فۆلتێر،دیدرۆ،مۆنتیسكیۆ) وەری گرتبوون، بەلآم دواتر نكوڵی لەو پرەنسیپانەكرد، و لەگەڵ دروست بوونی شۆڕشی فەرەنسیش گۆڕا بە دیكتاتۆرێكی خوێنرێژ، كە نرخەی هەرەسهێنان و تیاچوونی بریتی بوو لە سەر و گیانی خۆی بوو.



ئەوە چارەنووسی دەیان هەزار لەقوربانیەکانی  رونبسیر بوون , کەدەیان بردنە بەردەم مەقەصتەکە, پێش ئەوەی خۆشی هەمان چارەنووسی هەبێت! !

له زۆرترین ئەو هەڵە کوشندانەی کە مێژووی کودەتا سەربازیەکان لە جیهاندا بە خۆیانەوە بینیوە، بریتی بوون لە پشت بەستنی سەرکردەی کودەتاکان، لە کاتی گەیشتنیان بە دەستەلآت بە هاوبەشەکانیان لە کودەتاکەدا و دانانیان لە پۆستە گرنگ و هەستیارەکانی ولآتدا،پێدانی دەستەلآتێك کە تووشی لەخۆبای بوونیان بکات و دواتر ببێتە هۆی لە ناوبردنی ئەوان، ئەوە ئەو هەڵە مەزنەیە کە لە زۆرێك لە ولآتاندا بە درێژای مێژوو ڕویداوە، لە عێراق بەسەر عبدالکریم قاسم و ئەحمەد حسن بکر و لە ولآتی چیللیش بەسەر سیلڤادۆر للیندیدا هات.

بەنسبەت عبدالکریم قاسم، کۆمەلێك هۆکاری ناوخۆی و ناوچەی ڕۆڵیان هەبوو، لە دروستکردنی بارێکی گونجاو بۆ لەناوبردنی. میژوو نوسان وایدەبینن کە هۆکارە ناوخۆیەکان بریتی بوون لە: بێ سەروبەری لە کردار و تاکڕەوی قاسم، وە ئەوهەلآنەی کە ئەنجامیدان بە لە سێدارەدانی نیشتمان پەروەرەکان، ئەو کردەوە توندوتیژیانەی کە میلیشیا شوعیەکانی هاوپەیمانی ئەنجامیاندا، ناکۆکی لەگەڵ عبدالسلام عارف کە هەمیشە لە ژێر مانەوەی بە زۆر ڕایگرت بوو،ئەمانە هەموو هۆکاری ناوخۆی گرنگ بوو، بەلآم هۆکاری ناوچەیش هەبوون کە ڕۆڵیان هەبوو، وەك ئیمپریالیستی جیهانی بەهۆی دەرکردنی یاسای ژمارە (٨٠ ساڵی ١٩٦١)ز کە لە بەرژەوەندی کۆمپانیا قۆرخکارەکانی نەوتدا نەبوو.

عبدالکریم قاسم بینای وەزارەتی بەجێهێشت بەرەو هۆڵی(گەل) لە نزیك بینای وەزارەت لە شەوێکی تاریکدا، کە هەریەکە لە فازیل عباس مهداوی سەرۆکی دادگای بالآی سەربازی تایبەت، و عمید روکن تەها شیخ ئەحمەد بەرێوەبەری جوڵەسەربازیەکان، و

قاسم جەنابی سکرتێری ڕۆژنامەوانی عبدالكريم قاسم، و ملازم كنعان حداد هاوڕێ یەتیان دەکرد.

لەوێ لە بارەگای ڕادیۆ پەیوەندی بە عبدالسلام عارفەوە کردو لە تەلەفۆنەکەیدا داوای لێکرد کە ڕێگەی بدات ولآت بەجێبهێڵێت، یان

دادگایەکی دادپەروەرانە بکرێت، بەلآم عبدالسلام عارف لە وەلآمدا داوای لێکرد خۆی بدات بەدەستەوە، و ڕایگەیاند کە ئەو پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەو کودەتایەوە نیەو، بۆ دادگایی کردنەکەشی قسە لەگەڵ سەرکردەکانی کودەتاکەدا دەکات.

سەرجەم بەڵگەنامەو دیکیۆمێنتەکان لەو بارەیەوە، لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیەکان و دانیشتنەکان و دیداری بەرپرسەکان، ئاماژە بەوە دەکەن کە کوشتن و لە سێدارەدانی عبدالكريم قاسم سەرۆك کۆماری پێشووی عێراق،لە کودەتاکەی (٧ فبرایەری ساڵی ١٩٦٣)ز بە بڕیاری سەرکردایەتی باڵی توندڕەوی ناو پارتی بەعس بووە، ئەوەش لە میانەی دادگایکردنێکی خێرای، لە ڕۆژێك لە دوای کودەتاکە لە هۆڵی (گەل) نزیك وەزارەتی بەرگری، کە بارەگای کارکردنی قاسم بوو لە پێش تردا، هەرچەندە عبدالسلام عارف ئاگاداری ڕێکخستنی ئەو دادگایە نەبوو تا ئەو کاتەی کە دەستی کرد بە کارەکانی بۆ دادگایکردنی قاسم. کاتێك کە گواستیانەوە بۆ بینای ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراقی، عبدالسلام عارف چاوی کەوت بە سەرکردەکانی حزبی بەعس وەك هەوڵێك بۆ نێوەندگیری تا قاسم لە سێدارە نەدەن.

بەڵگەنامە سەربەخۆ و بێلایەنەکان، ئاماژە بەوە دەکەن، کە عارف داوای لە سەرکردەکانی حزبی بەعس کردووە، بۆ ئەوەی چاوی بە قاسم بکەوێت، ئەوانیش ڕێگەیانداوە، لە کاتی چاوپێکەوتنەکادا سەرکۆنەیەکی زۆری قاسمی کردووە و ڕەخنەی زۆری لێگرتووە لەسەر هەڵسوکەوتە تاکڕەویەکانی و دەرچوونی لە کۆدەنگی ئەفسەرە ئازادی خوازەکان ، دروستکردنی تۆمەت بۆعبدالسلام عارف بە هەوڵی ئەنجامدانی کودەتاو، دواتر بە هۆیەوە دادگایکردن و زیندانی کردنی.

هەر ئەو بەڵگەنامانە ئاماژە بەوە دەکەن، کە دوای ئەو مشت و مڕەی کە لەنێوان قاسم و عارفدا ڕوویداوە، عارف داوای لە سەرکردەکانی بەعس کردووە، کە قاسم لە سێدارە نەدەن و بە زیندانی کردن وازی لێبهێنن، بەڵام ئەو داوایەیی ڕەد کراوەتەوە، لە دەرئەنجامی کاریگەری ئەو ڕەد کردنەوەیەش، سەرەتاکانی ڕیشەی ئەو ناکۆکیەی نێوان عبدالسلام عارف و بەعسیەکان دروست بووە، کە دوای ڕوداوەکانی گاردی نیشتمانی کە (علی صالح السعدی) سەرکردایەتی کرد، زیاتر گەورەو بووە و تێکچووە،دواجلریش بووەتە هۆی ئەوەی کە عارف کودەتایەکی ناوخۆی لە دژیان بەرپا بکات کەناوی لێنابوو کودەتای ڕاستکردنەوە لە (١٨ نوفەمبەری ساڵی ١٩٦٣)ز.

زۆرینەی ئەو گەورە ئەفسەرانەی کە بەشداریانکرد لەگەڵ قاسمدا لە جێ بەجێکردنی کودەتاکەی (١٤ تەموزی ساڵی ١٩٥٨)ز، بەڵکو، تەنانەت سەرۆك عبدالکریم قاسم خۆشی بە گەورە پیاوانی سەر بە ڕژێمی پاشایەتی ئەژمار دەکران، بۆ نموونە عبدالسلام عرف، بە کەسێکی سەر بە (رفیق عارف)ی سەرۆك ئەرکانی سوپا دادەنرا،ناجی تالیب یەکێك بوو لە کەسە نزیکەکانی ملیك فیصڵی دووەم لە کۆشکی پاشایەتی، ئەمە سەرەڕای دووان سیانێك لەو گەورە ئەفسەرانەی کە بەشداریانکردبوو لە کودەتاکەداو وەصی (عبداله) یان کوشت بوو و بە شەقامەکانی بغدای پایتەختدا ڕایانکێشابوو بە شوێن ئۆتۆمبێلدا، بە کەسانی دۆستی نزیکی وەصی ئەژمار دەکران، لەوەش زیاتر یەکێك لەوانە هەموو هەفتەیەك دوو شەو یان سێ شەوی لەگەڵ وەصی (عبداله) دا بەسەر دەبرد. بۆیە ئەو کارە وەحشیانەیە شتێکی سەیرو نامۆ نەبوو، کە ئەو کۆمەڵەیە لە بەرواری (٨ فبرایەری ساڵی ١٩٦٣)ز ئەنجامیاندا بەرامبەر سەرۆك عبدالکریم قاسم، چونکە پێشتر ئەو کارە زۆر لەوە وەحشیانە ترو خوێناوی تر ئەنجامدرابوو لە بەرەبەیانی ڕۆژی (١٤ تەموزە ساڵی ١٩٥٨)ز لەلایەن قاسم و دارودەستەکەیەوە، لە بەرامبەر بنەماڵەو خێزانی پاشایەتیدا.

پاکیەتی سەرۆك قاسم و هەستە نیشتمان پەروەریەکەیان قۆستەوە، بە ڕازیکردنی بۆ چوونە نێو جوڵانەوەیەك بەناوی (جوڵانەوەی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان )، کە هەموو

دراوه مێژووییەکان ئاماژه بەوه دەکەن، کە عبدالکریم قاسم نه کەسی یەکەم بووه لە وجولانەوەیەدا، نه ئەندامێکی بنەڕەتیش بووه.

عبدالکریم قاسم وانەی جەنگی خوێند بوو، و ڕاهێنانیش لەسەر کردبوو لە بەرەکانی جەنگ لە فەلەستین و چەند ناوچەیەکی تریش، بۆیە ئەوەندەی کەسێکی سەربازی ڕووت بوو، نیو ئەوەندە کەسێکی سیاسی نەبوو تا پۆستێکی گەورەی وەك سەرۆك کۆمار بەدەستەوە بگرێت.

بەکورتی و دوور لە بۆچوونی هەندیك نوسەر، کە دەیانەوێت ڕووداوەکان لە چوارچێوه مێژووییەکەیان جیابکەنەوه، تاوانی (٨ فەبرایەری ساڵی ١٩٦٣)ز دەرئەنجامێکی ئاسای بوو بۆ ئەو تاوانانەی کە لە شۆڕشی (١٤ تەموزی ساڵی ١٩٥٧)ز ڕوویاندا.

کێشەی تاوانبار بریتیه لە چۆنیەتی جێ بەجێکردنی تاوانی یەکەمی، بە هۆی بوونی لە مپەرێکی دەروونی، کە سروشتی مرۆڤ دوور دەخاتەوه لە ئەنجامدانی هەرکارێکی خراپ و ناشیرین لە یەکەمجاریدا،بەلام دوای ئەوەی کە ئەنجامیداو ئەو لەمپەره دەروونیەیی تێکشکاند، کە لە بەردەمیدا وەستا بوو، ئەو کات مەسەلەی ئەنجامدانی تاوانێکی تر دەبێته وەك خواردنەوەی ئاو و زۆر ئاسایی دەبێت بەلایەوه، ئەوه وەك بەسەر هاوەلانی سەرۆکدا جێ بەجێ بوو، ئەوانەی کە هەستان بە کوشتنی خانەوادەی پادشایەتی لە عێراق لە گەورەوه تا منداڵیان بە ڕێگەیەکی وەحشیانە لە بەرواری (١٤ تەموزی ساڵی ١٩٥٨)ز ، نەیان دەتوانی خۆیان بوێرن لە کوشتنی تاکه کەسێك، بە هەمان ڕێگەی وەحشیانە لە بەرواری (٨ شوباتی ساڵی ١٩٦٣)ز. تاوانبارەکان هەمان تاوانبار بوون،پاڵنەرەکەشیان هەمان پاڵنەر بوون، ئیتر سەیرو نامۆی ئەو تاوانه لە کوێدایه؟ !

بەلام بە هەر جۆرێك بێت، دور لە ڕەخنەکانمان لە سەرۆك، دەتوانین بڵێین ئەو شکستی هێنا، دوای ئەوەی بەرەنگاری کودەتاچیەکان بوویەوه، کە ئامانجیان گەیشتن بوو بە دەستەلات بە هەر جۆر و ڕێگەیەك بێت،تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی سەدان گیانی هاولاتیانی عێراقیش بێت، کە دوای ئەوەو دواتریش ڕژێنران، لە جەنگه خوێناویەکانی عێراقدا، کە هەرکەسەو ئەوی تری دەکوشت لەسەر ناکۆکی و جیاوازی

بیرکردنەوەیان لەگەڵ ئەوی تردا، لە جیاتی دانیشتن لە سەر مێزی کفتوگۆ و زمانی لۆژیك و عەقڵ، کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە.

عێراقیەکان بوونەتە دوو بەشەوە، لە باسی سەرۆك کۆماری عێراق (عبدالکریم قاسم) :بەشێکیان بە کەسێکی خاوەن زۆرترین دادپەروەری و پاکی و ڕاستگۆیی دەزانن، لە نێوان دەستەڵاتدارە هاوچەرخەکانی عێراقدا، هەروەها  بە کەسێکی دڵسۆز و باوکی هەژاران و سەرکردەی بەرجەستی شۆڕشی دەزانن، هەندێکی تریش لە خەڵکی وای دەبینن کە ئەو وا خۆی پیشانداوە کە گوایا ئەو سەرکردەی باوکی ڕوحی شۆڕشەو پلان داڕێژەریەتی، کە ئەمەش وای لێکردووە بەرەو دیکتاتۆریەت و تاکڕەوی بەرێت و خۆی بە تاکە سەرکردەی ناوزەند بکات و سەرجەم دەستەڵاتەکان لە دەستی خۆی کۆبکاتەوە و دەستەڵاتەکانی ئەنجومەنی سەروەری پەك بخات و هەڵبژاردنی پۆستی سەرۆك کۆمار بە هەڵواسراوی بهێڵێتەوەو دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتیمانی بۆ سەرکردایەتیکردنی شۆڕش هەڵبوەشێنێتەوە، هەر وەك چۆن پێشتر هەردوو ئەنجومەنی پیران و نوێنەرانی سەردەمی پادشایەتی هەڵوەشاندبوویەوە. بەمەش هیچ بوارێکی نەهێشتەوە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی نوێ و سەرجەم پارتەکانی هەڵوەشاندەوە و ڕۆژنامەکانی پەك خست، و گۆڕینی بە ژمارەیەکی دیاریکراوی ڕۆژنامەی سەر بە دەوڵەت.

دواتر دەوروبەرەکەی، وریایی خۆیان وەرگرت لە کێ بڕکێ کردن لەگەڵیدا، تەنانەت هاوڕێ نزیکەکانی لە چەکداران و ئەندامانی ڕیکخراوی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان، ئەوانەی کە پارێزراو نەبوون لە گرتن و لێکۆڵینەوە وسوکایەتی و تۆمەت داتاشین بۆیان، هەر وەك چۆن تۆمەتی بۆ نەیارەکانی دروستدەکرد، کە گوایا لایەنگری پارتێك یان لایەنێك دەکەن لەسەر حسابی لایەنێکی  تر، هەرچەندە ئەندام نەبوون لە هیچ پارت و ڕێکخراوێکی سیاسی، یان کردنەوەی بوار لەبەردەم میلیشیاکانی پارتی شیوعیەکان، کە بەشداربوون لە دەستەڵاتدا لەگەڵیداله ساڵی (١٩٥٩) و یەوە، بە ئەنجامدانی کردەی توندو تیژی لە هەردوو پارێزگای موصڵ و کرکوك، پاش دروست بوونی یاخی بونێکی سەربازی چەکداری کە عەقید (عبدالرحمن شەواف) سەرکردایەتی دەکرد.

له دەرئەنجامی ئەوەدا زۆرێك لەوانەی كە گومانیان لێدەكرا، لە كەسانی بێتاوان و نیشتیمان پەروەر وكەسایەتی نیشتیمانی و سەركردەی شۆڕشی (مارسی ساڵی ١٩٤١)ز سەرۆك وەزیرانی پێشوی عێراق (رەشید عالی گەیلانی )و (عمید نازم تەبەقچەلی) و هاوسەرەكانیان ڕاپێچی بەردەم دادگای شۆڕشكران، كە دواتر بە دادگای (مەهداوی) ناسرا،زۆرێك لەوانەی كە دەستگیركرابوون، دواتر ڕاپانگەیاند كە ئەوان ئەشكەنجەدراون و سوكایەتیان پێكراوەو دەستدرێژیان كراوەتە سەر.

هەرچی دەربارەی خۆی و خزم و لایەنگرانی خۆی هەیە،ئەوە ڕكەبەرەكانی تۆمەتباری دەكەن، بە باوەڕبوون بە ڕەوشتی ستالینی لە فەرمانڕەوایەتی ولآتدا، كاتێك كە دەیگوت :پێویستە لە سەرفەرمانڕەوای ولآت خاوەنی هیچ نەبێت، لەبەر ئەوەی ئەو بە شێكە لە دەوڵەت و بۆ خۆیی و خێزانی خەرجەكات بەبێ بوونی هیچ جۆرە موڵكداریەتیەكی تایبەت،ئەوەش ڕێگەی كردەوە لە بەردەم براكەیدا بەناوی (حامد قاسم) كە ئەوە بقۆزێتەوە لە بەرژەوەندی خۆیدا، لە كاتێكدا كە ئەو خاوەنی دەستەلآتێكی فراوان بوو. ئەو پێشتر كەسێكی سادە بوو لای بازرگانێك لە (الخصیری )،دواتر بە هۆی ئەو بارەوە كە ئاماژەمان پێدا توانی سامانێكی زۆر كۆبكاتەوە كە بە ملیۆنەها مەزەندە دەكرا، بە سەرپەرشتی كردنی لەسەر دابەشكردنی زەوی چاكسازی كشتوكاڵی بەسەر جوتیاراندا، لەگەڵ پارێزەری تۆمار(عبدالكریم حاج)، دواتر ئە دەوڵەمەند بوونەی لە ژێر بازرگانیدا شاردەوە لە (بیروت)، دوای دەستگیركردن و ڕەوانەكردنی بۆ بەردەم دادگای بەرایی ( ڕەصافە) كە حوكمی دوو ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاند، دوای دوو ساڵ ئازاد كرا، پاش ئەوە بە دوو ساڵ وەك یەكێك لە گەورە بازرگانان و سەرمایەدارانی عێراق دەركەوت، بە شێوەیەك كە ساڵی (١٩٦٩) ز خۆی كاندید كرد بۆ پۆستی جێگری ژووری بازرگانی بغداد.

هەروەها قاسم پارچە زەوی نیشتەجێ بوونی، بێ بەرامبەر دابەشدەكرد بەسەر كەسە نزیكەكانی خۆیدا، لە ئەندامانی خێزانەكەی خۆی لە براو خوشكەكانی و سەركردەكانی سوپاكەی،لە گەڕەكی (زەیتونە)، كە تائێستاش لەو گەرەكە راقیەدا نیشتەجێن،ئەمە

جگە لە دابەشکردنی پۆستەکان بەسەر کەسە نزیکەکانی خۆیدا،بۆ نموونە کوڕی خاڵەکەی (مقدم فازیل عباس الهداوی) پلەی عەقیدی پێدرا و کرا بە سەرۆکی دادگای شۆڕش.

هەروەها نەیارە تۆمەتباریان دەکرد بە تێکدانی دیمۆگرافیایی بەغدای پایتەخت، بە گەمارۆدانی بە کۆمەڵگای نیشتەجێ بوون لە خێڵە شروگیەکان لەسەر حسابی دانیشتوانی ئەصڵی بەغداد، بۆ نموونە لە بەری ڕەصافە گەڕەکەکانی (ئەمین،فەزیلیە، عوبێدی،شەماعیە، سەورە،حوسێنیە)، لە بەری کەرخیش هەر یەکە لە گەڕەکەکانی(ئەبو دەشیر، دەباشە،شوعلە،حوریە،ئیسکان،دەور السود) زۆر گەرەکە تریشی دروستکرد، کە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان، لە کۆچەرەکانی گوندەکانی باشوری عێراق بوون، و هەریەکەیان لەسەر هۆکارێکی جیاواز کۆچی کردبوو، هەیان بوو لەسەر ستەمی دەرەبەگەکان و هەندێکیان لەسەر تۆمەتی خێڵەکی و هەشیان بوو لە دەستی دادگاکان هەڵهات بوو. ئەمانە نیشتەجێ کران لە ناوچەیەك کە ناسرا بە (پشتی بەنداوەکە). کە بەنداوێکی خاکی بوو بە بەرزی (١٠-١٢)م، کاتی خۆی لەلایەن والی بغداد (نازم پاشا)وە لەسەرەتاکانی سەدەی بیست بنیادنرابوو، بۆ پاراستنی بغداد لە لافاوی هەردوو ڕوباری (دیجلەو دیالە)، کە لە سنورەکانی کەناری ئەعزەمیە لە باکوری بغداد دەستی پێدەکرد و درێژ دەبوویەوە تا ناوچەی (رستمیە)لەسەر ڕووباری دیالە لە باشوری بغداد.

گرنگترین نەیارەکانی لە ناوخۆی وڵات بریتی بوون لە (حەوزەی علمی نەجەف) بە هۆی نزیك بوونەوەی لە ڕەوتی شیوعی و بەرەی سۆشیالیستی و دورخستنەوەی عێراق لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی.گرنگترین هەڵویستێك کەحەوزەی علمی نەجەف لە بەرامبەریدا نواندی بریتی بوو لە هەڵویستەکانی لە دژایەتی کردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی و یاسای باری کەسێتی، هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بوو لەگەڵ ڕودانی کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٣ز لە دژی قاسم بروسکەی پیرۆز و پاڵپشتی بۆ سەرانی کودەتاکە نارد.

کوردەکانی عێراقیش تۆمەتباریان دەکرد بە یاریکردن بە دۆسیەیی کوردیەوە. لە ساڵی (١٩٥٨) لەگەڵ ڕاگەیاندنی سیستەمی کۆماری لە عێراق و کۆتای هاتنی پادشایەتی، عبدالکریم قاسم داوای لە سەرکردەی کوردی (ملا مستەفا بارزانی)کرد کە بگەڕێتەوە عێراق، ئەو کاتەی کە ئەو چەند ساڵێك لەوەو پێش ئاوارەی یەکێتی سۆڤیەت بوو بوو، دوای هەرەس هێنانی کۆمارێکی کوردی کورت ماوە، کە کوردەکانی ئێران دروستیان کردبوو، و بارزانی لەوکۆمارەدا پۆستی وەزیری بەرگری پێسپێردرابوو، بەڵام ئەو کۆمارە دوای یازدە مانگ هەرەسی هێنابوو، کاتێك کە حکومەتی ئێرانی هێرشی کردبووە سەری، پاش کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە زەویەکانی ئێران، کە لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا داگیری کرد بوون.

بارزانی لەو کاتەدا، زیاتر لە هێڵی مارکسیەوە نزیك بوو، دەستیکرد بە دانوسان و هەندێك مافی نەتەوەی بۆ کوردەکان دەستەبەر بوو، بەڵام خواستەکانی بارزانی و چەشتنی تامی ئەزموونی کۆماری کوردی لە مهاباد، وای لێکردبوو کە خەون بە ئەزمونێکی لەو جۆرەوە ببینێت لە عێراقدا، بەڵام ئەو حەزەی نەهاتە دی، لەبەر ئەوەی کە عبدالکریم قاسم نیازی شتێکی لەو جۆرەی نەبوو، ئەوەش بووە هۆی هەڵگیرسانەوەی ناکۆکی لە نێوان هەردوو لادا. دوا جایش قاسم هەڵمەتێکی سەربازی کردە سەر سەنگەرەکانی (مەلا مستەفا) لە ساڵی (١٩٦١)ز، لە دەرهاویشتەکانی ئەو پەلامارەش، کوردەکان تۆمەتباریان کرد، کە توشی جەوسانەوە بوون و خێڵە عەرەبەکانی حەویجەو موصڵی داوە بە گژیاندا، کە بووەتە هۆی ڕودانی ڕووداوی نەخوازراو لە ڕشتنی خوێن لە نێوان ئەو دوو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەی عێراقدا.

هەرچی دەربارەی ئەوانەشە کە زۆرترین پەیوەندیان بە عبدالکریم قاسمەوە هەبووئەوە بریتی بوون لە کەسە نزیکەکانی خۆی لە ڕیزی سوپاو، هەندێك کەسایەتی شیوعی، لایەنگرانی تریش دابەش بوو بوون، بە گوێرەی دەستکەوت و هەڵوێستە نیشتمانیەکانی، بەو شێوەیە هەندێك لە جوتیارەکانی باشور پەیوەندیان پێوەی هەبوو، و لە ڕیزی ئەودا وەستا بوون، ئەوانە زیادەڕۆیان دەکردلە پیاهەڵدانیدا، تا ئاستی

ئەفسانەی، کە لە ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەدا بڵاویاندەکردەوە. لەو قسە ئەفسانەیانەش، هەندێکیان دەیانگووت وێنەی سەرۆکیان لەسەر هێلکەی مریشك بینیوە، هەندێکی تر بڵاویانکردەوە کە گوایا وێنەی سەرۆکیان لە نێو مانگدا بەدی کردووە، ئەم جۆرە قسانە مانەوەو لە نێو دەستەڵاتدارەکاندا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا، ئەوانەی کە سودیان لە دەستەڵاتەکەی وەردەگرت، هەندێکی تر لەوەش زیاتر زیادەڕۆیان دەکرد لە دروستکردنی ئەفسانە و هێنانەوەی قسەی ناواقعی، دەربارەی ژیاننامەی سەرۆك کۆماری پێشووی عێراق عبدالکریم قاسم.

پەیوەندیە دەرەکیەکانی عێراق لە سەردەمی قاسمدا بەوە ناسرابوون، کە دابڕاون لە جیهانی عەرەبی و دوورکەوتوونەتەوە لە ڕۆژئاواو نزیك کەوتوونەتەوە لە بلۆکی ڕۆژهەڵاتی و شۆسیالیستی، بە هۆی کاریگەری شیوعیەکان بەسەر ناوەندی بڕیار لە سەرەتای حکومەتەکەی قاسمدا،کاتێك ڕیکەوتنامەی بەرگری هاوبەشی ستراتیژی لەگەڵ بلۆکی ڕۆژهەڵاتیدا واژۆکرد. سەراپای پەیوەندیەکانیشی لەگەڵ سەرکردە عەرەبەکاندا،بریتی بوون لە بێ سەرو بەرەیی و جیاوازی و ناکۆکی، کە هەندێك جار دەگەیشتە ئاستی برینداردکردنی یەکدی.

مەترسیدارترین بڕیارێك کە عبدالکریم قاسم دای لەسەر ئاستی سیاسەتی جیهانی عەرەبی بریتی بوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئەندامیەتی عێراق لە کۆماری عەرەبی، بەهۆی باوەڕنەبوونی بە هەر لێك نزیك بوونەیەك، یان یەککگرتنێك، یان هەر پرۆژەیەکی یەکگرتنی عەرەبی، ئەو بڕیارە ش عێراقی خستە نێو دابڕانێکی تەواوەتی، بە شێوەیەك کە تەنها پەیوەندی لەگەڵ وڵاتی ئێران و دەوڵەتە شیوعیەکانی سەر بە یەکێتی سۆڤیەت هەبوو.

پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەریتانیا، بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕاگەیاندن تێکچوو خراپ بوون، بەڵام خانەی تیکیۆمێنتی بەریتانی پەردەی لەسەر هەندێك بەڵگەنامە لادا، کە ئاماژە بە بوونی جۆرێك لە هەماهەنگی دەکەن، بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە عێراق و ناوچەکەدا، لە وانەش خۆماڵینەکردنی کێڵگە نەوتیەکان، کە لەو ماوەیەدا دەنگی داواکاری خۆماڵیکردنیان بەرز بوو بوویەوە، دوای ئەوەی (موصدق)

کێڵگە نەوتیەکانی ئێرانی خۆماڵیکرد بوو، لە میسریش نۆکەندی (سوێس) خۆماڵی کرابوو.

هەمان ئەو هەڵەیەیی کە عبدالکریم قاسم کردی، گەڕایەوەو جارێکی تر سەرۆکی عێراق (ئەحمەد حسن بکر)یش ئەنجامیدایەوە، کاتێك صدام حسێنی کردە جێگری خۆی و دەستەلآتێکی فراوانی پێدا، تا ئاستی سازش کردن لە هەندێك لە دەستەلآتەکانی خۆی وەك سەرۆك کۆمار بۆ ئەو، بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئەو کەسەی کە کردوویەتیە هاوبەشی دەستەلآتەکەی کۆتای ژیانی سیاسی ئەوی هەلگرتووە.

لیوا ئەحمەد حسن بەکر بووبە سەرۆك کۆماری عێراق،خەڵکی پارێزگای تکریت بوو، و لە کەسە نزیکەکانی صدام بوو، ئەو کات صدام حسێن تەمەنی تەنها (٣١) ساڵ بوو، هەردووکیان پێکەوە کاریان کردوو بوونە هێزی دەسترۆشتووی یەکەم لەنێو پارتی بەعسدا، بەلآم صدام توانی گرەوەکە بباتەوە دواجار( بکر)یش بەلاوە بنێت.

صدام حسێن بە سیفەتی جێگری سەرۆك کۆمار، دەوڵەتێکی لە نێو دەوڵەتی عێراقیدا بنیادنا، بە دامەزراندنی دەزگایەکی ئاسایشی توند، کە ڕاستەخۆ لە خۆیەوە فەرمانی وەردەگرت. صدام توانی جێ پێ ی خۆی قایم بکات لە دەستەلآتدا، لە ڕێگەی دانانی کەسە نزیکەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانی، لە پۆستە گرنگ و بالآکانی حکومەت و شوێنە گرنگە بازرگانیەکان و ناوەندەکانی کاردا.

لە ساڵی (١٩٧٨)ز لایەنگری بۆ هەر پارتێکی ئۆپۆزیۆن بە تاوان هەژمار دەکرا، سزاکەشی لە یاسای عێراقیدا لە سێدارەدان بوو، بۆ ساڵی ئایندە واتە لە ساڵی (١٩٧٩)ز صدام سەرۆك کۆماری عێراقی (ئەحمەد حسن بەکر)ی ناچارکرد واز لە دەستەلآت بهێنێت لە بەرژەوەندی خۆیدا. صدام حسێن لە میانەی گەشتنی بە دەسەلآت، دەیان کەسی لە ڕکەبەر و سەرکردەکانی حزبی بەعسی لە سێدارەدا.

هەر لەیەکەم ڕۆژی ئەنجامدانی کودەتاکەیان، بەو شێوەیە دەستیکرد بە دەستەلآتەکانی، وەك ئەوەی کە سەرۆکی فعلی ولآت بێت، سەرەڕای بوونی ئەحمەد حسن بکر لە لوتکەی دەستەلآتی عێراقیدا، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕۆڵی لە فەرمانڕەوایەتی ولآتدا

زیاتر و گەورەتر دەبوو، بە تایبەتی دەستگرتنی بەسەر دەزگای ئاسایش و سەربازی وڵات، وەك ئەوەی کە صدام خۆی پلانی دانا بێت وەرگرتنی دەستەڵات لە عێراقدا.تا ڕۆژی (١٧ یولیوی ساڵی ١٩٧٩)ز گەلی عێراق تووشی سەرسوڕمان بوو، بە ڕاگەیاندنی دەستلەکارکێشانەوەی سەرۆك ئەحمەد حسن بکرو، وەرگرتنی دەستەڵاتی حزب و حکومەت لە لایەن( صدام حسێن)ە وە. بەڵام چۆن و بۆچی ئەو دەستەڵاتە گوێزرایەوە لە بکرە و بۆ صدام؟ ئەوە بەڵگە هەیە کە ئاماژە بەوە دەکات، ئەو کودەتایە پلانەکەی لە فەرمانگەی ناوەندی هەواڵگری ئەمریکیەوە داڕێژراوە.

ئەو کودەتایە کۆمەڵێك ئامانجی گرنگی لە پشتەوە هەبوو،کە سەرجەمیان دەچوونە خانەی خزمەتی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکاوە، لەوانە شکست پێهێنانی هەر جۆرە لێکنزیك بوونەوەیەکی نێوان سوریاو عێراق، و بەرگریکردن لە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی یەکێتی نێوانیان، ،وە تێکدانی ئەو ئەو هەوڵانەی کە سەرۆك بەکر لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا دابووی بۆ بەدەستهێنان و جێ بەجێکردنی پەیمانی کاری نەتەوەی هاوبەش لە نێوان عێراق و سوریادا.،کە بوو بووە هۆی دروست بوونی نیگەرانی و دڵە ڕاوکێیەکی زۆر بۆ ئەمریکاو ئیسرائیل، لە ڕوانگەی دروستکردنی مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەی ئیسرائیل.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کودەتایە تەنها بە پلانی دەزگای ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکا بەڕێوە نەچوو،بەڵکو یاریدەدەریشی لە عێراقدا هەبوو،ئەوەش لە میانەی قسەکانی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کە لە بغداد کردنی، لە کاتی گفتوگۆیەکی دورو درێژی لەگەڵ سەرۆك ئەحمەد حسن بکرلە بارەگای تایبەتی خۆی لە کۆشکی کۆماری، دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان، شاندە ئەمریکیەکە بە دەم و چاوێکی گرژەوە هاتنە دەرەوە، دیاربوو کە دڵخۆش نەبوون بە دەرئەنجامی کۆبوونەوەکە،دواتر هەر هەمان شاند چوونە نوسینگەی تایبەتی جێگری سەرۆك کۆماری عێراق (صدام حسێن) و چاویان بە صدام حسێن کەوت، پاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان، بە دڵخۆشی و پێکەنینەوە

هاتنە دەرەوە،وەك ئەوەی كە بلّێیت شتێكی باشیان دەستكەوتبێت و زۆر شادمان و دلّخۆش بن پێی.

ئەوەی كە لەو دوو كۆبونەوەیە ڕوپدا،بە نهێنیەك لە نهێنیەكان مایەوە، بەلاّم ئەو قسانەی كە دەربارەی ئەو دوو كۆبونەوەیە دەكرێن، ئاماژە بەوە دەكەن كە ئەو مشت و مڕو گفتوگۆیانەی كە هەبوون لە سەر دوو خالّی بنەڕەتی بوون :

یەكەمیان:دەربارەی پەرەسەندنی پەیوەندیەكانی نێوان سوریاو عێراق و كاریگەری ئەو پەیوەندیانە لەسەر كۆی گشتی بارودۆخەكە لە ناوچەكەداو ئیسرائیل بە تایبەتی.

دووەمیش:دەربارەی بارودۆخی ئێران بوو، دوای ڕووخانی دەستەلاّتی شای ئێران و وەرگرتنی دەستەلاّت، لەلایەن خومەینیەوە، وە ئەو مەترسیانەی كە ئەو ڕژێمە نوێیە دروستی دەكات لەسەر بارودۆخی ناوچەی كەنداو پێویستی بەرەنگاربوونەوەی ئەو مەترسیانە.

دەلێن شاندە ئەمریكیەكە هەولّیداوە بۆ هاندانی دەستەلاّتدارانی عێراق، بۆ ئەنجامدانی چەند كارێك لە دژی دەستەلاّتدارانی ئێران، لە نێو ئەو كارانەشدا دەستێوەردانی سەربازی. بەلاّم سەرۆك بەكر ڕازی نەبووە بە پێشنیاری شاندە ئەمریكیەكە، بە تایبەتی كە بكر خۆی كەسێكی سەربازی بووە و بە تەواوی زانیویەتی كە جەنگ جگە لە نارەحەتی و كارەسات و نەهامەتی و وێرانكردنی ئابوری ولاّت هیچی تر بەدوای خۆیدا ناهێنێت، بۆیە شاندە ئەمریكیەكە بە دەم وچاوی گرژەوە لە كۆبوونەوەكەی لەگەلّ سەرۆك بەكردا هاتۆتە دەرەوە، بە پێچەوانەی چاوپێكەوتنەكەیان لەگەلّ صدام حسێندا كە بە دلّخۆشیەوە هاتوونەتە دەرەوە. بۆیە وا دەرئەكەوێت كە صدام حسێن هەموو ئامادەیەكی خۆی نیشاندا بێت بۆ ئەوەی ئەو ڕۆلّە بگێڕیت كە ئەمریكیەكان داوای لێدەكەن، لە تێكدانی پەیوەندیەكانی نێوان سوریاو عێراق و بەرپاكردنی جەنگ لە دژی دەستەلاّتدارانی نوێ ی ئێران.

پاش ماوەیەكی كەم لەو چاوپێكەوتنە،سەرۆك ئەحمەد حسن بكر بەهێزی چەك لەلایەن صدام حسێن و هاوكارەكانیەوە، ناچار بە دەست لەكاركێشانەوە كرا. صدام

حسێن لەو چرکە ساتە بەدواوە سەرجەم دەستەلأتەکانی حزب و حکومەتی لە ولأتدا بەدەستەوە گرت، و دەستەلأتی ڕەهای خۆی بەسەر سەرجەم تواناکانی عێراقدا سەپاند، دوای لەناوبردنی نەیارەکانی،سەرەتا لە ئەندامانی پارتەکەی خۆشیەوە دەستی پێکرد بە پاکتاوکردنی جەستەییان بە شێوەیەکی دڕندانە، دواتریش کەوتە نێزەی هەموو کەسایەتیە سیاسیەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی عێراق،و سەرجەمیانی پاکتاو کرد.

دەزگا سەرکوتکەرەکانی ناشیرین ترین کردەوەی تۆقاندنیان بەکارهێنا، لە بەرامبەر کەسانی نیشتیمان پەروەر و شوعیەکان و ئیسلامیەکانی نەتەوەییەکان و دیموکراتخوازەکان. ئەمە سەرەڕای ئەو تۆقاندنەی کە لە بەرامبەر گەلی کورد بەکاری هێناو،زیندانەکانی لێ پڕکردن و توندترین و نارەحەترین جۆرەکانی ئەشکەنجەدانی جەستەی و دەروونی لەگەڵدا بەکارهێنان و ژمارەیەکی زۆری لە ژێر ئەشکەنجەدا لێ کوشتن.

**+هەر چەندە هەندێك جیاوازی ڕوخساری هەیە لە نێوان عبدالکریم قاسم و ئەحمەد حسن بەکر لەلایەك و سەرۆکی دیموکراتی ولأتی چیللی (سیلفادۆر لليندی)، بەلأم ئەویش بە جۆرێك لە جۆرەکان هەمان هەڵەی ئەمانی دووبارە کردەوە:**

چیرۆکی لليندی بریتیە لە چیرۆکی خەبات و تێکۆشان، ژیانی ئەو پیاوە پڕە لە تێکۆشان، لە پێناو ئازادی و دیموکراسی و دادی کۆمەلأیەتی لە ولأتەکەی خۆی و هەموو جیهاندا...بەلأم گەورەترین هەڵەیەك کە کردی و خۆشی و ولأتەکەشی باجێکی زۆریان لەسەردا،بریتی بوو لەو متمانە بێ پاساوەی کە هەی بوو بە ژەنەڕاڵە سەرسەختەکەی.

هەموو بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە هیچ ڕادەیەك نەبوو بۆ تەماعەکانی، و هیچ سنورێکیش بۆ چاوتێبڕینە سەرسەختەکەی نەبوو، و ئامادە بووە هەموو شتێك بکات و هاوپەیمانی لەگەڵ هەر کەسێکدا ببەستێت، تەنانەت ئەگەر دوژمنی ولأتەکەشی بێت وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا !

بۆیە دەبینین سەرکردەی ئەمریکای لاتینی و پیاوی گەورەو مرۆڤ دۆست و سەرۆکی چیللی (سلڤادۆر) گیانی خۆیدا وەك باجێك لە بەرامبەر ئەو متمانە لە ڕادەبەدەرەی کە هەی بوو بە ژەنەڕاڵەکانی سوپاکەی، بە تایبەتی ژەنەڕاڵ(ئوجیستو بینوشینە) ی وەزیری بەرگری.

**+ ئێستاو ئێوەو ئەو چیرۆکە ناسۆرییەی کە تا ئێستا جیهان شتی لەو شێوەیەیی بە خۆوە نەدیوە :**

سلڤادۆر للیندی لە (٢٦ یونیوی ساڵی ١٩٠٨)ز لە (فالبارایشۆ) لە کەناری زەریای هێمن لە باوکێکی پارێزەر و دایکێك بە ناوی (لاورا گوسنسی ئوریبی) لە دایك بووە. دواتر چووەتە قوتابخانەی (ئیدواردۆ باترا) لەوێ وردە وردە دەرکەوتووە بە هۆی ڕەوشتە باشەکانیەوە، لەو ساڵانەدا (خوان دیمارشی )ناسیەوە، کە یەکێك بووە لە بەرهەڵستکارانی دەستەڵاتی وڵاتەکەی و بنەڕەتێکی ئیتالی هەبووە و کاریگەر بووە بە بیروباوەڕە سەرەتاییەکانی مارکس.

ساڵی (١٩٢٦)ز چووەتە زانکۆی(چیللی)، کە یەکێکە لە کۆنترین و بەناوبانگترین زانکۆکانی ئەمریکای لاتینی بۆ خوێندنی پزیشکی. لە ساڵی (١٩٣٠)ز بووەتە جێگری یەکێتی قوتابیانی چیللی و بەشداریکردووە لە خەبات و تێکۆشان لە دژی دیکتاتۆری چیللی (ئیبانس).

لە ساڵی (١٩٣٢) دەستی لە خوێندنەکەی هەڵگرتووە و، گەڕاوەتەوە بۆ (فالبا) تا لەوێ نزیك بێت لە باوکیەوە کە نەخۆش بووە، لە هەمان کاتدا تێزێکی ئامادەکردوە لەو کاتەدا بە ناونیشانی (تەندروستی عەقڵی و تاوان).

لە مانگی یونیوی ساڵی (١٩٣٢)ز کۆمارێکی سۆسیالیستی بە سەرکردایەتی (مار مارۆك گروڤ) لە چیللی ڕاگەیەنرا دوای ئەزمونێکی سۆسیالیستی نهێنی. حکومەتی نوێ دەستیکرد بە دەستگیرکردنی کەسانی پێشکەوتوخواز، لە نێو ئەوانەشدا (سیلڤادۆر للیندی)، بە شێوەیەك کاتێك لە زینداندا بوو باوکی کۆچی دوایکرد، بۆیە هەر لەوێ سوێندی خوارد کە بە درێژای تەمەنی خەبات بکات لە پێناو ئازادی لە وڵاتەکەیدا.

لە ساڵی(١٩٣٣)ز بڕوانامەی پزیشکی بەدەست هێنا و دوای چەند هەوڵدانێك وەك پزیشك لە نەخۆشخانەکانی وڵاتدا دامەزرا، لە (١٩) مانگی نیسانی هەمان ساڵدا بەشداریکرد لە دامەزراندنی (پارتی سۆسیالیستی چیللی)

له ساڵی (١٩٣٦)ز بەشداریکرد لە دامەزراندنی بەرەیەك بەناوی (بەرەی جەماوەری) و سەرکردایەتی بەرەکەشی لە ناوچەی (فالبارایشۆ) گرتە دەست، هاوڕێکانیشی لە پارتی سۆسیالیسی چیللی وەك یاریدەدەری ئەمینداری گشتی پارتەکە هەڵیانبژراد.

لە ساڵی (١٩٣٨) بەرەی جەماوەری (بیدرو ئەگیری) کاندید کرد بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار، لەو هەڵبژاردنەدا للیندی بوو بە بەرپرسی یەکەمی هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی (ئەگیری) لە ناوچەی (فالبارا یشۆ).

ساڵی (١٩٤٢)ز بوو بە ئەمینداری گشتی پارتی سۆسیالیستی چیللی، دواتر لە ساڵی (١٩٤٥)ز وەك ئەندامی ئەنجومەنی پیران هەڵبژێردرا لە ناوچەی (ڤالدیڤیا) و دەوروبەری لە باشوری وڵات.ساڵی (١٩٥٢)ز بەرەی جەماوەری کاندیدیان کرد بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار، و توانی نزیکەی (٥٢) هەزار دەنگ بەدەست بهێنێت.

لە ڕووی چالاکیشەوە لە ئەنجومەنی پیران بە هاوبەشی لەگەڵ هاوڕێ ی خەباتی (ئەلیاس لافیرتی) پڕۆژە یاسای خۆماڵیکردنی (مس)یان پێشکەش کرد بەو ئەنجومەنە کرد. تا ساڵی (١٩٥٣)ز جارێکی تر بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران هەڵبژێردرایەوە لە ناوچەی (ئەنتۆ ڤاگاستاو تاراباکا) لە باکوری وڵات.

لە ساڵی (١٩٥٧)ز هەر یەکە لە(پارتی سۆسیالیستی جەماوەری، و سۆسیالیستی چیللی، و پارتی شیوعی چیللی ) یەکیان گرتوو (بەرەی خەباتی جەماوە)یان پێکهێنا و (للیند)یان کاندید کرد بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری چیللی.

دوای ئەوەی لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کۆماردا شکستی هێنا لە بەرامبەر (خورجی ئەلیساندری) ڕاستڕەو، هەستا سەردانێکی (هاڤانای) پایتەختی کوبای کرد، بۆ زانینی قۆناغەکانی شۆڕشی کوبی، و توانی چاوپێکەوتنی درێژ لەگەڵ هەر یەکە لە (ڤیدڵ کاسترۆ،گیڤارا)دا ساز بکات.

تا ساڵی (١٩٦٣)ز جارێکی تر(بەرەی خەباتی جەماوەری) کاندیدیان کردەوە بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کۆماری چیللی و توانی نزیکەی یەك ملیۆن دەنگ بەدەست بهێنێت، بەڵام هەر شکستی هێنا لەبەرامبەر پاڵێوراوی پارتی دیموکراتی مەسیحی

(ئیدواردۆ فرای مونتالبا). تا ساڵی (١٩٦٦)ز توانی سەرکەوێت بۆ پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی پیرانی چیللی.

ساڵی (١٩٦٨) سەردانی کۆریای باکور و ڤێتنامی دیموکراسی کرد و لەگەڵ (هۆشمینە) کۆبوویەوە، دواتر سەردانی هەریەکە لە وڵاتانی (کەمبۆدیاو لاوس)کرد. تا دواجار لە ساڵی (١٩٧٠)ز ئەو سێ پارتەی پێشتر کە ئاماژەمان پێدان، جارێکی تر کردیانەوە بە کاندیدی خۆیان بۆ پۆستی سەرۆکایەتی چیللی و توانی بە ڕێژەیەکی کەم سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە بەرامبەر ڕکەبەرەکەیدا.

## +کاتێك للیندی متمانەیەکی زۆری بە ژەنەڕاڵ (ئوگستۆ بینوشیە)کرد باجێکی زۆریدا!!

لە نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٧٠)ز سەرکردەی سۆسیالیستی (سیلڤادۆر للیندی) گەیشتە سەرۆکایەتی وڵاتی چیللی لە هەڵبژاردنێکی ئازاد و ڕاستەخۆدا، ئەمە بۆ ئەمریکا جێگەی سەرسوڕمان نەبوو،چونکە لەو کاتەدا ئەمریکای لاتینی بە ماوەی سۆسیالیستی خۆیی و دوژمنایەتی سەرمایەداریدا تێدەپەڕی، بە ڕادەیەك زۆرێك لە (قەشەکان) کار و پیشەی کەنیسەکانیان بەجێهێشت و ڕویانکردە بە شداریکردن لە شۆڕشەکان و هاندان لە دژی گەندەڵی دەستەلاّتدارانی سەرمایەدار،ئەوانەی کە ئەمریکا لێیان ڕازی بوو. هەروەها جگە لەوەی کە ئەم ڕوداوە،لە ماوەی درێژبوونەوەی سیستەمی سۆسیالیستی و جەنگی ساردی نێوان هەر دوو بلۆکی سەرمایەداری و سۆسیالیستیدا بوو.

للیندی بوویە پزیشکی هەژارەکان، سیاسەتەکانی ئازایانە بوون بۆ لێدانی بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆریەتی ئەمریکی لە چیللی، بە وەستانی لە پاڵ هەژارەکان و لایەنگری بە شێوەیەکی ئاشکرا بۆ سیستەمی سۆسیالیستی، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاریدا کە (للیندی) بە مەترسیەکی گەورە ئەژمار بکات لەسەر بەرژەوەندیەکانی خۆی، بەلاّم نەیدەتوانی تانە و گومان بخاتە سەر شەرعیەتی

دەستەڵاتەکەی، لە بەرئەوەی لە هەڵبژاردنێکی دروست و ڕاستدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بوو.

بۆیە ئەو ئیمپراتۆریەتە زەبەلاحە بڕیاریدا ڕووی ناشیرینی خۆی دەربخات و ڕێگەیەکی تر بگرێتە بەر بۆ دوژمنایەتی کردنی للیندی و خەونی گەلی چیللی و گەلانی هەژاری جیهان لە گۆڕ بنێت . پیاوی هەڵبژێردراوی ئەوانیش بۆ ئەو کارە بریتی بوو لە ژەنەڕاڵ (ئۆگستۆ بینوشینە)،سەرکردەی سوپا، کە توانی بە فەرمانی ئەمریکا دەست بەسەر دەستەڵاتدا بگرێت لە چیللی لە بەرواری (١١ سیبتەمبەری ساڵی ١٩٧٣)ز ، کاتێك بە دەبابەکانی کۆشکی کۆماری گەمارۆداو داوای لە سەرۆك کۆماری شەرعی ئەو وڵاتە کرد خۆی بدات بە دەستەوە. بەڵام للیندی ڕەدی کردەوە، کە واز لە دەستەڵات بهێنێت و سوربوو لەسەر شەرعی بوونی خۆی لە دەستەڵاتدا، لە دەرئەنجامی ئەوەشدا جەلادەکانی (بینوشیە) هەڵیان کوتایە سەر کۆشکی کۆماری و کوشتیان.

بینوشیە سەردەمی دەستەڵاتی دیکتاتۆری خۆی بە کوشتنی سەرۆکێکی خۆشەویستی گەل دەست پێکرد، دوای ئەوە ماوەی سەرۆکایەتیەکەی (٢٧) ساڵ درێژەی کێشا، وەك نینۆکێکی پیسی ئەمریکا لە ناوچەکەد و دوژمنی یەکەم بۆ سەرجەم بیریاران و نوسەران و ئازادیخوازانی ئەمریکای لاتینی.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا ژەنەڕاڵ(توریخۆس)ی تیرۆرکرد، کە کەسایەتیەکی وڵاتی (پەنەما)بوو،و لە مپەرێك بوو لەبەردەم دەستەڵاتی ڕەهای ئەمریکیەکان بەسەر کاناڵ و ناوچەکانی ئەو وڵاتەدا.

لەگەڵ هەریەکە لە (نوریجا)ی فەرمانڕەوای (پەنەما)، (ڕافاییل لیونداس)و فەرمانڕەوای (دومنیکان) خراپترین و ناشیرین ترین ڕووی دیکتاتۆریەکانی شوێنکەوتەی ئەمریکایان نیشاندا لە ناوچەکەدا.

بینوشیە کۆتاییەکەی لە هیچ کان لەوانەی نەکرد،نەوەك (نوریجا) کۆتای هات کاتێك کە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە تۆمەتبارکرات بە بازرگانی ماددەی هۆشبەر و گرتیان و خستیانە زیندانەوە، نە بە کوژراویش کۆتای هات کە لەلایەن گەلەکەیەوە بکوژرێت وەك

(لیونداس)،سەرەڕای چەند هەوڵێکی تیرۆرکردنیشی، بەڵکو لەسەر دەستی گەلەکی خۆی کۆتایان پێهێنا، کاتێك ناچاریان کرد واز لە دەستەڵات بهێنێت، سەرەڕای بە هێزی ڕژێمە سەربازیەکەشی، بەو شێوەیەش کۆتای هات بە (٢٧) ساڵ لە خنکانی ئازادیەکان و سەرنگون بوون یەکێك لە خراپترین دیکتاتۆرەکانی جیهان.

لە بەیانی ڕۆژی (٣ دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٦)ز ڕاگەیەنرا کە بینوشیە توشی (دڵە کوتێ) بووە، ئەمە دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك لە وەوپێش خرابوویە ژێر مانەوی بە زۆر، لە ڕۆژی (٤ دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٦)ز دادگای پێداچوونەوەی چیللی بڕیاریدا بە هەڵگرتنی سزای مانەوەی بەزۆری لەسەری، لە (١٠ دیسەمبەری ساڵی٢٠٠٦)ز بینوشیە بە هۆی توند بوونی نەخۆشیەکەیەوە ڕەوانەی یەکێك لە نەخۆشخانەکانی ولآت کراو، لەوێ خرایە ژێر چاودێری وردی تەندروستیەیەوە،دواجار لە هەمان ڕۆژدا و بە هۆی لە کارکەوتنی دڵیەوە گیانی لە دەستدا.



عبدالكريم قاسم دوای كردەی تیرۆركردنەكەی!!



احمد حسن بكر و صدام حسين پێش ئەوەی بەكر باجی متمانەیەكی بێ پاسا و بدات به صدام حسين !!

## 15-عباس و هەنیە......

## نەهامەتی گەڕانەوەی دۆسیەکە بۆ دواوە!!



له مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلاندا،هەڵەی کارەساتبار ڕوویانداوە، کە خۆی بینیوەتەوە لە ملمڵانێ ی ناوخۆی ئەو بزوتنەوانەلەسەر دەستەڵات، کە دواجار بووەتە هۆی ئاژاوەو دوو بەرەکی دابەش بوون و پەرت بوونیان، سەرجەم ئەو شتانەشی لەبار بردوون کە بە درێژای مێژووی خەباتیان بەدەستیان هێناوە، بوونەتە نێچیرێکی ئاسان بۆ دوژمنانیان.

له مێژوودا نمونەی زۆر لەم جۆرە بزوتنەوانە هەیە، کە هەڵەی گەورەیان ئەنجامداوە،بەڵام بە ئەندازەی ئەو هەڵانە نا کە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی فەلەستینی ئەنجامیداون لەم ساڵانەی دوایدا، لە هەڵەی کوشندە کە ڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی ململانێ ی دەستەڵات لەنێوان بزوتنەوەی فتح بەسەرکردایەتی(محمود عباس)و بزوتنەوەی حماس بە سەرکردایەتی (ئیسماعیل هەنیە).

ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ململانێ ی لایەنگرانی هەردوو بزوتنەوەی فتح و حماس لە پێناو بەرنامەیەکی سیاسی نیە کەپەیوەندی بە ئازادکردنی زەویە داگیرکراوەکان و دامەزراوەکانی دەوڵەتەوە هەبێت، بەڵکو ململانێ ی دەستەڵات و جەنگی دەست بەسەردا گرتنیەتی،جەنگ لەسەر ئەوەی کامیان حوکمی مەترێك لەو زەویانە بکات کە سوپای ئیسرائیل لە غەززە تیایدا پاشەکشەی کردووە، یان چەند کیلۆمەترێك لەزەویەکانی کەناری ڕۆژئاوای فەلەستینی.

ململانێ ی فتح و حماس لەر دەستەڵات لە فەلەستین لەو کاتەوە دەستیپێکرد، کە بزوتنەوەی حماس لە هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکەی سەرەتای ساڵی (٢٠٠٦)ز سەرکەوتنی بەدەستهێنا. ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی پەرلەمانی ئازاد و شەفاف و پاك، دەستکەوتێکی

گەورەی دەستەڵاتی فەلەستینی بوو، و نموونەیەکی شارستانی و مەدەنی لە پەیوەندی هێزو ڕەوتە جیاوازەکانی هێزە فەلەستینیەکاندا.

بەڵام ئەو شادی و سەرکەوتنەی گەلی فەلەستینی تەواو نەبوو، کاتێك گەرمای جیاوازی و ناکۆکیەکان دەستیپێکرد، لە نێوان دوو لای سەرەکی ململانێکەدا:لایەك کە هەستی دەکرد شتێکی لەدەست چووە کە هی خۆی بووە و پێویستە بە زوترین کات وەری بگرێتەوە کە بزوتنەوەی (فتح) بوو،لایەکی تر کە هەستی دەکرد سەرکەوتوو بووە لە بەدەستهێنانی متمانەی خەڵکی و پێویستە دەستەڵاتەکان بە خێرای وەربگرێت کە بزوتنەوەی (حماس) بوو.

فتح پارێزگاری لە دەستڕۆشتووی خۆیی دەکرد بەسەر ڕێکخراوی ئازادی فەلەستینی و پۆستی سەرۆکایەتی وڵاتدا،هەروەك چۆن بە شێوەیەکی کردای پارێزگاری لە دەستەڵاتی خۆی بەسەر دەزگای ئاسایش وخزمەتی شارستانیدا دەکرد، لە کاتێکدا کەحماس دەستەڵاتی هەریەکە لە ئەنجومەنی یاسادانان و سەرۆکایەتی حکومەتی فەلەستینی بەدەستەوە گرت.

هەر دوولا چوونە ململانێ وە لەسەر دەستەلات، بەڵام هەردوو لا زەرەرمەند بوون تیایدا و، گەلی فەلەستینیشیان تووشی نەهامەتی کرد لەگەڵ خۆیاندا، لە کاتێکدا هەر یەکە لە ئەمریکیەکان و ئیسرائیل هەوڵی نانەوەی ناکۆکی زیاتر و سەرخستنی لایەك بەسەر لایەکی تریاندا دەدا.

لەیەکەم ساتی گەیشتنی حماس بەدەستەلات، ململانێ لەسەر دەستەلات دەستی پێکرد، کە هەریەکەیان بۆ خۆی دەویست، تا دەستەڵاتێکی زۆری هەبێت بەسەر جڵەوی کارەکاندا.

نیشانە سەرەتاییەکانی ئەو ناکۆکیە، لەدامەزراندنی ژمارەیەك فەرمانبەرو پڕکردنەوەی بۆشاییەکان دەرکەوت لە دامەزراوەی سەرۆکایەتی فەلەستیندا کە بەدەست بزوتنەوەی( فتح)وە بوو، ئەمە جگە لە لەو شتانەی کە لە کۆبوونەوەی کۆتای ئەنجومەنی یاساداناندا ڕوویاندا، کە بزوتنەوەی فتح زۆرینەی پێکدەهێنا و باڵادەست بوو تیایدا، کاتێك لەو

کۆبوونەوە کۆتاییەدا کۆمەڵێك بڕیار و ڕاسپاردەی پەسەند کرد کە بە گوێرەی ئەو بڕیار و یاسا و ڕاسپاردانە دەسەڵاتەکانی سەرۆکایەتی فەلەستینی فراوانتر کرد، پاش ئەمە کۆبوونەوەی کردنەوەی خولی نوێ (زریان)ی ئەنجومەنی یاسادانای بەدوادا هات، هەر لەو دانیشتندا کوتلەی پەرلەمانی بزوتنەوەی حماس، کە زۆرینەی ئەنجومەنەکەیان پێکدەهێنا، سەرجەم ئەو بڕیارو ڕاسپاردانەیان هەڵوەشاندەوە، کە لە کۆتا دانیشتنی خولی پێشوودا پەسەندج کرابوون لەلایەن ئەندام پەرلەمانەکانی بزوتنەوەی(فتح)وە.

بەلام لە ڕاستیدا ململانێکانی نێوان فتح و حماس لەسەر ناڕوونی یاساکان دروست نەبوون، یاساکان ڕوون و ئاشکرابوون لە دیاریکردنی دەسەڵاتەکانی هەردوو دامەزراوەی سەرۆکایەتی فەلەستین و حکومەتدا، بەڵکو لەسەر ئەوە ڕوویدا کە پێشتر ئەو دوو پۆستە لەلایەن بزوتنەوەی فتح خۆیەوە بەڕێوەدەبران، بەلام ئێستا پاش سەرکەوتنی بزوتنەوەی حماس سەرۆکایەتی حکومەت بەدەست ئەوەوەیە و کێشەی دیاریکردنی دەسەڵاتەکان هەیە لە نێوان دامەزراوەی سەرۆکایەتی فەلەستین و حکومەتدا، کە هەر یەکەیان بەدەست یەکێکیانەوەیە. ئەبو مازن و بزوتنەوەی فتح هەوڵیاندەدا بۆ مانەوەی تاکڕەوی دەسەڵاتی خۆیان لە پۆستەکاندا، جا ئیتر لە ڕێگەی دامەزراندنی فەرمانبەر، یان بەخشینی هەندێك پۆستی حکومی بە هەندێك کەسایەتی بە شێوازی جیاواز، یان تەنانەت بە مانگرتن و یاخی بوونی مەدەنیش بێت.

دواتر ململانێکە گوێزرایەوە بۆ وەزارەتی دەرەوەو نوێنەرایەتی دەرەوەی وڵات، لە کاتێکدا کە یاسای فەلەستینی وەك هەمووان، کارەکانی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی کورت دەکردەوە لە کاروباری ناوخۆدا، و دەسەڵاتی گەورەی دەبەخشیە سەرۆکایەتی فەلەستینی، بە تایبەتی لە بواری پەیوەندیە دەرەکیەکاندا.

ململانێکە لە مەڕ وەزارەتی دەرەوە لەسەر دوو ئاست بوو :یەکەمیان ناوخۆیی بوو پەیوەندی بە سەرپەرشتیکردن هەبوو لەسەر کاروباری وەزارەت و فەرمانبەرانی وەزارەت و کاری دیبلۆماسی، دووەمیش لەسەر ئاستی نوێنەرایەتی و بەشداریەکانی دەرەوە بوو،کە لە چەند بۆنەیەکدا بە دیارکەوت، یەکەمیان لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی

ولآتانی بێلایەن لە (کوالالامپور)لە کۆتاییەکانی مانگی مایۆی ساڵی(٢٠٠٦)ز کە پێکدادان و ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان (زەهار)و سەرۆکی بازنەی سیاسەتی ڕێکخراوی ئازادی فەلەستینی (فاروق قدومی) بە خۆوە بینی، ئەمە شان بەشانی ناکۆکیەکانیان لەسەر نوێنەرایەتی کردنی فەلەستین لە کۆبوونەوەکانی کۆمکاری عەرەبی.

ململانێکە زیاتر ترسناك بوو لە بواری ئاسایش و وەزارەتی ناوخۆدا، کە تەوەرەی سەرەکی ناکۆکیەکانی دەسەلآت بوو لە نێوان هەردوو لادا، سەرۆك محمود عباس و هاوکارەکانی هەمیشە بیانویان دەدۆزیەوە،بۆ کێشانەوەی دەستەلآتەکانیان، یان وازهێنان لە دەستەلآتیان، کە بە پێی یاسا و عورفیش لە دەستەلآتەکانی وەزارەتی ناوخۆ بوون، وەك بەرپرسیاریەتی پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ، و بەڕێوەبردنی خەندەق تونەیل و خاڵە سنوریەکان، ئەمە سەرەڕای ململانێ لەسەر دامەزراندنی کارمەندانی ئاسایش و دەربارەی بابەتی هێزی جێ بەجێکردن کە وەزارەتی ناوخۆی سەر بە بزوتنەوەی حماس دایمەزراند بوون، لە ڕووی دامەزراندن و کار و ئەو نارەحەتی و لە مپەرانەی دەهاتنە ڕێگەی، وە ئەو مشت و مڕە یاسایەیی کە لەسەری دروستی بوو بوو، هەروەها دەربارەی پلامی ئەمنی کە وەزیری ناوخۆ (هانی قواسمی) لە حکومەتی یەکێتی نیشتمانی پێشکەشی کرد بوو، دوای ڕێکەوتنامەی (مككه)، وە ئەو لە مپەرانەی بەردەمی کە بەبێ جێ بەجێکردن هێشت بوویەوە، وای لە (هان)ی کرد دەستلەکار بکێشێتەوە، لە بەرامبەر هەستکردنی بەوەی کە هەموو دەستەلآتەکان بەدەست بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشی ناوخۆ (ڕەشید ئەبو شباك)ە وەن، ئەو هیچ جۆرە دەستەلآتێکی نیە،تەنها ئەوانە نەبێت کە لە ڕێگەی ئەوە وە نەبێت، بە گوێرەی ئەوەی کە خۆی لە نامەی دەستلەکارکێشانەوەکەیدا نوسیویەتی.

هەرچی دەربارەی هەڵوێستی هەریەکەلە سەرۆکایەتی فەلەستینی کە بەدەست بزوتنەوەی فتحەوە بوو، و حکومەتی فەلەستینی کە بزوتنەوەی حماس بەڕێوەی دەبرد، دەربارەی یەکەکانی بەرگری و چەکەکانیان ئەوە جیاوازیەکی زۆری لەسەر هەبوو،سەرەڕای ڕێکەوتنی هەردوولایان لەسەر کۆتای پێهێنانی بێسەرو بەرەی هەڵگرتنی

چەك، كە بوو بووە هۆی دروست بوونی كێشەی ئەمنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو لایان لە ململانێیەكی بەردەوامدا بوون، لەسەر چۆنیەتی نەهێشتنی ئەو بێ سەروبەریە.

عباس پێداگری دەكرد لەسەر هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاكان و داماڵینی سەرجەم چەكەكانیان، بە شێوەیەك چەك تەنها بەدەست دەزگای ئاسایشی فەلەستینیەوە بێت، لە بەرامبەردا حماس ڕەدی دەكردەوە كە چەك دابنێت و، داوای دەكرد كە جیاوازی بكرێت لە نێوان چەكی خۆیی و چەكی بێ سەروبەرەیدا، كە بوو بووە هۆی تێكدانی باری ئاسایشی وڵات.

دواتر داواكاری عباس هات بۆ هەڵبژاردنی پێشوەختە، ئەو بابەتە زۆرترین مشت و مڕی وروژاند لەسەر ململانێ ی دەستەڵات، لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی پێش وەختە، چەكێك بوو بەدەست محمود عباس و تیمەكەیەوە كە بزوتنەوەی حماسی پێ دەترسێنرا. پاشان پرسیارێك هاتە ئاراوە كە ئایا سەرۆك مافی ئەوەی هەیە داوای هەڵبژاردنی پێش وەختەی ئەنجومەنی یاسادانان بكات؟ كە ئەوەش بە دیوەكەی تریدا بە واتای هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئەنجومەنە دەهات كە حماس باڵادەست بوو تیایدا، بەڵام دواجار كۆتا هات بەوەی كەپسپۆڕانی بواری یاسا ڕایانگەیاند سەرۆك ئەو دەستەڵاتەی نیە كە داوایەكی لەو جۆرە پێشكەش بكات.

پاشان عباس ئاماژەی بە بڵاوكردنەوەی هێزی نێودەوڵەتی كرد و دواكەی تایبەتكرد بە (غەززە)،ئەو هەنگاوەشی لە چوارچێوەی ئەو ململانێیە دەها كە هەی بوو لەگەڵ بزوتنەوەی حماس، وەك هەوڵێك بوو بۆ تێكشكانی دەستەڵاتی ئەو بەسەر كەرتی غەززدا، بە هاوكاری و یارمەتی هێزە بیانی.

سەرۆك محمود عباس بۆ ئەو مەبەستە (سێ)مەرسومی سەرۆكایەتی دەركرد لە مانگی یونیو ساڵی (٢٠٠٧)ز وەك وەڵامێك بۆ دەستگرتنی بزوتنەوەی حماس بەسەر كەرتی غەززەدا، كە پێكدەهاتن لە: دەستلەكاركێشانەوەی حكومەتی یەكرێزی نیشتمانی بە سەرۆكایەتی (ئیسماعیل هەنیە)، ڕاگەیاندنی باری نائاسای،دروستكردنی حكومەتێك بە سەرۆكایەتی (سلام فیاز).

دەرکردنی ئەم مەرسومانە بە خێرای مشت و مڕێکی زۆری نایەوە، بەتایبەتی مەرسومی دامەزراندی حکومەت، کە لە یاسی بنەڕەتی فەلەستینیدا شتێکی تێدا نەبوو لەسەر دروستکردنی حکومەت لەکاتی نائاسایدا، لێرەدا کەس نەدەگەڕایەوە بۆ ئەوی کە کێ سکالای هەیە لە مەڕ ڕاگەیاندنی باری نائاسای، تەنانەت ئەگەر ئەو ڕاگەیاندنەش نا شەرعی بوایە، لە کاتێکدا ئەو حاڵەتە نایاسایيە پوچەڵ دەبوویەوە ئەگەر ئەنجومەنی یاسا دانان پەسەندی نەکردایە، بەڵام کێشەو قەیرانی حکومەتی شەرعی لە نێوان هەردوو لادا بە هەڵواسراوی مابوویەوە، واتە لە نێوان (هەنی)و (فەیان)دا، هەرچەندە ئەوەی کە زیاتر دەردەکەوت لەبەرژەوەندی (هەنیە)دا دەشکایەوە، وەك حکومەتی کاربەڕێکەر، تا ئەو کاتەی هەر حکومەتێکی تر متمانەی ئەنجومەنی یاسادانان وەربگرێت.

لە ژێر ڕۆشنای ئەو هەموو شتەدا،ململانێکە لە ژێر پەردەی دەستەڵات و ناوەندی دروستکردنی بڕیاردا بە ئاشکرا تەقیەوە، لەگەڵ بوونی دوو حکومەتدا کە هەر یەکەیان بە جیا بڕیاری دەردەکرد و فەرمانبەری دادەمەزراند و لە کارەکان دووری دەخستنەوە، و سەرپەرشتی دەزگایی ئاسایشی لە ناوچەکەی خۆیدا دەکرد، ئەمە جگە لەوەی کە بووە هۆی دروست بوونی کەرت بونێکی گەورە لە نێوان هەردوو بەشی فەلەستینی (کەناری ڕۆژئاواو کەرتی غەززە)دا.

ململانێ فتح و حماس گەورە بوو گەیشتە نێو نوسراوەکانی نەتەوە یەککرتووەکان، لەو کاتەی کە نێردەی تایبەتی فەلەستینی پرۆژە یاسایەکی پێشکەش کرد و بزوتنەوەی حماسی بە میلیشیای چەکدای دەرەوەی یاسا لە قەڵەمدا، وە داوای کردبوو کە بارودۆخەکە بگەڕێتەوە بۆ پێش ئەو کاتەی کە حماس دەستەڵاتی لەو کەرتەدا بەدەستەوە بوو.

مەسەلەی بانگکردنی خولی نوێ ی ئەنجومەنی یاسادانان بۆ دانیشتنی خولی دووەمی لە ساڵی (٢٠٠٧)ز، بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی دەستەی نوێ ی مەکتەبی سیاسی،بابەتی داواکردنی هەڵبژاردنی پێش وەختەی ئەنجومەنی یاسادانان، هەموو ئەمانە لەسەر بنەمای ڕێگە پێدانی ئەنجومەنی ناوەندی ڕێکخراوی ئازادی فەلەستینی بوون. ئەمە سەرەڕای

خستنە ڕووی بڕیار و ومومارەسەی دەستەڵات، کە خۆی دەبینیەوە لە کاری ئیداری و دامەزراوەکانی سەر بە هەردوو حکومەتەکەی هەنیە و فیاز کە هەردووکیان بەشیان تێدا هەبوو، ئەو بڕیارانەی کە تایبەت بوون بە دەزگاکانی ئاسایش و دەستەڵاتی جێ بەجێکردن هەردوولا بە جیا بڕیاریان لەسەر دەردەکرد، هەروەها ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە تونێلەکان و یەکەکانی بەرگری و چەکەکانیانەوە هەبوو هەر بەو شێوەیە بوو بڕیار و بۆ چوونەکان جیاوازبوون لەسەریان، محمود عباس بۆخۆی لە مانگی یونیوی ساڵی(٢٠٠٧)ز لە کاتی سەردانی کردنیدا بۆ فەرەنسا داوای هێزی ئاشتی پارێزی نێودەوڵەتی کردبوو بۆ کەرتی غەززەو کەناری ڕۆژئاوا.

بە هۆی هەموو ئەو ڕوداوانەوە کە ڕویاندا، کۆرەپانی فەلەستینی ڕژانی خوێنی فەلەستینی بەدەستی فەلەستینی بە خۆوە بینی، و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەو وڵاتەشی دەیان ساڵ بەرەو دواوە بردەوە ! !

لەبەر ئەوەی ئەو گرژیە سەربازیەیی دوای کە لە نێوان هەردوو بزوتنەوەی فتح و حماسدا ڕویدا ئاسای نەبوو، و یەکەم هەنگاو بوو بۆ چوونە نێو جەنگێکی ناوخۆییەوە، دوای ئەوەی سەد کەس لە چەکدارانی هەردوولا کوژران.

لێرەدا پێویستە ئەو پەیامانەی جەنگی ناوخۆ بپشکنین، کە هەر لایەکیان ئاڕاستەی لاکەی تری دەکرد، لە کاتی ئاڵۆز بوونی کرژیەکانی نێوانیان، لەبەر ئەوەی ئەو پەیامانە لێکەوتەو مەترسی ئاییندەییان هەبوو بوونە هۆی ڕشتنی خوێن:

یەکەم پەیامی گشتی لەدەرئەنجامی پەرچەکرداری هەردوولادا دەرکەوت:هەردوولا سەلماندیان کە جەنگەکەیان لەسەر دەستەڵاتە لە جیاتی ئازادکردنی زەویە داگیرکراوەکان، واتە بزوتنەوەی فتح بە هەموو توانایەوە هەوڵیدەدا بگەڕێتەوە سەر دەستەڵات، ئەگەر تەنانەت بە هاوکاری سەربازی ئەمریکی و ئیسرائیلیش بێت، بۆ دورخستنەوەی حماس لە دەستەڵات. ئەزموونی بزوتنەوەی حماسیش لە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکانی لە دەستەڵاتدا بنەڕەتی و دروست بوو، دواتر گرنگیدان بە پاراستنی شتێکی خراپ بوو بۆ بزوتنەوەکە، لەبەر ئەوەی جەنگی لەسەر دەستەڵاتێکی خەیاڵی

دەکرد و دەترسا لەوەی کە ئەگەر وازی لێبهێنێت بە تایبەتی وەزارەتی ناوخۆ، بزوتنەوەی فتح ئەوە بقۆزێتەوەو بەکاری بهێنێت بۆدژایەتی کردنی و تەنگ پێهەڵچنینی.

پەیامی دووەم گرنگە، لەبەر ئەوەی کە گرژی سەربازی لە نێوان هەر دوولادا لەمپەرەکانی عەقلانیەتی تێکشکاند بوو.حاڵەتی دابڕاوی لە نێوان هەردوو تیمی ململانێکەدا چەسپاند بوو :بە شێوەیەك دامەزراوەکانی حکومەت بەدەست بزوتنەوەی حماسەوە بوون و، دامەزراوەی سەرۆکایەتی فەلەستینیش بەدەست (ئەبو مازن) و بزوتنەوەی فتحەوە بوون. ئەوە ئاماژەیەکی مەترسیداربوو، لەبەر ئەوەی دیاردەکانی جەنگی ناوخۆی هەردوو بەرەکەی دیاریدەکرد، کە هەر یەکە لە ئیسرائیل و ئەمریکیەکان خوێ یان پێدا دەکرد، بە ڕادەیەك کە ئیسرائیل قسەی لەسەر دواخستنی پەرچەکرداری تۆڵە کردەی (ئیلان)ی دەکرد، تا ئەنجامدانی هەر جۆرە هێرشێکی ئیسرائیلی نەبێتە هۆی دروست بوونی لەمپەر لەبەردەم جەنگی ناوخۆی فەلەستینی و نەبێتەوە هۆی جارێکی تر یەکگرتنەوەی فتح و حماس لە دژی داگیرکاری ئیسرائیلی.

جێگیربوونی حاڵەتی جیابوونەوەی دابڕان لە نێوان هەردوو لادا پرسیار بە دوای خۆیدا دەهێنێت:کە ئایا دەوڵەتی فەلەستینی دابەشدەبێت بۆ کەرتی غەززەی سەر بەحماس و کەناری ڕۆژئاوای سەربە فتح، بە تایبەتی دوای ڕوودانی هێرشی تۆڵەسێنەری دوولایەنە بۆ سەر ناوەندو کۆمەڵگاکانی هەردوو لا لە کەرتی غەززەو کەناری ڕۆژئاوا، لەلایەن دەستەیەکی دوژمن و ناحەز، کە لەکردەی ئەو کۆچ پێکردنە بەزۆرە دەچوو کە لە عێراقدا هەبوو بۆ گۆڕینی شوێنەکانی نیشتەجێ بوون لە نێوان سوننە و شیعەکاندا.

پەیامی سێهەمی فریاکەوتن:بە کۆتای هاتنی قسەی ڕازاوەو سۆزداری و گواستنەوە بۆ جەنگی ناوخۆی فەلەستینی لە نێوان هەردوو بزوتنەوەی فتح و حماس، یان لە نێوان یەکەکانی بەرگریدا. گواستنەوەی ئەو سۆزداریە بۆ جەنگی ناوخۆ پێشتر شتێکی بینراو بوو، لەبەر ئەوەی یەکەکانی بەرگری پێشترسور بوون لەسەر نەچوونە نێو دەستەلات و

زیاتر جەختیان لە مەسەلەی بەرپەرچدانەوەی داگیرکەر و ئازادکردنی زەویە داگیرکراوەکان دەکردەوە، بەڵام ئێستا هاوکێشەکە جیاوازە لەبەر ئەوەی کە گەورەترین یەکەی بەرگری نقوم بووە لە کێشەی دەستەڵاتدا، بەو شێوەیەش توشی گەورەترین سەرسامی بووە، لە نێوان دەستگرتن بەدەستەڵاتەوە بە رێگەنەدان بە فتح بە تێپەڕاندنی ریکەوتنامەکان بە ناوی فەلەستینەوە کە پڕبوون لە سازشی گەورە، وە لە نێوان دەستگرتن بە دەستەڵاتەوە بە بەردەوامیدان بە گەمارۆی نێودەوڵەتی و جەنگی ناوخۆیی.

مەترسی ئەم پەیامی کۆتای لەوەدا بوو کە جەنگی ینایری ساڵی (٢٠٠٧)ز ئەوەی سەلماند کە رێز بۆ خوێنی تاکی فەلەستینی لە ناوخۆدا نەماوە، و بارودۆخی فەلەستین چاکتر نیە لە بارودۆخی عێراق و لوبنان و چەندین دەوڵەتی تر کە رێزی خوێنی تێدا نەماوە لە ناوخۆی خۆیاندا. ئەو چەکەی لەجەنگی نێوان فتح و حماسدا بەکار هێنرا، لە بەردەم داگیرکەری ئیسرائیلیدا بەکار نەهێنرا بە درێژای ئەو شەڕەی کە لەگەڵ ئەودا هەیان بوو.

پەرەسەندنە سەربازیەکان دوای سەردانەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا(کۆندا لیزا رایس) بۆ ناوچەکەو گۆنکرەی (داڤۆس) دەستیی پێکرد، کاتێك کۆبوونەوەی محمود عباس و شمعۆن پێرێزی سەرۆکی ئیسرائیل و دوو بەرپرسی ئەمریکی لێکەوتەوە، کە باس لە یارمەتیدانی سەرۆکایەتی فەلەستینی کرا لەسەر حسابی حکومەتەکەی حماس، لە رێگە پێدانی (١٠٠)ملیۆن دۆلاری ئەمریکی لەلایەن ئیسرائیلەوە بۆ عباس و، هەندێك یارمەتی سنورداری سەرۆکی ئەمریکا بۆ سەرۆکایەتی فەلەستینی، کە ئەوەش دادەنرا بە جۆرێك لە دەستگرتنی خێرای سەرۆکایەتی فەلەستینی کە بەدەست فتحەوە بوو بەسەر

دەوڵەت و دورخستنەوەی حماس لەو هاوكێشەیە، بە شێوەیەك كە تانك و دەبابەكانی سەرۆكایەتی فەلەستینی جوڵەیان پێكرا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بزوتنەوەی حماس، لە كاتێكدا ئەو تانك و دەبابانە پێشتر هیچ جۆرە جوڵەیەكیان پێنەكرا بوو تەنانەت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی داگیركاری ئیسرائیلیش.

هەریەكەیان ئەوی تری تۆمەتباردەكرد بە گرێ گرتەی دەرەكی، هەریەكەیان نیەت و مەرامەكانی ئەوی تری لە خانەی ناپاكی دوژمنە دەرەكیەكان دادەنا. حماس ئەو كردەوانەی كە هەندێك لە هێزە ئەمنیەكانی سەر بە سەرۆكایەتی فەلەستینی ئەنجامیان دەدا،بە تایبەتی ئاسایشی پاراستن و هێزەكانی سەر بە (محمد دحلان)، بە بەشێك لە پیلانی ئیسرائیل و ئەمریكیەكانی دەزانی بۆ لەناوبردنی خۆی، و دەیگوت:هێرشكردن سەر لۆریە بارهەڵگرەكانی تایبەت بە سەرۆكایەتی بە مەبەستی دەست بەسەردا گرتنی ئەو چەكانە بوو كەی پێیان بووە، بۆ ئەوەی بیگوازنەوە بۆ سەرۆكایەتی فەلەستینی و ئەویش بەكاریان بهێنێت بۆ لێدانی حماس لە ئایندەدا، هەرچەندە حماس ڕاستی ئەو قسانەی نەسەلماند و هیچ وێنەیەكی ئەو چەكانەشی بڵاونەكردەوە كە باسی لێوە دەكردن.

فتحیش حماسی تۆمەتبار دەكرد كە جێ بەجێكەری پیلانی ئێرانە،وهێرشكەی خۆی بۆ سەر زانكۆی ئیسلامی و سوتاندنی نوسینگەو بیناكانی بەوە پاساو دەدایەوە كە گوایا بووەتە مۆڵگەیەك بۆ مەشق پێدانی توندڕەوەكان، جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە ئەو شوێنە هەشت پسپۆڕ و شارەزای سەربازی ئێرانی لێبووە، بەڵام دەستەوسان بوو لە سەلماندنی ئەوە و نەشی توانی بەڵێنەكانی بەرێتە سەر بە پیشاندانی وێنەی ئەو شارەزا

ئێرانیانە، کە ئەصڵەن بوونیان و وێنەگرتنیان زۆر ئەستەم بوو، بە هۆی بوونی ئەو گەمارۆ توندەی سەر کەرتی غەززە.

لە نێو ئەو هەموو هات و هاوار و سەرەتاکانی دەرکەوتنی جەنگی ناوخۆی، کوژانەوەی ئاگری ئەو جەنگە ناوخۆیە ناڕەحەت بوو، بە تایبەتی بوونی کوژراو بریندار لە ڕیزی هەردوو لادا. ئەمە لە کاتێکدا کە یەکەکانی تری بەرگری وەك (جیهاد و سەرایاکانی قودس) کردە و چالاکی سەربازیان لە نێو زەویەکانی ئیسرائیلدا ئەنجام دەدا، بە مەبەستی گەیاندنی پەیامێکی ڕاستەوخۆ بە هەردوو لای ناکۆك، بەوەی کە کێشەی گرنگ بریتیە لە داگیرکەری ئیسرائیل و پێویستە لولەی تفەنگەکان ڕووبەڕوی ئەو بکرێنەوە. لە وانەشە مەبەستی چالاکیەکانی یەکەکانی بەرگری تێکەڵکردنی دۆسیەکان و دروستکردنی لەمپەر بوو بێت لەبەردەم پلانی لەناوبردنی حکومەتەکەی حماس، بۆ ئەوەی پەرچەکردای سەربازی ئیسرائیل بۆ سەرهەمووان بێت و بەو هۆیەشەوە ئەو کات حاڵەتی توڕەبوونی فەلەستینی گشتگیر دەبێت و وەڵامدانەوەکە گشتی دەبێت بۆ سەر ئسرائیل، بەڵام ئەوە ڕووینەدا، وەڵامدانەوەی ئیسرائیل دواکەوت، بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجێکی گرنگتر، کە بریتی بوو لە دروست بوون و درێژەکێشانی جەنگی ناوخۆی فەلەستینیەکان.

لە نێو ئەو هات و هاوار و کەشە نائارامەدا، سەرەتاکانی دەستپێشخەریەکی بەهێزی شانشینی عەرەبستانی سعودی دەرکەوت، بۆ کۆکردنەوەی هەردوولای ناکۆك لە شاری (مەککە)ی پیرۆز، تا بەشکوم کەشێکی روحیان بۆ دروست بێت و ئەو جەنگە خوێناویەیی نێوانیان ڕابگرن. دەستپێشخەریەکە بە شێوەی کاتی توانی خوێن ڕشتن ڕابگرێت، بەڵام دابەشبوون بە خێرای گەڕایەوە و ململانێکان لەسەر دەستەڵات تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان

درێژەیان هەیە. بەو شێوەیەش کێ بڕکێ و ململانێ ی نێوان هەردوو بزوتنەوەی حماس و فتح کە دوو بزوتنەوەی سەرەکی فەلەستینی بوون، بە تەواوەتی دیمەنی سیاسی فەلەستینی داپۆشی، لەسەر حسابی کێ بڕکێ کردن لە دژی ئیسرائیل و سیاسەتەکانی لە زەویە داگیرکراوەکاندا.






ئەبومازن و هەنیە ... هەردوكیان هێزەكانیان پڕ چەك دەكرد بۆ رووبەڕووبونەوەی ئەوی تر , لەجیاتی رووبەڕووبوونەوەی هێزەكانی اسرائیل لەبەرامبەریان وەستا بوون!!



جەنگی فەلەستینی لەدژی فەلەستینی!!



قوربانی فەلەستینی بەگوللەی فەلەستینی!!

## 16-لویسی نۆهەم....لە خۆبایی بوون نهێنی نەهامەتیەکە!!



لویسی نۆیەمی پادشای فەرەنسا ڕایگەیاند، کە خۆی سەرکردایەتی هەڵمەتێکی گەورەی خاچ دروشمەکان دەکات، بۆ گەڕاندنەوەی شان و شکۆ و شەرەفی خاچ دروشمەکان کە لە شاری (منصورە)ی وڵاتی میسر لە دەستیان دابوو، ئەو باش دەیزانی کە بە دەستگرتنی بەسەر میصردا سەرجەم ئامانجەکانی تری دێنە دی، بەو شێوەیەش لویس سوربوو لەسەر ئەنجامدانی هەڵمەتەکەی.

ئەمە یەکێکەلەو ووتە بەناوبانگانەی لویس کە لە نامەکەیدا بۆ نجم الدین ئەیوبی نوسوە پێش ئەنجامدانی هەڵمەتەکەی: (ئێمە بەندەکان دەکوژین، و دەچینە نێو وڵاتەکانەوە و زەویەکان لە خراپەو گەندەڵی پاکدەکەینەوە، ئەگەر بێت و لەبەرامبەرماندا بوەستنەوە، ئەوە دەتانکەینە پەندی زەمانەوە، دەست و پەیوەندەکەت بە دیل دەگرین و هات و هاوار و قیڕەقیڕتان لێبەرز دەکەینەوە، و ڕەحم بە شکۆدارو بێ شکۆتان ناکەین. )

نجم الدین ئەیوب وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: (هەڕەشەمان لێدەکەیت و دەمانترسێنیت بە سوپاو سەرباز و ئەسپ و پیاوەکانت، نازانیت ئێمە خاوەنی کەسانی لەناوبەر و سەروەریەکانی شمشێرین، نەمانداوە بەسەر هیچ گەلێکدا تا نەمان ڕوخاندبێت و،هیچ سەرکەش و یاخیەکیش لێمان یاخی نەبووە ئیلا تێکمان شکاندووە، ئەگەر نامەکەم گەیشتە دەستت ئەوە ئێمە لە بۆسەدان بۆتان، هەر لەو نامەیەشیدا دوو ئایەتی قورئانی پیرۆزیشی تێدا نوسی بوو کە بریتی بوون لە سەرەتای سورەتی (النحل) (اتی امرالله فلا تستعجلوه سبحنه وتعلی عما يشركون) کۆتای سورەتی (ص) (ان هو الا دكر للعلمين، ولتعلمن نباه بعد حين).

بەلام لویسی نۆهەم هەڵەی تەمەنی خۆی ئەنجامدا، کاتێك بیری لە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی خاچ دروشمەکان کردەوە بۆ سەر موسڵمانان، و هیچ وانەیەکی لە مێژووی هەڵمەتەکانی تری پێشووی خاچ دروشمەکان وەرنەگرت، کە بە خراپترین شێوە تێك شکابوون و وەدەرنرابوون، سەرەڕای ئەوەی کە هێزەکانیشیان کۆکراوەی هێزی چەندین وڵات بوون!

پادشا لویسی نۆهەم لە پاریسی پایتەخت کۆبوونەوەیەکی گشتی ڕێکخست لە پاییزی ساڵی (١٢٤٥)ز کە تیایدا گەورە پیاوانی شانشینەکەی و پیاوانی کەنیسە و ژمارەیەکی زۆر لە میرەکانی فەرەنساو پیاوماقوڵانی تێدا ئامادەبوو. ..لەو کۆبوونەوەیەدا پەیمان و بەڵێننامە وەرگیرا لەوانەی کە ئارەزووی بەشداریکردنیان هەبوو لەو هەڵمەتەدا، لە پێش هەمووشیانەوە بۆخۆی دەستی پێکردوو ناوی خۆی تۆمارکرد بۆ ئەو هەڵمەتە کە بڕیاربوو بیکاتە سەر جیهانی ئیسلامی، پاشان بە دوای خۆیدا میرەکان یەك بەیەك ناوی خۆیان تۆمارکرد و ئامادەی خۆیان نیشاندا.

ئامادەکاریەکان لە فەرەنسا دەستیان پێکرد، بۆ ئامادەکردنی پێداویستیەکانی هەڵمەتەکە بە شێوەیەکی خێرا، فەرەنسیەکان دڵیان گەرم بوو بۆ سەرکەوتن و باوەڕیکردنی ئەو کەشتیەیی کە پادشا لویسی نۆهەم بەڕێی کردبوو، خۆبەخشەکان لە سەرجەم شوێنەکانی فەرەنساوە دەهاتن و ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەیان پتر دەبوو.

لویسی نۆهەم دەستیکرد بە ئامادەکردنی ماڵ و دارای پێویست بۆ ڕێکخستنی هەڵمەتەکەی، و پاڵپشتی کردنی بە خۆراك و چەك و تەقەمەنی، لەو باج و بەخشینانەی کە میر و پیاوماقوڵان و گەورە بازرگانەکانی ئەورووپا پێشکەشیان دەکرد.

هەڵمەتە پێویستی بە کەشتیگەلێکی بە هێز هەبوو، بۆ گواستنەوەی سەرباز و چەك وز تەقەمەنیەکانی جەنگەکە لە ڕێگەی دەریاییەوە، کەرتی دەریاوانی فەرەنسیش لەو کاتەدا خاوەنی کەشتی پێویست نەبوو بۆ ئەو گواستنەوەیە، بۆیە لویسی نۆهەم ناچار بوو ژمارەیەك کەشتی لە هەردوو دوورگەی (جەنەوە و مارسیلیا) بەکرێ بگرێت ، دوای ئەوەی کە (بندقیە) ڕەدی کردەوە کەشتی بداتێ بۆ ئەو مەبەستە، ئەوەش لە ڕوانگەی

ئەو پەیوەندیە دۆستانەی کە هەی بوو لەگەڵ هەردوو ناوچەی (شام و میصر) کە دەبووە هۆی تێکچوونی بەرژەوەندیە بازرگانیەکانی بندقیە لەگەڵ ئەو دوو شوێنەدا.

لویسی نۆهەم ئامادەی خۆی وەرگرت، بۆ دابینکردنی خۆراك و چەك و تەقەمەنی پێویست بۆ هەڵمەتەکەی، و کۆمەڵێك لە پیاوانی خۆی نارده دوورگەی (قبرص) بە دوو ساڵ پێش دەست پێکردنی ئەنجامدانی هەڵمەتەکەی، بۆ کڕینی ئەو پێداویستیانەی کە هەڵمەتەکە دەیخوازێت، بۆ ئەوەی ئەو شوێنە ئامادەبێت بۆ پێشوازیکردن لەو سوپاییەی کە بڕیارە بە و شوێنەدا تێپەڕێت بەرەو ڕۆژهەلأت و داگیرکردنی ناوچەکانی میسر.

لویسی نۆهەم لە (١٢ اغستسی ساڵی ١٢٤٨)ز لە پاریسەوە بەڕێکەوتی، دوای ئەوەی کە بەڕێکەوتنەکەی بۆ ماوەی نزیکی (٣) ساڵ دوا کەوت، بە هۆی ئامادەکاریەکانی دابینکردنی پێداویستیەکانی هەڵمەتەکەوە. لە (٢٥) هەمان مانگدا فەوجی یەکەمی هەڵمەتەکە بەندەری (یەجور)ی باشوری فەرەنساوە بەجێهێشت بەرەو دورگەی (قبرص)، دواتریش فەوجی دووەم بەندەری (مرسیلیای) بەجێ هێشت، تا پەیوەندی بکات بە فەوجی یەکەمەوە لە دورگەی قبرص. سوپاکەی لویس پێش ئەوەی هیچ جۆرە جووڵەیەك بکات هەشت مانگ لە دورگەی (قبرص) مایەوە دوای ئەوەی لە ساڵی (١٢٤٨) گەیشت بوونە ئەو دوورگەیە،لە میانەی ئەو ماوەیەدا کە لەوێ مانەوە ڕای لویس و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لەسەر ئەوە جێگیر بوو کە پێویستە ئەوان دەست بەسەر میسردا بگرن، بە هۆی ئەو ڕۆڵە زیندووەی کە هەی بوو بۆ لێدانی موسڵمانان لە شام، هەر وەك چۆن دەستگرتن بەسەر (دمیات) لە میسر هەلێکیان دەداتێ بۆ قۆستنەوەی سازشکردن لەسەر (قدس)، لە حاڵەتێکدا ئەگەر سوڵتان (نجم الدین ئەیوب) فەرمانڕەوای میصر مەرجی ئاگربەست و ڕێکەوتن بخاتە ڕوو.

له ماوەی مانەوەی لە قبرس پادشای فەرەنسا لویسی نۆهەم پێشوازیکرد لە نێردەیەکی تایبەتی مەغۆلەکان، نێردەکە پێشنیاری بەشداریکردنی مەغۆلەکانیان لە لە داڕنینی قدس و فەلەستینی لەدەست میصریەکان خستە بەردەم لویسی نۆیەم، و ئارەزووی خۆیان بۆ دروستکردنی هاوپەیمانیەتی لە دژی موسڵمانەکان نیشاندا، پادشای فەرەنساش پێشوازیکرد لەو دەست پێشخەریەو لەگەڵ نێردەی مەغۆلەکاندا شاندێکی فەرمی نارد بۆ دانوسان لەو بارەیەوە، هەرچەندە دواتر ئەو دەست پێشخەریە نەچووە بواری جێ بوجێکردنەوە.

سولْتان (صالح ئەیوب) زانیاری تەواوی پێگەیشت لەسەر تەواوی وەردەکاریەکانی هەڵمەتەکەی لویسی نۆیەم کاتێك کە لە شام بوو، لە ڕێگەی (فردریك ی دووم)ی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا، کە ئەو بۆ خۆی زانیاری تەواو و وردی هەبوو لەسەر پڕۆژەی هەڵمەتەکە، لەبەر ئەوەی ئیمپراتۆر پەیوەندیەکی باشی هەبوو لەگەڵ صالح ئەیوبی فەرمانڕەوای میسر،نێردەیەکی تایبەتی ناردە لای بە جلوبەرگی بازرگانیەوە بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە تا ئاگاداریی بکاتەوە لە تەواوی وردەکاریەکانی هەڵمەتەکەی خاچ دروشمەکان.

سولْتان ئەیوب زۆر بە خێرای دەستیکرد بە جوڵە سەرەڕای ئەوەی کە نەخۆشیش بوو، دیمەشقی بەجێهێشت و گەیشتە (ئەشموم تەناح) کە ئێستا بە (ئەشمون رومان) ناسراوە لە ناوەندی (دکرنس) سەربە پارێزگای (دهقلیە) لە میسر، لە بەرواری (١٨ مایۆی ساڵی ١٢٤٩)ز، و ئەو شارۆچکە بچوکەی کردە سەربازگەی سەرەکی و ناوەندی کردە دەریایەکان.

سوڵتان دەستیکرد بە ئامادەکاریەکانی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، و کاری لەسەر پارێزبەندی ئەو شارە دەکردەوە، بە هۆی ئەوەی کە دەیزانی ئەو شارە ئامانجی سەرەکی هەڵمەتەکانی پێشوو تری خاچ دروشمەکان بووە لە ڕابردوودا، بە خۆراك و چەك ئامادەی کرد و بەڵێنیدا بە خێڵی (بنی کنانە) کە خێڵێکی بەناوبانگ بوون بە ئازایەتی و نەبەردی بەوەی کە شارەکە بپارێزێت، سوپایەکیشی بەسەرکردایەتی (ئەمیر فخرالدین یوسف ی کوڕی شێخ موقەدەمی العساکر) لە ڕووی وشکانی ڕۆژئاواوە نارد بۆ (دمیات) تا بەرامبەر خاچ دروشمەکانەوە بووە ستێتەوە لە کاتی گەیشتنیان بە کەناراوەکانی میصر، تا بواریان نەدەن دابەزنە کەناراوەکانی میسر، بۆ ئەو مەبەستە ئەو هێزە بە ڕووی شارەکەدا سەنگەریان گرت و ڕووباری (نیل) یان خستە نێوان خۆیان و ئەوانەوە.

لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی (٤ یولیۆی ساڵی ١٢٤٩)ز هەڵمەتی خاچ دروشمەکان گەیشتە کەناراوەکانی میصر، و دابەزینە وشکانی، لە پێش هەمووشیانەوە پادشای فەرەنسا لویسی نۆیەم، پێش ئەوەی دابەزنە وشکانی هەندێك ڕووبەڕووبونەوە لە نێوان ئەوان موسڵمانەکاندا ڕوویدا تا نەهێڵن دابەزنە وشکانیەکانی میصر، بەڵام دواجا توانیان دابەزنە وشکانیەکان، پاش ئەوەی ئەمیر (فخرالدین) پاشەکشەی کرد بە سوپاکەی و ڕووباری نیلی تێپەڕاند بەرەو (دمیات) و ئەویشی بەجێهێشت بەرەو سەربازگەی (ئەشموم تەناح).

کاتێك دانیشتوانی (دمیات)سوپاکەیان بینی پاشەکشەی کرد، ترس و دڵە ڕاوکێ دایگرتن و دەستیانکرد بە هەڵهاتن بە ژن و منداڵ و پیریانەوە، ماڵ و گەنجینەکانی خۆیان بەجێهێشت کە پڕبوون لە گەنم و ئارد و خۆراکی ڕۆژانە، ئەوە سەرەڕای بەجێ هێشتنی ئەو چەکە قورسانەی کە سوپاکە لە دەرئەنجامی پاشەکشێدا بەجێی هێشت بوون.خاچ پەرستەکان توشی سەرسام بوون هاتن کاتێك بینیان دەروازەکانی شارەکە

کراوەن و شەقامەکانی چۆڵن کەسیان تێدا نابینرێت، ترسان لەوەی کە ئەو فێڵێك بێت، و ماوەیەك مانەوە نەچوونە نێو شارەکەوە، تا دڵنیا بوونەوە لەوەی کە چۆڵەو کەسی تێدا نیە، پاشان بەبێ جەنگ چوونە ناو شارەکەوە. پاشان ڕووداوەکان بەدوای ئەمەدا هاتن و جیهاد و تێکۆشان لە دڵی موسڵمانەکاندا گڕی گرت، و کارەکە بە تێکشکانێکی خراپی هەڵمەتی خاچ دروشمەکان کۆتای هات.

صالح ئەیوب فەرمانڕەوای میصر ئەوکاتەی کە هەڵمەتی خاچ دروشمەکان گەیشتە شاری (دمیات)ی میصر خۆی لە شام بوو، کاتێك بە هەواڵەکەی زانی بە خێرای بەرەو میصر گەڕایەوە، بەڵام لە ڕێگەدا کۆچی دوای کرد و (شجر الدر)ی هاوسەری هەواڵی مردنەکەی شاردەوە نەیگەیاندە (توران شای ) کوڕی صالح ئەیوب، بۆ خۆی سەرپەرشتی جوڵانەوەیەکی بەرگری کرد و، ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر ئەو پلانەی کە (زاهیر بیبرس) دای نابوو، بە پێی ئەو پلانە (بیبرس) هەموو هێزەکانی میصری لە نێو شاری (منصوریە)دا حەشاردا، و فەرمانیکرد بە قەدەغەکردنی هاتوچۆ و خەڵکی منصوریەی پابەند کرد کە لە ماڵەکانی خۆیان بمێننەوە و نەیەنە دەرەوە بە فەرمانی ئەو نەبێت، ئەمە جگە لەوەی کە فەرمانیدا بە سەربازە میصریە ئەیوبیەکان کە لە بۆسەکانیی خۆیاندا بمێننەوە تا ئەو کاتەی ئەو فەرمانیان پێدەکات.

پاشان خاچ دروشمەکان بەسەرکردایەتی (روبرت ونت ئەرتوا) لە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا چوونە شاری (المنصورە) لە بەرەی ڕۆهەلاتی شارەکەوە، بینیان شارەکە هیچ جۆرە بەرگریەکی تێدا نیە، ڕۆبرت وا گومانی برد کە سوپا و خەڵکی شارەکە ڕایانکردووە و شارەکەیان بەجێ هێشتووە، دوای بینیی ئەوەی کە لە سەربازگەی (جەدیلە)روویدا بوو (گوندێکی نزیکی شاری منصوریە بوو لەسەر ڕێگای دمیات، خاچ دروشمەکان بە چەند ڕۆژێك پێش ئەوە دەستیان بەسەردا گرت بوو ) هیوایەکی بە هێزیان هەبوو بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە ماوەیەکی نزیکدا.

سوارە خاچ پەرستەکان بە ئەسپەکانیانەوە بە کۆڵان و شەقامەکاندا بڵاو بوونەوە،وەك ئامادەکاریەك بۆ ڕۆشتنی (ڕۆبرت)بۆ کۆشکی سوڵتانی لە ئەوپەر شاری منصوریە، بۆ

خۆبەدەستەوەدانی تەواوەتی و داننان بەسەرکەوتنی یەکجارەکی خاچ دروشمەکان. بەلاَم لە ڕاستیدا ڕۆبرت لە خشتە برابوو، لەو کاتەی کە خەریك بوو نزیك دەکەوتەوە لە کۆشکی سوڵتانی، فەرمان لە سەرکردە(بیبریس) وە دەرچوو کە فەرماندەی سریەکانی گەمارۆدانی دەکرد، بە لێدانی هێزەکانی (ڕۆبرت) و توانی ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان لێ بکوژێت، لەو ژمارە زۆرە ئەسپ سوارانەی کە بەشارەکەدا بلاَوبوو بوونەوە، دوای ئەمانیش لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردە سەر (ڕۆبرت)و هاوڕێکانی لە نزیك کۆشکی سوڵتانی،لە دەرئەنجامدا ڕۆبرت و سەدان کەس لە خاچ دروشمەکان هەڵهاتن بە ئومێدی ڕزگار بوونیان. لێرەدا ڕۆڵی خەڵکی شاری منصوریە دەدرەوشێتەوە، کە بەشداریەکی کارایانکرد لە هێرشکرنە سەر خاچ دروشمەکان لە ناوبردنیان، بە هەرچیەك کە بەدەستیانەوە بوو لێیان دەدان و ڕاویان دەنان.

ڕۆبرت پەنای بردە بەر خانوویەك لە نزیك کۆشکی سوڵتانی، لەوێ خۆی حەشاردا بە ئومێدی دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ ڕاکردنی. ...بەلاَم خەڵکی منصوریە نەوەستان و هێرشیان کردە سەر خانووەکەو دەریان هێناو کوشتیان، سەرچاوە مێژوویەکان باس لەوە دەکەن کە ژمارەی کوژراوانی خاچ دروشمەکان لە شاری منصوریە نزیکەی هەزار کوژراو بووە، لە کاتێکدا هەندێك سەرچاوەی تر باس لە کوژرانی هەزار و پێنج سەد کەس لە خاچ دروشمەکان دەکەن.

### +سەرەتای کۆتای

پاشان توران شا گەیشت و، سەرکردایەتی سوپای عەرەبی گرتە دەست. کردە سەربازیەکانی بە دەستگرتن بەسەر سەرجەم ئەو شتانەی کە خۆراك و زەخیرەیان دەگواستەوە بۆ فەرەنسیەکان دەست پێکرد، بەو شێوەیەش لەمپەری دروستکرد بۆ

گەیشتنی یارمەتی بە فەرەنسیەکان، و ناچار بە شکانی کردن دوای ئەوەی چەك و تەقەمەنی خۆراکی پێویستیان نەما تا بەرگری لە خۆیان بکەن، و بەرگریکارانی عەرەب هێرشیان کردە سەریان تا کۆتا خاڵەکانی سنور ڕاویاننان، لە کاتی پاشەکشەشیاندا جەنگێکی یەکلاکەرەوە لە نێوانیاندا ڕوویدا.

ژمارەی کوژراوانی خاچ دروشمەکان لەو جەنگەدا وەك چۆن مێژوونوسان باسیدەکەن، گەیشتە نزیکەی (٣٠) هەزار کەس و بوونە پەند و وانەیەکی مێژووی بۆ هەرکەسێکی سەرکەشی یاخی بوو لە پاش ئەوان.

**+سەرئەنجامی ستەمکارو ملهوڕ**

جەنگێکی یەکلاکەرەوە لە (میت النصاری) (منیه النصر) نزیك شرمساح،ڕوویدا، ئەو شارۆچکەیەیی کە بە بەناوی (منیه ئەبی عباللە) ناسراوە، لەو جەنگەدا سەرەتاکانی سەرکەوتنێکی نزیك دەرکەوتن، کاتێك لویسی نۆهەم گەیشتە ئەو باوەڕەی کە هیچ ئومێدێك بۆ سەرکەوتنی پاشماوەی سوپاکەی نەماوە، ئەو سوپاییەی کە دەیبینی لە بەردەمیدا ڕادەکەن و لێیان دەکوژرێت، بۆیەپێشنیاری خۆبەدستەوەدانی خستە بەردەم هەریەکە لە (توشی رشید الدین، ئەمیر فخرالدین القمری) داوای پارێزگاری بۆ خۆیی و دەست و پەیوەندەکەی دەوروبەری کرد، بە تایبەتی سەرباز و کەسە نزیکەکانی خۆی، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە ڕەزامەندیان لەسەرپێشنیارەکەی دەربڕی، هەرچەندە ژمارەیەك لە فەرەنسیەکان خۆیان نەدا بەدەستەوەو لەسەر دەستی نیشتیمان پەروەرەکانی میصر کوژران.

لویسی نۆهەم بە کۆتاییەکی ئازار بەخش خۆیدا بەدەستەوەو، گوازرایەوە بۆ ماڵی(ئیبراهیمی کوڕی لوقمان)ی قازی شاری المنصورە، لەوێ بەندکراو چاوەڕێ ی ئەوەی دەکرد کە چی بەرامبەر دەکەن. پاشان دەوروبەری پڕکرا لە ئەفسەری خاچ دروشمی دیل کراوی فەرەنسی و بەریتانی، ئەمە جگە لەوەی سەربازگەیەکیشان لە دەرەوەی شار بۆ پاشماوەی سەرباز وبیرندارەکانی تری سوپاکەی لویسی نۆیەم دروست کرد.

ڕۆڵە سەرکەوتووەکانی دهقلیە مەرجی بەدەستەوەدانی (دمیات)و دورخستنەوەی ئەو هەڵمەتە ستەمکاریە لەسەر ناوچەکەیان دانا،پێش ئازادکرنی پادشا وهەر گەورە بەرپرسێکی تری دیل کراو، ئەمە جگە لە دانی پارەیەکی زۆر پارەیەکی زۆر لەبەرامبەر ئازادکردنی پاشاو گەورە ئەفسەرانی تردا، بۆیە هیچ شتێك لەبەردەم پاشادا نەمایەوە،

تەنها مل کەچ بوون نەبێت بۆ ویست و خواستی سەرکەوتوان، بۆیە خۆیی و پاشماوەی تری سەربازەکانی ناچار بەدانی پارەیەکی زۆر کران کە بەدەیان ملیۆن (فرەنك)ی فەرەنسی مەزندە دەکرا لە بەرامبەر ئازادکردنیاندا.

میصریەکان لویسی نۆهەمیان لە ماڵی (ئیبراهیمی کوڕی لوقمان)دا بەند کرد،بەندەیەکیان کردە پاسەوانی، لەو کاتەدا عورف و عادەت وەها بوو، کاتێك سەرکردەو پاشاکان بە دیل دەگیران، زیندانی نەدەکران،بەڵکو لە شوێنێکی تایبەت دادەنران و گەورە ئەفسەران چاودێریان دەکردن، بەڵام لویسی نۆهەم لە و خانووە زیندانی کرا بوو، بەندەیەکیان کردبووە پاسەوانی بۆ زیاتر سوککردن و ڕیسواکردنی، لویس هەستی بە تاڵی و ناخۆشی ئەو چارەنوسە دەکرد، لە کاتی جەنگەکەشدا منداڵێکی بوو ناوی لێنا (تربستان )کە بە واتای (لە دایك بوونی خەم و پەژارە )دەهات، لەو کاتە بەدواشەوە هەندێك جار مێژوونوسان ناوی لویسی نۆهەمیان بە پادشای خەم و پەژارە ناودەبرد.

## 17-ئەبو عبدالله الاحمر.... لە دەستدانی کورسی دەسته‌ڵات و کۆتای خەون؟



مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس، دادەنرێت بە درێژترین و بە پیت ترین تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامی، کە پەند و ئامۆژگاری وانەو سودی لێوەر بگرین. دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس نزیکەی هەشت سەدە درێژەی کێشا، لەو هەڵە کوشندانەی کە کە موسڵمانان کردیان لە مێژوودا و نەهامەتی و پەشیمانی بە دوای خۆیدا هێنا و ئەندەلوسی پێ چۆلکردن، بریتی بوو لە ڕێگەدانیان بە ئاژاوە و دووبەرەکی و دابەش بوون ودروستکردنی درز وبۆشای لە نێو ڕیزەکانیاندا،بە شێوەیەك کۆمەڵی موسڵمانانی پەرتکرد و لە ناوی بردن.

کەوتن و ڕووخانی ئەندەلوس دادەنرێت بە دەرئەنجامی ئەو حاڵەی کە عەرەبەکان لەوێ هەیان بوو، لە دوو بەرەکی و ناکۆکی نێوان پادشا و خێڵەکان، ئەو بارودۆخەش نەوەستا تا گەیشتە ئاستی دابەش بوون، بەڵکو ئەوەشی تێپەڕاند و گەیشتە ئاستی پەنابردنی هەندێك خێڵ بۆ خاچ دروشمەکان و بە کارهێنانیان دجی ئەوانی تر، بە ئامانجی فراوانکردنی دەستەلاتیان. ...ئەوە ئەو هەڵە مەزنە بوو کە هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا لەناوبرد ! !

کەوتن و ڕووخانی (غرناتە) ڕوداوێکی کت و پڕ و لە خۆوە نەبوو، بەڵکو دەرئەنجامی بەرهەمی ساڵانێك لە بێ ئاگایی و بەزینی موسڵمانەکانی ئەندەلوس بوو.

تا شارەزای ئەو نەگبەتیە ببین کە بەسەر موسڵمانانی ئەندەلوسدا هات، گرنگە ئاگاداری تەواوی چۆنیەتی چوونی عەرەبەکان بین بۆ ئەوێ، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتای، وە چۆن کارەکان بەڕێوە دەچوون، تا کۆتای هات بەو کارەساتە.

مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس دادەنرێت بە درێژترین و بە پیت ترین تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامی کە پەند و ئامۆژگاری و وانەو سودی لێوەربگرین، دەوڵەتی

ئیسلامی لە ئەندەلوس نزیکەی هەشت سەدە درێژەی کێشا، لە میانەی ئەو هەشت سەدەیەدا ئەندەلوس بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕیوە، لە نێوان بەهێزی و لاوازی و یەکێتی و پەرت بووندا.

ڕووخانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس، شتێکی کت و پڕ نەبوو بۆ ئەو تەمەنە درێژەی خۆی، دەتوانین ژیانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس دابەش بکەین بەسەر (١٠) قۆناغدا، هەر قۆناغێکیش هۆکاری تایبەتی خۆی هەبوو، کە کاریگەری تەواوی بەسەر درێژی تەمەنی ئەو دەوڵەتەوە بەجێ دەهێشت، هەر قۆناغەشی سیماو تایبەتمەندی خۆی هەبوو کە لە خوارەوە بە درێژتر ئاماژەیان پێدەکەین :

## +قۆناغی یەکەم :قۆناغی فەتح کردن لە ساڵی ٩٢کۆچی تا ساڵی ١٣٨کۆچی.

ئەندەلوس ساڵی (٩٢)کۆچی لەسەر دەستی پاڵەوانە فتحکەرە سەرەتاییەکانی وەك (موسای کوری نصیر، تاریقی کوری زیاد،عبدالعزیزی کوری موسی) فتح کرا، دوای جەنگێکی زۆر لەگەڵ ئیسپانیەکاندا فەتحکرا،بەو شێوەیەش لەو کاتە بەدواوە ئەندەلوس بوو بە ویلایەتێکی ئیسلامی سەر بەدەوڵەت و ئومەی ئیسلامی و ژمارەیەکی زۆر خێڵی عەرەب لەگەڵ سوپای موسڵماناندا چوونە ئەو وڵاتە، لەم قۆناغەدا لەگەڵ ئەو ماوە کورتەی کە هەی بوو (٢٣) والی فەرمانڕەوایەتی ئەو ویلایەتەیان کردووە، واتە هەر دوو ساڵ والیەك، ئەم ماوەیە بە ماوەی تێکچوون و نا ئارامی ناسراوە و بە چەند کارێکیش پێناسە دەکرێت و دەناسرێتەوە لەوانە:

١-دەستگرتنی عەرەبەکان بە پۆستە باڵاکانەوە، وای لە خێڵە بەبەرەکان کرد کە بەشێکی زۆری سوپای فتحکەریان پێکدەهێنا، هەست بە جۆرێك لە بێزای بکەن لەو بارودۆخە، بە تایبەتی کاتێك هەستیان بە جۆرێك لە جیاکاری کرد کە لەبەرامبەریان دەکرا، ئەمە جگە لە هەستی دەمارگیری عەرەبی لە بەرامبەر ئەوان.

٢-بڵاوبوونەوەی فکرەی خەواریج، ئەوانەی کە لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕایانکردبوو ڕۆژئاواڵە ژێر زۆر و فشارەکانی دەوڵەتی ئومەوی، لە نموونەی سەرکردە گەورەکانیان (مهلب کوری ئەبی صفرە)و(قتیبەی کوری مسلم) بوون. چوونی خەواریجەکان بۆ وڵاتی (مەغریب) هۆکارێك بوو بۆ بڵاوبوونەوەی جۆرێك لەتەنگ و چەڵەمەی تایبەت، بە تایبەتی ئەو فکرەیە بە دەمە چوونێکی زۆری هەبوو لە نێو خێڵە بەربەرەکاندا و وای لێکردن شۆڕشێك بەرپا بکەن لە ژێر سەرکردایەتی کەسایەتیەکی بەربەری بەناوبانگ بەناوی (میسرە).ئەو تەنگ و چەڵەمانەی کە بەربەرەکانی مەغریب دروستیانکرد،وای لە بەربەرەکانی ئەندەلوسیش کرد کە ئەوانیش شۆڕشێك بەرپا بکەن، ئاژاوە وڵاتی ئەندەلوسی گرتەوەو جەنگیان لە دژی موسڵمانەکان بەرپاکرد، ئەوەش بووە هۆی پاشەکشێی موسڵمانەکان لە باکوری ئەندەلوس لە سنوری ڕووباری (تاجە)، ئەمەش وایکرد هەموو ئەو زەویانە وەك دەستکەوتێکی سارد بەجێبهێڵن بۆ خاچ دروشمەکان.

٣-هەڵگیرسانی دەمارگیری خێڵەکی نەفامی لە نێوان قەیسیەکانی عەرەبی شام و (المچریە) عەرەبەکانی حیجاز و یەمەن، بە هۆی ڕق و قینی کۆن و شۆڕشەکانی ڕۆژی ئازادی ساڵی (٦٣)کۆچی، ڕۆژگاری (یزیدی کوڕی معاویە) کاتێك سوپای شام هێرشیکردە سەر شاری (مەدینە)ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ئەو شارەی کوشت، سەرەڕای هەوڵێکی زۆر بۆ چاککردنەوەی ئەو درزە، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر گەورە دەبوو، و حەزو ئارەزووەکان زاڵ دەبوون بەسەر عەقڵەکاندا بە تایبەتی لای سەرکردەکان. کە بەو هۆیەوە ڕووبەرێکی زۆر لە زەویەکانی باکوری ئەندەلوس لە کیس چوون، بە هۆی سەرقاڵ بوونی موسڵمانەکان بە شەرکردن و ململانێ نێوان خۆیانەوە.

## قۆناغی دووەم:دروست بوونی دەوڵەتی ئومەوی و سەردەمی گەشانەوە سالی ۱۳۸ك–۲۳۸كۆچی :

لەم قۆناغەدا ئەندەلوس یەکی گرت لەژێر یەك سەرکردایەتی و، یەك سەرکردەشی هەبوو بەناوی (عبدالرحن کوری معاویە کوری هشام کوری عبدالملك کوری مروان)ناسراو بە (عبدالرحن داخل) یان (صقر القریش) یان (ابو الجعفر المنصور). عبدالرحمن داخل توانی سەرلە نوێ دەوڵەتی ئومەوی بنیاد بنێتەوە لە ولآتی ئەندەلوس. ئەم پیاوە لەسەرجەم دامەزرێنەرانی تری دەوڵەتە ئیسلامیەکان لە مێژوودا جیاوازە، ئەندەلوسی بردە سەر شێوازێکی نامۆ جیاواز، بە خۆڕاگری و ئارامی و ئیرادەی خۆی و پشتیوانی خودا، توانی بەردی بناغەی گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامی نوێ بنیاد بنێت. عبدالرحمن داخل توانی چەند کارێکی گرنگ ئەنجامبدات بۆ پارێزگاریکردن لەو دەوڵەتە ئیسلامیەیی کە بنیادی نابوو لە وانەش:

۱–لەناوبردن و نەهێشتنی ئەو دەمارگیریە خێلەکیەی کە لەنێوان قیس و المچریەدا هەبوو و سەرکوتکردنی شۆڕشەکانیان.

۲–بەرەنگاربوونەوەی هەوڵەکانی عباسیەکان بۆ دووبارە گەڕاندنەوەی ئەندەلوس بۆ سەر خەلافەتەکەیان.

۳–سەرکوتکردن و بەرپەرچدانەوەی هەوڵەکانی فەرەنسیەکان و ئیسپانیەکان بۆ هێرشکردنە سەر ئەندەلوس، بە تایبەتی ئەوەی کە (شارلمان)ی پادشای فەرەنسا کردی، بە یارمەتی بوونی هەندێك ناپاك لە نێو ڕیزی موسڵماناندا لە نموونەی (سلیمانی کوری یقزان الکلبی) والی بەرشەلۆنە، کە هەلێکی باشیدا بەدەستەوە تا بتوانن هێرش بکەنە سەر موسڵمانان.

٤-ساڵی(١٧٠)ك عبدالرحمن داخل دەستیکرد بە قۆناغی ئارامی و بنیادنان و گەشانەوە پێشکەوتن، مزگەوتی (قرتوبە)ی لەو ماوەیەدا بنیادنا، کە تا ئێستاش بیناکەی ماوەتەوە، بەڵام گۆڕاوە بە کلێسا.

کورەکەی بە ناوی (هیشام) کە دوای خۆی لە ساڵی (١٧٣- ١٨٠)ك دەستەڵاتی وەرگرت، توانی شوێن پێی باوکی وەربگرێت لە شێوازی حوکم کردندا، کە سێکی پیاوچاك و تێگەیشتو فەقیە بوو، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەودا مەزهەبی (امام المالك)بە شێوەیەکی فراوان لە ئەندەلوس بڵاوبوویەوە. بەڵام دوای ئەم کورەکەی دەستەڵاتی وەرگرت، کە کەسێك بوو زیاتر حەزی بە ژیانی ڕابواردن و خۆشی و وەرزش و ڕاوکردن بوو، لە دەوروبەریدا کۆمەڵێك خەڵکی خۆبەگەورەزان و خۆسەپێن دروست بوون، کە وایان لێکرد ببێتە کەسێکی سەرکەش و توند و ڕەق و گوێنەدەر بە کاروباری خەڵکی. لەبەر ئەوە چەند شۆڕشێك لە دژی بەرپابوون، بەناوبانگترینیان شۆڕشی (الربچ) بوو لە (١٣ ڕەمەزانی ساڵی ٢٠٢) کۆچی کە فوقەهاکان سەرکردایەتیان دەکرد لەوانەش(یەحیای کوری یەحیایی لەیسی ) بەو شێوەیەش موسڵمانان بە ئاژاوەی نێوخۆی خۆیانەوە خەریك بوون و دوژمنە سەرەکیەکەی خۆیان کە خاچ دروشمەکان بوون لە بیر کردبوو، بۆیە خاچ دروشمەکان توانیان چەند سەرکەوتنێك بەدەست بهێنن و دەست بەسەر دەروازەی گەورەی بەرشەلۆنەدا بگرن، کە پاش ئەوە بوو بە دڕکێك لە پاڵ دەوڵەت ئیسلامی ئەندەلوسدا. دوای ئەمیش کوڕەکەی (عبدالرحمن) دەستەڵاتی وەرگرت، لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی خۆیدا، خۆشگوزەرانی و ڕابواردن باڵی کێشا بەسەر گەلی ئەندەلوسدا،کە ئەوەش خۆیی لە خۆیدا خراپکەری گەلانەوە و،دەبێتە هۆی جیاوازی و ناکۆکی لە نێوانیاندا، ئەمە جگە لەوەی ئەو خۆشگوزەرانی موسڵمانانە بووە هۆی ئەوەی کە مەسیحیەکانی ئەندەلوس(اهل الزمە)،لە دژی موسڵمانەکان شۆڕش بەرپا بکەن کە ناسرا بوو بە شۆڕشی(المستعربین)، هەرچەندە سەردەمی (عبدالرحن) بەسەردەمی خۆشگوزەرانی و بەهرەمەندی ناسرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو سەردەمەدا هیچ جۆرە دەمارگیریەکی زیاتر و لایەنگریەکی لە دژی مەسیحیەکان بەخۆوە نەدیوە.

**قۆناغی سێهەم:سەردەمی نوشستی یەکەم لە ساڵی ٢٣٨کۆچی –٣٠٠کۆچی:**

لەو ماوەیەدا سێ کەسایەتی یەك لە دوای یەك حوکم و فەرمانڕەوایەتی ئەندەلوسیان کردووە، کە بریتی بوون لە (محمد ی کوری عبدالرحمن لە ساڵی ٢٣٨– ٢٧٣کۆچی،مونزیری کوری محمدلە ساڵی ٢٧٣– ٢٧٥کۆچی،عبدالله کوری محمد لە ساڵی ٢٧٥ك –٣٠٠کۆچی).

ئەم ماوەیە بە سەردەمی زۆری ئاژاوەو شلۆقی و پاشاگەردانی و زۆری دەرچوون لە دەستەلاتی ناوەندی ناسراوە، عەرەب بوو بە چەند دەوڵەتۆچکەیەك لە نێو دەوڵەتی دایکدا. گرنگترینیان دەوڵەتی (بنی حجاج)بوو لە ئیشبیلیە کە ڕۆڵەکانی خێڵی (لخمی )یەمەنی دروستیانکرد، لە نێو ئەوانیشدا (ئیبراهیمی کوری حجاج) لەسەر شێوازی دەوڵەتی ئومەوی هەر لە دیزاینی کۆشکی میرنشینەکەوە تا دیوەخان و دەست وپەیوەند و پاسەوان و سوپاکەی. هەر لەو سەردەمەدا بەربەرەکانی ئەندەلوسیش خۆیان داڕنی لە فەرمانبەردای دەستەلاتدارانی بنەماڵەی ئومەوی، و سەربەخۆ بوونی خۆیان ڕاگەیاند لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاواو باشوری پرتوگال، لە بەناوبانگترین ئەو خێڵە بەربەرانەش کە دەوڵەتێکی گەورەیان دروستکرد بریتی بوو لە خێڵی (زی النون)بە سەرکردایەتی گەورەی ئەو بنەماڵەیە (موسی) کە کەسێکی خراپ و شەڕانگێز بوو، ڕیزی موسڵمانانی تێکدا و ئاژاوەیەکی گەورەی نایەوە لە ئەندەلوس. پاشان ئەو ئاژاوە ناوخۆییە ڕێگەی خۆشکرد بۆ بەرپابوونی شۆڕشێکی مەزن کە بە شۆڕشی (لەدایك بووان)ناسرا، ئەوانەی کە لە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس لە دایك بوو بوون، بەڵام بنەڕەتێکی ئیسپانی و مەسیحیان هەبوو، ئەوان لە ژێر سایەیی دەوڵەتی ئیسلامیدا گەورە بوو بوون و گەشەیان کردبوو، تا هەلێکیان بۆ هەڵکەوت و شۆڕشێکی گەورە و توندیان بەرپاکرد، کە سێکی بێباوەڕی خراپی گەورە بەناوی (عمری کوڕی حفصون) سەرکردایەتی دەکردن، ئەم کەسە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەڵگەڕابوویەوە، توانی بووی لە دایك بوانی

(٣٠)ساڵی پێشوو لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و لە دژی موسڵمانان شەڕیان پێبکات لە ناوچەکانی (قرتوبەو حەوزەکانی دەوروبەری ئەو ناوچەیە).

## قۆناغی چوارەم:گەڕانەوەی هێز و ڕاگەیاندنی خەلافەت ٣٠٠كۆچی –٣٨٦كۆچی:

لەم قۆناغەدا تەنها دوو کەس فەرمانڕەوایەتیان کردووە، یەکەمیان (عبدالرحمن الناصر) کە بەهێزترین و باشترین کەسێك بووە کە فەرمانڕەوایەتی ئەندەلوسی کردبێت، هەر لە سەردەمی (عبدالرحمن داخل)وە. بۆ ماوەی نیو سەدە فەرمانڕەوایەتی کردووە، لە میانەی ئەو ماوەیەدا دەستەڵات و هێزی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس گەڕاندۆتەوە و بەسەر مەترسیەکانی ناوخۆدا سەرکەوتووە کە خۆیان دەبینیەوە لە میرنشینە سەربەخۆکان و میرە تەماع کارەکانیان، سەرجەمیانی گەڕاندەوە ژێر سایەیی دەوڵەتی دایك، پاشان شۆڕشە خراپەکەی (ابن حفصونی) لەناو برد پاش زنجیرەیەك جەنگی توند لەگەڵیدا. هەروەها شێوازی ترساندن و هاندانی بەکارهێنا بۆ زاڵ بوون بەسەر سەرۆك خێڵە عەرەبەکان و دەمارگیریە خێڵەکیەکاندا. مەترسیە دەرەکیەکانیش خۆیان دەبینیەوە لە مەترسی دوژمنکاری مەسیحیەکان لە باکوری وڵات، ناصر هێزێکی ئێجگار گەورەی ئامادەکرد بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی هەموو هەوڵە فراوانخوازیەکانی ئیسپانیەکان، هەر لەساڵی (٣٠٥ –٣٢٩)کۆچی بەرەنگاریان بوویەوە تا توانی سەرجەمیان مل کەچ بکات، جارێك بە هاوپەیمانی جارێکیش بە ناچاری و بەزۆر.

عبدالرحمن ناصر، یەکەم کەس بوو کە خۆی وەك خەلیفەی شەرعی موسڵمانان ڕاگەیاند لە ئەندەلوس، ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ دروست بوونی دەوڵەتی (عەبێدی فاتمی) لە مەغریب و دەستەڵاتدارەکانی ئەویش ناوی خەلافەت لە خۆیان بنێن و تەماعیان بۆ دروست بێت بۆ دەستگرتن بەسەر جیهانی ئیسلامیدا بە ئەندەلوسیشەوە. لەو کاتەدا خەلافەتی عباسی بە حاڵەتی ململانێ لەسەر دەستەڵات و ئەوپەڕی لاوازی خۆیدا تێدەپەڕی، بەهۆی دەستگرتنی تورکەکان بەسەر دەستەڵاتدا لە ناوخۆی خەلافەتەکەدا.

بۆیە عبدالرحمن ناصر لە رەمەزانی ساڵی (٣١٦)کۆچی خۆی بە خەلیفەی موسڵمانان ڕاگەیاند. گرنگترین ئەو کارە شارستانی و بیناسازیەیی کە لە دوای خۆی بەجێی هێشتووە بریتیە لە بنیادنانی شاری (الزهرا ) لە ساڵی (٣٢٥)کۆچی.

دوای خۆی کوڕەکەی دەستەڵاتی وەرگرت کە بە (المستنصر) ناسرا،کەسێك بوو زانست و زانیاری زۆر خۆشدەویست، بوو بوویە میراتگری دەوڵەتێکی بەهێزی پایەجێگیری سەردەمی باوکی، بۆیە خۆی تەرخانکرد بۆ زانست و خوێندنەوەی کتێب، کتێبێکی زۆری لەسەر ناوچەکانی جیهاندا کڕی و زانایانی دەنارد بە شوێن کڕینی ئەو کتێبانەداو لە شاری (قرتوبە) دای دەنان، بە شێوەیەك ئەو شوێنەی گۆڕی بوو بە شوێنی روناکبیری و ناوەندێکی زانستی گەورە ی جیهانی، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا کتێبخانەیەکی دروستکرد کە نزیکەی (٤٠٠) هەزار (مجلد) کتێبی تێدا بوو، کە بۆخۆی گرنگترین کتێبەکای ناو کتێبخانەکەی خوێند بوویەوە.

## قۆناغی پێنجەم :سەردەمی دەوڵەتی عامری ساڵی ٣٦٦کۆچی -٣٩٩کۆچی سەردەمی زێڕین:

دوای مردنی (حکم ی کوری عبدالرحمن) تاکە کورەکەی هیشام ناسراو بە (المؤید) دەستەلاتی وەرگرت، ئەو تەمەنی کەم بوو شایستەی وەرگرتنی ئەو پۆستە گرنگە نەبوو، ئەوەش بووە هۆی دەرکەوتنی کەسانی شۆڕشگێڕو ئەوانەی چاویان بڕی بووە کورسی دەستەلات لە سەردەمی (ناصر و مستنسیر)دا، دوایان خست بوو بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایەتی (موئەیەد) بۆ ئەنجامدانی کودەتاو هەڵگەڕانەوە بەسەریدا، لە دەرئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانەش کەسێك لە نێو گۆڕەپانی ڕووداوەکاندا و لە نێو چینە جیاوازەکانی گەلی ئەندەلوسدا دەرکەوت بەناوی (محمدی کوری ئەبی عامر)ناسراو بە (منصور) کە لە ڕیزی گەورەترین کەسایەتیەکانی گەلی ئەندەلوس ئەژمار دەکرێت،

دەرکەوتنی ئەو رەحمەتێکی خودای و ڕزگارکەرێك بوو لەلایەن پەروەردگارەوە نێردرابوو بۆ ئومەتی ئیسلامی، ئەم کەسایەتیە ژمارەیەکی زۆر کاری گرنگی ئەنجامدا بۆ سەرخستنی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس لەوانەش:

١-شکست پێهێنانی هەوڵی کودەتا کردن بەسەر خەلیفەی مێرد منداڵ(موئەید) و، دەستگرتن بەسەر دەستەلآتدا،پاش ئەوەی کە زانی خەلیفە دەستەوسانە لە بەڕێوەبردنی ئەو پۆستە گرنگە.

٢-گەندەڵی ئیداری لەناوبرد کە لە دیوانەکانی ولآتدا پەرەی سەند بوو، هەستا هەموو ئەو وەزیرانەی لەکارەکانیان دورخستەوە کە تێوەگلابوون لە گەندەڵیدا، زاڵ بوو بەسەر دیاردەکانی لادان دووڕووی و خراپەکاری کە لە ولآتدا بلآوبوو بوونەوە.

٣-دووبارە ڕێکخستنەوەی سوپا، بە شێوەیەك کە بتوانێت زاڵ بێت بەسەر دەمارگیری خێڵەکیدا.

٤-لە گەورەترین کارەکانی منتصور هەڵمەتە جیهادیەکانی بوو، کە توانی زیاتر لە (٥٢) جەنگ بەسەر کەوتووی ئەنجامبدات، لە هەڵمەتەکانیدا پەیڕەوەی لە سیاسەتی توند و بێ سۆز و میهرەبانی دەکرد، بە شێوەیەك بۆ ماوەیەکی درێژ کە نزیکەی نیو سەدە دەبوو شان و شکۆی خاچ دروشمەکانی تێك شکاند بوو.

پاراستنی ئیسلامی لە دڵی ئەندەلوسیەکاندا زیندوو کردەوە و بە خۆشی و شادیەوە ژیانیان دەبردە سەر، ئەندەلوس لەسەردەمی منصوری کوری ئەبی عامردا گەیشتەئەوپەری هێزی خۆی، بە ڕاستی ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو، سەردەمی ئاڵتونی ئەندەلوس بوو.

بە مردنی ئەو سەرکەوتن وگەشەسەندنی ئەندەلوسیش ڕۆشت و جارێکی تر ئەندەلوس جەنگی دەمارگیری یەخەی پێگرتەوە،کە هۆکاری یەکەم بوو بر ڕووخانی ئەندەلوس، دەوڵەتی دایك پەرت پەرت بوو بۆ چەند دەوڵەتۆچکەیەکی بچووك، کە هەر یەکێك لەو دەوڵەتە بچووکانە کەسێکی ستەمکار و بەرژەوەندی خواز سەرۆکایەتی دەکرد، کە گوێ

ی بە هیچ نەدەدا، تەنها بەرژەوەندی خۆی و خێزانەکەی نەبێت، بەم شێوەیەش ڕێگە کرایەوە لە بەردەم خراپترین و مەترسیدارترین قۆناغ لە مێژووی ئەندەلوسدا.

### قۆناغی شەشەم:ڕوخانی خەلافەتی ئومەوی ساڵی ٣٩٩کۆچی –٤٢٢کۆچی :

لە ماوەی ئەم کاتە ناهەموارەدا، ژمارەیەك لە خەلیفە ئومەویەکان دەستەلاّتیان وەرگرت، کە ژمارەیان لە کۆی هەموو ئەو کەسانەی کە دەستەلاّتیان وەرگرت بوو لە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیەوە لە ئەندەلوس زیاتر بوو، شان و شکۆی خەلافەت نەماو جارێکی تر ولاّت دابەش و پەرت پەرت بوو، و دەمارگیری و خێڵچیەتی زیاتر لەوەی کە پێشتر هەبوو دەرکەوتەوە، بۆ یەکەم جار فکرەی پشت بەستن و داوای هاوکاریکردن لە مەسیحیە ئیسپانیەکان سەریهەڵدا، ئەوەش ئەو هەلە زێڕینە بوو کە موسڵمانەکان بەدەستی خۆیان بەخشیانە مەسیحیەکان.

بە مردنی (المعتمد بالله) لە ساڵی (٤٢٢)کۆچی وەزیرەکەی (محمدی کوری جهور)کۆتای و ڕووخانی خەلافەتی ئومەوی لە ئەندەلوس ڕاگەیاند، بەهۆی نەبوونی کەسێك کە شیاوی وەرگرتنی ئەو پۆستە بالاّیە بێت، دوای ئەوەش کۆمەڵێك لە وەزیرەکان ولاّتیان بەڕێوەدەبرد لەسەر شێوازی نیمچە کۆماری. بە کۆتای هاتنی خەلافەت بە شێوەی فەرمی ولاّت دابەش بوو بەسەر چەند دەوڵەتێکی بچووکدا، هەر میرێك سەربەخۆی هەرێمەکەی خۆی ڕاگەیاند و خۆی بە پادشای ئەو ناوچەیە ناساند، بەو شێوەیەش ئەندەلوس چووە تونێلێکی تاریکەوە، کە دوای ئەوە بۆ هەتا هەتایە لێی دەرنەهاتەوە.

## قۆناغی حەوتەم:سەردەمی پادشای خێڵەکان ساڵی ٤٢٢کۆچە -٤٨٣کۆچی :

تەنها ئەوە نەبوو خەلافەتی ئومەوی بروخێت،بەڵکو دەوڵەتی دایکیش دابەش بوو بەسەر چەند دەوڵەتۆچکەیەکی بچوکدا، هەریەکە لە نەتەوەکانی عەرەب و بەربەر و صەقالیبەکانیش دابەش بوون، لە ماوەی ئەو سەردەمەدا کە دەمارگیریەکی زۆر باڵی کێشابوو بەسەر وڵاتدا نزیکەی (٢٥) خێزانی سەربەخۆ حوکمی وڵاتیان دەکرد.

**لە بەناوبانگترین پادشای خێڵەکان :**

١- دەوڵەتی بنی جهور کە لە ناوچەی قرتوبە و دەورووبەری فەرمانڕەوایەتی دەکرد.

٢-دەوڵەتی بنی عباد لە ئیشبیلیە.

٣-دەوڵەتی بنی ئەفتەس لە بەتلیوس.

٤- دەوڵەتی بنی نون لە تولەیتیلە.

٥-دەوڵەتی بنی جمود لە مالیقەو جەزیرە.

٦-دەوڵەتی بنی هود لە سەرەقستە.

٧-دەوڵەتی بنی سناد لە غرناتە.

٨- دەوڵەتی فتیانی صەقالیبە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی لە مرسیە، دانیە،بلنسیە.

ئەم سەردەمە بە چەند سیفەتێك ناسراوە، کە بوونە هۆی لادان و برینێکی قوڵیان لە جەستەی گەلی ئەندەلوسدا دروستکرد، بە شێوەیەك دوای نەمانی ئەو ماوەیەش ئەو برینانە سارێژنەبوون و شوێنیان هەر مایەوە، لەو تایبەتمەندیانە:

١-حاڵەتێکی خۆشگوزەرانی زۆر و بە فیرۆدانێکی گەندەڵکارانە،کە کاریگەری خۆی بەجێهێشت لە سەر سەرجەم چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی ئەندەلوسی، لە گەورەوە تا بچوك، لە دەوڵەمەندەوە تا هەژار، کاریکردە سەر لاوازبوونی هێزی ئەندەلوس.

٢-شەرکردنی دەوڵەتە بچووکەکان لە نێوان خۆیاندا، بەرپابوونی جەنگی دژوار لە نێوان لە نێوان موسڵماناندا،هەندێکیان لە دژی هەندێکی تریان لەسەر دەستکەوتی ماددی دونیای کەلای پەروەردگار بە هێندەی مێشێك ئەرزش و بەهایان نیە.

٣- بڵاوبوونەوەی کردەوەی ناشیرین و خراپ بە جۆرەها شێوە، وەك خواردنەوەی مەیی و دەرکەوتنی ئافرەتان بە ڕووتی و، دیاردەی دزیکردن کە شێوەی باندی مافیایی وەرگرت بوو.

٤-فراوان بوونی بابەتی پشت بەستن و یارمەتی وەرگرتن لە مەسیحیە ئیسپانیەکان لە باکوری ئەندەلوس، بە هۆی زۆری شەڕو کوشتار لە نێوان موسڵمانەکان خۆیاندا، هەر لایەنێکی شەڕکەر، یارمەتی لە میرنشینێکی مەسیحی وەردەگرت لە بەرامبەر سازشکردن لە بەشێك لە موڵکەکانی، کە لە ڕاستیدا موڵکی ئەو نەبوون، بەڵکو موڵکی هەموو موسڵمانان بوون بە گشتی، ئەمە جگە لە دانی بڕە پارەیەکی زۆر، هەموو ئەمانە لە پێناو شکست پێهێنانی برا موسڵمانەکانی لە ئەندەلوس.

پادشای خێڵەکان لە ڕاستیدا پاشا گەلێکی لاواز بوون، لە هەموو ڕوویەکەوە، لاواز بوون لە ڕووی ئایینی و نیشتمان پەروەریەوە، هەوەس و ئارەزووی تایبەتی خۆیان زاڵ بوو بەسەر کردەوەکانیاندا تا ئەوپەڕی سنور، لە سەرخۆشی خۆیاندا نیشتمان و ئایینەکەیان لە بیر کردبوو، لەوەش زیاتر شکۆ و ڕێزی خۆیان لە بیر کردبوو، سەرەڕای هەموو ئەمانەش لەگەڵ گەلەکانی خۆیاندا زۆر ڕەق و ستەمکار و دیکتاتۆر بوون.

## قۆناغی هەشتەم:سەردەمی مورابتین ساڵی ٤٨٤کۆچی -٥٣٩کۆچی:

حاڵەتێکی ناجێگیری زۆر خراپ دروست بوو بوو لە ئەندەلوس، ئەمە جگە لەو گەندەڵیە بەربڵاوەی کە لە نێو سەرجەم چین وتوێژەکانی گەلی ئەندەلوسیدا بڵاو بوو بوویەوە لە ژێر سایەیی فەرمانرشەوایەتی پادشای خێڵەکاندا، بۆیە ڕزگارکردنی ئەندەلوس بە خەڵکی خۆیی نەدەکرا، بە تایبەتی بەو نەوەیەیی کە دروست بوو بوو. پاش ئەمە داگیرکردنی شاری (تولەیتیلە)ی کۆن هات وەك هەورە بروسکەیەك بۆ گەلی ئەندەلوسی، بە هەموویەوە بە گەل و فەرمانڕەواوە. ئەم شارە لەلایەن پاشایەکی خاچ دروشمەوە بەناوی (ئەلفوسۆی شەشەم) کە فەرمانڕەوای (قشتالە) بوو لە (١ مانگی صفری ساڵی ٤٧٨)کۆچی دەستی بەسەردا گیرا.

لە هەمان ئەو کاتەی کە ئەندەلوس خراپترین قۆناغەکانی خۆیی و گەندەڵترین سەردەمەکانی دەگوزەراند،لە وڵاتی مغریب خێڵە بەربەرەکان دەوڵەتێکی نوێیان دروست کرد بەناوی دەوڵەتی (مرابتین)،وەك هەموو دەوڵەتێکی نوێ لەسەرەتادا بەهێز و گەنج بوو، و پیس نەبوو بوو بە جۆرەکانی ڕابواردن و ستەم و پاڵ لێدانەوە، کە هۆکاری سەرەکی ماندوکردنی دەوڵەتن. ئەصڵ و بنەمای کۆکردنەوە و دروستکردنی ئەو دەوڵەتە جیهادکردن بوو لە ڕێگای خواداو بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام بوو، کەسێك سەرکردایەتی دەکرد کە سەرجەم سیفەتە باشەکانی سەرکردەیەکی چاکی تێدا بوو بە ناوی (یوسفی کوری تاشفین).

لە کاتی داگیرکردنی (تولەیتیلە) لەلایەن خاچ دروشمەکانەوە، پادشای خێڵەکان، لە ژێر فشاری گەلەکانیان و لە ترسی قڕکردنیان لەلایەن خاچ دروشمەکانەوە، ناچار بوون ئاگاداریەك بدەنە یوسفی کوری تاشفین و داوای ڕزگارکردنی ئەندەلوسی لێبکەن. یوسف وەڵامی دانەوەو خۆیی و سوپا مەزنەکەی کە زۆرینەیان لە خێڵە بەربەڕەکانی مغریب بوون، گەیشتنە ئەندەلوس و توانیان لە جەنگی (زلاقە) لە١٣مانگی ڕەجەبی هەمان ئەو

ساڵەدا سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر خاچ دروشمەکاندا تۆمار بکەن، ئەو سەرکەوتنەی کە ڕوخانی ئەندەلوسی بۆ ماوەی چوار سەدە دواخست.

یوسفی کوری تاشفین نیازی نەبوو لە ئەندەلوس بمێنێتەوە. دوای بەدەست هێنانی سەرکەوتنێکی سەرشۆڕکەر بەسەر خاچ دروشمەکان لە جەنگی (زلاقە)دا گەڕایەوە مغریب، بەڵام دوای ئەوەی کە ڕاستی پادشای خێڵەکانی بۆ ئاشکرا بوو لە چۆنیەتی ئەو گەندەڵی و لادان و دورکەوتنەوەیان لە ئاین و، ئەو داواکاریە زۆرەی خەڵکی بۆ پاراستنیان لە دەست درێژی خاچ دروشمەکان و ڕزگارکردنیان لە دەست ستەم و خراپەی پاشاکانیان، بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ئەندەلوس،توانی کۆتای بە دەسەڵاتی پادشای خێڵەکان بهێنێت و، جارێکی تر سەرجەم وڵاتی ئەندەلوس یەك بخاتەوە لە ژێر ئاڵای دەوڵەتی مورابتیندا.

دوای یوسفی کوری تاشفین کورەکەی بەناوی (علی )دەسەڵاتی وەرگرت، ئەم کەسێکی چاکخواز و خواناس بوو، سەرقاڵی خودا پەرستی بوو بەشەو شەونوێژی دەکرد و بە ڕۆژیش بە ڕۆژو بوو، ئەوەش وای کرد کە گەورە بەرپرسانی کۆنی سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پادشای خێڵەکان جارێکی تر دەست بگرنەوە بەسەر دەسەڵاتدا و دەست بدەنەوە شتە خراپ و قەدەغە کراوەکان وڵات توشی خراپەکاری و گەندەڵیەکان بکەنەوە، ئەمەش کاریکردە سەر (علی کوری یوسف) و لە خوادا پەرستی دوری خستەوەو هەمان خووی ئەوانی گرت، سەرئەنجام ئەوەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ دروست بوونی شۆڕشێکی ناوخۆی لە وڵاتی (مغریب)دا کە کەسێك سەرکردایەتی دەکرد بە ناوی (محمدی کوری تومرت) ناوی خۆینا بوو (مهدی چاوەڕوانکراو).ئەم شۆڕشە پەرەی سەند و شوێن کەوتوانی زۆربوون و بزوتنەوەکەی (تومرت) یان فراوان کرد، تا دواجار توانی دەوڵەتی مورابتین لە مغریب بڕوخێنێت، بە ڕووخانی لە وێ شتێکی سروشتی دەبێت کە لە ئەندەلوسیش هەمان ئەو دەسەڵاتە بڕوخێت.

## قۆناغی نۆهەم:سەردەمی موەحدین ساڵی ٥٣٩کۆچی –٦٢٠ کۆچی :

موەحیدەکان بریتی بوون لە شوێنکەوتوانی بزوتنەوەکەی (محمدی کوری تومرت)،کە بانگەشەی( مهدی چاوەڕوانکراو)ی دەکرد بۆ خۆیی، ئەمانە توانیان دەوڵەتی مورابتین بڕوخێنن پاش ئەوەی کە خۆی لاواز بوو بوو. ناوی خۆیان نابوو (الموحدون) لە بڕوایی خۆیانەوە کە گوایا بڕواداری ڕاستن و خودا بە تاك و تەنها دەزانن و لەسەر یەکتاپەرستیەکی ڕاست و دروستن، بەلأم لە ڕاستیدا بیروباوەڕێکی لادەریان هەبوو،بیروباوەڕیان تێکەڵەیەك بوو لە (اعتزال و جمهیە)سیفەتەکانی خودایان ڕەد دەکردەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین گومڕاترین کۆمەڵە بوون لە ڕووی بیروباوەڕەوە، بەلأم توانیان سواری هۆکارەکانی سەرکەوتن و هێز و توانا ببن و سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنن.

خەڵکی ئەندەلوس کە لەسەر بیروباوەڕی سەلەفی صالح بوون، بە ئاسانی ئەو بیرباوەڕە داهێنراوەیان وەرنەگرت، بۆیە موەحیدینەکان زۆرینەی ئەو کاتەی کە لە ئەندەلوس مانەوە، بە جەنگ کردن لەگەڵ شوێنکەوتوانی مرابیتینەکان و ناچارکردنی ناکۆکەکانیان بەسەر برد بۆ ڕازی بوون بە بیروباوەڕە داهێنراوەکەیان، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا توانیان لە جەنگی (ئاراك)دا سەربکەون بەسەر خاچ دروشمەکاندا، بە شێوەیەك کە یادی جەنگی (زلاقە)ی وەبیر خەڵکی هێنایەوە.

خەڵکانی خاوەن بیروباوەڕە خراپ هەرچەندە ئاڵایان بەرز بێت و شان و شکۆیان بە هێز بێت، بەلأم هەر بەخێرای ماندوو دەبن و لە ناودەچن، بۆیە دەبینین خاچ دروشمەکان لە جەنگێکدا بەناوی جەنگی (تۆڵە) لە ساڵی (٦٠٩)کۆچی بەسەریاندا سەرکەوتن و یەك لە دوای یەك بنکەو بارەگاکانیان هەرەسی هێناو کۆتای بەدەستەلأتیان هات لە مغریب و ئەندەلوس، دوای ئەمەش میرەکانی ئەندەلوس جەنگ لە نێوانیاندا دروست بوویەوە و، هەندێکیان لە دژی هەندێکی تریان داوای یارمەتیان لە خاچ دروشمەکان دەکرد و پەنایان

بۆ دەبردن تا هاوکاریان بکەن لە دژی یەکتری، تا کار گەیشتە ئەوەی هەندێکیان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەڵبگەڕێنەوە، لە پێناو بە دەستهێنانی سەرکەوتنی دونیای.

## قۆناغی دەیەم:دەوڵەتی بنی الاحمر(شانشینی غرناتە) ساڵی ٦٢٠ کۆچی – ٨٩٧کۆچی :

دوای هەرەسهێنانی سوڵتانە موەحیدەکان لە ئەندەلوس لە ساڵی (٦٢٠)ك خاچ دروشمەکان یەك لە دوای یەك توانیان دەست بگرن بەسەر بنکەو شارە دێرینەکانی ئەندەلوسدا وەك (ئیشبیلیەساڵی ٦٤٦ك،بتلیوس ساڵی ٦٢٦ك، بلنسیە ساڵی ٦٣٦ك، بیاسە ساڵی ٦٢٥ك، جیان ساڵی ٦٤٤ك، قەڵای جابر ساڵی ٦٤٥ك، شاتبە ساڵی ٦٤٧ك، قرتوبە ساڵی ٦٣٣ك، قرتاجینە ساڵی ٦٤٠ك، مرسیە ساڵی ٦٤١ك، میورقە ساڵی ٦٣٠ك ) بەو شێوەیە لە ماوەی سی ساڵدا دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس زۆرینەی بنکەو شارە گرنگەکانی لە دەستداو کەوتنە ژێر دەستەڵاتی خاچ دروشمە نەیارەکانیانەوە.

دوای ئەو پەرت بوونەی کە بەسەر دەوڵەتی ئیسلامی ئەندەلوسدا هات، دەوڵەتەکە تەنها لە ناوچەی باشوری وڵاتدا مایەوە،ئەویش بە دیاری کراوی لە شانشینی (غرناتە)،ژمارەیەك لە سەرکردە موسڵمانەکان بیریان لەوە کردەوە کە چۆن بوونی سیمای ئیسلامی لە ئەندەلوسدا بپارێزن، بە تایبەتی لە شانشینی غرناتە، دواجار سەرکەوتوو بوون و شانشینی غرناتە مایەوە بەرگەی گرت و مەیدانخوازی کرد، لە بەرامبەر فشارە بەردەوامەکانی ئیسپانیەکان، خۆڕاگری شانشینی غرناتەش بۆ ئەو ماوە درێژە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك هۆکار لەوانە:

١–بوونی سەرکردایەتیەکی بەهێزی پتەو لە پاشاکانی بنەماڵەی (بنی حمر)، لەسەروی هەمووشیانەوە (محمدی کوری یوسفی النصری) ناسراو بە (ابن حمر) کە ڕەچەڵەکی لە

بنەڕەتدا دەگەڕایەوە بۆ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لە پشتیوانان بەناوی (سعدی کوری عبادە).

محمدی کوری یوسف یەکەم ەس بوو کە شانشینی غرناتەی دامەزراندا، پاشایەتیش هەر لە دەستەڵاتی ئەو بنەماڵەیەدا مایەوە تا ڕووخانی یەکجاری شانشینەکە. سەرکردە سەرەتاییەکانی لە ئاستی بەرپرسیاریەتیدا بوون و توانیان شانشینەکە بگەیەننە ئەوپەڕی هێز و توانای خۆی، تا سەردەمی (محمدی پێنجەم) لە ساڵی (٧٦٣)ك دوای مردنی ئەو، ئەوانەی بە دوای ئەودا هاتن لە هەمانی ئەو ئاستەدا نەبوون، بۆیە شانشینەکە ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو ڕووخان و هەڵدێر هەنگاوی دەهاویشت.

٢-پەیوەندی کردن و پەنابردنی زۆرێك لە موسڵمانانی ئەندەلوس بەو شانشینەوە، کە نوێنەرایەتی (دار الاسلام)ی دەکرد لەو کاتەدا، دوای ئەوەی سەرجەم شارەکانی تری ئەندەلوس کەوتنە دەست خاچ دروشمەکان. ئەوانەی کە ڕۆشت بوونە ئەو شانشینی غرناتە ئەوان بوون کە بێزاربوون و ڕقیان لە خاچ دروشمەکان دەبوویەوە، لە زاناو ئەدیب و پیشەوەر و جوتیار و خاوەن پیشە.بەو پسپۆڕیە جیاوازانەیان توانیان غرناتە بنیاد بنێن و نۆژەنی بکەنەوە، بە شێوەیەك کە یەك بست زەوی غرناتە نەمابوو کە بەکار نەهێنرابێت و سودی لێوەرنەگیرا بێت، تا ژمارەی موسڵمانان لەو شانشینەدا گەیشتە شەش ملیۆن کەس، کە ئەوەش ژمارەیەکی ئێجگار زۆر بوو.

٣-هاوکاری پاشاکانی دەوڵەتی مەغریبی عەرەبی بۆ برا موسڵمانەکانیان، بە تایبەتی پاشاکانی (حفصیین )و پاشاکانی (بنی مرین)،ئەمانە هەر دووکیان میراتگری دەستەڵاتی دەوڵەتی موەحدین بوون لە وڵاتی مغریب، بە تایبەتی پاشاکانی (بنی مرین) کە زۆرترین یارمەتی سەربازی و سوپاییان دەنارد بۆ سەرخستنی موسڵمانەکانی ئەندەلوس، بە تایبەتی لەو کاتانەی کە خاچ دروشمەکان فشارەکانیان توندتر دەکرد لەسەر شانشینی غرناتە.

٤-حاڵەتی ململانێ ی ناوخۆی و ئەو لەبەر یەك هەڵوەشانەی کە باڵی کێشابوو بەسەر میرنشینە مەسیحیە ئیسپانیەکاندا لەو ماوەیەدا، بە شێوەیەك کە دابەش بوون باڵی

کێشابوو بەسەر شانشینی (قشتالە) کە گەورەترین شانشینی مەسیحی ئیسپانی بوو، و چووبووە ململانێیەکی خوێناویەوە لەگەڵ شانشینی (لیۆن و ئەراگۆن)دا، ئەوەش یارمەتی شانشینی غرناتەیدا کە پایەکانی دەسەڵاتی خۆی جێگیر بکات و بنەماکانی بەهێز بکات و خۆیی یەکلای بکاتەوە بۆ نۆژەنکردنەوە وبنیادنانی غرناتە، تەنانەت هەندێك جاریش بۆ فراوانخوازی لە دەرەوەی سنورەکانی خۆی.

بارودۆخی شانشینی غرناتە بۆ ماوەیەکی درێژ بە چەسپاوی و جێگیری مایەوە، تا ئەو هۆکارانەی کە بوونە هۆی دروست بوون ئەو شانشینەو بەهێزبوونی، یەك لە دوای یەك نەمان چوون، پاشاکانی بنەماڵە (بنی مرین) ی مغریبی وازیان لە سەرخستنی موسڵمانانی ئەندەلوس هێنا، بە هۆی خەریك بوونیان بە کێشەکانی خۆیانەوە کە لەدەرەوەی وڵاتی خۆیان هێرشدەکرایە سەریان، هەروەها خاچ دروشمەکانیش ئاڵای خۆیان یەکخست و هەردوو شانشینی (قشتالە و لیون) لە ژێر یەك ئاڵادا یەکیانگرت، دوای ئەوەی کە (فردیناند)ی پادشای (لیون و ئەراگون) ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ (ئیزابێلا)ی شاژنی شانشینی( قشتالە) پێکهێنا، هاوپەیمانێتیەکی بەهێزیان لە دژی موسڵمانەکان ڕاگەیاند، لەهەمان کاتدا پادشاکانی ئەو سەردەمی بنەماڵەی بنی حمر لە ئاستی مەترسیەکانی ئەو قۆناغەدا نەبوون و سەرقاڵی ململانێ ناوخۆییەکانی خۆیان بوون لەسەر دەسەڵات و پاشایەتی، ئەمە جگە لەوەی کە ژیانی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی لە نێو گەلی شانشینی غرناتەدا بڵاوبوو بوویەوە، و خەریکی کاری خراپەو ناجۆر بوون و خراپەکاری سەراپا وڵاتی داگرت بوو، هەموو ئەمانە ئاگادارکردنەوەی پێش وەختی کۆتای و ڕووخانی شانشینی غرناتە بوون.

موسڵمانەکان بە سوپای خاچ دروشمەکان، لە خەوی بێ ئاگای و ئازاربەخشی خۆیان هەستان، کاتێك شیو و دەشت و دۆڵیان لێ پڕکردن لە سەرباز، موسڵمانان شەڕێکی قورسیانکرد بۆ بەرگری لە بوونی قەوارەی قۆیان، بەڵام هاوار بۆ گەلێك کە هەموو هۆکارەکانی سەرکەوتنی لە دەستدابێت، بۆیە دەبینین لە (٢١ مانگی محرم ساڵی

٨٩٧)كۆچی غرناتە وەك دواهەمین قەلأی ئیسلام لە ئەندەلوس ڕوخاو كۆتای بە دەستەلأتی موسڵمانان هات لەو ولأتە.

ئەبو عبدالله كۆتا پادشای غرناتە، پەیماننامەی خۆبەدەستەوەدانی لەگەڵ خاچ دروشمەكاندا واژۆكرد كە (٦٧) بەندی لە خۆگرت بوو، لەوانەش دڵنیابوونی موسڵمانەكان لە ئایین و بیروباوەڕ و ئازادی و ماڵ و سامانیانی، بەلأم هیچ یەكێك لە بەندەكانی ئەو ڕێكەوتنامەیە جێ بەجێنەكران،

دواجار ئەبو عبدالله ی پادشای غرناتە، بە قەدپاڵی چیای (ریحان)ە وەستاو بە دەم گریانەوە كلیلی شانشینەكەی دایە دەست فردیناند و ئیزابێلای هاوسەری، ئوم عائیشە وتەیەكی بەناوبانگی لەو بارەیەوە هەیەو دەڵێت : (وەك ئافرەت بگری، بەسەر ولأتە لەدەست چووەكەتدا،ئەو ولأتەی نەتوانی وەك پیاو پارێزگاری لێ بكەیت ).

ئەوەی ماوە كە بیڵێن ئەوەیە كە نەهامەتی ئەندەلوس، لە ژیان و واقعی موسڵماناندا دووبارە دەبێتەوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو ناهامەتیان بەردەوامیان دەبێت لە فەلەستین و ئەفغانستان و ئێریتریا و فلیپین و عێراق چەندین ولأتی تری ئیسلامی،مادام دابەش بوون و پەرت پەرت بوون درێژەی هەبێت!!



غەرناتەی جوان پێش رووخانی ! !




شانشینی غەرناتە, کەکۆتایی زنجیرەی بەنی ئەحمەر و کۆتایی سەردەمی ئیسلامی لە ئەندەلوس نیشان دەدات! !

هەندێك جار دونیا بەدەم كەسێك چ پیاو بێت یان ئافرەت پێدەكەنێت،و لە بارێكەوە دەیباتە بارێكی تر. ..لەوانەشە پێكەنینەكەشی بۆ پتر بكات و زیاتر و زیاتر سەری بخات. ...تا بیگەیەنێتە لوتكەی دەستەڵات لە وڵاتەكەی خۆیدا بە شێوەیەكی پێشبینی نەكراو، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو سەرەتا سادەو ئاساییەی كە هەی بووە.

یان لەوانەیە ڕۆژگار بەهرە سیاسیەكەی ئاشكرا بكات لە دەستەڵاتدا كەلای شاراوە بووە، ئیتر چ ئافرەت بێت یان پیاو و بە تاقیكردنەوەیەكی باش تاقیی بكاتەوە، كە بتوانێت تواناو لێهاتووی و دانای خۆی پیشان بدات، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەو كەسە لەیەك چركە ساتدا، لاوازی خۆی لە بیردەكات و شوێنی خواستە دەروونیەكانی دەكەوێت و،ئەوەش دەبێتە هۆی لەدەستدانی كورسی دەستەڵاتەكەی، لەوەش زیاترلەوانەیە بە مردنێكی شەرشۆڕكەر بەسەریدا بشكێتەوە، كە بەهیچ جۆرێك لە خەیاڵیدا نەبووە و حسابیشی بۆ نەكردووە. ...ئەوە ئەو شتە بوو كە بەسەر شاژنی وڵاتی میصر شەجەرە دوڕدا هات، ئەو چیرۆكەی كە تا ئێستاش خەڵكی باسیدەكات! !

شەجەرە دوڕ یەكەم ئافرەت بووە كە توانیویەتی فەرمانڕەوایەتی وڵاتی موسڵمانان بكات و سەركردایەتی بكات لە ناڕەحەترین كاتەكاندا.ڕاسترین پێناسەیەك كە بۆ ئەو ئافرەتەی بكەین، ئەوەیە كە بوترێت كە ئەو ئافرەتێكی ئاسنین بووە، ئەو كەنیزەكەی كە توانی بە خۆڕاگری و ژیری و دانای و پێداگری خۆی بگاتە سەر كورسی دەستەڵات لە وڵاتی میصردا.

شەجەرە دوڕ یەكێك بوو لە كەنیزەكەكانی ملك نجم الدين كە كاتی خۆی كڕی بووی،مێژوونوسان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر دیاریكردنی ڕەگەزنامەی ئەو، هەندێك دەڵێن توركەو هەندێكی تریان دەڵێن ڕەگەزی جەركەس یان ڕۆمانیە، بەڵام هەر جۆرێك

بێت ئەو ئافرەتە وەك کەنیزەکەکانی تر نەبووە ، بەڵکو کەسێکی زیرەك و تێگەیشتوو بووە، توانای نوسین و خوێندنەوەی هەبووە و گۆرانیشی گووتوە، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی جوانیەکی زۆر بووە.

ملك نجم الدین سارسام بوو پێی و کڕی، و ناوی لێنا (شەجەرە دوڕ)،لەوانی تر جیای کردەوە و لە لای خۆی شوێنێکی شیاوی بۆ دابینکرد، بە شێوەیەك کە مافی خۆیی بوو کە تاکە خاوەنی دڵ و عەقڵ و ڕاوبیرو بۆچوونی پاشا بێت و،دواجاریش ببێتە هاوبەشی شەرعی دایکی کوڕەکەی.

ئەمیر نجم الدین بە فەرمانی باوکی نێردرابوو بۆ قەڵای (کیفا)بۆ ئەوەی ببێتە والی ئەو ناوچەیەو فەرمانڕەوایەتی ئەو قەڵایە بکات (قەڵای کیفا یەکێك بوو لە قەڵاکانی ڕۆهەڵاتی ئیسلامی و،دەکەوتە سنوری ترکستان)، دوای ڕۆشتنی هەواڵی لە قاهیرەی پایتەختەوە پێگەیشت کە باوکی (پادشا کامیل) برا بچوکەکەی ئەبابکری ناسراو بە (پادشای دادپەروەر) کردوە بە جێگرەوەی خۆی لە جیاتی ئەم، لەبەر ئەوەی دایکی (پادشا ئەبابکر) لە دڵی باوکیەوە نزیکتر بوو تا دایکی (نجم الدین). بۆیە نجم الدین لە هەنگاوەکەی باوکی توڕەو نارەحەت بوو، لەبەر ئەوەی براکەی کەسێکی هەڵەشەو بێ عەقڵ بوو، دەوڵەتیش لە هەموو لایەکەوە لە مەترسیدابوو و چاوی دوژمنانی خاچ دروشمەکان و مەغۆلەکانی لەسەر بوو، لەبەر ئەم هۆیانە نجم الدین سوێندی خوارد کە نابێت خەلافەت لە دوای باوکی بۆ کەس بێت جگە لە خۆی نەبێت،

چونکە کەسێکی پێگەیشتوو تر لە براکەی و شایستە تر بوو بۆ ئەو پۆستە.

لەو کاتەدا شەجەرە دوڕ باشترین هاوسەریەتی بۆ هاوسەرەکەی نیشانداو هەستا پاڵپشتی کرد و هانیدا لەسەر ئەو کارەی، یارمەتی هاوسەرەکەیدا بۆ سەندنەوەی مافە داگیرکراوەکەی خۆی، لەو ماوەیەشدا کوڕێکی بوو نایان لێنا (خلیل).

نجم الدین لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکەیاندا بەرەو قاهیرە بەڕێکەوتن، ئەوانەی کە یاوەریان دەکردن تەنها پێکدەهاتن لە ژمارەیەکە کەم سەرباز کە بە دەیان سەرباز مەزندەدەکران، و ژمارەیەکی کەم لە مەمالیکەکان لە سەروی هەمووشیانەوە (بیبرس،

ئەیبك، قلاوون،ئاق تای)، لە ڕێگەیاندا لە کاتی گەیشتنایان بە خاکی ئەردەن سوپای ملك (ناصر داوود) کە کوڕی مامی نجم الدین بوو والی میرنشینی (کەرك و شەویەك)بوو، دای بەسەریانداو دەستگیری کردن و لە قەڵای (کرك) زیندانی کردن، پاشان هەواڵی نارد بۆ ملك(عادل) و هەواڵی ئەو دەستگیرکردنەی پێداو، لە بەرامبەردا داوای والیەتی ناوچەکانی شامی لێکرد، بەندکردنیان لەو قەڵایەدا ماوەی حەوت مانگی پێچوو، لەو ماوەیەدا شەجەرە دوڕی هاوسەری هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئارامکردنەوەی هاوسەرەکەی و دروستکردنی گەشبینەیەکی ئومێد بەخش لە دڵیدا.

لەگـــەڵ درێژەکێشـــانی مـــاوەی بەنـــدکردنیان، نجـــم الـــدین بـــە هاوکـــاری هاوسەرەکەی(شەجەرە دوڕ) پلانێکیاندانا، بە ڕێکەوتنی هاوسەرەکەی لەگەڵ نەیارەکانی (ملك ناصر) بە ئازادکردنی نجم الدین بۆ وەرگرتنی دەستەڵات لە میصر و لـە بەرامبـەردا فەرمانڕەوایـەتی شـام و نیـوەی خـەراجیان بـداتێ. پاشـان ملـك نجـم الـدین صـاڵح هاوسەرەکەی (شەجەرە دوڕ)ی نارد بەرەو قاهیرە و ئەویش تـوانی براکـەی (ملـك عـادل) تێکبشـکێنێت و لـە قـەڵای (صـلاحەدین) زینـدانی بکـات، بـەو شـێوەیەش شـەجەرە دوڕ گەیشتە مەرامی خۆیی،کاتێك کاتێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەستەڵاتیان دابەشکرد.

دەڵێن کاتی خۆی کە پادشای فەرەنسا (لویسی نۆهەم) نەخۆش کەوتووە، نەزری کردووە، ئەگەر بێت و چاك بێتەوە ئەوا هێرش دەکاتە سەر موسڵمانەکانی میصر،دواتر چاك بووەتەوە و وەك وەفایەك بۆ جێ بەجێکردنی بەڵێنەکەی هێرشی بۆ سەر وڵاتی میصر دەست پێکردوە، بە ڕێکەوت کاتی ئەنجامدانی ئەو هێرشە هاوکاتی دەرکەوتنی شەجەرە دوڕ بووە، وەك کەسایەتیەکی سیاسی لە میصردا. لویسی نۆهەم پادشای فەرەنسا سوپایەکی ئامادەکرد و لە ڕێگەی دەریاوە لە ساڵی (١٢٤٩)ز هێرشیکردە سەر میصر، لەو کاتەدا نجم الدین صاڵح نەخۆش بوو، هەرچەندە ئامادەی خۆی نیشاندا بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشەی فەرەنسیەکان، شاری منصورەی کردە ناوەندی سەرکردایەتی گشتی و میر (فخر الدین) ی کردە بەرپرسی ئەو ناوەندە، لەو کاتەی کە هاوسەرەکەی شەجەرە دوڕ بۆخۆی حەزیکرد بەو شێوازە بێت، شەجەرە دوڕ سەلماندی

بۆ هاوسەرەکەی کە لە توانایدا هەیە ڕوبەڕووی ناڕەحەتیەکان ببێتەوە، سوێندی خوارد بۆ هاوسەرەکەی کە خاچ دروشمەکان لەناو دەبات لە کاتی گەیشتن و دابەزینیان لە زەویەکانی میصر.

دانای و ژیری شەجەرە دوڕ کاتێك دەرکەوت، کە هەواڵی مردنی هاوسەرەکەی نجم الدین صالح ی شاردەوە، لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە:تا نەبێتە هۆی ڕوودانی دڵەڕاوکێ و شپرزەی لە ولاتدا، بە تایبەتی لە نێو ڕیزەکانی سوپادا، تا بتواننێت ڕوبەڕوی دوژمن ببێتەوە، هەروەها تا نەبێتە هۆی ئەوەی کە میرەکانی بنەماڵەی ئەیوبی و مەمالیکەکان چاوببڕنە تەختی پاشایەتی ولات.

بارودۆخ لە کۆشکی پاشایەتیدا وەك خۆی بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی کە شەجەرە دوڕ تێبینی ئەوەی کرد کە لە وانەیە هەواڵی مردنی هاوسەرەکەی ئاشکرا بێت ولە هەمان کاتیشدا دوژمن لە لێواری شکاندا بوو، بۆیە هەستا کوڕی هاوسەرەکەی (توران شا)بانگکرد و فەرمانیدا بە پیاوانی دەوڵەت و سوپای ولات سوێندی دڵسۆزی بۆ بخۆن، و لە میمبەری مزگەوتەکانەوە بانگەوازی بۆ کرد و کردیە دەستەلاتداری میصر.

بەلام ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەبوو، کە دەستەلات لە دەستی خۆیدا بمێنێتەوە و،خۆی چۆنی پێخۆشە بەو شێوازە بیجولێ نێت، ئەوەش نیشانەی زیرەکی و دانای ئەو بوو.

پێش ئەوەی توران شا بگاتە بەرەکانی جەنگ، شەجەرە دوڕ لەگەڵ سەرکردەکانی مەمالیك و ئەو هێزەی لەوێ بوو، پلانێکی سەربازیان داڕشت بۆ بەرەنگاربوونەوەی خاچ دروشمەکان، خۆی سەرپەرشتی جێ بەجێکردنی پلانەکەی گرتە دەست و، هەر بۆخۆشی چاودێری ڕێڕەوی بەڕێوەچوونی جەنگەکەی دەکرد لە شاری منصوریەی میصر، لە زۆری پەرۆشی شەجەرە دوڕ بۆ پاراستنی شارەکە، بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی شارەکە

هاوكاری سەربازەكان بكەن و هێرشی دوژمنەكان بەرپەرچ بدەنەوە و سەربكەون بەسەر خاچ دروشمەكاندا لە ساڵی (١٢٥٠)ز.

فەرمانڕەوایەتی (توران شا) زیاتر لە دوومانگ درێژەی نەكێشا، بە هۆی گەندەڵی ملهوڕیەوە پیاوانی دەوڵەت لە دەستەلآت دوریان خستەوە، داوای سامانەكی باوكیان لێكرد، بەوەش وازیان لێنەهێنا مەمالیكەكان شتەكەیان زیاتر وروژاند، تا بووە هۆی توڕەبوونی خەڵكی زیاتر و لەسەردەستی (بیبرس) كوژرا، بە كوژرانی ئەویش، ئیتر هەمووان لە میصردا یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی كە شەجەرە دوڕ دەستەلآتی میصر وەربگرێت.

سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شەجەرە دوڕ لە میصردا گەش و ڕووناك بوو،لەو ماوەیەدا تواناو بەهرەكانی خۆی لە بواری فەرمانڕەوایەتیدا وەدەرخست، هەژاران بە چاكەخوازیەكانی بەهرەدار بوون. ئەو شاژنێكی عاقڵ و ژیر بوو، شارەزایەكی تەواوی هەبوو لەسەر لایەنی دەروونی گەلی میصر و داواكاریەكانیان، حكومەكەی دیكتاتۆریانە نەبوو، هیچ كارێكی ئەنجام نەدەدا تا ئەنجومەنی شورای كۆنەكردایەتەوە، هیچ جۆرە بڕیارێكیشی دەرنەدەكرد تا ڕای ڕاوێژكار و وەزیرەكانی وەرنەگرتایە لەسەری. لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا ئاشتی و ئارامی لە ولآتی میصردا بلآوكردەوە، و ژمارەیەكی زۆر لە شاعیر و وێژەوانی میصری دەركەوتن لە نموونەی ئەوانەش(بها الدین زهیر،جمال الدین كوری مەتروح، فخر الدینی كوری شیخ).

شەجەرە دوڕ لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا چەند نازناوێكی جیاوازی هەبوو لە وانە (شاژنی پارێزەری ئیسلام) (شاژنی دایكی خلیل) (شاژن شەجەرە دوڕی دایكی خەلیلی موستەعصەمی ) وەك ئاماژەیەك بە ناوی خەلیفە (المستعصم)ی خەلیفەی

عباسیەکان،لە ترسی ئەوەی نەبادا دان بە دەستەلاتەکەیدا نەنێت ,بەلام هەموو ڕۆژانی هەینیەك لە گوتاری ڕۆژانی هەینی مزگەوتەکاندا ناوی دەهێنرا، و بڕیارەکان بەناوی ئەوەوە دەردەچوون لە ولاتدا، ناویشی لەسەر درهەم و دینارەکانی ولاتەکەی نەخشێنرا.

عباسیەکان بەوە دلخۆش نەبوون کە ئافرەتێك تەختی پاشایەتی میصر بەڕێوەبەرێت، ئەوەش بووە هۆی سەرهەلدانی ناکۆکیەکی زۆر لە نێوان میر و سەرکردەکان لە میصر و شام، بۆ نەمانی ئەو قسەو باسانەش کە لەسەری دەکران شەجەرە دوڕ هەستا ژیانی هاوسەرگیری لەگەلێ یەکێك لە سەرکردە بالاکانی سوپادی ولاتەکەی پێکهێنا بەناوی (میر عز الدین ئیبك)،بەوەش قسەی خەلکی و نارەزایەتی عباسیەکانی لەسەر نەما.بەلام پێش ئەوەی کە ژیانی هاوسەرگیری لەگەلێ میر عز الدین پێکبهێنێت مەرجی ئەوەی لەسەر دانابوو کە دەبێت واز لە کوڕەکەی بەناوی (المنصور علی) بهێنێت، تا دوای خۆی دەستەلات نەگوزرێتەوە بۆ ئەو، نازناوێکیشی بۆ هاوسەرە نوێکەی دانا بەناوی (ملك المعز).

ڕۆژگار تێپەڕی و سەرجەم کاروبارەکانی میصر لە ناوخۆ و دەرەوەی ولات کەوتنە دەست هاوسەرەکەی (ملك المعز)، پاشان بۆی دەرکەوت کە هاوسەرەکەی نیازی وایە کە کچی (ملك بدر الدین لو لو )ی فەرمانڕەوای موصلێ بخوازێت، بەوەش پەیوەندی نێوان شەجەرە دوڕ و ئەوکەسەی کە متمانەی پێکرد تێکچوو، خەریك بوو عەقلی لەدەست بدات بە هۆی توندی ڕق و ئیرەییەوە، هەروەها ئەوەشی زانی بوو کە هاوسەرەکەی نیازی وەهایە لە کۆشکی (قلعە) دوری بخاتەوە بۆ (دار الوزرا )وەك ئامادەکاریەك بۆ پێشوازیکردن لە بوکی نوێ.

شەجەرە دوڕ زۆر تورەبوو لە ڕوانگەی هەست و گەورەی خۆیەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە بۆی دەرکەوت دەیەوێت وازی لێبهێنێت، بۆیە ڕۆژێك هاوسەرەکەی بانگ کرد و زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرد، وەك ئەوەی کە هیچ لە نێوانیاندات ڕووینەدا بێت،تا هەستی بە دڵنیای کردوو ڕۆشتە گەرماوەکەوە، لەو کاتەدا پێنج لە پیاوە بەهێزەکانی شەجەرە دوڕ هێرشیانکردە سەری و کوشتیان، دوای ئەمەش وەها بڵاوی کردەوە کە گوایا (ملك المعز) بە شێوەیەکی کت و پڕ کۆچی دوای کردووە، بەڵام خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی باوەڕیان بەو قسەیە نەدەکرد.

دوای ئەم ڕوداوە شەجەرە دوڕ هەوڵیدا یەکێك لە میرەکانی مەمالیك لەسەر کورسی دەستەڵات دابنێ تا پارێزگاری لە خۆی بکات، بەڵام هەوڵەکەی شکستی هێنا، پەنای بردە بە تاوەری الاحمر لە قەڵاکە لە ساڵی (١٢٥٧)ز، بەڵام بەو هەنگاوەش ڕزگاری نەبوو، لەلایەن ئەو میر و سەرکردانەوە کە لایەنگری هاوسەرە کوژراوەکەی بوون دەستگیرکرا و خرایە زیندانی تاکە کەسیەوە و بە جۆرەها شێوە ئەشکەنجە درا. پاشان (دایکی علی) هاوسەری یەکەمی مێردە کوژراوەکەی دەست تێوەردانی کرد و کورەکەی (علی) هاندا لە تۆڵەی کوژرانی باوکیدا بیکوژێتەوە.هەندێك سەرچاوەی تری مێژووی باس لەوە دەکەن کە شەجەرە دوڕ لەسەر دەستی ژمارەیەك لە کەنیزەکەکان کوژراوە، کە بە پێڵاوی دارین لێیانداوە تا گیانی دەرچووە. بەو شێوەیە دەبینین شەجەرە دوڕ بە ڕێز و شکۆوە ژیاو دەستەڵاتی وەرگرت، بەڵام مرد بە مردنێکی مل کەچ و ڕیسواو سەرشۆڕ.

تا ئیستاش ژیاننامەی شەجەرە دوڕ دەگێڕیتەوە، و زۆرێك لە ئافرەتان هیواخوازن یەکێك بن لەوانەی کە خۆیان بەهێز بکەن بە کەسایەتی ئەو، لەبەر بەهێزی و زیرەکی و لێهاتووی و ئەو توانا سەرسوڕهێنەرەی کە هەی بوو بۆ فەرمانڕەوایەتی کردن.

مێژوو بە زیندوی دەمێنێتەوە لە باسکردنیدا،باسکردنی ئەو خزمەتگوزاریانەی کە پێشکەشی موسڵمانان و میصریەکانی کرد، بەڵام ئیرەییەکەی لە گەورەی شکۆی خۆیدا، هۆکارێك بوو کە وای لێکرد ئەو تاوانە ئەنجامبدات، کە لە ئەوپەڕی لوتکەو بەناوبانگیدا خستیە خوارەوە و لەناوی برد.

له هەڵەکانی سیاسیە گەورەکان ئەوەیە کە بڕیاری گونجاو لە کاتی پێویستدا نادەن، هەندێك کەسی سیاسی هەڵەی کوشندە ئەنجامدەدەن، کاتێك گرەوی خۆیان زیاترلەسەر ئەو گۆڕانکاریەکان دەکەن کە پشت دەبەستن بە هیواخوازی، لەوەتەی کە پشت بە گۆڕانکاریە واقعیەکان ببەستن. لەوانەیە باشترین نموونەکە نمونەیەکە زیندومان بداتێ بۆ کەسێکی سیاسی، کاتێك ماوەکەی دواکەوت و قۆناغەکەی تێپەڕاند، بریتی بێت لە سەرۆکی تونسی (زین العابدین بن علی)کە شۆڕشێکی جەماوەری ناچار بەڕاکردنی کرد، دوای ئەوەی لە مانگی یولیوی ساڵی (٢٠١٢)ز تۆمەتبارکرا بە کوشتنی خۆپیشاندەران، دوای ئەوەی کە ڕاشیکرد بە زیندانی هەتاهەتای حوکم درا.

هەڵەی گەورەی بن علی ئەوەبوو کە ئامادەی خۆی نیشاندابوو، بۆ وەڵامدانەوەی داواکاریەکانی جەماوەری ڕاپەڕی و، بەڵام دوای ئەوەی کاتی بەسەر چوو بوو.

باشترین شتێك کە ئەو هەڵە گەورەیە بەرجەستە بکات بریتی یە لەو دەستەواژە بەناوبانگەی بن علی خۆی کە پێش ڕوخانی لە وتارە کارەساتبارەکەیدا بەکاری هێنا، دەستەواژەی (لێتان تێدەگەم)

لێتان تێدەگەم، دەستەواژەیەکە لەوانەیە بۆ تێپەڕاندنی قۆناغێك باش بێت، بەڵام پێش ئەوەی کار لەکار ترازابێت و لە ژێر کۆنترۆڵدا دەرچوو بێت، بەڵام کاتێك لە دەمی سەرۆکی تونسیە دەرچوو هیچ دەنگدانەوەیەکی لە شەقامی تونسیدا لێنەکەوتەوە، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا کەس ئەو سەرۆکە هەڵخەڵەتێنەرەی بە ڕاستگۆ نەدەزانی، کە گوتارێکی لە کۆشکی سەرۆکایەتی وڵاتەوە لە ڕێگەی پەخشی تەلەفزیۆنیەوە بڵاوکردەوە. ..هەرکەسێك ئەو ئێوارەیە بن علی ببینیایە کە گوتاری بۆ گەلی تونسی دەدا، ئەو سەرۆکێکی دەبینی لە کۆتای دەستەڵاتیدا، سەرۆکێکی شڵەژاو و تکاکار بە

چاکەخوازی، وەك ئەوەی کە ئەوشتانەی پێشتر ئەو نەی کردبێت، وەکە ئەوەی بە زمان حاڵی خۆی بڵێت (لام مەدەن. ..دەمەوێت لاسایی ژەنەڕاڵ دیگۆل بکەمەوە، کە بە فەرەنسیەکانی گوت بوو لێتان تێدەگەم، پێش ئەوەی کە کۆشکی ئیلیزای بەجێ بهێڵێت).

گوتارەکەی بن علی هیچ جۆرە کاریگەریەکی نەبوو نەی توانی شەقام هێور بکاتەوە، بەڵکو خۆپیشاندەران پەیامیان بۆ ئەو هەبوو.

ژەنەڕاڵ چڵەوی کارەکانی لەدەستداوە و لە توانایدا نەبوو کاروبارەکان کۆنترۆڵ بکات، بۆیە دەستیکرد بە کۆمەڵێك سازش، کە پێشڕویان کرد بەرەو خێرا کۆتای هاتنی خۆی، لەوانەش دەستلەکار کێشانەوەی حکومەت و هەڵبژاردنی پەرلەمانی لە ماوەی شەش مانگدا و ڕاگەیاندنی باری نائاسای لە وڵاتدا.

ژەنەڕال بن علی وەك هەموو ژەنەڕاڵەکانی تر، ئەوانەی کە دەزانن کۆتاییان نزیکە لە گوتارەکەیدا وەك کەسێکی مرۆڤ دۆست و ڕێزگری مافەکانی مرۆڤ خۆی نیشان دەدا و دەیگووت: خەمبارم بەو بارەی کە تونس تێی کەوتووە، داوای لە هەمووان کرد خزمەتی تونس بکەن و بنیادی بنێن، هەروەها ڕایگەیاند نارەحەتە بە ڕژانی خوێنی ڕۆڵەکانی، وەك ئەوەی کە خۆی بەرپرس نەبێت لە ڕژانی ئەو خوێنە. ..و داوای دروستکردنی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی کرد لە بارەیەوە...دواجاریش ئەوەی ئاشکرا کرد کە دەستەواژەی نەفرینی (سەرۆك بە درێژای تەمەن) کە سەرۆکی پێشوی وڵات بورقیبە بەکاری هێنا، شایستەی تونس نیەو، بڕیاریدا وازی لێبهێنێت.

هەرکەسێك ئاگای ئەو گوتارەی سەرۆکی تونس بوایە، بەبێ ئەوەی ئاگاداری گوزەران و بارودۆخی تونس بوایە، لە وانەی بیگوتایە، سەرۆك ڕاستدەکات و ئومێدێکی بۆ دروست بوایە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە بۆ کەسێکی بێئاگا، نەك بۆ ڕۆڵەکانتی تونس، چونکە شتەکە بەو شێوازە نەبوو.

ئەو گوتارە هەمان ئەو شتە بوو کە لە ساڵی (١٩٨٧)ز لە کاتی کودەتاکەی بەسەر سەرۆکەکەی خۆیدا (بەرقیبە) خوێندیەوە، هەما قسەو هەمان ئەو بەڵێن و ناوەڕۆکە،

بەلأم بە تێپەڕبوونی کات نەگۆڕان و نەپێشکەوتنیشیان بەسەردا هات و نە جێ بەجێش کران، ئەوەی لەو نێوەندەدا گۆڕا سەرۆك خۆی بوو.

بن علی پێش ڕوخانی ڕژێمەکەی (لێتان تێدەگەم...لێتان تێدەگەم )ی ڕاگەیاند، کاتێك لە گوتارەکەی ڕۆژی پێنج شەممەی بەرواری (١٣ ینایری ساڵی ٢٠١١)ز ئەو دەستەواژەیەیی دووبارە کردەوە، لە سەرەتاکانی پەرەسەندنی خۆپیشاندانە جەماوەریەکان و زیادبوونی کردەوە تێکدەرانەکان و تێکچوونی باری ئەمنیدا. لێتان تێدەگەم دەستەواژەیەك بوو پێویست بوو بن علی لەسەرەتاکانی وەرگرتنی دەستەلأتەکەیەوە بیگوتایە.

لێتان تێدەگەم واتە :تێگەیشتن لە پێداویستیەکانی خەڵك، وەك فرەی سیاسی ڕاستەقینەو ئازادی ڕۆژنامەگەری و دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەستەلأت و مافی دەستخستنی هەڵی کاری یەکسان و ژیانێکی ئابرومەندانەو ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادی خۆپیشاندان و هەر شتێك کە پەیوەندی بە کار و چالاکی سیاسیەوە هەبێت.

لێتان تێدەگەم. ..بوو بە چەمکێکی لێ تێگەیشتراو،بەلأم دوای (٢٣) ساڵ لە دواکەوتن، پێویست بوو ئەو چەمکە ببوایە بە دروشمێکی نەتەوەی، دوای ئەوەی جیهان گۆڕا بە گوندێکی بچووك و فتیلەی ڕوداوەکانی شۆڕشی تونسی لە سەرجەمە شار و شارۆچکەکاندا هەڵگیرسان و لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەلأیەتیەکانی وەك فەیس بوك و تویتەر و یوتیوبەوە سەرجەمە هۆکارەکانی تری ئەلکترۆنیەوە بلأوکرانەوە، بە شێوەیەك وەك ئەوەی کە ڕوداوەکان لەبەردەم چاوی هەموو جیهاندا ڕوویدەن.

دەستەواژەی لێتان تێدەگەم، وێستگەی کۆتاییە لەتەمەنی ئەو ڕژێمەی کە ڕەدی دەکاتەوە و ڕێگرە لەبەردەم ڕاو ڕای جیاوازدا. لەبەر ئەوە لە مێژووی مرۆڤایەتی و شۆڕشە جەماوەریەکاندا، کەس نەبووە بتوانێت ئەو شەپۆلە مرۆیانە ڕابگرێت لە ڕاپەڕیون لەبەرامبەر ستەم و دەستدرێژی و جەور و خراپەکاریدا، بۆیە دیمەنی هاوڵاتیان و گەنجانی تونسی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دوای بەسەرچوونی کات، نەدەکرا بوەستێنرێت لە سنوری بەڵێندا.

ویستی خەڵكی گۆڕانێكی ڕیشەی بوو، ئەوەش پەیامێكی ڕوون و ئاشكرا بوو، بەڵام پێچەوانەوە ناكۆك بوو لەگەڵ تێگەیشتن و حەزەكانی سەرۆك زین العابدین بن علی، كە زیاتر لە دوو دەیە فەرمانڕەوایەتی تونسی دەكرد.

تونس لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەودا، جەور و ستەم و بێدەنگ كردنی دەنگەكانی بەخۆوە بینی، ئەمە جگە لە ڕاوەدوونانی بانگەشەكارانی مافەكانی مرۆڤ و داخستنی بوارەكانی دەربڕینی ڕای ئازاد لە ڕۆژنامەو هێڵەكانی ئینەتەرنێت و هۆكارەكانی تری ڕاگەیاندنی ئازاد،هەروەها ڕەد كردنەوەی فرەی سەندیكای و كپ كردنەوەی هەموو ئەو دەنگانەی كە دژ و نەیاری دەنگی بن علی بوون. دیمەنی ئەو ڕووداوانەی كە لە تونس ڕویاندا، دەرئەنجامی ساڵانێك لەو ناڕەحەتی و ئازارە بوون كە نوسەران و شاعیران و ڕۆژنامەنوسان و ئازادیخوازان چەشتیان، بە جۆرەها ڕێگە و شێوازی جیاواز، بە ڕادەیەك كە تونس لە بیركردنەوەی ڕای گشتی ڕۆژئاوا و عەرەبیدا بە سیستەمێكی پۆلیسی و دەستەلاتێكی دیكتاتۆر ناسرا بوو، كە چاوی خۆی لە ئاست ئەو هەموو ڕاستیانە لە سەر ئاستی گۆڕەپانەكەدا داخست بوو.

بۆیە دەستەواژەی لێتان تێدەگەم پێویستی بە زیاتر تێگەیشتنی قوڵ هەیە، بۆ ئەو گەلانەی كە لەسەر هەمان ڕێگەی گەلی تونسی شۆڕش بەرپا دەكەن.

ئەو كاتەی كە بن علی خەریك بوو گوتارەكەی كۆتای پێ بهێنێت،جارێكی تر سەرلەنوێ شەقامەكانی تونس پڕبوونەوە لە خۆپیشاندەر، میلیشیاكانی ڕژێمەكەی بن علیش دەستیانكرد بە تەقەكردن و ژمارەیەكی زیاتر خۆپیشاندەریان كوشت. لەو شتە كت و پڕ و لە ناكاوانەی كە لە پایتەختدا ڕویاندا بریتی بوو لە شكانی قەدەغەكردنی هاتوچۆ، و دەرچوونی خەڵكی بۆ خۆپیشاندان و مانەوەیان تا بەرەبەیان و نزیك بوونەوەیان لە كۆشكی و كۆماری و وەزارەتی ناوخۆ، و هوتاف كێشانیان لە دژی سەرۆك بە ڕۆشتنی لە وڵات و ڕزگاركردنی سەرجەم گیراوە سیاسیەكان.

خۆپیشاندانی شەوانە بەرەو كۆشكی سەرۆكایەتی (قرتاجین) ڕۆشتن، و پاسەوانەكانی سەرۆكایەتی ڕووبەڕویان بوونەوە، خۆپیشاندەران لە شەقامەكاندا مانەوە و پاشەكشێیان

نەکرد، و چەند گروپێك لەوان هێرشیان کردە سەر ماڵی خانمی یەکەمی ئەو وڵاتە (لەیلا تەرابلوسی).

لە کاتژمێر شەشی ئێوارەی ڕۆژی هەینی تونس لاپەڕەکانی ماوەی فەرمانڕەوایەتی زین العابدین ی پێچایەوە،بە فڕینی فڕۆکەکەیی و نەگەڕانەوەی بۆ فڕۆکەخانەی (قرتاجینە). سەرۆك کاروباری سەرۆکایەتی وڵاتی بە کاتی دایە دەست سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی وڵات (محمد غەنوشی)،کە گومانێکی زۆر هەبوو لەسەر دەستوری بوونی ئەو کارەی، ئەمە جگە لەوەی کە سەرۆك وڵاتی لە باری نائاسایدا بەجیٚ هێشت و ڕادەستی سوپای وڵاتی کرد.

سیناریۆی گەشتکردنی سەرۆك بۆ تاراوگە لە چەند کاتژمێری کەمی دوای گەشتەکەی بلاّو بوویەوە، لە نیوەڕۆی هەمان ئەو ڕۆژەدا دەستکرا بە جیٚ بەجێکردنی، کاتێك بەلانی کەمەوە (١٦) کەس بە گوللەی هێزە ئەمنیەکان لە شاری تونسی پایتەختی وڵاتدا کوژران. هەرچەندە سەرۆك لە گوتارێکیدا بەڵێنی بە کاراکردنی فرەی و دابینکردنی دیموکراسی و وەلاّمدانەوەی زۆرینەی داواکاریەکانی خۆپیشاندەرانی دابوو، بەلاّم پەرەسەندنەکان لەوە خێراتر بوون، چونکە بن علی دەستی هێزە ئەمنیەکانی والاّکردبوو لە تەقەکردن لە خۆپیشاندەرانی ناڕازی. ڕژانی خوێن لەناو جەرگەی تونسی پایتەختدا، هەلی کۆتای بوو، بۆ گەڕانەوەی متمانە بە بەڵینەکانی سەرۆك، کە ژمارەیەکی زۆر خۆپیشاندەر بوونە قوربانی لە میانەی جەنگێکی قورس لە نزیك بینای وەزارەتی ناوخۆی حکومەتەکەی بن علی. هێزە ئەمنیەکان پەنایان بردە بەر بەکاهێنانی گازی فرمێسك ڕێژ، بۆ بلاّوە پێکردن و دورخستنەوەی خۆپیشاندەران، پاش ئەمە بارودۆخەکە زیاتر دارماو شپرزەبوو، گەیشتە ئاستی تەقەکردنی ڕاستەخۆ لە خۆپیشاندەران، لەگەڵ ئەوەشدا خۆپیشاندەران هێرشیانکردە سەر ژمارەیەك لە ماڵی دەستەلاّتدارانی تونس،لە هەمان ئەو شەوەدا سوپا گەشتی ئاسمانی وڵاتی لە ڕێگەی فرۆکەخانەکانەوە ڕاگرت و، هەموو ئەو ڕێگایانەی داخست لەبەرە فرۆکەخانەی پایتەخت دەڕۆشتن.

بن علی جەنگی کۆتای دەست پێکرد بۆ مانەوەی لە دەستەڵاتدا، لە ڕوبەڕوبونەوەیەکی خوێناوی لەبەردەم بینای وەزارەتی ناوخۆ لە شەقامی بورقیبە، تەنها بە گەیشتنی ژمارەیەکی زۆری خۆپیشاندەر بۆ بەردەم وەزارەتی ناوخۆ، ڕووداوێکی مێژووی ڕویدا و سەرۆك گرەوەکەی دۆڕاند کەلە سەر پۆلیس و هێزە ئەمنیەکان کردبووی، بەوەی کە بتوانن جڵەوی کارەکان لە تونسی پایتەختدا بخەنەوە دەستی خۆی.

لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا خۆپیشاندانی ئاشتیان گۆڕا بۆ ڕوبەڕوبونەوەیەکی خوێناوی، کاتێك پۆلیس هێرشیکردە سەر هەزاران کەس لە خۆپیشاندەران کە مامۆستایان و پارێزەران و چالاکانی بواری سەندیکای ڕێبەرایەتیان دەکردن، و بۆمبی فرمێسك ڕێژی بەکارهێنا بۆ بڵاوە پێکردنیان و دەیان کوژرا و برینداری لێکەوتەوە.

دروست بوونی ئەو جەنگ لەبەردەم وەزارەت، سوپاو سوپا و لایەنە پەیوەندیدارەکانی دەستەڵاتی وڵاتی گەیاندە ئەو باوەڕەی، کە توند و تیژیی و پەنابردنە بەر هێز و نەبوونی هیچ جۆرە ئاسۆیەکی سیاسی، وڵات بەرەو کوشتارگەیەکی خوێناوی دەبات، بە تایبەتی هەموو ئەو سازشانەی کە کرابوون نەبوو بوونە هۆی هێورکردنەوەی هەست و دڵ و دەروونی گڕکرتووی خۆپیشاندەرە تونسیەکان.

بانگەوازی یەکێتی گشتی کار بۆ خۆپیشاندان لە ناوجەرگەی تونسی پایتەختدا، ئاگادارکردنەوەیەکی تر بوو بۆ مەترسیەکانی فراوان بوونی ناڕەزایەتیەکان، هەر چەندە سەرکردەکانی ئەو یەکێتیە لەسەرەتای ڕوبەڕوبونەوەکاندا بێلایەن بوون، بەڵام دواجار نەیان توانی لەژێر فشاری بنکەی جەماوەری خۆیان ڕابگرن، کە هەر لە سەرەتاوە بەسەربەخۆیانە بەشداریان لە ناڕەزایەتی و خۆپیشاندانەکاندا کردبوو.

بەڵام بەردەوام بوونی ناڕەزایەتیەکان و خۆپیشاندان و خەبات و تێکۆشان، هێندەی دڵخۆشی لایەنە سیاسیە ئۆپۆزیۆنەکانی وڵاتی دەرخست، بە قەد ئەوە خراپەکاریەکانی دەستەڵاتدارەنی تونسی دەرنەخست، دوای نزیکەی مانگێك لە گرتێبەردانی

(محمدبوعزیزی) لە جەستەی خۆی وەك كارێكی خۆكوژی بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتیەكانی خۆی.

پێش هەفتەیەك لە ڕووخانی ڕژێمەكەی بن علی، هیچ ڕۆژێك تێنەدەپەڕی بەبێ ئاماژەیەك بۆ كۆتای هاتنی ڕژێمەكەی، پاشەكشێ یەك لەدوای یەكەكانە وەك تۆپەڵێك بەفریان لێكردبوو، ڕۆژ بە دوای ڕۆژ دەتوایەوە، هێندە ترسی لێنیشت بوو لە توانایدا نەمابوو ئیدارەی ڕوبەڕوبونەوەكان بكات لەگەڵ خۆپیشاندەراندا.

لە نێو ئەو ئاماژە دیارانەی كە خێرای ڕووخانی ڕژێمەكەی دەردەخست، بریتی بوون لە گواستنەوەی ماڵی گشتی و تایبەتی بۆ دەرەوەی وڵات. هەندێك سەرچاوەی تونسی لە پاریسەوە ئاماژەیان بەوە دەكرد كە دەستەلأتداران و كەسانی نزیك لەوان، دەستیانكردووە بە ڕێوشوێنەكانی گواستنەوەی ماڵ و دارایەكەیان بۆ دەرەوەی وڵات. ڕاپەڕین و خۆپیشاندانەكانی تونس، وایان لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ژمارەیەك دەوڵەتی تری ئەورووپی كرد،كە گەشتیار و كارمەندانی باڵوێزخانەكانیان لەو وڵاتە ڕزگار كەن، هەر یەكە لە ئەڵمانیا و بەریتانیاش كەهاوڵاتیانی خۆیان كە بە گەشت لەوێ بوون و پشوەكانی خۆیان لەوێ بەسەر دەبرد لە ناوچەی (حمامات و سوسە) ڕزگار كرد، دوای ئەوەی ژمارەیەك كۆمەڵگەی گەشتیاری لەو دوو شارە كەوتنە بەر هێرش و سوتێنران.

پەرچەكرداری نێودەوڵەتی تاڕادەیەك نامۆ نادیار بوو، ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و فەرەنسا دوو دۆستی نزیكی ڕژێمەكەی بن علی بوون، تەنها ئەوەندەیان لەسەر ڕوداوەكان گووت كە نیگەرانن لە بەكارهێنانی هێز بەشێوەیەكی زیاد، و نەیان توانی سواری شەپۆلی شەقامی تونسی بن، كە وشەی سەرەتا و كۆتای بەدەست بوو، بۆ نوسینەوەی شۆڕشێك كە جیهانی عەرەبی لەوەو پێش شتی لەو جۆرەی بەخۆوە نەدی بوو.هەرچی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بوو، بە شێوەیەكی لاوەكی لە هەڵویستەكە تێگەیشت بوو، كۆشكی سپی لە بەیاننامەیەكدا دوای هەڵهاتنی بن علی ڕایگەیاند كە گەلی تونس مافی تایبەتی خۆی هەیە لە دیاریكردنی سەركردەكانی.

تونس سەردەمێکی نوێ ی لە مێژووی سیاسی خۆیدا دەست پێکرد، و لاپەڕەکانی (٢٣) ساڵ دەستەلاَتی دیکتاتۆری زین العابدینی پێچایەوە، دوای ڕاکردنی لە ولاَت لە ژێر کاریگەری فشار و شۆڕش و ناڕەزایەتیە جەماوەریەکان، دوای خۆی سوپا و دەستە ئەهلیەکان بەرپرسیاریەتی پاراستنی هاولاَتیانی تونسیان گرتە ئەستۆ، ئەو هاولاَتیانەی کە لە شەوێکی ترس و بیمدا دەژیان، بە هۆی بلاَوبوونەوەی کردەوەی تالاَن و بڕۆ و خراپەکاری و تێکدان و ئاژاوە گێڕی، لەو چوارچێوەیەدا سوپا ڕایگەیاند کە سەدان کەسی لە گەورە بەرپرسانی پۆلیسی ولاَتی دەستگیر کردووە کە دەستیان لەو تالاَن و ئاژاوە گێڕیەدا هەبووە.

ئەنجومەنی دەستوری تونسی ئەو مشت و مڕانەی یەکلاکردەوە، کە هەبوون لەسەر یاسای بوونی وەرگرتنی دەستەلاَتی سەرۆکایەتی ولاَت لە پاش بن علی، لەلایەن سەرۆك وەزیرانی ماوە تەواو بوەوە. سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران(محمد فواد المبزع) وەك سەرۆکی کاتی ولاَت دیاریکرد،بە مەرجی ئەوەی کە لەماوەی شەست ڕۆژدا هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ولاَت ئەنجام بدرێت.

محمد فواد سوێندی یاسای خوارد و، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە بەرژەوەندی بالاَی ولاَت دروستکردنی حکومەتێکی نیشتمانی دەخوازێت، و بۆ ئەو مەبەستە داوای لە وەزیری یەکەمی ماوە بەسەر چوو کرد کە کابینەی ئەو وەزارەتە پێکبهێنێت، ئەویش پاش ڕاسپاردنی لەلایەن سەرۆکی کاتی ولاَتەوە بە تەنها ڕۆژێك ڕایگەیاند هەوڵدەدات بۆ دروستکردنی حکومەتێکی ڕزگاری نیشتیمانی، کە سەرجەم سەرکردەکانی ئۆپۆزیۆنی پێشووی ولاَت بەشداری تێدا بکەن، بە بزوتنەوەی نەهزەی ئیسلامیشەوە.

سەرەڕای بوونی باری نائاسای گشتی و قەدەغەکردنی هاتو چۆ بە شەوان لەسەرتا سەری ولاَتدا، بەلاَم تونسیەکان شوانێکی پڕ ترس و بیمیان بەڕێ دەکرد، بەهۆی بلاَوبوونەوەی کاری خراپەکاری و تالاَن و بڕۆ و دزی کە باندە چەکدارەکان ئەنجامیان دەدان لە پایتەخت و شارەکانی تری وەك (قەیرەوان و قەفصیە)،پاشتر دەرکەوت کە ئەو باندە چەکدارانە لە لایەنگرانی دەستەلاَتداری پێشووی ولاَت و ژمارەیەك بەرپرسی

دەزگا ئەمنیەکانی وڵاتن، پاش ئەوەی سوپای وڵات دەیان کەسی لێدەست گیرکردبوون بە تۆمەتی بەشداریکردنیان لە کردەوەی دزی و تاڵان و خراپەکاری و ئاژاوە نانەوە.

گەشتەکەی بن علی سەرۆکی هەڵهاتوی تونس (شەش) کاتژمێری خایاند تا فرۆکەکەی لە فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی (جدده)ی وڵاتی شانشینی عەرەبستانی سعودی نیشتەوە، پاش ئەوەی کە فەرەنسا ڕەدی کردبۆوە پێشوازی لە خۆیی خانەوادەکەی بکات. بن علی لە ژێر فشارێکی زۆری جەماوەریدا ڕۆشت، وەك بەرجەستەکردنی وتەی شاعیری بەناوبانگی تونسی ابی القاسم الشابی کە دەڵێت: (اذ الشعب یوما اراد الحیاه).

کەس پێش بینی ئەوەی نەدەکرد، کە ئەو ( ژەنەڕاڵ بن علی)یەی کە لە ساڵی (١٩٨٧)ز بە دەستی ئاگر و ئاسن فەرمانڕەوایەتی تونس دەکرد،بەو شێوە سەرشۆڕ و ریسوایە ڕابکات.

کاتژمێرەکانی کۆتای ڕاکردنەکەی بن علی دیاردەکانی کۆتای هاتنی ڕژێمەکەی بە ئاشکرا پێوە دیار بوو. لێتان تێدەگەم وشەیەکی نهێنی گرنگ بوو لە ڕوداوی شۆڕشە عەرەبیەکاندا، لە تونسەوە دەستی پێکرد و لە میصر بەردەوامی هەبوو.

سەرۆکی لەسەر کارلادراوی تونسی زین العابدین بن علی، لێتان تێدەگەمی گووت، بەلاّم درەنگانێك لێی تێگەیشت. موبارەك و ڕژیمەکەی لە میصر دەیانگووت ئێمە تونس نین، بەلاّم کاتێك تێگەیشتن کات نەمابوو بۆ ئەوانیش،قەزانیش لە لیبیا تێی نەگەیشت، کاتێك تێگەیشت گوشتیان. ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی تێك شکاند، ئەو ڕژێمانەی کە کاتێك تێگەیشتن لە واتای چەمکەکە کات نەمابوو بەسەر چوو بوو، بن علی لە تونس هەڵهات، موبارەك لە میصر وازی لە دەستەلاّت هێنا،قەزافی لە لیبیا کوژرا،علی عبدالله صالح لە یەمەن، هەوڵیدا یاری لەگەڵ وشەکەدا بکات، بەلاّم دواجار تێگەیشت و وازی لە دەستەلاّت هێنا.

ئەمە تەنها خراپ تێگەیشتن نەبوو، بەڵکو خراپی بەڕێوەبردن و نیەت و سەرکوتکرن و دەستگیرکردنیش بوو،ئەمە جگە لە تێکەڵکردنی دەستەلاّتی وڵات و خواستە

گەندەڵەکانی خۆیان و تالآن و دزی ڕێکخراو ساختەکردنی هەڵبژاردنەکان. ئەگەر دیکتاتۆرەکان تێبگەیشتنایە، ئەگەری هەبوو زۆر شت بگۆڕایە وە گەلانی عەرەب ژیانیان بەو شێوازە نەبوایە.

بن علی دەیگوت من لێتان تێدەگەم، واتە لێتان تێدەگەم! بن علی دیکتاتۆر بەو شێوەیە قسەی دەکرد بۆ گەلەکەی، دوای ئەوەی مەلەکردنەکەی بە پێچەوانەی تەوژمی ئاوەکەی لێهات و گەڕانەوەی بۆ نەبوو، دوای ئەوەی کە بینی ڕیسواکردنی گەل و تۆمەتبارکردنیان بەوەی کە لە نێو ڕیزی خۆپیشاندەراندا ژمارەیەك پیس و گلاو هەن و ترساندنیان بە تیرۆریست سودی نیە، بینی هەموو ئەمانە شتانێکی بەسەر چوون و ئێستا دادی نادەن و ڕزگاری ناکەن.

بن علی دوای چەندین ساڵ لە ستەم و دیکتاتۆریەت بەسەر گەل و برسی کردن و سوکایەتی کردن بە شکۆیان، گەڕایەوە و داوای لێبوردنی لەگەلەکەی کرد، وەك ئەوەی بە درێژای ئەو چەند ساڵە بێ عەقڵ بوو بێت و لە گەلەکەی تێنەگەیشت بێت، دەست و پەیوەندەکەی هەڵیانخەڵەتاندبێت و درۆیان لەگەڵدا کردبێت. وەك ئەوەی ئێستا بە هۆش خۆی هات بێتەوە دوای نۆشینی مەی، و لەوە تێگەیشت بێت کە پێویستە ڕێز لە شکۆی گەلەکەی بگرێت. بۆیە بەڵێنیدا بە لێپرسینەوە لەوانەی کە هەڵیانخەڵەتاندووە و درۆیان لەگەڵ کردووە بە درێژاەی ئەو چەندین ساڵە.

لەو ماوەیەدا سەرۆك سێ جار لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆن دەرکەوت:

لە جاری یەکەمدا بە هەڕەشەکردن دەرکەوت، و هەوڵیدا جیاوازی بخاتە نێوان خۆسوتاندنی (محمد بو عزیزی) و ئەو گەنجە ناڕازیە بێکارانەی کە لە شەقامەکانی شارە جیاوازەکانی تونسدا نارەزایەتیان دەردەبڕی، و هەڕەشەی لێپێچینەوە و سزادانی لێکردن، هەر لە هەمان کاتی دەرکەوتنی ئەو یەکەم جارەیدا سەرکۆنەی کەناڵی جەزیرەی قەتەری کردوو تۆمەتباریکرد بە ووتنی شتی ناڕاست بڵاوکردنەوەی درۆ.ئەمە جگە لەوەی هەستا بە ئەنجامدانی گۆڕانکاری وەزاری و سەرەتاش بە گۆڕینی وەزیرەکانی پەیوەندی و ئابوری و ژمارەیەك پارێزگارەکانی شارەکان دەستی پێکرد، لە

نێو ئەو پارێزگایانەشدا پارێزگاری شاری (صیدە بوزید) وەك ئەوەی بیەوێت جەنگەکە لەگەڵ هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا بەڕێوە ببات، بە تایبەتی کەناڵی جەزیرە، ئەمە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە حسابێك بۆ تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانی وەك فەیسبوك و تۆڕەکانی تر، و گەڕانەوەی خوێندکاران بکات بۆناوەندەکانی خوێندن پاش بەسەربردنی پشووی نیوەی وەرزی خوێندنیان، بە شێوەیەك کە کاتێك ئەو خوێندکارانە گەڕانەوە بۆ ناوەندەکانی خوێندنی خۆیان، پێکدادان و ڕووبەڕوبونەوەکان لەگەڵ هێزە ئەمنیەکاندا پەرەیان سەند و زیادیان کرد بە تایبەتی لە شاری تونسی پایتەختی وڵاتدا.

لە جاری دووەمدا جارێکی تر بن علی دەرکەوتەوە بۆ تۆمەتبارکردنی ئەوانەی کە خۆی ناوی دەبردن بە کۆمەڵەیەکی کەم. بەڵێنی خەیاڵی ڕاگەیاند بە خستنە سەرکاری (سێ سەد) هەزار بێکار لە ماوەی دوو ساڵدا، ڕێگەی بە خۆیدا کە لە کەناڵێکی سەربەخۆی وڵاتەکەیەوە دەربکەوێت کە خاوەنداریەتیەکەی دەگەڕایەوە بۆ (الهاشمی الحامدی) یەکێك لە سەرکردەکانی پێشووی بزوتنەوەی نەهزەی ئیسلامی تونسی. ئەمە جگە لەوەی کە ڕێگەیدا بە وەزیرەکانی حکومەتەکەی بەتایبەتی (سمیر العبیدی) وەزیری لاوان، بە دەرکەوتنی لەسەر شاشەی کەناڵی ئاسمانی جزیرەی قەتەری، وەزیری خوێندنی باڵا (بشیر التکاری )وەزیری گەشەپێدان و هاوکاری نێودەوڵەتی(نوری الجوینی )،لایەنگران و دڵسۆزانی ڕژێمەکەی، ئەوانەی کە ناوی خۆیان نابوو چالاکی کۆمەڵی مەدەنی لە دیارترین ئەو کەسانەش(برهان بسیس)،و سەرکردەکانی ئۆپۆزیۆنی وڵاتەکەی ئەوانەیان کە بەلایەنگری خۆی ناسرابوون وەك (مونزیر سابت) ئەمینداری گشتی پارتی کۆمەڵایەتی و ئازادیخوازی چەپڕەو.

لە جاری سێهەم و کۆتایدا، بن علی بە شپرزیەکی زۆرە وە دەرکەوت،هەوڵیدا تونسیەکان بە گوتارە هەڕەمەکیەکەی ڕازی بکات، کە تێکەڵەیەك بوو لە شێوەزاری بازاری و زمانی ستانداردی عەرەبی، بەڵام ئەوانەی کە گوتارەکەیان بۆ تۆمارکردبوو، لە بیریان چوو بوو کە مۆنتاژی بکەن، یان نەیانزانی بوو مۆنتاژێکی باشی بکەن،بۆیە

ئەوانەی کە شارەزاییان لە بواری مۆنتاژ و ڕاگەیاندندا هەبوو، بە خێرای زانیان کە ئەو گووتارەی تۆمارکراوە و بە ڕاستەخۆی پێشکەشی ناکات.

کاتێك ویستی لاسای (شارل دیگۆل) بکاتەوە بە وتنەوەی دەستەواژەی (لێتان تێدەگەم)، هەوڵیدا قوربانی بە دەست و پەیوەندەکەی دەوربەری بدات لە پێناو خۆیدا، بە تایبەتی وەزیری ڕاگەیاندن (عبدالوهاب عبدالله) و ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی (عبدالعزیز کوری چیاو). ڕایگەیاند کەوەزیری ناوخۆ (رفیق الجاج قاسم) دەگۆڕێت بە (ئەحمەد فریعە).

هەر لەو دەرکەوتنی جاری سێهەمیدا بەڵێنی ئازادی و هەڵگرتنی کۆت و بەندەکانیدا لەسەر ئەنتەرنێت و، ڕێزگرتن لە دەستور و خۆ هەڵنەبژاردنەوەی بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ساڵی (٢٠١٤)ز.هەروەها بەڵێنیدا بە دابینکردنی هەلی کار و دابەزاندنی شمەکە بنەڕەتیەکانی وەك ئارد و شەکر و تەماتە و نان. ....دۆست و پەیوەندەکانی تۆمەتبارکرد بەوەی کە هەڵەیان ئەنجامداوە و فەرمانیکرد بە بەکارنەهێنانی چەك تەنها لە کاتی بەرگریدا نەبێت، وە بەڵێنیدا بە دروستکردنی دوو لیژنە بۆ لێکۆڵینەوەی لە ڕووداوەکان و بەرتیل و گەندەڵی، وەك هەوڵێك بۆ ڕاکێشانی سۆزی خەڵکی و مانەوەی لە دەستەلاتدات تا ساڵی (٢٠١٤)ز.

بەڵام لەبەرەبەیانی ڕۆژی هەینیەوە خۆپیشاندەرە تونسیەکان ڕژانەوە سەر شەقامەکانی پایتەخت، لە بەردەم وەزارەتی ناوخۆ کۆبوونەوە و داوای ڕۆشتنی سەرۆکیان کرد. لە دەرئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانەدا وەزیری دەرەوە ڕایگەیاند کە دەکرێت حکومەتێکی هاوپەیمانی دروست بکرێت، بەڵام ئەمەش دادی نەدا،پاشان سەرۆك حکومەتی هەڵوەشاندەوەو داوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پێشوەختەی کرد لە دوای شەش مانگ، بەڵام خۆپیشاندان و ناڕەزایەتیەکان بەردەوامیان هەبوو تا ئەو کاتەی ژەنەڕاڵ بن علی سەرۆك و ژمارەیەك لە ئەندامانی خێزانەکەی هەڵهاتن و وڵاتیان بەجێ هێشت.

بن علی لە بەرەبەیانی ڕۆژی (٧ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٧)ز گەیشتە دەستەڵات، بە بەڵگەنامەیەکی پزیشکی کە بێ توانای سەرۆکی پێشوی تونس (بورقیبەی) دەسەلماند لە بەڕێوەبردنی ولأتدا، لە وکاتەدا جگە لە بانگەشەی ڕێزگرتنی لە دەستور ئەوەشی ڕاگەیاند. (کە لە دوای ئەم ڕۆژەوە، بوار نیە بۆ دەستەلأت بە درێژای تەمەن) بەڵێنیدا بە دروستکردنی دەوڵەتی یاسا و دامەزراوەی، بەلأم سەرجەم ئەو بەڵێنانە بە جێگیربوونی دەستەلأتەکەی کۆتایان هات. ئەو پیاوە گرنتی هەموو شتێکی کردبوو بۆ خۆی، تەنانەت ئایندەی خۆشی،هەموو ولأتی ڕەنگ ڕێژکرد بە ڕەنگی مۆر، ئەو ڕەنگەی کە خۆی حەزی لێ بوو، ڕەنگی تەلەفزیۆنی ولأت و ستونی پردەکانیشی گۆڕی بەڕەنگی مۆر، بە جۆرێك تونسیەکان لە ڕەنگی سوری ولأتەکەیان دەترسان، کە نەوەك و لەگەڵ حەزەکانی سەرۆکدا نەگونجێت. شوێنکەوتووانی پێش برکێیان دەکرد لە ڕازیکردنی حەزوئارەزووەکانی سەرۆك و یاریکردن بە دەستوری ولأت. وێنەکانی لەسەر شوێنەکانی ولأتدا بلأوکرانەوە،وەك هەولێك بۆ شاردنەوەی گەندەڵیەکانی بنەماڵەکەی.

گەندەڵی لەسەرجەم جومگە سەرەکیەکانی ولأتدا بلأوبوویەوە، بنەماڵەی فەرمانڕەوا دەستی گرت بەسەر هەموو تواناکانی گەل و گرنگترین کەرتەکانی وەبەرهێنانی ولأتدا وەك:کەرتی زەویی و بیناسازی وبازرگانی ئۆتۆمبێل و گەشت وگوزار و ڕاگەیاندن. هەولێدا گەل هۆگر بکات بە خوگرتن بە تۆپی پێوە، کە بەتەواوەتی زاڵ بوو بوو بەسەر قسەی بەرنامە تەلەفزیۆنیەکان و قسەی شەقامدا، بەلأم لەمەشدا سەرنەکەوتوو نەیتوانی شەقامی پێ ڕابگرێت.

ئەو پیاوەی کە بەڵینی دەستاو دەستکردنی ئاشتیانەی دەستەلأتیدا بوو، دەیویست تا کۆتای تەمەنی لە دەستەلأتدا بمێنێتەوە، ئەگەر بە ڕشتنی خوێنی هاولأتیانیش بێت، بەلأم ئەو ڕاپەڕین و خۆپیشاندانەی کە دوای خۆسوتاندنی (بو عەزیز) هەموو شارەکانی ولأتی گرتەوە، ئەو خەیاڵەی بن علی لەبەر یەك هەڵوەشاندەوە.

زین العابدین بن علی بە بەڵگەنامەیەکی پزیشکی هاتە سەر دەستەلأت کە دەیسەلماند سەرۆك بورقیبە ناتوانێت کاروبارەکانی ولأت بەڕێوە ببات، ئەو بە زەبر و زەنگ و چنگی

ئاسنین بۆ ماوەی (٢٣) ساڵ دەستەڵاتی خۆی سەپاند، بەڵام دواجار ناچارکرا بە فرۆکەیەکی سەربازی لەگەڵ خێزان و کەسە نزیکەکانیدا لەبەردەم ئیرادەی گەلدا ڕابکات، دوای دروست بوونی خۆپیشاندانێك کە سەرجەم وڵاتی گرتەوەو بۆ ماوەی یەك مانگ درێژەی کێشا.

لە ڕۆژگاری بەرپابوونی نارەزایەتی خۆپیشاندانەکانی گەلی تونسدا،لە شاشەکانی تەلوفزیۆنەوە دوو دیمەنی تەواو جیاوازمان بینی، دیمەنێك کە سەربازێکی تونسی نیشان دەدا لە کاتی هێرشکرنە سەر هاولاتیەکی خۆ پیشاندەر لە گۆرەپانی گشتی بەردەم وەزارەتی ناوخۆی وڵات لە گەرمەی نارەزایەتیەکانی هاوڵاتیاندا،دیمەنێکیش هاوڵاتیەکی تونسی پیشاندەدا،کە چەپکە گوڵێکی جوانی بەدەستەوە بوو لەسەر بۆنیتی ئۆتۆمبێلێکی سەربازی دای دەنا لە نزیك پەیکەری ئیبن خلدون لە گۆرەپانی ئازادی، ئەوە دیاریەك بوو بۆ نیشاندانی خۆشەویستی لە نێوان هاوڵاتیانی ئاسای و سەربازدا لەو شۆڕشە سەرسوڕهێنەرەی تونسدا.

بەو شێوەیە تونسیەکانی چیرۆکی پاڵەوانی خۆیان نوسیەوە لە ڕیزی نەمرەکاندا، شۆڕش بە هەموو پێوەرەکان مایەوە وەك ئەزمونێکی ناوازە، کە بەڕاستی شایستەی ئەوەیە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی زیاتری لەسەر بکرێت. گومانیشی تێدا نیە بۆ نەوەکانی داهاتوو سەرجەم ئازادیخوازانی دونیاش، وەك سەرچاوەیەکی ئومێد بەخش دەمێنێتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دیکتاتۆری و ستەم و جەورو زۆرداری.

## 20-نەفرینی بە پشتاوپشتکردنی دەستەڵات....بزمارێك كە موبارەك لە تابووتی خۆیدا!!



له (٢٥) يناير گەلی میصر بە یەکدەنگ گووتی :نا بۆ بە پشتاوپشتکردنی دەستەلاَت، تا موبارەك نەبێتە تاکە جێگرەوەی خۆی و بژاردەی کۆتای بۆ گەل!

ڕەدکردنەوەی بە پشتاوپشتکردنی دەستەلاَت، یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی دروست بوونی شۆڕشی ینایر بوو، دوای ئەوەی بابەتی بە پشتاوپشتکردنی دەستەلاَت بۆ ڕژێمی فەرمانڕەوای میصر بوو بوویە بابەتی ژیان یان مردن. ئەوەی کە ڕوون بوو بوویەوە، ئەوە بوو موبارەك لە ئامادەکاریدا بوو، تا شتێك لەو بارەیەوە بکات، تەنانەت ئەگەر بە توندکردنی ملیۆنەها هاولاَتی میصری نەیاری بیرۆکەی بە پشتاوپشتکردنی دەستەلاَتیش بێت لە سوچی زیندانەکاندا!

تا ئەوەی موبارەك زۆر بە ڕوونی دەستیکرد بە موراوەغەکردن لە گۆڕەپانی ئەمریکیدا، بە ئامانجی بەدەستهێنانی پیرۆزبای و پالَپشتی ئەمریکی بۆ پرۆژەکەی و دەست بەسەرداگرتنی دەستەلاَت بۆ کوڕەکەی.

شۆڕش هات بۆ ئەوەی میصریەکان ڕاییگەیەنن، کە ئەوان دوای ئەو ڕۆژە ڕازی نابن کە دەستەلاَتدارانی ولاَتەکەیان چی دیکە، وەك ئامێریکی بێگیان هەلَسوکەوتیان لەگەلَدا بکەن، شۆڕشی ٢٥ ینایر کۆتای هێنا بە سەردەمێکی درێژ لە حوکمی تاکڕەوی و زۆرداری و ژێردەستەی.

شۆڕشی میصر، سەرجەم چین و توێژەکانی بەشداریان تێدا کردوو، سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە جێ بەجێکردنی ئامانج و داواکاریەکانی، دەستی پێکرد بە وازهێنانی موبارەك لە دەستەلاَت و درێژەی کێشا بە دانانی خالَی کۆتای بۆ سەردەمی هەلَبژاردن و ڕاپرسیە ساختەکان و دانانی دەستورێکی نوێ کە گونجاو بێت لەگەلَ گیانی سەدەی بیست و یەکدا، سەرەڕای هەموو ئەمانەش شۆڕش دۆسیەی بەپشتاو پشتکردنی

دەستەلاّتی لە میصردا بۆ ماوەیەکی نادیار داخست. کۆتای هێنا بە ئەصلّەکە (حوسنی موبارەك )خۆیی و، جێگرەوەکەی (جمال موبارەك)ی کوڕی.

ئەوەی کە ئەمەی خێراتر کرد هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠)ز بوون،دەبینین بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکان بەرەو ئەو ئامانجە بوون، بە شێوەیەك کە سەرجەم جۆر و شێوزەکانی ساختەکای تێدا بەکارهێنرا، کە میصر لەوەو پێش شتی وای بەخۆوە نەدی بوو، هەمووشی بۆ بەدەستهێنانی یەك ئامانج،ئەویش دروستکردنی پەرلەمانێکی ئامادەکراو کە ڕۆڵی دایکێك بگێڕێت، بۆ ئەوەی لەسەردەستی ئەو سەرۆکی داهاتووی میصر (جمال موبارەك) لە دایك بێت.

مەبەستی سەرەکی پەرلەمان کۆکردنەوەی موبارەك و کوڕەکەی بوو لەسەر یەك ئامانج ئەویش لە ئامێزگرتنی ڕژێمێکی نوێ ی موبارەکی بوو لە میصردا، هەرچەندە موبارەك بیری مانەوەی دەکرد لە پۆستەکەی بە شێوەی هەتا هەتای و خۆ پالاّوتنی بە شێوەیەکی فەخری بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتووی میصر، بەلاّم ڕێگریش نەدەبوو لە خۆپالاّوتنی جمالی کوڕی گواستنەوەی دەستەلاّت بۆی، ئەوەش بەو مانایە دەهات کە هەردوو پالێوراو بە گوێرەی سیناریۆکە کە چانسی سەرکەوتنی سەد لە سەدیان هەیە بریتین لە موبارەکی باوك و جمالی کوڕی، ئەگەر موبارەکی باوکیش تەمەنی درێژەی بکێشایە، تا کاتی هەڵبژاردنەکانی داهاتوو، کە بە ئاشکرا شوێنەواری نەخۆشی و بەسالاّچوونی پێوە دیار بوو، ئەوا ڕازی دەبوو بە سازشکردن لە سەرۆکایەتی میصر و ڕێگەی دەدا بە پارتی نیشتمانی دیموکراسی دەستەلاّتدار کەسێکی نر جگە لەخۆی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی میصر کاندید بکەن، لەبەر ملیۆنەها هۆکاریش ئەو کاندیدە جگە لە جمال موبارەکی کوڕی کەسی تر نەدەبوو.

سەرەڕای بانگەشەی جمال بۆ خۆیی بەبێ ڕاگەیاندنێکی ڕوون و ئاشکرا، کە گوایا نوێنەرایەتی نەوەی گەنج دەکات و، هیوایەکە بۆ نوێ کردنەوەی خوێنی پارتی نیشتیمانی دەستەلاّتدار، بەلاّم لە ڕاستیدا فکرەی نوێ ی حزب، هەمان شێوەی فکرەی کۆنی حزب بوو، تەنها لەیەك شتدا نەبێت، ئەویش ئەوەبوو کە فکرەی نوێ لەسەر زمانی

جمال موبارەکەوە دەردەچوو، لە کاتێکدا فکرەی کۆن لەسەر زمانی موبارەکی باوکەوە دەرچوو بوو. ئەوەش تەنها جیاوازی گەورە بوو لە نێوان سەرۆکی پارتی نیشتیمانی دەستەڵاتدا و خاوەنی فکری کۆن حوسنی موبارەك،لەگەڵ سەرۆکی لیژنەی سیاسەتی حزب و خاوەنی فکرەی نوێ جمال موبارەکی کوڕی. جگە لەمە فکرەی نوێ، کە لەوانەشە بە هۆکاری بۆ ماوەی بێت، بە هیچ شێوەیەك ڕازیکردنی ڕای گشتی و وەڵامدانەوەی داواکاریەکانی خەڵکی لە پێشینەی کارەکانیدا نەبوون.

شتێکی ڕوون بوو، کە فکرەی نوێ وەك فکرەی کۆن، لە توانایدا نەبوو تەنها بۆ ماوەی ڕۆژێکیش واز لە یاسای باری نائاسای بهێنێت، لەبەر ئەوەی هیچ دەستەڵاتێکی دیکتاتۆری واز لە ئامرازەکانی سەرکوتکردنی خۆی ناهێنێت کە لە بەردەستیدان،بە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی داواکاریەکانی گەل بە هەڵوەشاندنەوەی یاسای باری تەنگەتاوی لە ولاتدا.

پارتی نیشتمانی کۆن بە درێژای ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆی، دامەزراوە یاسایی و جێ بەجێکارەکانی بۆ خۆی زەوتکردبوو، خاوەنی پارتی نیشتمانی نوێش، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ولاتی بۆخۆی قۆرخکردبوو، بە شێوەیەك کە شاشەی کەناڵە ئاسمانی و تەلەفزیۆنە ناوچەیەکان وێنەی سەرۆکی لیژنەی سیاسەتی پارتی نیشتمانیان لێنەدەبڕا، کە لە میانەی دەرکەوتنەکانیدا وانەی فکری نوێ حزبی فێری ئەندامان و بینەران دەکرد.

بیرکردنەوەی نوێ ی پارتی نیشتمانی، وەك هەمان بیرکردنەوەی کۆن لە بەرژەوەندی پیاوانی کاردا بوو، هیچ گرنگیەکی بە بەرژەوەندیەکانی زۆرینەی گەلی هەژاری میصر نەدەدا.هەندێك دەڵێین ئەگەر وا بڕیار بێت جیاوازیەك هەبێت لە نێوان بیرکردنەوەی کۆنی حوسنی موبارەك و، بیرکردنەوەی نوێ ی جمالی کوڕیدا ئەوە جیاوازیەکی زۆر سادەو کەمەو بریتیە لەوەی کە بیرکردنەوە کۆن وای دەبینی میصر بێوەژنی پارتی

نیشتمانی موبارەكەو، بیركردنەوەی نوێش وای دەبینێت كە مصر بێوەژنی سەرۆكی لیژنەی سیاسەتەكانی پارتی نیستامنی جمال موبارەكە.

سەرۆك كۆمارەكانی پێشتری میصر، پلان و بەرنامەیان نەبوو بۆ بەپشتاوپشتكردنی دەستەڵاتەكەیان، هەرچەندە زۆر بە توندی دەستیان بە دەستەڵاتەوە گرت بوو تا مردن یان كوشتن یان دەركردنیان بە زەبری هێز، بەڵام موبارەك پلانی هەبوو بۆ ئەو كارە.

بە پشتاوپشتكردنی دەستەڵاتی میصری بابەتێكی نهێنی ماڵپەری (ویكلیكس)ی ئەمریكی بوو، كە دوای ماوەیەك لە لادانی موبارەك و كوڕەكەی بلاّوی كردنەوە، لە بەڵگەنامەیەكی نهێنیدا باس لەو لەمپەر و ناڕەحەتیانە دەكات كە دێنە ڕێگەی حوسنی موبارەك بۆ ڕازیكردنی سوپا، بۆ ئەوەی ڕازیان بكات، تا كوڕەكەی بكات بە میراتگری دەستەڵاتەكەی لە پاش خۆی. ئەو بروسكە بەڵگەنامەییە، جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كەلەوانەیە ئەو كارە بە ڕێژەیەكی دیاریكراو ئاسان بێت، لە حاڵەتی ڕودانی وازهێنانی حوسنی موبارەك لە دەستەڵات تا ئەو كاتەی خۆی لە ژیاندا بێت و نەمرد بێت، لەبەر ئەوەی ئەو كارە دەبێتە هۆی ئیحراج بوونی دامەزراوەی سەربازی میصری كە بیرۆكەی میراتگری ڕەد دەكاتەوە، لە وانەیە ناچار بە بێدەنگیان بكات ئەگەر بە نا بەدڵیش بێت، بەڵام ئەگەر موبارەك وەصیەت بكات بۆ ئەوەی كوڕەكەی لە پاش خۆی دەستەڵاتی میصر وەربگرێت، ئەوە كەس پابەند نابێت بەو ڕاسپاردەیەوە، لە ڕوانگەی ئەوەوە كە زۆرینەی سەركردە باڵاكانی سوپا ئەو جۆرە گواستنەوەی میراتگری دەستەڵات ڕەد دەگكەنەوە، لەسەروی هەموشیانەوە بە گوێرەی ئەم بەڵگەنامە نهێنیە ئەمریكیە كە ماڵپەری (ویكلیكس)ی ئەمریكی بلاّوكردۆتەوە، وەزیری بەرگری (موشیر محمد حسین

گنگاوی) و سەرۆکی دەزگای هەواڵگری میصری (لیوا عمر سلیمان).ئەم دووانە تەنانەت لە کاتی زیندوویەتی حوسنی موبارەك خۆشیدا دەتوانن لە دژی ئەو کارە بوەستنەوە.

بەڵگەنامەیەکی نهێنی ئەمریکی کەلە باڵوێزخانەی ئەمریکی لە قاهیرە دەرچووە لە بەرواری (٣ ئەپریلی ساڵی ٢٠٠٦)ز. باس لە هۆکارە یاریدەدەرەکانی ڕێگە خۆشکردن دەکات، لە بەردەم جمال موبارەکی کوڕدا تا شوێنی باوکی بگرێتەوە لە دەستەڵاتدا،ئەمە جگە لە ئاماژەدان بە لەمپەرەکانی بەردەم ئەو گواستنەوەی دەستەڵاتە.ئەمەی خوارەوەش دەقی ئەو بەڵگەنامەکەیە:

**بەروار:٣-٤-٢٠٠٦**

**باڵوێزخانە لە قاهیرە**

**نهێنی**

بۆ نێردراو: وەزارەتی دەرەوە لە واشنتۆن

بابەت: جمال موبارەك: کردەوەکان لە وشەکان بەهێزترن

نوسین و ئامادەکردنی : ستوارت جونز جێگری سەرۆکی نێردە

**کردنەوەی بابەت:**

کێشەی جێگری سەرۆکایەتی لە میصر،گەرمترین کێشەی ناوخۆیی دیمەنی سیاسی میصرە، بە پێچەوانەی ئەوانەی پێشخۆی، سەرۆك موبارەك جێگری بۆ خۆی دیارینەکردووە. سەرۆك موبارەك کەماوەی خولی پێنجەمی سەرۆکایەتیەکەی لە مانگی (سێبتەمبەری ساڵی ٢٠٠٥)ز دەست پێکردووە، لە مانگی مایۆ تەمەنی (٧٨) ساڵ تێدەپەڕێنێت، هەرچەندە بە هێزەو تەندروستیەکی باشی هەیە، بەلأم تەمەن تێدەپەڕێت و درەنگ یا زوو کۆتای بە ژیان دەهێنێت.

پێشبینیەکان وەهان کە موبارەك برەو بەوە دەدات کە کوڕەکەی (جمال موبارەك )جێگەی بگرێتەوە لە دەستەڵاتدا، ئەو بیرۆکەیەش لە ساڵی (٢٠٠٢)ز زیادی کردووە، کاتێك کوڕە بچوکەکەی (جمال) گەیشتە ناوەندی سەرۆکایەتی لە پارتی نیشتمانی دیموکراسی دەستەڵاتدار.

## هەڵوێست لەسەر گۆڕەپان:

هەریەکە لە جمال و حوسنی موبارەکی باوکی بەبەردەوامی ئەوە ڕەد دەکەنەوە کە هیچ جۆرە سیناریۆیەکی میراتگری هەبێت بۆ بەپشتاوپشتکردنی دەستەڵات لە میصردا،بەڵام کردەوەکانی جمال و جوسنی موبارەکی باوکی و ئەوانەی دەوروبەریان لە قسەکانیان گرنگترن، وەك چۆن ژمارەیەکی زۆر میصری پێمان دەڵێن: ئەوان دیمەنەکە لە گۆڕەپانەدەکەدا ئامادە دەکەن بۆ پێشوازیکردن لە چوونە سەردەستەڵاتی موبارەکی کوڕ.

لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٤)ز، و کۆتای ساڵی (٢٠٠٥)ز سەرۆك گۆڕانکاری وەزاری ئەنجامدا، بە گوێرەی ئەو گۆڕانکاریە وەزاریانە، زۆرینە کەسە کۆنەکانی پارتی فەرمانڕەوا لابران، ژمارەیەك گەنجی تەکنۆکرات شوێنیان گرتنەوە، کە زۆرینەیان پەیوەندی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان بە جمال موبارەکی هەیە.

لە سەرەتای ساڵی(٢٠٠٦)ز گۆڕانکاری لە پارتی دەستەڵاتداری میصریدا ڕوویدا، کە بە گوێرەی ئەو گۆڕانکاریانە جمال موبارەك پۆستی یاریدەدەری ئەمینداری گشتی حزبی وەرگرت، کە ئەو پۆستە هاوتای پۆستەکەی (زەکەریا عەزمی) سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار و پۆستەکەی(مفید شهاب) ی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو گۆڕانکاریە حزبیانە ژمارەیەك لە کەسایەتی و دۆستە نزیکەکانی جمالیان بردە نێو پۆستە گرنگەکانی حزبەوە، کاتێك ژمارەیەك لە بەرپرسی کۆنی حزب گۆڕانیان بەسەردا هات وەك (کمال شازەل)ی ناوبانگ خراپ.

**جێگیربوون :**

مارەکردنی خەدیجە جمالی خانمی یەکەمی داهاتووی کۆمەڵگای میصری لە تەمەنی (٢٤) ساڵیدا، لە ڕووی بیروبۆچونی ڕای گشتی خەڵکەوە، وەك هەنگاوێکی تر بەرەو سەرۆکایەتی لێکدرایەوە. لەو کۆمەڵگایەیی کە پیاوان لە خوار تەمەنی سی ساڵیەوە ژیانی هاوسەرگیری پێکدەهێنن جمال تیایدا تەمەنی گەیشتووبووە سەروی چل ساڵ و ژیانی هاوسەرگیری پێکنەهێنا بوو، بەڵام ئەو ژنهێنانەی جمال وەك ئەوان دەیانگوت، بە ئامانجی بەدەست هێنانی فراوان بوونی جەماوەری خۆی بوو لە نێو کۆمەڵگەی میصریدا.

**هیچ ئامانجێکی تری نەبوو :**

لە (٢٨) مانگی مارس، جمال موبارەك بە یاوەری زومی کامێراکان، سەردانی گەڕەکێکی هەژار نشینی کرد، کە دەکەوتە ڕۆژئاوای ناوەڕاستی قاهیرەی پایتەختەوە، جمال موبارەك لەگەڵ وەزیری نیشتەجێ کردن و یەکێك لە دۆستەکانی بەناوی (ئەحمەد المغریبی) شریتی پرۆژەیەکی نوێ ی نیشتەجێ بوونی پچڕاند، کە بە یارمەتی (دامەزراووەی گەنجانی ئایندە) دروستکرابوون و بە نرخێکی هەرزان دەدرانە ئەو کەسانەی کە هەژار بوون. ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی (١٩٩٩)ز دامەزرا بوو ئامانجی یارمەتیدان و پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی گەنجانی هەژار بوو.

زۆرینەی چاودێرانی سیاسی لەو باوەڕەدان، کە ئەو دامەزراوەیە وەك دەروازەیەك بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی جمال لێیەوە بچێتە گۆڕەپانی سیاسی وڵات. لە کاتی کردنەوەی پرۆژەکە جمال بە یەکێك لە ڕۆژنامەنوسەکانی گووت کە یاوەری دەکرد( هاتوین تەنها بۆ یارمەتی و خزمەت، هیچ ئامانجێکی ترمان نیە ). لە هەمان ڕۆژدا جمال لە یەکێك لە پرۆگرامە گفتوگۆیەکانی کەناڵی یەکی میصردا دەرکەوت، کە ناڵەکە بە درێژای ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارەو پەخشکردنی بەرنامەکە، ئاگاداری بۆ ئەو بەرنامەیە دەکرد، لەبەر گرنگی پێدانیشی جارێکی تر لە (٢٩) مارسدا دووبارەی کردەوە. جمال لە قسەکانیدا جەختی دەکردەوە لەسەر کارەکانی خۆی بۆ نوێکردنەوەی گەنجانی پارتی

نیشتیمانی و پەرەپێدانی چاکسازی و بیری نویێ ی جزب، ئەوەشی ڕەدکردەوە کە خۆی دوور بگرێت لە شەقامی گشتی خەڵك و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە حەز دەکات دابەزێتە نێو شەقام و گوێ لە داواکاریەکانی خەڵکی بگرێت، ئەوەشی دووپات کردەوە کە بە شێوەی خولی سەردانی پارێزگا جیاوازەکانی میصر دەکات. بەڵام زیاتر باسی لە خۆی و برەودانی بەخۆی نەکرد، تا خەڵکی هەڵسوکەوتەکانی بە هەڵە لێکنەدەنەوە.

لەم دوایانەدا تێبینی ئەوەمان کردووە، کە جمال لە گەشتەکانی دەرەوەی قاهیرەی پایتەختدا شوێنی باوکی گرتۆتەوە، بە تایبەتی لە ڕێوڕەسمی پچڕاندنی شریتی کردنەوەی فرۆکەخانەی (جوبی) لە شەرەم شەیخ، ئەو ڕووداوەش گرنگیەکی زۆری پێدارا، بە شێوەیەك کە جمال وەك سەرۆکی دەوڵەت دەردەکەوت.

**بەردەکەی وەشاند :**

دەربارەی هەوڵەکانی بۆ گەشتنی بە پۆستی سەرۆکایەتی وڵات، جمال موبارەك بۆ بەرنامەی (تێك شۆ) کە لە بەرواری (٢٨) مارسدا پەخشکرا گووتی :ڕوونە وەك ڕوونی هەتاو، کە من هیچ نیەتێکم نیە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی وڵات، من ئێستا هەموو هەوڵەکانم چڕکردۆتەوە بۆ پەرەپێدانی چاکسازی و خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان. بەرهەڵستکاری لیبراڵی (سعدالدین ئیبراهیم) کە بۆ یەکێك لە ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەکان قسە دەکات دەڵێت: ئەو ئامادەکاری دەکات بۆ ئەوەی خۆی بنوێنیێ، ئەگەر بەڕاستی گرنگی بە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی وڵات نادات، ئەی بۆچی ئەو هەموو هەوڵە بەخەرج دەدات؟ )

ڕاوێژکاری پێشووی سەرۆك ناصر و نوسەری دیاری میصری (محمد حسنین هیکل) لە ستونی تایبەتی خۆی لە یەکێك لە ڕۆژنامە سەربەخۆکاندا، نەیاری خۆی بۆ جێنشسنی جمال موبارەك دەبڕیوەوە دەڵێت : (بیرۆکەی جێنشینکردنی جمال لە شوێنی باوکی، دژە لەگەڵ پرەنسیپەکانی کۆماری میصردا). عبدالحلیم قندیل سەرنوسەری هەفتەنامەی عەرەبی ناصری و، یەکێك لە دامەزرێنەرانی بزوتنەوەی (کیفایە)ی

بەرهەڵستکار، ئەویش یەکێکە لە سەرەکیترین بەر هەڵستکارانی جوڵانەوەکانی جمال.قندیل زنجیرەیەك سەر ووتای ورسکەری نووسی لە دژی پلانی بەرزکردنەوەی جمال موبارەك بۆ سەر کورسی دەسەڵات، و جەختی لەسەر رەدکردنەوەی رای گشتی جیهانی کردەوە لە دژی ئەو بیرۆکەیە.بۆیە هەندێك لەو باوەڕەدان کە رووداوی رفاندنەکەی لە ساڵی (٢٠٠٤) و لێدان و ئەشکەنجەدانی لەلایەن گروپێکی نەناسراوی بەڵتەجیەوە، پەیوەندی ڕاستەخۆی بەو جۆرە نوسینانەوە هەبووە.

بیریاری للیبرالی (وسام غزالی) کە لەم دواییانەدا وازی لە پارتی نیشتمانی دیموکراسی دەسەڵاتدار هێناوە، پێی گووتین:ئەو توشی نا ئومێدی بووە لەوەی کە چاکسازی بکرێت لە نێو پارتی نیشتیمانیدا، بە شێوەیەك کە لەو باوەڕەدا بوو،ئەوەی کە هەیە تەنها بریتیە لە کردەی ئامازەکردن بە چالاکیە سیاسیەکانی جمال موبارەك و هیچی تر.

لە (٢٣) مارس رۆژنامەی سەربەخۆی (دەستور) لە گۆشەیەکی نوێوە هێرشیکردە سەر جمال موبارەك،کاتێك ئەو رۆژنامەیە لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە بلاوی کردەوە، کە کۆمەڵەی دارای میصر بۆ ئالوگۆڕ و رێکخستن (هیرمس) رێگەی خۆشکردوە بۆ ئەوەی کە رووبدا لە دابەزینی بۆرصەی قاهیرە و ئەسکەندەریە لە بەرژەوەندی خاوەن پشکەکانی کۆمپانیاکە و هاوکارەکانیان، لەسەر حسابی وەبەرهێنەرە بچوکەکان. لە کاتێکدا ئەگەر بزانین جمال موبارەك ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئەو کۆمپانیایەیە.

**بواری کراوە :**

لەگەڵ رەخنەی خاوەن راکانی میصر و، زیاد بوونی دژایەتی جەماوەری (کە لە رێگەی پەیوەندیەکانمانەوە پێمان دەگات)بۆ بیرۆکەی ئەگەری بەدەستەوە گرتنی دەستەڵات لەلایەن جمال موبارەك لە دوای باوکی، ژمارەیەکی زۆر کەم کێ بڕکێ کەر سەرەکی و دیار هەیە لەسەر پۆستی سەرۆکایەتی میصر، پۆستی جێگری سەرۆکیش تا ئێستا

خاڵیەو پڕنەکراوەتەوە، سەرەڕای پێشبینیەکانی پێشوو، کە دەگوترا لەوانەیە سەرۆك دوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٥)ز جێگر بۆخۆی دیاری بکات.

لە پاییزی ساڵی ڕابردوودا، تەنها (١٠) کێ بڕکێ کەر هەبوون بۆ پۆستی سەرۆکایەتی میصر لەگەڵ حوسنی موبارەکدا. (ئەیمەن نور) لە پلەی دووەم دەهات، بەڵام لە کەش و هەوایەکی نادیار و گوماناویدا، کورسیە پەرلەمانیەکەی لە دەستداو، دواتر تۆمەتبارکرا بە ساختەکاری و بە حەوت ساڵ زیندانی کردن سزا درا.لە پلەی سێهەمدا (نعمان جمعه)ی پاڵێوراوی حزبی وەفد دەهات، ئەمیش بە تۆمەتی کوشتن دەستگیرکرا و خرایە زیندانەوە، سەرجەم پاڵێوراوەکانی تریش کە مابوونەوە کەسایەتی لاوەکی بوون و کاریگەریان زۆریان لەسەر گۆڕەپانتەکە نەبوو.

ئێستا دەتوانین بڵێین هیچ کەسایەتیەکی میصری نیە کە خاوەنی پێگەیەکی نیشتیمانی و سیاسی بێت، کە بتوانێت بە جۆرێك لە جۆرەکان کێ بڕکێ لەسەر پۆستی سەرۆکایەتی میصر بکات، جگە لەیەك کەس نەبێت کە ئەگەری کێ بڕکێ کردنی هەیە کە ئەویش(عمر سلیمان)ە، کە خاوەنی دەستەڵاتێکی گەورەی لە دانانی سیاسەتی ئاشایشی نەتەوەی، و جێگەی متمانەی تەواوی حوسنی موبارەکە.کە پێشبینی ئەوە دەکرێت عمر سلێمان ببێتە جێگری سەرۆکی ئێستای میصر حوسنی موبارەك، ئەوەش بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەرکەوت، لە میانەی سەردانە نێوەندگیریەکەی بۆ هەریەکە لە ئیسرائیل و زەویە فەلەستینیەکان، کە ڕوماڵێکی ئێجگار گەورەی سەردانەکەی کرا لەلایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنی میصریەوە.

ئەگەرێکی تری جیاوازیش هەیە، کە بریتیە لە ئەمینداری گشتی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی (عەمرو موسی)،کە خاوەنی جەماوەرێکی زۆرە و لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی میصریەوە ڕوماڵێکی زۆری چالاکیەکانی دەکرێت، هاوسەنگیەکی تەواویشی هەیە لە شەقامی میصریدا و بە پاڵەوانی گەورە تەماشای دەکەن لە بەرامبەر کێشە عەرەبیەکاندا. بەڵام عەمرو موسی هیچ جۆرە نیەت و ئاماژەیەکی نیە بۆ چاوتێ بڕینی سەرۆکایەتی میصری، هیچ جۆرە سەکۆیەکی دامەزراوەیشی نیە تا لێیەوە بۆی بچێت،

بەلام ئەگەری ئەوە هەیە کە (عەمرو موسی)بۆ ماوەی (٥) ساڵی تر، پۆستی ئەمینداریەتی کۆمکاری عەرەبی وەربگرێتەوە. شتێکی لەو جۆرە هەیە، بەلام هیچ جۆرە ئاماژەیەك نیە بۆ نیەتی چوونە نێو دیمەنی سیاسی ناوخۆییەوە.

**هەموو شتێك لە خێزاندایە :**

سیاسەتی ناوخۆی خێزانەکە بە تایبەتی دەربارەی جێنشینی جمال نا ڕوونە، کوڕی گەورە (علا ) ناسراوە بە بەرژەوەندیە بازرگانیەکانی (کە زۆرێك لە خەڵکی تۆمەتباری دەکەن بە گەندەڵی و هەڵپەرستی و دەست بەسەردا گرتن ) و زۆر دەرنەکەوتووە، پێشتریش هیچ جۆرە ئارەزوویەکی لێدەرنەکەوتووە بۆ چوونە نێو ژیانی سیاسیەوە، علا جارێکیان بە دەگمەن لە شاشەی تەلەفزیۆنی حکومیەوە دەرکەوت، لە کاتی یاری جامی نەتەوەکانی ئەفریقا لە مانگی (فبرایەر)، کاتێك لەسەر کورسی یاریگای قاهیرە دانیشتبوو دلخۆش و شاد بوو بەسەر کەوتنی میصر بەسەر ساحل عاجدا بە دوو گۆڵ بەرامبەر بە گۆڵێك.

سەرۆك وریایەکی زۆر نیشان دەدات و هیچ جۆرە پاڵپشتیەکی ئاشکرا بۆ جمالی کوڕی نیشان نادات، بەڵکو زۆر بەدەگمەن وێنەشی لەگەڵ دەگرێت. لە چەند بۆنەیەکدا بە توڕەییەوە ئەوەی ڕەد کردۆتەوە کە هیچ جۆرە پلانێك هەبێت لە ئارادا بۆ بەپشتاوپشتکردنی دەستەڵات لە بەرژەوەندی کوڕەکەیدا. لە کاتێکدا هەندێك لەو بڕوایەدان سەرۆك دوو دڵە دەربارەی ئایندەی سیاسی جمالی کوڕی، بۆیە نەوەستایەوە لەبەردەم ڕێگەی سەرکەوتنی جمالی کوڕی و هاویمانەکانی لە پارتی نیشتیمانی دیموکراسداو، لەمپەریشی بۆخۆی دروست نەکرد بۆ ئەوەی کە زیاتر لە ڕاگەیاندنەکانەوە دەربکەوێت، بەڵکو سەرۆك جارێکی تر سەرلەنوێ گۆڕانکاری لە وەزیرەکانی حکومەتەکەیدا کرد و باڵی کۆنی حزبی گۆڕی بە چەند گەنجێکی تەکنۆکرات کە پەیوەندی ڕاستەخۆیان بە جمالەوە هەیە.

هەر چەندە بەڵگەیەکی ڕوون نیە، بەڵام ڕای گشتی قاهیرە گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە خانمی یەکەمی میصر(سۆزان موبارەك) زۆر بەتوندی لە پشت سەرخستنی جمالی کوڕیەتی.بە پێچەوانەی سەرۆك خانمی یەکەم وێنەکی زۆر دەگرێت لەگەڵ جمالی کوڕی لە بۆنە گشتیەکانی تایبەت بە بوارە کۆمەڵایەتیەکان.

هەندێك دەڵێن هێز و دەستەڵاتی ئەو دوو کلیلی سەرەکی گەشەسەندنی دەستەڵاتی جمالن لە ڕووی سیاسیەوە. لە ژمارەیەك سەرچاوەی دیاریکراویشەوە پێمانگەیشتووە کە هەر ئەو ڕێگربووە لەوەی کە حوسنی موبارەك جێگرێك بۆ خۆی دیاری بکات.

## دروستکردنی چوارچێوەیەکی یاسای :

یاسای هەڵبژاردنەکان لەگەڵ هەموارکردنە دەستوریەکە ساڵی.(٢٠٠٥)ز جارێکی تر لە ماددەی (٧٦) دەستوردا ڕێکخرایەوە، ئێستا پارتی نیشتیمانی دیموکراسی دەستەڵاتدار کە جمال و هاوکارەکانی دەستیان بەسەردا گرتووە، پارێزگاری لە کلیلی سەرۆکایەتی دەکەن. لە نێو بیست پارتی ڕێگە پێدراوی یاسای میصریدا، تەنها پارتی دیموکراتی نیشتیمانی هاوتای ئەو مەرجانەیە کە لە هەموارکراوە دەستوریەکەدا هاتوون، بە تایبەتی ئەوەی کە تایبەتە بە پاڵێوراو بۆ پۆستی سەرۆکایەتی.

یاسایەك بە گوێرەی هەموارکراوە دەستوریەکە دەرچووە، کە هەر پارتێك بۆ ئەوەی کە بتوانێت پاڵێوراوی هەبێت بۆ پۆستی سەرۆکایەتی میصر، پێویستە ڕێژەی (٥٪) کورسیەکانی هەردوو ئەنجومەنی شورا و گەلی میصری هەبێت. بە نسبەت کەسانی سەربەخۆشەوە، مەرجەکان زیاتر قورسکراون، بە شێوەیەك هەر کەسێك بیەوێت خۆی کاندید بکات بۆ پۆستی سەرۆکایەتی میصر پێویستە (٦٥) ئەندام لە ئەنجومەنی گەل و (٢٥) ئەندام لە ئەنجومەنی شورا و (١٠) کەس لە ئەندامانی ئەنجومەنە خۆجێیەکانی پارێزگاکان لە (١٤) پارێزگای جیاواز لە کۆی (٢٦) پارێزگای میصر پشتیوانی لێبکەن.

**دامەزراوەی سەربازی بەردی کەوتن و سەرسمدان :**

دامەزراوەی سەربازی بەردی کەوتن و سەرسمدانی بنەڕەتیە لەبەردەم هەوڵەکانی دانانی جمال مەبارەك وەك سەرۆکی میصر. هەموو ئەو سەرۆکانەی کە فەرمانڕەوایەتی میصریان کردووە، بە درێژای ماوەی سیستەمی کۆماری لە میصر لە ساڵی (١٩٥٢)ز بە دواوە، سەرجەمیان لە دامەزراوەی سەربازیەوە هاتوون. بە شێوەیەك ئەو دامەزراوەیە پارێزەری حوکمی سەرۆك بووە. ...

جمال موبارەك وەك ئەفسەری سوپا خزمەتی سەربازی نەکردووە (نازانریت کە ئایا خزمەتی سەربازی کردووە یان نا،تەنانەت لە نوسراوە فەرمیەکانی دەوڵەتیشدا، کاتی خزمەتی سەربازی ئەوی تێدا نیە) بە پێچەوانەی باوکیەوە ناتوانێت پاڵپشتی دامەزراووی سەربازی گرەنتی بکات.ئەو زانیاریانە هەمیشە لەڕێگەی پەیوەندیەکانمانەوە پێمان دەگات.ئەوان لەو بڕوایەدان کە (عمر سليمان) کە پێشینەیەکی سەربازە هەیە، بە شێوەیەکی بەهێز دەردەکەوێت لە بەردەم هەر جۆرە سیناریۆیەك بۆ جێنشینکردنی جمال لە شوێنی باوکی. بۆچونێکی تریش هەیە دەڵێت :هەندێك لە سەرانی دامەزراوەی سەربازی بە کت و پڕی دەردەپەڕن وەك کێ برکێ کەر لەسەر پۆستی سەرۆکایەتی میصر، بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە وەزیری بەرگری (محمد گنگاوی) هیچ چاوتێبڕینێکی سیاسی نیە بۆ ئەو پۆستە.

**ووته :**

پێشکەوتنی جمال موبارەك لە پارتی نیشتیمانی دەستەلأتدار و، هەولەکانی بۆ ناساندنی خۆی وەك دۆستی گەل و سەرکردایەتی کردنی بۆ چاکسازی نیشتیمانی و بیری نویێ ی حزب، هەموو ئەمان بەلگەن بۆ تەماعە سیاسیەکانی و، نکولی لێکردنی هیچ واتایەکی نیە. سەرەڕای نەیاریەکی زۆری جەماوەری بۆ شوێنگرتنەوەی باوکی و ئەگەری بوونی لەمپەری زۆر لە بەردەمیدا، بەلأم وا دەردەکەوێت کە ڕێگە لەبەردەم جمالدا کراوەیە بەرەو سەرۆکایەتی.

جمال و دۆستە نزیکەکانی، لە ئەندام پەرلەمان و ئەندامی دیاری پارتی نیشتیمانی (ئەحمەد غز) و هەردوو وەزیری چاکسازی و ئابوری (رشید محمد رشید، یوسف بتروس غالی)، وا دەردەکەوێت کە ئارەزوویان بۆ چاکسازی و چاککردنی ژێرخانی ئابوری ولأت، بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بەرچاوە بە خەلکی، تا لەو ڕێگەیەوە بنکەی جەماوەری جمال موبارەك فراوان بکەن.

**ویکلیکس**

بروسکەیەکی تری دیبلۆماسی ئەمریکی، کە پێگەی ویکلیکس دزەی پێکردووە، لە نێو سەد بروسکەی نهێنی ئەمریکی لە میصردا، ئەوە ئاشکرا دەکات کە سەرکردایەتی پارتی دەستەلأتدار بێزارن لەو وێنە پالەوانیەیی کە (علا ) ی برا گەورەی پێدەرکەوت، دوای یاریەکەی جەزائیر لە خولی پالأوتنی جامی جیهانی ئەو دوایەدا، بەوە لێکدرایەوە کە ئەوە دوژمن و نەیاری بالأنسی جمال موبارەکە.

بالوێزخانەی ئەمریکا لە قاهیرە، لە بەلگەنامەیەکدا کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مانگی نۆڤەمبەری سالی (٢٠٠٩)ز ئاماژە بەو دەکات کە پارتی نیشتیمانی دەستەلأتدار بڕیاریداوە بە دەستپێکردنی هەلمەتێکە ڕاگەیاندنی گەورەو بەرفراوان، بۆ گەڕاندنەوەی وێنەی جمال موبارەك بەشێوەیەکی بەهێز، دوای ئەوەی کە پارتە بینیویەتی کە (علا )

لای میصریەکانْ باشترو شایستەترەو زۆرتریش باسیدەکەن. بەڵگەنامەکە ڕوونی دەکاتەوە، کە ئەو هەڵمەتە چڕوپڕەی پارتی نیشتیمانی ئامانجەلێ ی برەودانە بە ڕۆڵی سەرکردەییانە، کە مەبەستیانە ئەو ڕۆڵە جمال موبارەك بیگێڕێت، هەر بەپێ ی بەرنامەکانی ئەو هەڵمەتە، دەبێت جمال گوتارێك پێشکەش بکاتْ و، تیایدا باس لە بەرنامەی چاودێری تەندروستی بکات، کە بەگرنگترین خەمی میسریەکان ئەژمار دەکرێت.

بە کورتی دوای هەموو ئەو شتانەی کە لەو بەشەدا باسکران، دەتوانین بڵێین مەترسیدارتین دەرئەنجامێك بۆ ستەم و دیکتاتۆری سیاسی حوسنی موبارەك بریتی بوو لە لاوازی بەشداری سیاسی، بە شێوەیەك کە میصریەکان کەوت بوونە حاڵەتی دابڕان و گۆشەگیری سیاسی، پارتە سیاسیەکان زۆرینە یان بوو بوونە پارتی بێ جەماوەری.

وەك چۆن بەردەوام بوون لەسەر ساختەکاری هەڵبژاردنەکان و یاریکردن بە دەرئەنجامەکانیەوە، وای کردبوو کە ڕێژەیەکی زۆری دەنگدەران بەشداری پرۆسەکانی هەڵبژاردن نەکەن، لە ڕوانگەی ئەوەوە کە دەنگەکانیان هیچ بەهایەکیان نیە و، دەرئەنجامەکانی هەڵبژاردن پێشتر یەکلای بووەتەوە، ئیتر ئەمان بەشداری بکەن یان نەیکەن، ئەمەش بووە هۆی لاوازی بەشداری کردنی هاولاتیان لە پرۆسەکانی هەڵبژاردندا.

ئەم باوەڕەش زیاتر پەری سەند، دوای هەڵوەشانەوەی ڕۆڵی دادگاکان لەسەرپەرشتی کردنی هەڵبژاردنەکاندا، بە پێی هەموارکردنە دەستوریەکانی ساڵی (٢٠٠٧)ز. دوای ئەمیش هەڵبژاردنەکانی نوێ کردنەوەی نیوەی ئەنجومەنی شورای میصری بەدوادا هات لە ساڵی (٢٠١٠)ز بۆ جەخت کردنەوە بە شێوەیەکی ڕون و ئاشکرا لەسەر ئەو ڕاستیە. هەروەها بزوتنەوەی سیاسی نوێ سەرەڕای ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە دەیگێڕا لە جوڵەی سیاسی میصریدا، بەلاّم ئەمیش بە تەنها لە حاڵەتی جولانەوەیەکی نوخبەوەی قەتیسما.

یەکێك لەو دەرئەنجامانەی تری سیاسەتەکەی موبارەك بریتی بووە لەو ڕۆڵەی کە هەی بوو لە دیارنەبوون و لاوازنەبوونی ڕاستگۆی گۆتاری سیاسی فەرمی ولاّت، لەبەر بوونی کەلێنێکی گەورە لە نێوان کردار و گوفتار. بۆ نموونە کاتێك گەورە بەرپرسان و نوسەرانی سەربە دەستەلاّت، جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە لە میصر لە ماوەی

فەرمانڕەوایەتی موبارەکدا لە گەشاوەترین ماوەی ئازایی و دیموکراسی خۆیدا ژیاوە، وەك ئەوەی کە بلێیت باس لە میصرێکی تر بکەن، ئەو میصرەی نا کە خەڵکی میصر دەیناسی و تیایدا دەژیا.وە کاتێك گوتاری سیاسی فەرمی جەختی دەکردەوە لەسەر چاودێریکردنی هەژاران و ئەوانەی کە داهاتیان دیاریکراوە و دانانیان لە پێشینەی کارەکانی حکومەت و حزبدا، وە ئەو جیاوازیە زۆرەی بواری ئابوری و کۆمەلآیەتی کە میصر بەخۆیەوە دەیبینی، هیچ جۆرە ڕاستیەکی بۆ ئەو جۆرە قسانە نەدەهێشتەوە.

## 21-قەزافی و خۆبەهێزکردنی بەدەرەوە. ..کاتێك جادوەکە هەڵدەگەڕێتەوە بەسەر جادووگەرەکەدا!!



هەندێك جار،هەندێك دەستەڵاتدار وا گومان دەبەن کە خۆبەهێزکردن بەدەرەوە، لەوانەیە گرنتی مانەوە و بەردەوام بوونیان لەسەر کورسیەکانیان بۆ بکات.

لێرەدا دەستەڵاتداران پشت دەبەستن بە هێزی دەرەکی بۆ ئەوەی ناوخۆی پێ سەرکوت بکەن، بەبێ ئەوەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لێپێچینەوەیان لە بەرامبەردا بکات.ئەو کۆمەڵگەیەیی کە ئەمریکا چۆن بیەوێت ئاوا دەیجوڵێنێت،دەیجوڵێنێت بۆ سزادانی ئەوانەی کە خۆی مەبەستیەتی و دوریشی دەخاتەوە لەسەر ئەو دەستەڵاتدارانەی کە نایەوێت توشی لێپرسینەوە و دادگایکردنە ببن.

لەوانەیە ئەو جۆرە دەستەڵاتدارانە نەزانن،کە خۆبەهێزکردن بە دەرەوە هەتا سەرنیە،لەکاتی ڕودانی ڕێژەیەکی دیاریکراو لە تورەی و شۆڕشی گەلەکانیان ئەو دەستەڵاتەش ڕۆڵ و کاریگەری نامێنێت، دەستەڵاتدارەکە توشی وەستانی سیاسی و پەرگەمی دادپەروەری دەکات و پاشماوەی تەمەنی لە سوچی زیندان بەسەر دەبات، یان لەو شۆڕشە جەماوەریەدا گیان لەدەستدەدات و دەکوژرێت ! !

قەزافی نموونەیەکی رەهای ئەو جۆرە دەستەڵاتدارەنە بوو کە خۆیان بە هێز دەکرد بە دەرەوە، لە هەڵەیەکی کارەساتباری دوو بارە بۆوەی مێژوو.باجێکی زۆر گەورەی لەسەردا کاتێك شۆڕش لە دژی بەرپابوو، و دەرەوە هیچ سودێکی بۆ نەبوو، لە چالاکیەکی هێزە چەکدارە شۆڕشگێڕەکاندا بە بەرچاوی هەموو دونیاوە لە دیمەنێکە لەیاد نەکراودا کوژرا.

بەڵێ دیاردەیەکی مەترسیدار، لەم ماوانەی دوایدا ژیانی گشتی عەرەبی گرتەوە. دیاردەیەکی نێگەتیڤ و خراپ، کە زۆر لایەنی جیاوازی ژیانی گرتەوە و لە ژێر چەپۆکەکانیدا ژمارەیەك دەستەڵاتداری لەناوبرد، کە بریتی بوو لە خۆبەهێزکرن بە

دەرەوە،یان خۆبەهێزکردن و پشت بەستن بەلایەنی بیانی، کە لە هەموو حاڵەتەکاندا حەزو ئارەزووە ئەمریکی-ئیسرائیلی، یان ئەورووپی -ئیسرائیلی لەگەڵدا بوو.

هەندیك دەستەڵاتدار (کە قەزافیش نمونەیەك بوو لەو جۆرە) وا دەزانن بە لایەنگریان بۆ ئەمریکا و وەڵامدانەوەی داواکاریەکانی و جێ بەجێکردنی ئامانجەکانی لێرە و لەوێ، وەك ئەوەی لیبیای سەردەمی قەزافی کردی، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە شەڕ و خراپە و هێزی ئەمریکا پارێزراوبن، مادام لە باوەشی گەرمی ئەمریکادا دانیشتوون.

ژمارەیەك لە دەستەڵاتداران کەوتنە ئەو هەڵە مەزنەوە، لەسەروی هەمووشیانەوە صدام حسێنی دیکتاتۆری عێراق، کە خاوبوونەوەی لە باوەشی ئەمریکیدا گەیشتبۆوە ئاستی سیخوڕی و بەکرێ گرتەی بۆی، تا ئەو کاتەی کە ئەمریکا بینی بەرژەوەندی لەوەدا نەماوە، لە سەردەستەلاَت لایداو دەستگیریکرد و لە سێدارەیدا، بە چاوپۆشی لە هەموو ئەو باج و قوربانیەی کە دابووی بۆ ڕازیکردنی ئەمریکا.

قەزافیش هەر بەهەمان شێوە کاڵەکێکی ئەمریکی لە سکی دانابوو، دڵنیابوو لە ڕازی بووتی ئەمریکی. قەزافی بە شێوەیەکی کت وپڕ لە لێدانی قەوانی دژایەتی کردنی ئەمریکا، گۆڕا بە گوێڕایەڵێکی تەواوی ئەمریکا،پاشان بوو بە کرێ گرتەیەکی نمونەی بۆی، دوای ئەمە گەیشتە ئەو باوەڕەی کە کارەکە کۆتای هاتووە و دەستیکرد بە گرەو کردن لەسەر دەرەوە لەسەر حسابی سەرکوتکردنی ناوخۆی. تووشی بەلاَو نەهامەتیەکی گەورە بوویەوە، کەوتە قۆناغێکی پێشکەوتووی شێت بوونی گەورە،لەمەشدا ماڵ و داراییەکەی پارمەتیدا، کە ڕاگەیاندنی عەرەبی و ڕۆژئاوای لێ پڕکردبوو.

قەزافی ناوی خۆی نابوو پادشای پادشاکان،سوڵتانی سوڵتانەکان،میری میرەکان، شێخی شێخەکان، سەرۆکی سەرکردەکانی ئەفریقا، خاوەنی شۆڕشی سەوز و کتێبی سەوز و جل و بەرگی سەوزی للیبی و دروشمی نەخشەی سەوزی ئەفریقی و سەرۆکی شۆڕشی ڕزگارکەری سەوز. لە لیبیا هیچ سیفەت و نازناوێکی سوڵتانی ناما، تا بەموعەمەر قەزافیەوە نە لکێنرێت، بوو بووە پاڵەوانی جێگەی پێکەنینی خەڵکی ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاواو عەرەب و عەجەم (واتەخەڵکانی نا عەرەب ).

وەك هەموو جاران گەلانی عەرەب سەلماندیان کە ڕەد کرنەوە نیە بۆ ویست و ئیرادەیان، بەوەی کە ڕژێمەکەی قەزافی زیاتر لە چل ساڵ درێژەی کێشا بە هەموو گەورەی شێتی و سەرکەشی خۆیەوە ڕوخێنرا، لە بەهێزترین شۆڕشی عەرەبیدا،کە لە(تونس)وە دەستی پێکرد و وەك ئاگری ناو پووش بە جیهانی عەرەبیدا بلاْوبوویەوە. لە دەرئەنجامدا ڕژێمەکەی قەزافی روخێنراو لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە کوژرا، ئەو شۆڕشگێڕانەی کە توانیان هەردوو کوڕەکەشی سیف الاسلام و ساعدی دەستگیر بکەن.

کەس لەو باوەڕەدا نەبوو و پێشبینی ئەوەی نە دەکرد کە سەرۆکی لیبیا بەو ئاسانیە بکەوێت، دوای گوتارە بەناوبانگەکەی (کۆلان،کۆلان).دواجار دوای شەش مانگ لە گرتن و بەردەی شۆڕشگێڕان دیکتاتۆرەکەی لیبیا کەوت و، گیانی خۆی وەك باجێکدا بۆ تاوانەکانی. وەك هەموو چیرۆکی دیکتاتۆرەکانی تر، چیرۆکی قەزافیش کۆتای هات. کۆتاییەکەی زۆر جیاواز نەبوو لە کۆتای دیکتاتۆرەکانی تری هاوشێوەی خۆی وەك :(شاوشیسکۆی دیکتاتۆری رۆما،میلۆسۆڤیچی خوێن مژی بەڵقان، صدام حسێن لە عێراق، بن علی لە تونس، حوسنی موبارەك لە میصر، علی عبدالله صالح لە یەمەن.

قەزافی پێش چل و ئەوەندە ساڵ کودەتایەکی سەربازی لە لیبیا ئەنجامدا، دوای ئەوە ئیترهیچ جۆرە هەلێکی بە گەلەکەی نەدا تا گوزارشت لە ڕاو بیروبۆچونی خۆی بکات، هەستا لیژنە جەماوەریەکانی دروستکردو ڕایگەیاند کە ئەو سەرۆك نیە بەڵکو سەرکردەی شۆڕشە، لە ژێر ئەو پەردەیەدا گەلەکەی خۆی سەرکوتکرد و سوکایەتی پێکرد.

هەندێك تیۆرەکەیان بۆ دروستکرد و، زۆرێکیش لە ڕاگەیاندکارانی سەردەمی چەوسانەوە و دەست بەسەری لە سەرجەم ولاّتانی عەرەبیدا پشتگیریان لێکرد.هەمووان لەسەر سفرەکەیان دەخوارد و ستایشی تیۆرەکەیان دەکرد،هاوکێشەکەش بریتی بوو لە :پارە بەرامبەر پاڵپشتی و لایەنگری.

کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر هەموو سفرەیەکی ئامادەبوون و لە ماڵ و پارەی گەلی لیبیایان دەخوارد و شتایشی تیۆرەکەیان دەکرد. ....بێ ئاگا بوون لە ستەمکاریەکەی و ڕایان دەبوارد بە دینارەکانی.

قەزافی هەریەکە لە وڵاتەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو نەتەوە یەکگرتووەکانی تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە چاویان بڕیوەتە ماڵ و سامانی وڵاتەکەی، بەڵام کاتێك بووە هاوپەیمان و دۆستیان، هەڵوێستی گۆڕا و لەبەرامبەر ئەو دۆستایەتیەدا سازشی کرد لە بەشێك لە سامانی وڵاتەکەی بۆیان.

خۆی بەهێزکرد بەلایەنی دەرەکی و خۆپاراستن پێی، بۆ هەر جۆرە دوژمن کاریەك لە دژی گەل،سیاسەتێکی گەمژانەو چاوتێبڕینێکی بێ عەقلانە و بە ئاگابونێکی سەرشۆڕانەیە و بەهایەکی نزمیشە، لە کۆتای هەموو ئەو سزایانەی کە بەدوای ئەو جۆرە کردەوانەدا دێن، گەورەن بە پلەی ناپاکی گەورە، یان پلەیەکی بەرز لە ڕیسوابوون و سوکی و تاوان.

بە درێژای مێژووی مرۆڤایەتی، ئەوە سەلمێنراوە کە لە مەسەلەی خۆبەهێزکردن بەدەرەوە، کەسی خۆبەهێزکەر هیچی دەست نەکەوتووە، بەڵکو یەکەم کەسێك کە توشی ڕیسوای و سەرشۆڕی دەبێت، لە دەرئەنجامی دەستێوەردانی بیانی، هەر ئەو کەسە خۆیەتی کە داوای یارمەتی سەرخستنی لە لایەنی دەرەکی کردووە.

چیرۆك زۆرە لەو بارەیەوە بیخەینە ڕوو، بەڵام لەبەر نەبوونی بوار لەو نوسینەدا ناتوانین بیانخەینە ڕوو. کورتی قسە ئەوەیە کە کۆتای خۆبەهێزکردن بە لایەنی دەرەکی خێرو چاکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت و ناشتواتنێت شەڕ و خراپەش دوور بخاتەوە، بەڵکو نەهامەتی و ئێش و ئازار بەرهەم دەهێنێت، وەك ئەوەی کە بەسەر قەزافیدا هات.

سەیرە قەزافی لەوە تێنەگەیشت کە خۆبەهێزکردن بەدەرەوە، وەك چەکێکی دوو سەرە وەهایە، دەکرێت لە دژی بەکاربهێنرێتەوە. کاتێك دەرەوە بینی قەزافی دەستەلاتی لەدەستداوە و ناتوانێت جارێکی تر جڵەوی کارەکان بگەڕێنێتەوە ژێر دەستی خۆی، ئیتر ڕاستەوخۆ بە شوێن جێگرەوەدا گەڕا،ئەو جێگرەوەیەش گەلی لیبیا خۆی بوو.

دوای ئەوەی شۆڕشی گەلی لیبیا گەیشتە ڕێگەیەکی داخراو، و قەزافیش بە شێتی و سەرکەشیەکەی خۆی پێداگری دەکرد لەسەر دەستگرتن بە دەستەلات و بەردەوامیدان

بە تاوان و قەسابخانەکانی لە دژی گەلەکەی خۆی، کە دابەش بوو بوو بەسەر دوو بەشدا، ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات، بە شێوەیەك ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی لیبیا ئۆپۆزیۆن دەستی بەسەردا گرت بوو شاری (بنغازی) کردبووە بنکەو پایتەختی خۆی بۆ پێشرەوی کردن بەرەو ڕۆژئاوای ژێر دەستەلاتی قەزافی. قەزافیش ناوچەکانی ڕۆژئاوا و شاری (تەرابلوس)ی پایتەختی لە ژێر دەستەلاتدا مابوویەوە، بە تایبەتی (باب العزیزیە) ی کردبووە بارەگای دەستەلات و سوپاکەی بە ئاراستەی ڕۆشتن بەرەو ڕۆژهەلات، بەمەبەستی لەناوبردنی تەواوی ئۆپۆزیۆنی ولاتەکەی، تەنانەت ئەگەر بەو کارەشی تەواوی گەلی لیبیای لەناو بچوایە.

لەگەڵ بەردەوامی قەزافی بۆ لەناوبردن و سەربڕینی گەلەکەی و سازش نەکردنی لەسەر دەستەلات. ئۆپۆزیۆنی لیبی هیچی لەبەردەمدا نەمایەوە و ناچار بوو پەنا بۆ کۆمەلگەی نێو دەوڵەتی بەرێت و داوای یارمەتی لە کۆمەلگەی نێودەوڵەتی کرد، دەست تێوەردان بکەن، ئەگەر بە دروستکردنی قەڵغانی دژە فڕینیش بێت لەسەر فڕۆکە جەنگ کەرەکانی قەزانی.

ڕۆژئاوایەکان بەخێرای دەست تێوەردانیان نەکرد.بارودۆخەکەیان بە هەڵواسراوی وازلێهێنا، و بە شێوەیەکی خێرا وەلامی داواکاریەکانی ئۆپۆزیۆنی لیبیا یان نەدایەوە. تا بەتەواوی کارەکە گەیشت و پڕ بوو،کارەکە گەیشتە ئاستێکی مەترسیداری تەواو بە نسبەت گەلی لیبیاوە.دوای ئەمە دەستپێشخەری یەکەمی کۆمکاری عەرەبی هات، کە داوای لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی کرد، ئاسمانی دژە فڕین بسەپێنێت بەسەر ڕژێمەکەی قەزافیدا، بە پشت بەستن بە داواکاری ئۆپۆزیۆنی لیبی و ئەنجومەنە کاتیەکەی.

بەلام وەلامدانەوەی نێو دەوڵەتی جێ بەجێ نەبوو،ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ولاتە ڕۆژئاوایەکان دوایان خست، نە ئەزانرا ئایا پاڵنەری ئەو هەڵوێستەیان چیە؟ ئایا ئەو هەڵوێستەیان لە پێناو زیاتر خراپ بوونی بارودۆخەکەو ڕۆچوونی زیاتری شکستی ئۆپۆزیۆنی لیبی و کۆمکاری و عەرەبی و گەلی لیبیا بوو، کە وایان دەبینی دەستەوسانی

ڕۆژئاواو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرخستنی گەلی لیبی، پیلانێکە بۆ فراوانکردن و کردنەوەی بوار لە بەردەم قەزافیدا بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە گوشتارەکەی و پێشکەوتنی بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ژێر دەستەلاتی ئۆپۆزیۆن، یان ئەو دواخستنە لە پێناو پێگەیشتنی تەواوی ڕووداوەکەدایە، بەو پێیەش کەشەکە گونجاو لەبار دەبێت بۆ دەست تێوەردان بەبێ ورووژانی ڕای گشتی عەرەب و گەلانی ڕۆژئاوا خۆیان، بە تایبەتی دەست تێوەردانی ئەو جارە لەسەر داواکاری کۆمکاری عەرەبی ئۆپۆزیۆنی لیبیا خۆی بوو.

دواجار یارمەتیە ئاسمانیەکانی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی گەیشتن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو یارمەتیانە هیچ نەبوو، جگە لە هۆکارێك نەبێت بۆ بەهێزکردنی دەستی شۆڕشگێڕەکان بۆ لێدانی دوژمنە دیکتاتۆرەکەیان، کە ڕای گەیاند بوو ئەگەر گەل سەرشۆڕنەکات بۆ ویست و ئاروزووەکانی ئەوە ولاتی لیبیا تێکدەدات. ئەو ئامادەبوو بۆ ئەو ویستەی خۆی ژمارەی دانیشتوانی لیبیا لە شەش ملیۆنەوە کەم بکاتەوە بۆ دوو ملیۆن بە کوشتن و دەربەدەرکردن و بێسەر و شوێن کردنیان.

پەیمانی باکوری ئەتلەسی و ڕۆژئاوا،ستراتیژی تایبەتی خۆیان هەیە.یارمەتیەکانیان بۆ گەلی لیبیا لە خۆشەویستی ئەوانەوە نەبوو بۆ ئەو گەلە،بەڵکو لە ڕوانگەی حەزی ئەوانەوە بوو بۆ چنینەوەی زۆرترین ئەوەی کەدەکرێت لە دەستکەوت و ئیمتیازات، بە بەشداریکردنیان لەبردنی ماڵ و دارای لیبیا، لە ڕێگەی کۆمپانیاکانی ولاتەکانیانەوە بۆ دوو بارە بنیادنانەوەی لیبیا دوای ئەوەی کە وێران کرابوو.

## خوێنەری خۆشەویست، لەم کتێبەدا ئاشنا دەبیت، بە

زۆرترین ئەو هەلە مێژووویانەی کە لە جیهانی سیاسەتدا ئەنجامدراون، لەلایەن کەسانی سیاسیەوە، ئەو کەسانەی کە هیچ بیریان لێنەکردۆنەتەوە تا بەسەریدا نەکەوتوون، لە ڕوانگەی تێڕوانینیان بۆ شارەزای و ئەزموون و وانەی مێژووی،لە وەرگرتنی ئەزموون لە هەلەکانی ئەوانەی پێش خۆیان.

بۆ نمونە لەم کتێبەدا ئەو هەڵانە بەرجەستەکراون کە هەریەکە لە ئیمپراتۆری فەرەنسی (ناپلیۆن پۆناپۆرت) و سەرکردەی ئەلمانی (ئەدۆلف هیتلەر) و، ئیمپراتۆری ژاپۆنی (هیرۆ هیتۆ)، و هەر دوو سەرکردەی ئەمریکی (لیندۆن جۆنسۆن) و (ریچارد نیکسۆن)، ئەنجامیانداون،لە پێش ئەوانیشەوە ئەو هەڵانەی کە هەریەکە لە شاژنی میصر (شەجەرە دوڕ) و، پادشای فەرەنسا (لویسی نۆیەم) و کۆتا پادشای موسلمانەکانی غرناتە (عبدالله بن بنی الاحمر) ئەنجامیانداون.

هەروەها لەم کتێبەدا ئەو هەلە گەورانە دەبینین کە گەلان ئەنجامیانداون، وەك ئەو هەلە گەورەیەی کە گەلی ئەمریکی ئەنجامیدا بە هەڵبژاردنی (جۆرج بوشی کوڕ) بە سەرۆکی ئەمریکا. یان ئەو لادانە گەورەیەیی کە زۆرینەی سەرکردەکانی شۆڕش لە جیهانی سێهەمدا کردیان، بە بەکارهێنانی ئەوەی کە پێی دەگوترێت شەرعیەتی شۆڕشگێڕی بە خراپترین شێوە، بۆ گرنتی کردنی مانەوەیان لەسەر کورسی دەستەلاتی وڵاتەکانیان بۆ هەتا هەتایە.

هەروەها نموونەی سەرکردەیەکی تری وەك سەرۆکی عێراق(صدام حسێن)، کە بە بڕیارە هەلەکانی وەك داگیرکردنی وڵاتی کوەیتی دراوسێی، تێکدان و وێرانکردن و مردنی بە دوای خۆیدا هێنا، بۆ گەلی عێراق و گەلانی دراوسێی، و گیانی خۆی لە باجی ئەو هەلەیەدا لەدەستدا، لەم کتێبەدا باس دەکەین. ئەمە جگە لەوەی باس لەو هەلە گەورانە دەکەین کە سەرکردەکان بەرامبەر بە خۆیان ئەنجامیانداوە، بە بەجێهێشتنی چارەنوسی خۆیان لە دەستی هەندێك کەسی ناپاکی دەوربەری خۆیان، و پێدانی پۆستی گرنگ و هەستیار بەو کەسانە، کە دواجا بووەتە هۆی ئەوەی ئەو کەسانە لە دژیان هەڵبگەڕێننەوە و لە ناویان بەرن و لە سێدارەیان بدەن، وەك سەرۆکی وڵاتی چیللی سیلڤادۆر للیندی و، هەردوو سەرۆکی عێراقی عبدالکریم قاسم و ئەحمەد حسن بەکر.

هەروەها لەم کتێبەدا نموونەی ئەو سەرکردانە باسدەکەین، کە گرەویان لەسەر هاوپەیمانی ئەمریکیەکان کردووە، لە جیاتی ئەوەی گرەو لەسەر گەلەکانی خۆیان بکەن. بۆ ئەم کارەشیان باجێکی گەورەیانداوە، بەڵام دوای ئەوەی کە کار لەکار ترازاوە، ئینجا تێگەیشتوون کە ئەوەی گرەو لەسەر ئەمریکیەکان، یان هەر وڵاتێکی تری دەرەکی بکات بۆ گرەنتی کردنی مانەوە و درێژەدان بە دەستەلاتەکەی دەیدۆڕێنێت، لە نمونەی ئەوانەش محمد ڕەزای شای ئێران و سەرۆکی فلیپینی فریناندۆ مارکۆس.هەروەها ئەو هەڵانەی کە دوو سەرۆکی تری وڵاتانی عەرەبی ئەنجامیاندا ئەنوەر سادات سەرۆکی میصر و حبیب بورقیبەی سەرۆکی تونس. وە ئەو هەڵانەی کەهەر دوو سەرکردەی بزوتنەوەی نیشتیمانی فەلەستینی سەرۆکی بزوتنەوەی فتح محمود عباس و سەرۆکی حکومەتەکەی حماس ئیسماعیل هەنیە ئەنجامیاندا،بە چوونە نێو ململانێ و پێکدادان و جەنگ لەسەر دەستەلات، لە جیاتی هەوڵدانیان بۆ دروستکردنی دەولەتی سەربەخۆی فەلەستینی و بەرەنگاربوونەوەی ئیسرائیل.

هەموو ئەو کەسایاتیانەی نێو ئەم کتێبە هەڵگری نازناوی زیرەکن، بەڵام بە ئەنجامدانی یەك هەڵەی گەورە، هەموو ئەوەی کە هەیان بووە لە دەستیانداوە، یان هەموو ئەو شتەی لە مێژوو ناوبانگ کە هەیان بووە سڕیانەتەوە.

**نوسەر**



لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (١٢٠٠٠) دینار